میکاڤالتاری

# سینۆهە

## پزیشکی تایبەتی فیرعەون

و: سەیدا شێخ زرار

بەرگی یەکەم




دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی
کوردستان/هەولێر ت. (٢٢٢٩٩٩٢)

e.mail:mukriani@yahoo.com

- کتێبی ژمارە: (٤٥)
- کتێب: سینۆهە پزیشکی تایبەتی فیرعەون
- نووسینی: میگاڤالتاری
- وەرگێڕانی: سەیدا شێخ زرار
- هونەرکاری: قاسم قادر
- چاپی یەکەم: هەولێر ـ ٢٠٠١
- ژمارەی سپاردن (١٧٨)ی ساڵی ٢٠٠١دراوەتێ.
- چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە/ هەولێر

# پێڕست

## بەناوی یەزدانی مەزنی میهر و نەوا

سوپاس بۆ خوا، کە ئارەزووی دێرینم بۆ وەرگێڕانی ئەم کتێبە و حەزی ئاشناکردنی رۆشنبیران و خوێنەرانی کورد، بە زانیاری و رووداوە مێژووییە گرنگەکانی ئەم سەرگوزەشتەیە، هاتەدی و بە بڵاوبوونەوەو کەوتنە بەردەستی ئازیزانی کورد زوبان، بەشێکی زۆری ماندووبوون و شەکەتی کاری وەرگێڕانەکەیم لە یادچووەوەو ئومێد دەخوازم کە هەنگامەیەکی باش بێت بۆ دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردی و خزمەتکردن و بەرەوپێش بردنی رەوشی رۆشنبیری و هونەری لە کوردستان.

لێرەدا، ئەگەرچی نامەوێت لە گرفتە ماددی و مەعنەویەکان و ئەو ئاستەنگانە بدوێم کە دێتە سەر رێی نووسەران و رووناکبیران و هونەرمەندانی کورد، بەڵام وەرگێڕ لە نزمی ئاستە رۆشنبیری و هونەرییەکانی کۆمەڵ و پاشکەوتەیی لە گرنگیدان بە پەرتووک و خوێندنەوەو مۆتالاکردن، رەنج دەبات و ئەو فاکتەرانە تارادەیەک ئاکامی روخێنەر و ساردکەرەوەی دەبێت.

ئەمە لە کاتێکدا کە لە زۆربەی وڵاتانی دەوروبەر ئەم گرفتانە نییە. بۆ نموونە وڵاتی ئێران لە زۆربەی ئەو بوارانەدا پێشکەوتنێکی بەرچاوی هەیە، جا چ لە بەرهەمە ناوخۆییەکانیان بێت یان لەوەرگێڕانی نووسینە بیانییەکان و ئەمە لە سەرنجی یەکەمدا هەست پێ دەکرێت وەلەبەر ئەوەی. بەهۆی ئاوارەبوونی بەشێکی زۆری برا کوردەکانمان لە ئێران، کەسانێکی زۆر هەن کە ئاشنای رۆشنبیری فارسین، جێی خۆیەتی کەلەم رۆژەدا جێدەستیان لە خزمەتکردنی ئاستە زانستی و رۆشنبیرییەکانی ئەم نیشتمانە بەدیار بکەوێت و ئەوەش



لەبیرنەکەین کە هەڵبژاردنی بابەتی وەرگێڕان کاریگەرێتییەکی زۆری هەیە لەسەرکەوتن و ئاکام دانەوەی کاری وەرگێڕ.

هەروەها ئێمە لە وەرگێڕاندا دەتوانین سوود لە زانیاری و تەکنیک و هونەری وەرگێڕی یەکەمیش وەربگرین و ئەگەر زمانێکی وەکو فارسی بێت، ئەوا لەو رووەوە کە رەگی زمانی ئێمە و ئەوان زۆر لە یەکەوە نزیکە، سوودی زیاتری لێ بەدی دەکرێت. واتە مەرج نیە ئەو بابەتە تەنها لە زمانە ئەسڵییەکەیانەوە، یان لە زمانێکی ئەورووپی و... بێت، ئەمەش ئینکاری لێ ناکرێت کە وەرگێڕان لە زمانی نووسەرە ئەسڵییەکە ئیجابیاتی تایبەت بەخۆی هەیە.

سەبارەت بەم پەرتووکەی کە لە بەردەستتان دایە، ئەمە بەرگی یەکەمی (بەرگی دووەمیشی پەنابەخوا لەداهاتوودا دەکەوێتە بەردەستتان) سەرگوزەشتەو بیرەوەرییەکانی (سینۆهە - پزیشکی فیرعەون)ە کە بە زمانێکی شیرین و کار تێکەر باس لە رووداوەکانی ژیانی خۆی و خۆشەویستی و شێوەی ژیان و داب و نەریت و بیروباوەڕیان و خوایەکانیان (بتەکانیان) و فیرعەونەکان و زۆر شتی سەرنجراکێشەری تری ئەو سەردەمە دەکات و لەگەڵ ئەوەشدا کە نزیکەی (٣٣٥٠) ساڵ لەمەو بەر (سینۆهە) ئەم یادداشتانەی نووسیوەتەوە، بەڵام هەندێ لەو کارەسات و بەسەرهاتانە لە ناخەوە دەروونی مرۆڤ دەهەژێنێت و لە زۆر شوێنی تر خوێنەر چێژێکی تایبەت لە وتەکانی وەردەگرێت.

لە بارەی چۆنیەتی وەرگێڕانەکەشەوە، ئەوەندەی لە توانامدا بووبێ هەوڵم داوە نۆبەرەبوونی پێوە دیار نەبێت و لە زۆر شوێنیشدا سوودم لە وشە هاوبەشەکانی نێوان فارسی و کوردی وەرگرتووە و لە جێگای پێویستدا ئاماژەم بۆ ماناو مورادیف و زاراوەکان کردووەو هەندێ جاریش بەمەبەستی ئاشناکردنی خوێنەر بەو وشانە و هەروەها بۆ زانینی چۆنێتی بەکارهێنانی هەندێ لەو دەربڕین و شێوازانە لە زمانی فارسی و دەوڵەمەندکردنی خەرمانی وشەی کوردی، خودی زاراوە فارسییەکەم وەرگێڕاوەو وەک خۆی نووسیوەتەوەو ماناو روونکردنەوەشم

لەسەر نووسیووە.

بۆیە لەگەڵ ئەمانەشدا، بەخۆشحاڵییەوە گوێ لە ڕەخنەو تێبینی و پێشنیاری خوێنەرانی بەڕێز دەگرم و حەز دەکەم گوێ بیستی بیروبۆچوونیان بم. چونکە لە راستیدا هەڵسەنگاندنی چۆنیەتی کاری نووسین و وەرگێران بۆ خوێنەران دەگەڕێتەوە، نەک بۆ کەسێکی تر و هیوادارم سوودی لێ وەربگیردرێ و بە نەزەری لوتفەوە لێی بڕوانن.

هەروەها بە پێویستی دەزانم پێتان رابگەیەنم کە ئەم کتێبە (کە دوو بەرگە)، لە ئێران تاوەکو ئەمساڵ (٣٥) جار لە چاپ دراوەتەوە.

لە کۆتاییدا دەمەوێت سوپاس و پێزانینی خۆم ئاراستەی ئەم بەڕێزانە بکەم کە بە تەرتیب لە پشتگیری و هاندان وتایپ و چاپکردندا هاوکاریان کردم و پێمەوە ماندوو بوون:

× باوکی بەڕێزم

× خاڵە حەمرین (شاعیر و نووسەر)

× هەژار شێخ زرار-ی برام

**سەیدا شێخ زرار**

**٢٠٠٠/١١/٢١**

# پێشەکیی چاپی سێ و پێنجەمی وەرگێڕی فارسی

## چەند ڕوون کردنەوەیەک
## سەبارەت بە نووسینی پەرتووکی سینۆهە

ئێستا، کە ساڵی ١٣٦٤ی هەتاوی سەدەی چواردەیەمی ئیسلامییە (١٩٨٥ی زایینی)، باوەڕناکەم کە تاکو کۆتایی ئەم سەدەیە لە بازاڕی ئەدەبی جیهانیدا پەرتووکێک پەیدا بێت کە لە رووی مێژووی کۆنی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و شیکردنەوەی کومەڵایەتی و دەروونناسیی ئەو سەردەمە (سەردەمی فیرعەونەکان)، بگاتە هاوشانی ئەم پەرتووکە کە لە (١٣٥٠) ساڵ بەر لە لەدایکبوونی مەسیح نووسراوەتەوە.

ئێمە ئەم مێژووەمان لە سەرەتای پاشایەتی دامەزرێنەری سیلسیلەی نوزدەهەمی فیرعەونەکانی میسرەوە وەرگرتووە بە شێوەیەک کە (سینۆهە) نووسەری ئەم پەرتووکە ئاماژەی پێ دەکات، شەش ساڵ دوای دەست پێ کردنی پاشایەتیی ئەو پاشایە، سینۆهە لە میسر دوور دەخرێتەوە و دەست دەکات بە نووسینی ئەم پەرتووکەو بۆ ئەوەی ئێمە تووشی هەڵە نەبین مێژووی نووسینی ئەم کتێبەمان بە (١٣٥٠) ساڵ بەر لە زایین دانا، کە دەکاتە سەرەتای پاشایەتی دامەزرێنەری سیلسیلەی نوزدەهەم و، ئاشکراشە کە بۆ دۆزینەوەی مێژووی راستەقینەی نووسینەوەی ئەم پەرتووکە دەبێ شەش ساڵ لە مێژووی هاتنەسەر تەختی ئەو پیاوە کەم بکەینەوە.

خوێنەرانی ئەم پەرتووکە چ گەنج و چ پیر، لە خوێندنەوەی ئەم مێژووە دێرینە، سوودوەردەگرن، کە لە هەمان کاتدا مەعجوونێکی شیکردنەوەی



کۆمەڵایەتی و دەروونناسیشە.

بەڵام ئەگەر گەنجن ڕایان دەسپێرم کە ئەم پەرتووکە دوای خوێندنەوە لە کیس نەدەن و هەڵیبگرن بۆئەوەی کاتێک کە گەیشتنە تەمەنی شەست ساڵی یان زیاتر سەر لەنوێ بیخوێننەوەو لەو کاتەدا هونەری (سینۆهە) نووسەری ئەم پەرتووکە دێتە بەرچاویان و زیاتر هەست بە بایەخی کومەڵایەتی و دەروونناسیی ئەم پەرتووکە دەکەن.

یەکێک لە سوودەکانی تری ئەم پەرتووکە، ئاگاداربوونە لە مێژووی کۆن و شوێنەواری ئاسەوارناسی هەندێ لە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کە لە هەندێ لە مێژووە گشتییەکاندا تەنانەت ناوی ئەو وڵاتانەش نەبراوەو لە هەندێکی تر ناویان هاتووە، بەبێ ئەوەی لەرووی مێژووییەوە لێی بکۆڵنەوە. بەڵام ئێمە لەم پەرتووکەدا لە مێژووی کۆنی وڵاتێک وەکو (هاتی) و (میتانی) و (کووش)، زانیاری بەرچاومان دەست دەکەوێت.

وەرگێڕ بە پێویستی دەزانێت بە خوێنەران بڵێت کە شێوەی نووسینی ئەم پەرتووکە بە پێنووسی (سینۆهە) لەشێوەی نووسینی باووباپیرانی کۆن ئەچێت و لەم جۆرە دارشتنەدا هەندێ لە ڕستە کورتەکان دووبارە دەکرێنەوە بەبێ ئەوەی کار لە جوانیی نووسینەکە بکەن.

هەروەها لە سەردەمە تاریکەکانی سەدە و هەزارەکانی بەر لە زایین، گەلانی دواکەوتووی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست شەرابیان دەخواردەوە و خواردنەوەی شەراب لە لایەن ئەوانەوە، نیشانەی ئەوە نییە کە وەرگێڕ یان لایەنی بڵاوکەرەوە نەفرەتیان لەم مایەی زەرەرو زیانە نەبێت کە دەبێتە هۆی دارزاندنی لەش و گیانی مرۆڤ.

یەکێک لە بەشە سەرسوڕهێنەرەکانی ئەم پەرتووکە ئەوەیە کە لە میسری کۆندا، فیرعەونەکان بەدەستی پزیشکەکانی خۆیان دەکوژران. بەشە بەسوودەکانی تری ئەم پەرتووکە لە بارەی پێشکەوتنی زانستی پزیشکییە لە وڵاتانی

ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و بەتایبەتی وڵاتی میسر.

بەبێ موبالەغە لەم پەرتووکەدا هیچ بەشێک نییە کە لە ڕووی دەوڵەمەندی زانیاری مێژوویی کۆن بەسوود نەبێت و، دیسانەوە بەبێ موبالەغە سەرجەمی ئەم پەرتووکە (دائرة المعارف)ێکی گەورەیە بۆ خوێندنەوەی مێژووی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە سەدەو هەزارەکانی بەر لە زایین و هەندێ لە باسە مێژووییەکانی ئەم کتێبە هەمیشە لە یاددا دەمێنێتەوە.

بۆمیرزا بنووسێکی وەکو من جوان نییە کە کاتێک پەرتووکێک وەردەگێڕێت خۆی مەدحی بکات، بەڵام بەبێ ئەوەی زیادەڕۆیی لە پیاهەڵدانی بکەم دەڵێم: پەرتووکی (سینۆهە پزیشکی فیرعەون) کە ئێستا لە بەر دەستیان دایە پەرتووکێکە کە دوای خوێندنەوەی بۆتان دەردەکەوێت کە ئەرزشی ئەوەی هەبووە بیخوێننەوە.

**زەبیحوڵڵا حەکیم ئیلاهی دەشتی**

**نازناو (زەبیحوڵڵا مەنسوری)**

**خاوەن ناز ناوی نووسەری (زبیح الله منصوري)**

# چەند وتەیەک لەبارەی وەرگێڕان
# لە خەتی میسرییەوە
# بۆ یەکێک لە خەتە نێودەوڵەتییەکان

لە پاش ئەوەی کە چاپی یەکەمی ئەم کتێبە (سینۆهە پزیشکی تایبەتی فیرعەون) بڵاوکرایەوە، چەند کەسێک لە خوێنەران بە نامە داوایان لە وەرگێڕ کرد کە پێیان بڵێت، کتێبی (سینۆهە) کە بەخەتی وێنەیی (تصویری) میسری نووسراوە، لە چ کاتێکدا وەرگێڕدراوەتە سەر یەکێک لە خەتە نێودەوڵەتییەکان و وەرگێڕەکەی کێ بووە.

وەکو هەمووان دەزانن، خەتی ئەسڵی میسری، خەتی (هیروگلیف) واتە خەتی وێنەیی بووە و میسرییە کۆنەکان شێوەی مرۆڤ و گیانەوەران و ڕووەکەکان و کەل و پەلەکانیان دەکێشاو مەبەستەکانی خۆیان بەهۆی ئەو وێنانەوە لە یەکتری دەگەیاند.

مامۆستا میسرییەکان کە خەتی وێنەییان فێری قوتابیان دەکرد، تەنها خەتەکانیان دەکێشاو سەرنجیان نەدەدایە سێبەر و ڕووناکیی وێنەکان، بۆیە ئەو شتەی کە بەدەستی قوتابیان دەکێشرا نووسین و وێنە بوو نەک وێنەکێشان. مێژووی هاتنەکایەی خەتی هیرۆگلیف (خەتی وێنەیی میسری) لەلای مێژوونووسان ئاشکرا نییەو دەڵێن کاتێک کە یەکەمین زنجیرەی (سلسلە) فیرعەونەکانی میسر لەو وڵاتەدا فەرمانڕەواییان دەکرد، خەتی وێنەیی هەبووە و بەقسەی مێژوونووسان خەتی وێنەیی لە بیروباوەڕی ئایینی خەڵکی میسرەوە هەڵقوڵاوە.



لەگەڵ ئەوەشدا مێژوونووسان لە مەڕ ژمارەی سیلسیلەی فیرعەونەکانی میسردا لەگەڵ یەکتری کۆک نین، بەڵام بیرۆکەکەیان سەبارەت بە سێ چاخی گەورە، کە لە مێژووی فیرعەونەکانی میسردا هاتە ئاراوە، چون یەکەو ئەو چاخانەش بریتین لە (کۆن و ناوەڕاست و نوێ).

لەسەردەمی کۆندا کە لە ساڵی (٣٤٠٠ تا ساڵی ٢٤٧٥ ی بەر لە زایین) بوو خەتی هیرۆگلیف-ی میسری گۆڕانکاری بەسەردا نەهات. بەڵام لەسەردەمی ناوەڕاست (لە ساڵی ٢٤٧٥ تا ساڵی ١٧٨٨ ی بەر لە زایین) و لەسەردەمی نوێدا (لە ١٧٨٨ تا ساڵی ١٠٩٠ی بەر لە زایین)، شێوەی خەتی وێنەیی میسری گۆڕانکارییەکی زۆری بەسەرداهات. گۆڕانکاری لە شێوەی خەتەکە، بەم جۆرە دەستی پێکرد، کە خەتنووسەکان (یان وێنەکێشەکان) فراوانی گۆشەکانیان کەم کردەوەو گۆشەی کراوەیان کردە گۆشەی وەستاو و پاشانیش ئەو گۆشانەیان کردە گۆشەی تیژ و لە کورت کردنەوەی خەتەکان بەرەوپێش چوون و هەندێ لە خەتەکانیان وەک خاڵێک لێ کرد و ئەگەر نووسەرێک بیویستایە شێوەی باڵندەیەک بکێشێت، وەک باو و باپیرانی خۆی وێنەی باڵندەیەکی تەواوی نەدەکێشا، بەڵکو بەدوو هێڵی ئاسۆیی کورت، هەردوو باڵی باڵندەکەیان دەکرد و بە دوو هێڵی ستوونی کورت، قاچەکانیان دەکێشا.

نووسەرە میسرییەکان ئەوەندە لە گۆشەو قەوس و هێڵی نووسینی هیرۆگلیفیان کەم کردەوە، هەتا خەتێک دروست بوو کە ناویان نا (دێموتیک)و ئەو ڕۆژەی کە (سینۆهە) هەروەکو خۆی لەم پەرتووکەدا دەنووسێت، لە قەراغی دەریای ڕۆژهەڵاتدا نیشتەجێ بوو و دەستی بە نووسینی بیرەوەرییەکانی خۆی کرد، خەتی میسری هەمان خەتی وێنەیی کۆن نەبوو و میسرییەکان بەخەتی (دێموتیک) کە تەقریبەن بە خەتێکی ئەلف و بێیی لە قەڵەم دەدرێت، شتیان دەنووسی و سینۆهە بیرەوەرییەکانی خۆی بەهەمان خەت نووسیوەو (میکاڤالتاری) نووسیوبەتییەوەو لە خەتی (دێموتیک)یەوە وەریگێڕاوەتە سەر

زمـانی فـینلەندی و پاشـان ئەم پەرتووکـە وەرگـێـڕدرایە سـەر هەمـوو زمـانە ئەوروپییـەکـان و خوێنەران ئەوەی سەبارەت بە گۆڕانی خـەتی وێنەیی مـیسـری دەیخـوێننەوە لە دوو سـەرچاوەوە وەرگـیـراوە کـە یەکـێکـیـان (دائره المعـارف)ی کۆلۆمبیایە و ئەوەی تریان لە دەقی پێشـەکی فـارسی کتێبی (سینۆهە پزیشکی تایبەتی فیرعەونی) وەرگیراوە.

**(وەرگێڕی فارسی)**

# کورتە پێشەکیی نووسەر

ناوی من نووسەری ئەم کتێبە، (سینۆهە)یە و، من ئەم کتێبە بۆ ستایشکردنی خوایەکان نانووسم، چونکە لێیان بێزاربوومە. ئەم نووسینانە بو مەدح کردنی فیرعەونەکان نانووسم، چونکە لە فیرعەونەکانیش بەداخم. ئەم کتێبە تەنها بۆ خۆمی دەنووسم بەبێ ئەوەی چاوەڕوانی هیچ پاداشتێ بم یان بمەوێ ناوم لە جیهاندا بمێنێتەوە.

ئەوەندە لە فیرعەونەکان و لە خەڵک ئازارم چێشتووە کە لە هەموو شتێ تێرم، تەنانەت لە بەدەستهێنانی ناوێکی هەمیشەیی و نەمریش. من تەنها بۆ ئەوە دەنووسم کە خۆمی پێ ڕازی بکەم و لەو باوەڕەدام کە تاکە نووسەرێک بم کە بەبێ هیچ مەبەستێکی ماددی و مەعنەوی کتێب دەنووسم.

ئەوەی تا ئەمڕۆ نووسراوە، یان بۆ ئەوە بووە بەخێرهاتنی خوایەکان بکات ، یان بۆ ئەوەی کە مرۆڤ ڕازی بکات. من فیرعەونەکان بە مرۆڤ دەزانم، چونکە هیچ جیاوازییەکیان لەگەڵ ئێمەدا نییە و ئەم بابەتە بە باوەڕەوە دەڵێم.

من لەبەرئەوەی پزیشکی فیرعەونەکانی میسر بوومە لە نزیکەوە شەوو ڕۆژ لەگەڵ فیرعەونەکاندا هەڵسوکەوتم هەبووە و ئەزانم کە ئەوان لە ڕووی لاوازی و ترس و زەبوونی و هەستە دەروونییەکانەوە وەکو ئێمەن. تەنانەت ئەگەر فیرعەونێک هەزار جار گەورەتر بکەنەوە و بیخەنە ڕیزی خوایەکان، دیسانەوە هەر مرۆڤەو وەکو ئێمەیە.

تا ئیمڕۆ پەرتووکێکم نەدیوە کە ڕاستی تێدا نووسرابێ. لە کتێبەکاندا یان



مەراییان بۆ خوایەکان کردووە، یان بۆ خەڵکی، واتە فیرعەونەکان. لەم دنیایەدا تا ئەمڕۆ لە هیچ پەرتووک و نووسراوێکدا ڕاستی بوونی نەبووە و لەو باوەڕەش دام کە لەمەو بەدواش لە پەرتووکەکاندا ڕاستی بەدی ناکرێت.

لەوانەیە جل و بەرگ و زمان و داب و نەریت و بیروباوەڕی خەڵک بگۆڕدرێت، بەڵام نەفامی خەڵک ناگۆڕدرێ و لە هەموو سەردەمێک دەتوانرێ بە وتەو نووسراوی درۆ خەڵک لە خشتە ببرێ. چونکە وەکو چۆن مێش حەز لە هەنگوین دەکات، خەڵکیش ئەوها حەز لە درۆ و ڕیایی و وەعدە پڕوپووچەکان دەکەن کە هەرگیز نایەتەدی.

ئایا نابینن کە خەڵکی چۆن دەورە لە چیرۆک بێژی جلوبەرگ دڕاو دەدەن و گوێی بۆ دەگرن کەلەسەر خۆڵ دانیشتووە، بەڵام باسی زێڕ و زیو و گەوهەریان بۆ دەکات و پەیمانی دەستکەوتنی گەنجینەیان دەداتێ.

بەڵام من کە (سینۆهە)م لە درۆکردن لەم کۆتایی تەمەنەمدا بێزارم، هەربۆیەش ئەم پەرتووکە بۆ خودی خۆم دەنووسم، نەک بۆ کەسێکی تر. نامەوێ کەس ئەم پەرتووکەم بخوێنێتەوە و پیایدا هەڵبدات و نامەوێ منداڵان لە قوتابخانەکاندا نووسراوەکانی من لەسەر تەختە بنووسن و ڕاهێنانی لەسەر بکەن.

من نامەوێ زاناکان لەکاتی قسەکردن نووسراوی پەرتووکەکانم بە شایەدی بهێننەوە و بەم شێوەیە بیانەوێ زانست و ژیریی خۆیانی پێ بسەلمێنن، هەرکەسێ شتێ دەنووسێ هیوادارە کە کەسانی تر لە دوای ئەودا کتێبەکەی بخوێننەوە و بە چاوی ڕێزەوە سەیری بکەن و ناوی فەرامۆش نەکەن. لەبەر ئەوە باوەڕی خۆی دەخاتە ژێر پێوەو هاوڕەنگی هەمووان دەبێت و بێبایەخترین و سووکترین وتەکانی دەنووسێت کە تەنانەت خۆشی باوەڕی پێیان نییە، بۆ ئەوەی خەڵک دەستخۆشی و ئافەرینی لێ بکەن.

بەڵام من لەبەرئەوەی نامەوێ کەس پەرتووکەکەم بخوێنێتەوە، نابمە هاوڕەنگی

هەمووان و ڕێز لە خورافات و خەیاڵپڵاوەکانی ئەوان نانێم. من لەو باوەڕەدام کە مرۆڤ ناگۆڕێ تەنانەت ئەگەر هەزاران ساڵ بەسەریدا تێپەڕێت، ئەگەر مرۆڤێک بخەینە ڕووبارێکەوە، هەرئەوەندەی هاتەدەرەوە و جل و بەرگەکەی وشک بووەوە هەرئەوەیە کە پێشتر بووە. ئەگەر مرۆڤێک گیرۆدەی خەم و خەفەت بکەی لەکردەوەکانی ڕابردووی پەشیمان دەبێتەوە، بەڵام هەرئەوەندە کە خەم و پەژارەکەی نەما ئەگەڕێتەوە دۆخی جاران و هەروەک خۆی، خۆپەرست و بێ بەزەیی دەبێت. لەبەرئەوەی شکڵ و شێوەی هەندێ شت و وشەی هەندێ لە میللەتان دەگۆڕدرێ و هەندێ خواردن و جل و بەرگی ئەمڕۆ دێتەکایەوە کە دوێنێ نەبووە، خەڵک وادەزانێ کە ئەمڕۆ جیایە لە دوێنێ. بەڵام من دەزانم کە وانییە و لە داهاتووشدا هەروەک ئەمڕۆ و وەک دوێنێ کەس ڕاستی خۆش ناوێ.

کەواتە نامەوێ کەس پەرتووکەکەم بخوێنێتەوە و حەز دەکەم لە داهاتوودا بە نەناسراوی بمێنمەوە. من ئەم پەرتووکە بۆ ئەوە دەنووسم کە دەزانم زانینەکەم وەک تێزاب دڵی مرۆڤ دەسووتێنێ و ئەگەر مرۆڤ ئەوەی دەیزانی بەکەسی نەڵێ لەناو دەچێت. من ناتوانم زانستەکەم بەکەس بڵێم لەبەر ئەوە بۆخودی خۆمی دەنووسم بۆ ئەوەی بەم شێوەیە ئارام بگرم.

من لەماوەی تەمەنمدا زۆر شتم بینی، بینیم کە کوڕێ لەبەرچاوی من باوکی خۆی کوشت. بینیم کە هەژارەکان لە دەوڵەمەندەکان هەڵگەڕانەوە تەنانەت لە خوایەکانیش. بینیم ئەوانەی بەکاسەی زێڕین شەرابیان دەنۆشی لە کەناری ڕووباردا بەدەست ئاویان دەخواردەوە. بینیم ئەوانەی زێڕەکانیان بە قەپان دەکێشا ژنەکانیان بۆ بازنگێکی مسی دەفرۆشتە ڕەش پێستەکان بۆ ئەوەی نانی پێ بکڕن بۆ منداڵەکانی ئەو ژنەیان.

کاتی خۆی جێگای من کۆشکی فیرعەون بوو و لەلای ڕاستی فیرعەون دەوەستام و ئەو گەورە پیاوانەی کە سەدان بەندەیان هەبوو مەراییان بۆ ئەکردم و دیارییان بۆ دەناردم و چەندەها ملوانکەی زێڕم هەبوو.



ئەمڕۆ لێرە لە جێگایەک کە کەوتۆتە قەراغ دەریای ڕۆژهەڵات ژیان بەسەر دەبەم، بەڵام دەوڵەمەندییەکەم لەکیس نەچووە و وەک زوو بەتوانام و بەندەکانم هەردوودەست لەسەر ئەژنۆ بەرامبەرم سەر دادەنوێنن.

هۆی ئەوەی کە منیان لە میسر و شاری (تەبەس) دوورخستەوە و ناردمیانە ئێرە ئەوەبوو کە من لە ژیاندا هەموو شتێکم هەبوو، ئەمویست شتێک بەدەست بهێنم کە پێویستی بەدەست هێنانی ئەو شتە ئەوەبوو کە مرۆڤ هەموو شتێکی خۆی لەدەست بدات.

من ئەمویست دادپەروەری فەرمانڕەوایی بکات و ڕیا و درۆ و ڕواڵەت سازی لەناوبچێ، نەمدەزانی کە فەرمانڕەوایی کردنی راستەقینە (حەقیقەت) لە ژیانی مرۆڤدا کارێکی مەحاڵە و هەرکەس ڕاستگۆبێت و بیەوێ بەڕاستگۆیی بژێ دەبێ هەموو شتێ لە کیس بدات و من دەبێ زۆر خۆم بەبەختەوەر بزانم کە هێشتا دەوڵەمەندییەکەم ماوە.

**بەشی یەکەم**

# سەردەمی منداڵی

ئەو پیاوەی کە من بە باوە بانگم دەکرد لە شاری (تەبەس) واتە گەورەترین وجوانترین شاری دنیا ، پزیشکی هەژاران بوو و ، ئەو ژنەی کە من بەدایکی خۆمم دەزانی خێزانی ئەو پیاوەبوو.

ئەم ژن و پیاوە تا کاتی پیریبیان منداڵیان نەبوو ، بۆیە منیان وەک کوڕێکی خۆیان راگرت و بەخێویان کردم . ئەوان لەبەرئەوەی زۆر سادەبوون دەیانوت کە خوایەکان منیان بەدیاری بۆ ئەوان ناردووە و نەیان دەزانی کە ئەم دیارییەی خوایەکان تا چ رادەیەک دەبێتە هۆی چارەڕەشیی ئەوان.

دایکم بە (سینۆهە) بانگی دەکردم، چونکە ئەم ژنە، کە حەزی لە حەکایەت بوو ئەو ناوەی لەیەکێ لە چیرۆکەکان بیستبوو. یەکێ لە چیرۆکە بەناوبانگەکانی میسر ئەوەیە کە (سینۆهە) بەرێکەوت لەناو خێمەی فیرعەوندا نهێنییەکی ترسناک دەبیستێ و لەبەرئەوەی زانی کە فیرعەونیش زانیویەتی ئەو نهێنییەکەی زانیوە، لە ترسی ئەوەی بیکوژێ ڕای کرد و ماوەیەک لە بیابانەکان تووشی زۆر تەنگ و چەڵەمەهات تا لە دواییدا سەرکەوت.

دایکیشم وای بیردەکردەوە کە من لە تەنگ و چەڵەمەکان ڕزگارم بووە و بەو گەیشتووم و لەمەو بەدواش هەرتەنگ و چەڵەمەیەکم بەسەرداببێت دەتوانم خۆمی لێ ڕزگار بکەم.

کاهینەکانی[1] میسر دەڵێن ناوی هەموو مرۆڤێ دیاریکەری چارەنووسیەتی و بەناو دەزاندرێ کە مرۆڤ چی بەسەردا دێت . لەوانەیە هەر لەبەر ئەوەش بێت



کە من لە ژیانمدا تووشی زۆر گرفت بوومەتەوە و سەفەرم بۆ وڵاتانی بیانی کردووە و لە نهێنی فیرعەونەکان و ژنەکانیان (ئەو نهێنییانەی دەبوونە هۆی کوژرانیش) ئاگادار بوومەوە. بەڵام من وابیردەکەمەوە کە من ئەگەر ناوێکی تریشم هەبووایە هەر تووشی ئەم گرفتانە دەبوومەوە و ، ناو لە ژیانی مرۆڤدا کاریگەرێتی نییە.

بەڵام کە بەدبەختی یان بەختەوەری ڕوو لە هەندێ کەس دەنێت بەم بیر و باوەڕانە دڵی خۆیان دەدەنەوەو لە بەدبەختییدا ئارامی دەدەنە خۆیان و لە بەختەوەریشدا خۆیان بەشیاوی ئەو بەختەوەرییە دەزانن کە پێی گەیشتوون.

من لەساڵێکدا لە دایک بووم کە کوڕی فیرعەونیش لەو ساڵەدا هاتە دنیاوەو ژنی فیرعەون کە ماوەی بیست و دوو ساڵ نەیتوانی کوڕێک پێشکەش بە مێردەکەی بکات، لەو دەمەدا کوڕێکی بوو. بەڵام کوڕی فیرعەون لە وەرزی بەهار، واتە سەردەمی وشکی، لەدایک بوو و ، من لە وەرزی پاییز کاتی ئاوی زۆر هاتمە دنیاوە.[2]

من نازانم کە چۆن و لە کوێ چاوم بەدنیا هەڵهێناوە، لەبەرئەوەی کاتێ دایکم منی لەکەناری ڕووباری (نیل)دا دۆزیەوە من لە سەبەتەیەکدا بووم کە لە داری (جەگن) دروست کرابوو و کونەکانی ئەو سەبەتەیەیان بە جیوەی درەخت گرتبوو بۆ ئەوەی ئاوی تێ نەچێ.

خانووەکەی دایکم لە کەناری ڕووبار بوو و ، لەوەرزی پاییز کە ئاو سەری دەکرد ئیتر مەجبوور نەدەبوو بۆ هێنانی ئاو لە ماڵەوە دوور بکەوێتەوە. ڕۆژێک کە بەرامبەر بە ماڵەوە ڕاوەستابوو ئەو سەبەتەیە دەبینێ کە منی تێدابووم و دەڵێ پەڕەسێلکەکان لەبان سەرتەوە دەفڕین و دەیانخوێند ، چونکە بەرزبوونەوەی ئاوی نیل ئەوانی لەماڵی ئێمە نزیک کردبووەوە.

دایکم منی بردە ماڵەوە و لە نزیک ئاگردان دانیام بۆ ئەوەی گەرم ببمەوە و دەمی خستە سەر دەمم و قایم فووی تێدەکرد بۆ ئەوەی هەوا بڕواتە ناو

سییەکانمەوە و هانایەکم بێتەوە. لەوکاتەدا من هاوارێکم کرد بەڵام هاوارێکی بێ هێز.

باوکم کە بۆ چارەسەری نەخۆشی خەڵکی چووبووە گەڕەکی هەژارەکان، بەدەستهەقی ئەو ڕۆژەی کە دوو مراوی و دەفرێ ئاردبوو گەڕایەوە و کاتێ کە گوێی لە دەنگی من بوو، وای زانی دایکم بەچکە پشیلەی هێناوەتە ماڵەوە ، بەڵام دایکم پێی وت کە ئەمە بەچکە پشیلە نییە بەڵکو کوڕێکە و تۆ دەبێ بەختەوەربی کە بووینەتە خاوەنی کوڕ.

باوکم سەرەتا ڕەنگی تێک چوو و بە تووڕەییەوە بەدایکمی وتبوو (کوندەبەبۆ) بەڵام دوایی کە منی بینی زەردەخەنەیەکی هات و ڕازی بوو کە من بکەنە کوڕی خۆیان و بەخێوم بکەن. ڕۆژی دوایی دایک و باوکم بەجیرانەکانیان وت کە خوایەکان کوڕێکی پێ بەخشیون، بەڵام من لەو باوەڕەدانیم کە ئەوان سەلماندبێتیان، چونکە هەرگیز دایکمیان بە دووگیانی نەبینی بوو.

دایکم سەبەتەکەی بەو لانکەیەوە هەڵواسی کە منیان تێدا دانابوو و باوکم کاسەیەکی مسی بۆ پەرستگا بەدیاری برد، بۆ ئەوەی لە پەرستگا ناوم بنووسرێ کە کوڕی ئەو و خێزانەکەیم. ئەوسا باوکم چونکە خۆی پزیشک بوو خەتەنەی کردم، چونکە دەترسان بمبەنە لای پیاوە ئایینییەکانی پەرستگا، لەبەرئەوەی دەیانزانی کە چەقۆکانیان دەبێتە هۆی برین و هەوکردن و کێم. بەڵام باوکم تەنها لەبەر تووشبوون بەبرینەکە نەبوو کە خۆی منی خەتەنە کرد و نەیبردم بۆ مەراسیمی خەتەنەکردن، بەڵکو لەبەرئەوەی دەیزانی کە جگە لە کاسە مسیەکە دەبێ دیاردەیەکی تریش ببات بۆ پەرستگا و باوکم دەست کورت بوو و کاسەیەکی مسیش بۆ ئەو شتێکی گرانبەها بوو.

ئاشکراشە کە من ئاگام لە ئەم ڕووداونە نەبووە و ئەم شتانەم دوایی لە دایک و باوکمەوە بیستووە. تا ئەو کاتەی کە منداڵ بووم ئەوانم بە باوک و دایکی خۆم دەزانی، بەڵام لە دوای ئەوەی کە سەردەمی منداڵیم تیپەڕی و چوومە قۆناغی



گەنجییەوە و پرچمیان بە بۆنەی چوونە ناو ئەم قوناغەوە بڕی، دایک و باوکم ڕاستییەکەیان پێ وتم، چونکە لەخوایەکان دەترسان و نەیاندەویست من بەردەوام لەگەڵ ئەو درۆیەدا بژیم.

من هەرگیز نەمزانی کە دایک و باوکی ڕاستەقینەی من کێن ، بەڵام دەتوانم بەمەزندە و بڕوای خۆم بڵێم کە ئایا دایک و باوکم لە چینی هەژارەکان بوونە یان لە چینی دەوڵەمەندەکان و من یەکەم کۆرپە نەبوومە کە بەنیل سپێردراوم و بەدوا کۆرپەش لەقەڵەم نەدەدرام.

لەو کاتەدا (تەبەس) کە لە وڵاتی میسرە، ببوو بە یەکێک لە شارە پلە یەکەکان یان گەورەترین شاری جیهان و لەو شارەدا کۆشکی زۆر لەلایەن دەوڵەمەندەکانەوە بیناکرابوون. ناوبانگی (تەبەس) ببووە هۆی ئەوەی کە بیانییەکی زۆر لە وڵاتانی ترەوە بێن و لەوێ نیشتەجێ بن و زۆربەیان هەژاربوون، کە دەهاتن بۆ ئەوەی لەوشارەدا دەوڵەمەند بێن.

لەتەک کۆشکی دەوڵەمەندەکان و پەرستگەکاندا، لە ئەمبەر و ئەوبەری نیل تا چاوبڕی دەکرد خانووی هەژارانی لێ دروست کرابوو کەلەو خانووە بچووکانەدا یان هەژارە میسرییەکان دەژیان یان هەژارە بیانییەکان.

زۆرجار ڕووی دەدا کە ژنە هەژارەکان لەکاتی منداڵبوونیان کۆرپەکەیان دەخستە ناو سەبەتەیەکەوەو بە ڕووباری نیلیان دەسپارد کە بەرەو دەریا بڕوات. هەروەها جاری واهەبوو ژنی دەوڵەمەندەکان منداڵە ناشەرعییەکانی خۆیان دەکردە ناو سەبەتەیەکەوە و دەیان خستە نیلەوە. بەڵام لەبەرئەوەی میسرییەکان لەدوای منداڵبوون کۆرپەکەی خۆیان خەتەنە دەکردو من خەتەنە نەکرابووم لەو باوەڕەدام کە دایک و باوکی ڕاستەقینەم بیانی بووبێتن.

کاتێ کە سەردەمی منداڵیم بەجێهێشت و چوومە ناو تەمەنی لاوێتییەوە، واتە سەرەتای گەنجێتیم، قژیان بڕیم و دایکم قژە بڕاوەکان و یەکەمین پێڵاوی منداڵیمی کردە ناو سندووقێکی دارەوە و ئەو سەبەتەیەی نیشان دام کە من

تیایدا بەسەر نیلەوە تێپەڕی بووم.

کە سەیرم کرد هەندێ لە دارەکانی سەبەتەکە زەرد بووبوون و هەندێکیان شکابوون و، هەندێکیشیان بەپەت بەیەکەوە بەسترابوونەوە و، دایکم دەیگوت کاتێ کە سەبەتەکەم دۆزییەوە ئەم پەتانەی پێوەبوو.

لە وەزعی سەبەتەکە وادیاربوو کە دایک و باوکم دەوڵەمەند نەبووبێتن، چونکە ئەگەر دەوڵەمەند بوونایە منیان دەخستە سەبەتەیەکی باشترەوە و منیان نەدەدایە دەست شەپۆلەکانی نیلەوە. ئەمڕۆ کە پیربوومە سەردەمی منداڵیم بەڕوونی لەپێش چاودا دەدرەوشێتەوەو لەم ڕووەوە لە نێوان هەژار و دەوڵەمەند جیاوازی نییە و پیرەمێردێکی هەژار وەک دەوڵەمەندێکی پیر سەردەمی منداڵی خۆی بەڕوونی لەبەرچاوە، چونکە لە دیدی هەمووان وا دەردەکەوێت کە سەردەمی منداڵی باشترە لە ئەمڕۆ.

خانووەکەی ئێمە لەکەناری نیلەوە نزیک پەرستگاکە، لەگەڕەکێکی هەژارنشین بوو و لە پاڵ خانووەکەمان دارەڕایەکی لێ بوو کە کەشتییەکانی ڕووباری نیل لەوێوە کەل و پەلیان بار دەکرد یان دایاندەگرت.

لە کۆڵانە تەسکەکانی ئەو گەڕەکە دەیان دوکانی مەی فرۆشی لێ بوو کە مەلەوانەکانی ڕووباری نیل لەوێ دەیانخواردەوە. هەروەها لەو کۆڵانانەدا هەندێ خانووی بۆ ڕابواردن لێ بوو و دەوڵەمەندەکانی چەقی شار بەسواری کەژاوەوە بۆ خۆشگوزەرانی و ڕابواردن دەهاتنە ئەوێ. لەو گەڕەکە فەقیرنشینانەدا ئەوانەی کە لە گەڕەکدا دیاربوون بریتی بوون لە کاربەدەستانی وەرگرتنی باج (سەرانە) و ئەفسەرانی بەش و سایەقی بەلەمەکان و چەند کاهینێک لە کاهینە پلە پێنجەمەکانی پەرستگاکانی ناوشار، باوکی منیش یەکێک بوو لەوانە کەلە ناو گەڕەکدا دیاربوو.

خانووەکەی ئێمە لە چاو خانووی هەژارەکانی گەڕەک کە بە قوڕ دروست کرابوو وەک کۆشک وابوو. لە خانووەکەماندا باخچەیەکمان هەبوو کە باوکم



دارێکی (نارەوەن)ی لێ چاندبوو و ئەم باخچەیە بەڕیزێک داری (ئاقاقیا) لە کۆڵانەکە جیادەبووەوە و لە ناوەڕاستی باخچەکەدا حەوزێک هەبوو کە جگە لە وەرزی پاییز، واتە وەرزی بەرزبوونەوەی ئاوی نیل نەماندەتوانی ئاوی لێ هەڵبهێنجین. خانووەکەمان چوار ژووری هەبوو کە دایکم لە یەکێکیاندا چێشتی لێ دەناو ژوورێکیشیان عەیادەی باوکمی تێدابوو.

هەفتەی دووجار کارەکەرێک دەهات و لە ئیش و کاری ماڵدا یارمەتی دایکمی دەداو، هەفتەی جارێکیش ژنێک دەهات جل و بەرگەکانی ئێمەی دەبرد و لە قەراغی نیل دەیشوشتن.

من بەڕۆژ لەژێر سێبەری دارەکەدا ڕادەکشام و کاتێ دەچوومە کۆڵانەوە تیمساحێکی داریم هەبوو کە یاریم پێ دەکردو بە پەتێکەوە دەمبەست و بەدووی خۆمدا بەسەر بەردەکانی کۆڵاندا ڕامدەکێشا و هەموو منداڵەکان بە ئێرەییەوە(حەسودی) سەیری تیمساحەکەمیان دەکرد کە دەمێکی سووری هەبوو و ئارەزوویان دەکرد کە شتێکی وایان هەبووایە بۆ یاریکردن. منیش چونکە دەمزانی تەنیا منداڵی خانەدانەکان ئەو جۆرە کەل و پەلی یاریکردنەیان هەیە دەمهێشت کە منداڵانی تریش یاریی پێ بکەن. ئەو تیمساحەی من، دارتاشی فیرعەون دابووی بە باوکم، لەبەرئەوەی باوکم چارەسەری دوومەڵی ئەو دارتاشەی کردبوو کە نەیدەتوانی دابنیشێ.

بەیانیان دایکم منی لەگەڵ خۆیدا دەبردە بازاڕ، ئەگەرچی شتێکی زۆری نەدەکڕی، بەڵام خووی وابوو کە ماوەی یەک سەعاتی ئاویی لەسەر شتێ مامەڵەی دەکرد.[٣]

لە قسەکردنەکەی دایکم وەها دیاربوو کە دەیویست وا بنوێنێ کە هەیەتی، بەڵام لەبەر ئەوە مامەڵەی زۆری دەکرد کە ماڵداری و کەم خەرجکردن فێری من بکات و ئەیوت: دەوڵەمەند ئەوە نییە کە زێڕ و زیوی زۆری هەبێ، بەڵکو ئەوەیە کە بەکەم هەڵبکات و ڕازی بێت.

ئەگەرچی ئەو قسانەی دەکرد، بەڵام کاتێ کە چاوی بە کەل و پەلی بازاڕدا دەخشاند بۆم دەردەکەوت کە حەزی لە پارچە خورییە ڕەنگاو ڕەنگەکان و ملوانکەی عاج (شفرەی فیل) و پەڕی (وشتر مورغ)ە. من تا ئەو کاتەی گەورە نەبووم نەمزانی دایکم حەزی بە دەوڵەمەندییەو لە هەموو تەمەنیدا لەو ئارەزووەدا بووە، بەڵام چونکە ژنی پزیشکێکی گەڕەکە هەژارەکان بوو، ناچار بەکەم دەیبردەسەر.

شەوان دایکم چیرۆکی بۆ دەوتم و لە بیرم ناچێ کە لە گەرمای هاویندا جارێکیان باوکم ناڕەزایی دەربڕی و وتی: بۆچی فکری ئەم منداڵە پڕ دەکەی لە شتی پڕ و پوچ؟

دایکم لە دوای تووڕەبوونەکەی باوکم بێدەنگ دەبوو، بەڵام هەرئەوەندە کە دەنگی پرخە پرخی باوکم بەرزدەبووەوە دایکم دەستی دەکردەوە بە گێڕانەوەی درێژەی چیرۆکەکەی. جاری وا هەبوو لە بارەی سینۆهە و جاری واش بوو لە بارەی فیرعەونەکان و دێوەکان و جادووگەرەکان ئەفسانەی بۆ دەگێڕامەوە و من ئێستا تێدەگەم کە ئەو خۆشی لە وتنی ئەو داستانانە چێژی وەردەگرت.

من ئەو داستانانەم لەبەر ئەوە حەز لێ بوو کە لە کاتی بیستنیدا وام بیردەکردەوە کە لە جێگایەکی تردام و لەو کۆڵانە پیس و پڕ لە مێشوولە و زبڵانەدا ناژیم. بەڵام جاری وابوو بۆنی ئەو دارە سەوز و بریقەدارانەم دەکرد کە لە کەشتییەکان دایان دەگرت و کاتی وا دەبوو کە بۆنی عەتر دەهات، لەو کاتەی کە کەژاوەی ژنێ بە تەکمەوە تێدەپەڕی.

خۆرئاوابوون کاتێ کە کەشتی زێڕینی خوایەکەمان ئاموون (هەتاو) دوای پەڕینەوە بەسەر نیل و تێپەڕین بەسەر دەشتەکانی خۆرئاوادا دەیویست لە خاورووی گردەکانەوە خۆی بزربکات، لەو کاتەدا لە ماڵەکانی کەناری نیل بۆنی نانی گەرم و ماسی سوورەوەکراو دەهات و من ئەم بۆنەم لە منداڵییەوە حەز لێ بوو و ئێستاش کە پیر بوومە هەر حەزم لێیەتی.



یەکەمین قوتابخانە کە من وانەی ژیانی تێدا فێربووم هەیوانی ماڵەکەمان بوو. شەو، کاتی نان خواردن لە هەیوانەکەمان لەسەر سەکۆ دادەنیشتین و دایکم چێشتەکەی بەش دەکرد و لە پێش ئەوەی باوکم دەست بە خواردن بکات ئاوی بەدەستیدا دەکرد. هەندێ جار ڕووی دەدا چەند مەلەوانێکی مەست کە شەڕاب یان ئاوی جۆیان خواردبووەوە بە کۆڵاندا تێدەپەڕین و لە ژێر دارە (ئاقاقیا)کانی ئێمە بۆ دەست بەئاو گەیاندن دادەنیشتن و باوکم کە کابرایەکی دووربین بوو لەو کاتەدا قسەی نەدەکرد، بەڵام کە ئەڕۆیشتن دەیوت: بەس ڕەش پێستەکان یا سریانییەکان لە ناو کۆڵاندا دەڕیێن و میسرییەکان هەموو کات لە ماڵەوە ئەو پێویستییانە دەکەن. هەروەها دەشی وت: کاتێ کە گۆزەیەک شەڕاب دەخۆنەوە دەکەونە جۆگەیەکەوە و، کاتێ بە ئاگادێن دەبینن جلوبەرگەکانیان دزراوە.

هەندێ جار بۆنی عەترێکی تیژ لە ناو کۆڵانەوە دەهات و کە دەگەیشتە ئاست داڵانەکەمان ژنێ دەردەکەوت کە کراسی ڕەنگاوڕەنگی لەبەردا بوو و دەم و چاو و لێو و مژوڵەکانی ڕەنگ کردبوو و لە چاوەکانی شتێکی نائاسایی هەست پێ دەکراو من دەمزانی کە ئەو جۆرە ژنانە لەگەڵ ژنە ئاساییەکاندا جیاوازن و لەو خانووانەوە دەردەچن کە بۆ مەبەستی ڕابواردنە.

باوکم دەیوت: لەو ژنانە بەدوور بە کە پێت دەڵێن تۆ کوڕێکی جوانی و هەرگیز بەدەم بانگهێشتیانەوە نەچی و مەچۆرە ماڵەکانیان، چونکە دڵیان بۆسەیە و ئاگرێک لەناو سینەیاندا هەیە کە دەتسووتێنێ.

لە ژێر کاریگەرێتی ئەم قسانەی باوکم من لە منداڵییەوە لە گۆزەی شەراب و ئەو ژنە جوانانەی کە وەک ژنە ئاساییەکان نەبوون، دەترسام. کە منداڵ بووم باوکم ئەیبردمە عەیادەکەی خۆی، بۆ ئەوەی شێوەی چارەسەری نەخۆشییەکان ببینم. من بە زوویی هەموو ئەو کێرد و مەقاش و مەڵحەمانەی بەکاری دەهێنا ناسیم و کاتێ کە دەیویست چارەسەری نەخۆشێ بکات، من دەرمان و پەڕۆی پێچانەوە و ئاو و شەڕابم دەداپێی.

دایکم وەکو هەموو ژنان لە برین و دوومەڵ و جەراحەت دەترسا و هیچ کات نەدەهاتە عەیادەکەی باوکمەوە، مەگەر کاتێ کە باوکم بۆ هەندێ ئیش بانگی بکردایە.

من ئاگام لێ بوو کە باوکم بە سێ جۆر وەڵامی نەخۆشەکانی دەدایەوە، بە هەندێکیانی دەوت (نەخۆشیەکەت چارەسەر دەکرێ) و بە هەندێکی تری دەوت (چارەسەرکردنی نەخۆشییەکەت پێویستی بە کات هەیە) و هەندێ نەخۆشی تر پارچە کاغەزێکی پاپیروسی ((کاغەزی بەناوبانگی میسری)) پێ دەداو دەیوت: ئەمە ببە بۆ (خانەی ژیان)[٤] تا لەوێ چارەسەرت بکەن.

(خانەی ژیان) جێگایەک بوو کە ئەوانەی بەسەختی نەخۆش بکەوتنایە لەوێ چارەسەر دەکران و هەرجارێ کە باوکم یەکێک لەو نەخۆشانەی رەوانەی ئەوێ دەکرد دوای رۆیشتنی بە بەزەییەوە دەیوت: ئەی بێچارە..!

هەر چەندە باوکم پزیشکی فیرعەونەکان نەبوو، بەڵام هەندێ جار خەڵکی دەوڵەمەندیش دەهاتنە لای و هەندێکات لە سۆزانیخانەکانەوە خەڵک دەهاتن بۆ چارەسەرکردن کە کراسێکی گرانبەها، یان کەتانیان لەبەردابوو.

کاتێ کە تەمەنم گەیشتە ٧ ساڵان، دایکم پێڵاوەکانی منداڵی لە پێ کردم و منی بردە پەرستگای (ئاموون) کە گەورەترین و جوانترین پەرستگای خوایەکانی میسر بوو، بۆئەوەی لەوێ سەیری قوربانییەک بکەم. شەقامێکی دوور و درێژ کەلە ئەملا و ئەولایەوە لەمەودای دیاریکراودا، «ئەبولهەول»[٥] بە درێژایی پەرستگاکە دانیشتبوون و کاتێ گەیشتینە پەرستگاکە سەیرم کرد دیوارەکانی دەوری ئەوەندە بەرزە کە سەرەوەیم بە زەحمەت لێوە دیارە. کاتێ چووینە ناو حەوشەی پەرستگاکەوە فرۆشیارەکان پەرتووکی مردووەکانیان[٦] (کۆنترین پەرتووکە کە لە جیهاندا نووسراوەتەوە)ئاراستەی دایکم دەکرد کە بیکرێ، بەڵام ئێمە لە ماڵەوە هەمان بوو و پێویستمان پێی نەبوو.

دایکم حەڵقەیەکی مسی لە پەنجەی خۆی دەرهێنا و بۆ حەقی ئامادەبوون لە



مەراسیمی قوربانیدا، بەخشی و بینیم کاهینەکانی پەرستگاکە، کە کراسی سپییان لەبەردابوو و سەرە تاشراوە چەورکراوەکەیان بریقەی دەدایەوە، دەیانویست مانگایەک سەرببڕن کە مۆرێ لە نێوان دووشاخەکەیدا هەڵواسرابوو کە نیشانی دەدا لە هەموو لەشی ئەو مانگایەدا یەک تاڵە موویەکی ڕەشی تێدانییە.

من بینیم کاتێ مانگاکەیان سەربڕی دایکم چاوی بە فرمێسک بوو، بەڵام من سەرنجم نەدایە سەربڕینەکە و سەیری کۆڵەکە گەورەکانی پەرستگا و شێوە و وێنەی شەڕەکانم دەکرد کەلەسەر دیواری پەرستگاکەدا نەخشێنرابوون.

دوای ئەوەی لەپەرستگاکە هاتینە دەرەوە، دایکم پێڵاوەکانی لە پێ داکەندم و پێڵاوی تازەی لە پێ کردم و کاتێ گەڕاینەوە ماڵ دوای نان خواردنی نیوەڕۆ باوکم دەستی خستە سەر سەرم و پرسی: تۆ ئێستا بوویتەتە کوڕێکی حەوت ساڵان و دەبێ پیشەیەک هەڵبژێرێ، بڵێ بزانم ئەتەوێ ببی بەچی؟

وتم: بەتەمام ببم بە سەرباز، چونکە باشترین یاری کە من لە کۆڵان لەگەڵ منداڵاندا دەمکرد یاریی سەربازی بوو و ئەمبینی کە سەربازەکان چەکی بریقەداریان هەیە و گالیسکەکانیان بە دەنگێکی زۆرەوە بەسەر بەردە راخراوەکانی کۆڵانەکاندا دەڕۆن و ئاڵا رەنگاو رەنگەکانیان لەسەر گالیسکەکان دەشەکێنەوە.

هەروەها دەمزانی کە سەربازەکان پێویستیان بە خوێندن نییەو من لە منداڵە گەورەکان کە دەڕۆیشتن بۆ قوتابخانە، بەسەرهاتی ترسناکم لەبارەی ئازارو ئەشکەنجەی خوێندن دەبیست و دەیانوت مامۆستا تووکی سەری ئەو قوتابییە یەک یەک هەڵدەکەنێ، ئەگەر لەبەر کەمتەرخەمی لەوحە قوڕینەکەی بشکێنێ.

باوکم لە وەڵامەکەی من کەوتە بیرکردنەوە، وا دیاربوو ئەم بۆچوونەی منی بەدڵ نەبوو. دوایی بەدایکمی وت کە گۆزەیەکی بداتێ و دایکم گۆزەکەی دایێ و باوکم دەستی گرتم و بەدەستێکی تر گۆزەکەی گرت و منی بردە کەناری نیل و

بینیم کە هەندێ لە کرێکارەکان خەریکی داگرتنی کەل و پەلی کەشتین و یەکێ بە قامچی ئەکێشێت بە پشتیاندا و ئەوان ئارەقە دەڕێژن و هەناسە بڕکەیان پێ کەوتووە و بارەکان دادەگرن.

باوکم وتی: سەیرکە.. ئەمانە باربەرن و پێستی لەشیان ئەوەندە بەر خۆرو با کەوتووە کە لە پێستی تیمساح ئەستوورتربووە و ناچارن تا خۆرئاوابوون لە ژێر لێدانی قامچی ماندووبن و شەو کە دەچنە خانووە قوڕەکەیانەوە خواردنیان تەنها کەرتە نانێک و پیازێکە. باری ژیانی جووتیاریش هەروەهایە و بەگشتی هەرکەس کە بەدوو دەستەکانی خۆی کاردەکات ئەوها دەژیت...

وتم: باوە .. من نامەوێت ببمە کرێکار یان جووتیار، من دەمەوێت ببمە سەرباز و سەربازەکان چەکی بریقەداریان هەیە و ملوانکەی زێڕ لە ملی هەندێکیانە و لە شەڕەکاندا زێڕ و زیو و بەندە و کەنیز دەهێننەوە و خەڵکی باسی شەڕەکان و قارەمانێتییەکانیان بۆ یەکتر دەگێڕنەوە.

باوکم بێ دەنگ بوو و منی لەگەڵ خۆی برد و لەوێ دوورکەوتینەوە و گۆزەکەی پڕکرد لە شەراب کە لە شەراب فرۆشێکی کڕی و بەڕێکەوتین تا گەیشتینە هۆدەیەکی لەقوڕ دروستکراو لە کەناری نیل. باوکم سەری کرد بەناو هۆدەکەدا و بانگی کرد: (ئین تب)... (ئین تب).

پیاوێکی پیری پۆخل کە تەنها دەستێکی هەبوو و پێڵاوەکانی لە چڵکنیدا دیار نەبوو چ ڕەنگێکی هەبووە، لە هۆدەکە هاتە دەرەوە و من بەسەرسوڕمانەوە وتم: باوکە ئایا (ئین تب)ی سەربازی بەناوبانگ و ئازا ئەمەیە؟

باوکم سەلامی لە پیرەمێردەکە کرد و ئەویش دەستی بەرزکردەوە و بەسەلامێکی سەربازی وەڵامی دایەوە. لەبەرئەوەی کورسی و تەختەی دانیشتن لەبەردەم ماڵەکەیدا نەبوو، هەرلەسەر زەوییەکە دانیشتین و باوکم گۆزەی شەڕابەکەی لەبەرامبەر پیرەمێردەکە دانا، ئەویش بەیەک دەستەکەی گۆزەکەی بۆ دەمی برد و بەتامەزرۆییەکی زۆرەوە هەڵی قوڕاند.



باوکم وتی: (ئین تب) ئەم کوڕەی من (سینۆهە)، حەز دەکات ببێتە سەرباز و منیش هێناومەتە لای تۆ بۆ ئەوەی تۆ ببینێ و لە زمانی تۆی قارەمانەوە بەسەرهاتی ئەو شەڕانە ببیستێ.

(ئین تب) گۆزە شەڕابەکەی دانا و بە تووڕەییەوە سەیری کردم و بەو دەمە بێ ددان و چارە ناشرین و برۆ سپی و زۆرانەی هاتە ئاخاوتن و وتی: سوێندت دەدەم بە (ئاموون) کە واز بێنە لەم بۆچوونە، مەگەر شێت بوویتە؟

دوایی دیسان بەو دەمە بێ ددانانەی خۆی پێکەنی و وتی : ئەگەر من بەرامبەر هەر نەفرەت و جنێوێ کە بە خۆمم داوە کە بۆچی بوومەتە سەرباز، قومێ شەڕابم وەربگرتایە بەو هەموو شەڕابە نەک هەر دەمتوانی دەریاچەکەی فیرعەون پڕبکەمەوە کە بۆ خۆشگوزەرانیی ژنەکەی هەڵیکەندووە، بەڵکو دەمتوانی شەڕابی هەموو دانیشتووانی شاری تەبەس تایەک ساڵ دابین بکەم.

من وتم: ئاخر من بیستوومە پیشەی سەربازی چاکترین پێشەیە لە دنیادا.

(ئین تب) وتی: ناوبانگی شانازی سەربازی لەم وڵاتەدا بریتییە لە زبڵ و پاشماوەی ئاژەڵان کە مێش لەسەری کۆدەبێتەوە. تەنها سوودێک کە من لەو کارە وەرمگرتووە ئەوەیە کە ئەمڕۆ دەبێ ئەو شتانە بۆ خەڵکی باس بکەم تا تیکە نانێ یان کەمێ شەڕابم بدەنێ ئەویش لەسەد نەفەر، یەک کەس دەیدات. لەبەرئەوە من پێت دەڵێم کوڕم لە نێوان هەموو پیشەکانی دنیادا هیچ پیشەیەک لەسەربازی خراپتر نییە و کۆتایی هەموو پاداشتەکانی سەربازی ئەم هەژارییەیە کە منی تێدام.

لە پاشان گۆزە شەڕابەکەی تا دوا قەترە نۆشی و تینی شەڕابەکە دەم و چاوی سوورکردەوە و سەری هەڵبڕی و وتی: ئایا ئەم گەردنە باریک و چرچەی من دەبینی؟ ئەمە گەردنێکە کە ڕۆژگارێ پێنج ملوانکەی پێوەهەڵواسرابوو و خودی فیرعەون ئەو ملوانکانەی کردە ملم. هەرکاتێ لە مەیدانی شەڕ دەگەڕامەوە ئەوەندە دەستی بڕاوەم دەهێنایەوە کەلەبەردەم خێمەکەمدا کەڵەکە دەبوو، بەڵام

ئەمڕۆ لەو هەموو سەربەرزی و دەستڕۆییە هیچم بۆ نەماوە. زێڕەکانم لە ناوچوون و بەندەکانم و کەنیزەکانم لەبرسا مردن یا ڕایان کرد و دەستی ڕاستیشم لە مەیدانی شەڕدا بەجێ ما.

لەکاتی لاویمدا شەو و ڕۆژ لە بیابانەکان لەگەڵ برسێتی و تینوێتی مەیدانی شەڕ دەجەنگام، ئێستاش بەم پیرییەم برسی و تینووم. ئەگەر لە باوکت بپرسی کاتێ کە دەستی بریندای سەربازێ ئەبڕنەوە و بەداخکردن برینەکەی چارەدەکەن، پێت دەڵێ کە چی بەسەردێت، چونکە ئەو پزیشکەو دەزانێ.

هەرپارچەیەکی لەشم لە شەڕێکدا بەجێ ماوە و ددانەکانم و قژی سەرم لە کیس چووە و ئەمڕۆ ئەگەر چەند پیاوێکی خێرومەندی وەک باوکت یارمەتیم نەدەن دەبێ لەبەردەم پەرستگای ئاموون-دا دەرۆزەبکەم.

دوای ئەم قسانە (ئین تب) سەیرێکی گۆزەکەی کرد و وتی: بەداخەوە تەواو بوو...

باوکم بازنێکی مسی لە دەستی خۆی دەرهێنا و دای پێی بۆ ئەوەی شەڕابی پێ بکڕێ و (ئین تب) لە خۆشیا هاوارێکی کرد و بانگی منداڵێکی کرد و بازنە مسەکەی پێداو وتی: ئەم گۆزەیە ببە و شەڕاب بکڕە و بە فرۆشیارەکە بڵێ پێویست ناکات شەڕابی زۆر چاکمان بداتێ، بڵێ با شەڕابی مام ناوەند بێت و گۆزەکە پڕ بکات و باقی مسەکەت بداتەوە.

منداڵەکە ڕۆیشت و من وتم: باشەی سەربازی ئەوەیە کە سەرباز پێویستی بە خوێندن و نووسین نییە و ئەتوانێ ئەرکی چوونە قوتابخانە لە کۆڵی خۆی بکاتەوە.

(ئین تب) وتی: ڕاست دەکەی، سەرباز پێویستی بە خوێندن و نووسین نییە و تەنها دەبێ شەڕ بکات، بەڵام ئەگەر خوێندەواری هەبێ بەسەر ئەوانەی تردا فەرمانڕەوایی دەکات و ئەوانەی تر لە ژێر فەرمانی ئەودا شەڕ دەکەن. هەرگیز نەخوێندەوارێ نابێتە خاوەن پلەوپایە و یەکێک کە نەتوانێ بنووسێ تەنانەت



کۆمەڵێکی سەد کەسیشی پێ ناسپێرن و بەردەوام وابووە و لە داهاتووشدا هەر وادەبێ. کەواتە ئەگەر ئەتەوێ لەداهاتوودا فەرماندەی سەربازان بیت، دەبێ نووسین فێرببی، ئەوساکە ئەوەی ملوانکەی ئاڵتونی لە ملدایە سەری ڕێزت بۆ دادەنەوێنێت و لەکاتی شەڕ سواری کەژاوە دەبی و بەندەکانت ئەتبەنە مەیدانی جەنگ.

ئەو منداڵەی کە چووبوو شەڕاب بکڕی بە گۆزەیەکی پڕەوە هاتەوە و چاوی پیرەمێردەکە لە خۆشیدا بریسکەی دەدایەوە و وتی : باوکی تۆ قەت شەڕی نەکردووە و ناتوانێ ژێی کەوانێ ڕابکێشێ و شمشێرێ لە کێلانەکەیدا دەربێنێت، بەڵام چونکە ئەتوانێ بنووسێ، ئەمڕۆ بەئاسوودەیی ژیان بەسەردەبات و لەبەرئەوەی کە پیاوێکی ڕەوشت بەرزە من گومانی خراپی لێ ناکەم.

من کاتێ کە بینیم پیرەمێردەکە گۆزەی شەڕابەکەی بەرزکردەوە، لەترسی ئەوەی کە سەرخۆشی ئەو کار لە ئێمەش بکات و بکەوینە جۆگەی ئاوەکەوە و جل و بەرگەکانمان بدزن، قۆڵی باوکمم ڕاکێشا بۆ ئەوەی لەوێ دوورکەوینەوە. کاتێ کە دوور کەوتینەوە (ئین تب) یەکێ لە سروودەکانی شەڕی ئەخوێندەوە و ئەو منداڵەی شەڕابی بۆ کڕیبوو بەدیاریەوە پێدەکەنی.

بەڵام من کە (سینۆهە)م لە بڕیاری خۆم کە ببمە سەرباز پەشیمان بوومەوە ، ڕۆژی دوایی منیان بردە قوتابخانە.

***

١ - کاهین : پیاوی ئایینی، مەلای جوولەکە - وەرگێڕی کوردی.

٢ - ڕووباری نیل لە پاییزان ئاوەکەی زیادی دەکرد و خەڵکی دەیانکرد بە جەژن ، چونکە کێڵگەکانی تێرئاو دەکرد و چینێک پەینی سروشتی بەسەر زەوی و زارەکاندا بەجێ دەهێشت کە بۆ بەروبوومی جووتیاران زۆر بەسوود بوو - وەرگێڕ .

٣- کاتژمێری ئاوی: قاپێک کە کونێکی بچووکیان تێ دەکرد و دەیان خستە ناو تەشتێ ئاو و لە ماوەی سەعاتێکدا قاپەکە لە کونەکەیەوە پڕ دەبوو لە ئاو و دوایی ئاوەکەیان بەتاڵ دەکردەوە و

سەرلەنوێ دایان دەنایەوە سەرئاوەکە.. تا ٧٥ ساڵ لەمەوبەر ئەو سەعاتانە لە شاری (تەبەس) و لە خوراسانی ئێران باوبووە و بەکار هێنراوە.

٤- (دار الحیاة)

٥- ابو الهول

٦- کتێبی (أموات)

**بەشی دووەم**

# چوونە قوتابخانە

باوکم نەیدەتوانی بمنێرێتە ئەو خوێندنگایانەی کە لە پەرستگاکاندا دامەزرابوون، لەبەر ئەوەی ئەو خوێندنگانە تایبەت بوو بە کوڕ و کچی خانەدانەکان و کاهینە پلە بەرزەکان و جگە لەوەش خەرجیی فێرکردن لەوێ گران بوو.

مامۆستاکەم کاهینێکی پلە پێنج بوو کە لە هەیوانی ماڵەکەی خۆیدا قوتابخانەیەکی کردبووەوە. ئێمە لە کاتی بەهار و هاویندا لە هەیوانەکەی وانەمان دەخوێند و لە زستاندا دەچووینە ژوورەوە. قوتابییەکانی بریتی بوون لە کوڕی ئەفسەرانی بەش و مامەڵەچییەکان و کاهینە بچووکەکان کە باوکیان بە هیوابوون کوڕەکانیان بتوانن لەسەر تەختە بنووسن و حیسابی کەل و پەلی دوکان بکەن. یان بتوانن لێکی بدەنەوە کە گوێدرێژەکانی سوپا لە تەویلە(پشتیر)ەکان و، هەروەها ئەسپەکانی هەر گالیسکەیەک لە مەیدانی شەڕدا چەندە ئالیکیان پێویستە.

لە شاری (تەبەس)، کە پایتەختی گەورەی دنیابوو لەم خوێندنگانەی کەلە ماڵەکاندا کرابوونەوە زۆری لێ بوو و، ئەرکی خوێندنی قوتابییان لەمانەدا گران نەبوو، چونکە قوتابییەکان حەڵقەی مسیان نەدەدایە مامۆستاکانیان، بەڵکو جاری وا دەبوو خواردن یان کووتاڵیان بۆ دەهێنان، بۆ نموونە.. کوڕی خەڵووز فرۆش لە زستانان خەڵووز و داری بۆ مامۆستا دەهێنا و، کوڕی نەساج هەموو ساڵێ چەند پارچە قوماشێکی بۆ دەهێنا و، کوڕە جووتیار گەنمی بۆ دەهێنا. بەڵام باوکم لە بری خوێندنی من داو و دەرمانی پێدەدا و جاری وادەبوو کولاوەی



هەندێ گیام بۆ مامۆستا دەبرد کە بەشەڕاب تەڕ کرابوو.

لەبەرئەوەی ئێمە کەل و پەلی ژیانی مامۆستامان دابین دەکرد ئەویش زۆری لێمان نەدەکرد و ئەگەر منداڵێ لەسەر لەوحەکەی خۆی بخەوتایە سزاکەی ئەوەبوو کە دەبوو رۆژی دوایی کەمێ هەنگوین یان پاقلە بۆ مامۆستا بهێنێ.

ئەگەر رۆژێ قوتابییەک گۆزەیەک ئاوی جۆی بهێنایە، ئەو رۆژە دەبووە جەژن، چونکە مامۆستاکەمان هەر ئەوەندە کە بیرەکەی دەخواردەوە ئیتر خوێندن و فێرکردنی لەبیر نەدەما و بە دەمە بێ ددانەکەی حەکایاتی پێکەنیناوی لە بارەی خوایەکان بۆ دەگێڕاینەوە، ئێمە وا پێدەکەنین کە ئەوانەی بە کۆڵاندا تێدەپەڕین دەوەستان و گوێیان هەڵدەخست بۆ ئەوەی بزانن ئێمە بەچی پێدەکەنین.

بەڵام کاتێ کە گەورەبووم ئینجا تێ گەیشتم کە مامۆستاکەمان لەم کارە مەبەستێکی گرنگی هەبووە و دەیویست بەهۆی ئەو چیرۆکە پێکەنیناویانەوە ئێمە بەئەرکەکانی ژیان ئاشنا بکات و تێمان بگەیەنێت کە لە نێوان خوایەکاندا خوایەک هەیە کە سەری وەک چەقەڵەو بەردەوام ئاگای لە کردەوەکانی مرۆڤەو هەر کەسێ کردارێکی خراپ بکات دەرخواردی گیانەوەرێکی دەدات کە نیوەی لەشی وەک تیمساحەو نیوەکەی تری وەک ئەسپی ئاوییە.

دەیوت: خوایەکی تر هەیە کە لە ناو رووبارەکان کەشتی لێدەخوڕێ و دوای مردن، مرۆڤ دەباتە ئەو جێگایەی کە دەبێ بۆی بڕوات و تیایدا بەختەوەر بێت.

پاش ئەوەی ماوەیەک لەو خوێندنگەیەدا خوێندم شتێکی سەیر ڕووی دا و ئەویش ئەوەبوو کە کاتێ دوو وێنەم لێک نزیک دەکردەوە لە ماناکەی تێدەگەیشتم.

کاتێ کە وێنەیەک بە پەیکان[١] لەسەر لەوحەیەک دەنەخشێنن ، نەفامترین کەسیش دەتوانێ لە ماناکەی تێ بگات ، بەڵام تەنها یەکێکی خوێندەوار دەتوانێ لە مانای چەند وێنەیەک کەلە تەنیشت یەکەوە ڕیزدەکرا تێ بگات .

ئەگەر ئێوە شێوەی مرۆڤێ لەسەر لەوحە بکێشن و بیدەنە نەخوێندەوارێ

دەزانی ئەوە مرۆڤە و ئەگەر شێوەی تیمساحێکیش بێت دەزانیت تیمساحە ، بەڵام ئەگەر یەکێ بتوانێت لە مانای چەند وێنەیەکی بەیەکەوە نووسێندراوی مرۆڤێک و تیمساحێک و دارێک و گالیسکەیەک تێ بگات و بزانێ کە مەبەستی بەرامبەرەکەی چییە ، ئەوە پێی دەڵێین خوێندەوار .

لەو رۆژەی کە توانیم لە مانای دوو شکڵی پێکەوە لکێندراو تێبگەم ئیتر پێویستم بە هاندان و دەستخۆشی مامۆستا نەبوو، چونکە زۆر پێی دڵشادبووم و کە دەگەڕامەوە بۆ ماڵێ داوام لە باوکم دەکرد کە شێوەکان پێکەوە بنووسێنێ بۆ ئەوەی ماناکانیان تێ بگەم.

لەو کاتەی کە لە خوێندندا بەرەوپێش دەچووم ، هەستم کرد کە من وەک ئەوانی تر نیم، چونکە شێوەی دەم وچاوم هێلکەیی و دەست و قاچم ناسکە و رەنگی دەم و چاوم لە هی خەڵک روونترە و هەر لەبەر ئەمەش هەندێ لە قوتابییان ئازاریان دەدام و، کوڕی عەلافەکە[٢] قوڕگی دەگرتم و دەیگوشی و پێی دەوتم: تۆ وەکو کچی و.. من ناچار بووم نووکی پەیکانەکەمی پێدا بکەم بۆ ئەوەی بەرم بدات.

سەرەڕای ئەمانە یەکێ لە قوتابییان کە باوکی ئەفسەری بەش بوو منی خۆش دەویست و هەموو رۆژێ هەندێ خۆڵی سووری دەهێنا بۆ فێرگەکە و لەوێ پەیکەری ئاژەڵانی لێ دروست دەکرد و رۆژێ شکڵی منی بە قوڕ دروست کرد و دای پێم . بەڵام کە بردمە ماڵەوە دایکم خەمباربوو و ، وتی: ئەمە جادووگەرییە..

بەڵام باوکم لەو هەلەدا تێی گەیاند کە ئەگەر دروستکردنی بت جادووبێت ئەوا ئەو هەموو بتەیان لە کۆشکی فیرعەون دانەدەنا.

ماوەیەک تێپەڕی بەسەر خوێندنم لە قوتابخانەدا، تاکو رۆژێ باوکم جلکە نوێیەکەی خۆی لەبەر کرد و دەستی گرتم و بردمیە پەرستگای ئامون و وتی: ئەمەوێت تۆ بنێرمە (خانەی ژیان).



بۆ وەرگیرانی من لە (خانەی ژیان)، دەبووایە کاهینەکانی پەرستگە رازی بوونایە، بەڵام باوکم کەلە هەموو تەمەنیدا بەس گەداکانی چارەسەر دەکرد لە هەڵسان و دانیشتن لەگەڵ کاهینەکان بێبەش بوو و نەناسینیان زیانێکی زۆری لە ژیانی باوکم دا، چونکە لەمیسر هەموو ئیش و کارێ بەدەست کاهینەکان بوو و ئەوان قوتابییەکانیان هەڵدەبژارد کە بچن لە خانەی ژیان بخوێنن و هەر ئەوان سەرانە (باج) یان دادەنا و کاتی بەرزبوونەوەی ئاوی نیل رادەی بەرزبوونەوەکەیان ئەپێوا و ئەوەندە دەسەڵاتیان زۆر بوو کە ئەگەر فیرعەون حوکمی بەسەر یەکێکدا بدایە و ئەو کەسە لەنێو کاهینەکان دۆستێکی هەبووایە فەرمانەکەی فیرعەونیان هەڵدەوەشاندەوە .

لەبەرئەوەی باوکم لەپەرستگە کەسی نەدەناسی ناچار لە حەوشەکە لەسەر زەوی دانیشت بۆ ئەوەی وەکو ئەوانی تر بە نۆبە لەلایەن یەکێ لە کاهینەکانەوە بانگهێشت بکرایە، ئێمە کە بەیانی زوو چووبووین بۆ پەرستگە تا پاش نیوەڕۆش سەرەمان نەهات.

لەو کاتەدا پیاوێک هاتە پەرستگاکەوە و باوکم هەر کە بینی ناسییەوە و وتی: ئەمە (پاتوور)ە کەبەیەکەوە لە خانەی ژیان دەمانخوێند و لەیەک پۆل بووین و ئەو ئێستا کاسەی سەری فیرعەون کون دەکات.

من ئەوسا نەمدەزانی کە کاسەی سەر کون کردن چییە و بۆچی ئەو شیاوییەی ئەو کەسە هەیەتی ئەوانی تر نییانە و ، لە دواییدا کە خۆم بوومە پزیشک زانیم کون کەری کاسەی سەر ئەو کەسەیە کە کاسەی سەری فیرعەون یان کەسانی تر (لە کاتی نەخۆشی)دا کون دەکات و ئەو (غودە) زیادانە لە نوا سەریدا دەردەکات کە لەسەر مێشکی دروست بووە. سەرەڕای ئەمە، ئەوەی کاسەی سەر کون دەکات بو ئەوەش وادەکات کە گازە ترسناک و ژەهراوییەکان دەربچێ کە لەنێو کاسەی سەردا کۆبوونەتەوەو دەبنە هۆی نەخۆشی.

باوکم کاتێ کە (پاتوور)ی بینی هەڵسا و سەلامی لی کرد و پاتوور

ناسییەوە و دەستی خستە سەرشانی باوکم و وتی: چۆنە هاتوویتە بۆ ئێرە؟ ئایا ئیشت هەیە؟

باوکم وتی: هاتووم کەلە کاهینەکان ڕوخسەت وەربگرم کە ئەم کوڕەم لە خانەی ژیان وەربگرن.

پاتوور وتی: ئەم کارەتان بێ سوودە، لەبەر ئەوەی کە داواکارییەکەتان ڕەت دەکەنەوە، من خۆم دوایی دێمە ماڵەوەتان و لەم بارەیەوە گفتوگۆ دەکەین.

سەر لە بەیانی ڕۆژی دوایی باوکم چووە بازاڕ و بۆ میوانداریێتی پاتوور قازێک و چەند ماسییەک و هەندێ هەنگوینی کڕی و هێنایەوە بۆ دایکم کە قازەکە لێ بنێ و ماسییەکان سوور بکاتەوە و بە هەنگوینەکەش نانێکی شیرین دروست بکات.

کاتێ کە بۆنی قازەکە بڵاوبووەوە، دەرۆزەکەرەکان و کوێرەکان لەبەردەم دەرگای ماڵمان کۆبوونەوە و هەرچەندە دایکم دەری دەکردن نەدەڕۆیشتن و ناچار هەندێ لە نانەکەی لە چەوراوی قازەکە وەردا و دای پێیان کە لەوێ نەمێنن.

باوکم گۆزەیەکی پڕ کرد لە گوڵاو و دایە دەستم و وتی: کە پاتوور هات بەمە ئاوبەدەستییدا بکە و، دایکم پارچەیەک کەتان، کە بۆ (ڕووپۆشی) تەرمی خۆی هەڵی گرتبوو لەتەک منەوە دانا و وتی: کە ئاوت بەدەستییدا کرد بەمە دەستی وشک بکەرەوە.

ئێمە وامان دەزانی پاتوور وەکو جاران کاتی عەسر دێت بو ماڵمان ، بەڵام تاریک داهات و پاتوور هەر نەهات. من چونکە برسیم بوو دواکەوتنیم پێ ناخۆش بوو، چونکە دەمزانی هەتا ئەو نەیەت نان نادەن بە من.

باوکم ئەوەندە دڵگران بوو کە کاتی تاریکیش داهات، چرای هەڵ نەکرد و هەردووکمان لە هەیوانەکە لەسەر تەختە چوارپێیەکان دانیشتبووین و نەماندەوێرا سەیری یەکتر بکەین. ئەو ڕۆژە من بۆم دەرکەوت کە کەم تەرخەمی یان گوێ نەدانی گەورەکان لە ئاستی ژێر دەستەکانیان چەند دەبێتە هۆی دڵ ڕەنجانی



هەژارەکان و ئەوانەی لەوان بچووکترن.

هەر چۆنێ بێ مەشخەڵی لە کوڵانەکەدا دەرکەوت و لەدوایەوە کەژاوەیەک دەبینرا کە دوو ڕەش پێست هەڵیان گرتبوو، بەڵام ئەوەی مەشخەڵەکەی پێ بوو میسری بوو.

کاتێ پاتوور ویستی دابەزێ، باوکم دەستەکانی خستە سەر ئەژنۆی و داچەمییەوە و پاتوور بۆ دەربڕینی خۆشەویستی یان بۆ ئەوەی نەکەوی دەستی خستە سەرشانی باوکم. ئینجا هەردووکیان هاتن بەرەو هەیوانەکە و دایکم بەپەلە دارێکی لە چێشتخانەکە هێنا کە ئاگری پێوەبوو و هەردوو چراکەی هەڵکرد.

باوکم پاتووری لەسەر کورسییەی دانیشاند و من ئاوم بە دەستییدا کردو بەکەتان دەستیم سڕییەوە. کەس قسەی نەدەکرد، تاوەکو پاتوور سەیرێکی کردم و وتی: کوڕەکەت جوانیشە... دوای ئەوە وتی تینوومە و داوای شەڕابی کردو باوکم شەڕابی بۆ تێکرد و ئەویش کەمێ بۆن و تامی کردو کە دڵنیا بوو شەڕابێکی باشە خواردییەوە. کاتێ کە ئەو خەریکی نۆشینی شەرابەکەبوو، من بە دیقەت سەیرم دەکرد، پیاوێکی بەساڵاچوو بوو کە قژی سەری کەم بوو و قاچەکانیشی کورت بوون و سینگی بەناودا چووبوو و سکی گەورە بوو و ملوانکەیەکی زێڕی بەملەوە بوو و، کراسەکەی لەکەی زۆری پێوە بوو.

دوای شەڕاب خواردنەوە باوکم نانی شیرین و ماسی بریانی و قاز و میوەی لەبەردەمی دانا. هەرچەندە وا دەردەکەوت کە پاتوور پێش هاتنی بۆ ماڵی ئێمە لە میوانداریییەکی تر بووبێ، بەڵام بۆ دەرخستنی ژیری و تێگەیشتوویی خۆی لە خواردنەکانی خوارد و باسی بەتام و لەزەتی خواردنەکەی کرد و، ئاگام لێ بوو دایکم ئەو مەدح کردنەی پێخۆش بوو.

پاتوور وتی: مەشخەڵدارەکەم ئەوەندەی خواردووە باوەڕ ناکەم هیچی تری پێ بخورێ، بەڵام ئەگەر هەندێ چێشت و بیرە بۆ ڕەش پێستەکان ببەن خراپ نییە.

من نان و چێشتم بۆ بردن و ئەوان لە جیاتی ئەوەی کە خۆشحاڵ بن هەندێ جنێویشیان داو وتیان: ئایا نازانی ئەم پیرەمێردە کەی هەڵدەستێ بڕۆین؟

وتم: من ئاگام لێ نییە و نازانم... گەڕامەوە و بینیم میسرییەکە لەژێر دارەکان خەوی لێ کەوتووە.

ئەو شەوە باوکم بەبۆنەی میوانەکەیەوە لە خواردنەوە زیادەنۆشیی کرد، بۆ ئەوەی هانی ئەویش بدات کە بخواتەوە و دوای ئەوەی ئەو شەڕابەی کەلە بازاڕ کڕیبوومان هەمووی خورایەوە، دەستیان بە خواردنەوەی ئەو شەڕابەش کرد کەباوکم بۆ چارەسەرکردن بەکاری دەهێنا و گۆزەیەک ئاوی جۆ کە لە ماڵەوە هەمان بوو خواردیانەوە و ئیتر کەوتنە کەیف و خۆشی و لەبارەی ساڵەکانی خوێندنیان لەخانەی ژیان گفتۆگۆیان دەکرد و ڕووداوەکانی ئەوسایان وەبیر یەک دەهێنایەوە.

پاتوور وتی: ئەم پیشەیەی من کە کون کردنی سەری فیرعەونە بۆ یەکێکی تەمبەڵی وەکو من زۆر لە بارە، چونکە لە نێوان هەموو بەشەکانی پزیشکی هیچ بەشێک لەبەشی کاسەی سەر و مێشک ئاسانتر نییە، جگەلە ددان و گوێ و قوڕگ کە ئەمانە پێویستی بە پسپۆڕی تایبەتی خۆی هەیە.

پاتوور ئەیوت: من ئەگەر کابرایەکی تەمبەڵ نەبوومایە و بچوومایەتە بەشێکی تر، پزیشکێکی ئاسایی وەکو تۆم لێ دەردەچوو کە دەبووایە چارەسەری خەڵکیم بکردایە و ژیانم پێ ببەخشینایە، بەڵام ئەمڕۆ ئیشی من ئەوەیە کەخەڵک بمرێنم. کاتێ کە خەڵک لەپیر و پەککەوتە و ئەوانەی چارەسەر ناکرێن بێزار دەبن، دەیهێنن بۆ لای من کە سەریان هەڵدڕم و منیش کاسەی سەریان هەڵدەتلێشێنم بۆئەوەی هەڵمە ئازارگەیەنەرەکان دەربچێ و لە ئەنجامدا ئەو نەخۆش و بەسالاچووانە دەمرن.

دوایی وتی: ئەگەر وەک تۆ ببوومایە بە پزیشکی هەژاران ئەم سکە زلەم نەدەبوو و، ئەم ورگە تەنانەت ناهێڵێ بەباشی بەڕێدا بڕۆم، لەبەر ئەوەی



پزیشکی فیرعەونم و هەموو جۆرە خواردنێکی بە هێز و نایاب دەخۆم. ئەم ورگەم پەیدا کردووە، بەڵام تۆ چونکە کەم دەرامەتی تەنها ئەو خواردنانە دەخۆی کە بۆ لەش ساغیت پێویستە و ورگت پێی گەورە نابێت و دوو ئەوەندەی من ئەژیت چونکە. بۆ کورت کردنەوەی تەمەن هیچ شتی لەوە کاریگەرتر نییە کە مرۆڤ ئەو خواردنانە بخوات، کە پێویستە پێش خواردن بکوڵێنرێ.

پاتوور دەمی باوکمی کردەوە و سەیری ددانەکانی کرد و دوایی دەمی خۆی نیشانی باوکم داو وتی: سەیرکە من لە سیانزدە ددان زیاترم نەماوە و ددانەکانم بوونەتە بەڵاوگێڕی خواردنە کوڵاوەکان و تۆ لەبەر نەبوونیت زۆربەی کات خواردنی سروشتی و سادە دەخۆی و ددانەکانت پاراستووە.

دوایی سەرێکی باداو بەپەرۆشەوە وتی: وام لێ هاتووە زور لەش قورس و کەم توانا بوومە و لەبەر زێڕ و زیو و پارەی زۆر وەک ئاژەڵم لێ هاتووە.

باوکم وتی: کوڕم سینۆهە، بەم قسانە باوەڕ مەکە، چونکە پاتوور ئێستا گەورەترین نۆژداری مێشکە و ئەم پیاوە ئەوەندە لە هونەرەکەی خۆیدا کارامەیە کە دەتوانێ لوویەک بەقەدەر هێلکەیەک لە مێشکی نەخۆشێ بهێنێتە دەرەوە و سەدان کەس لە کاهینەکان و گەورەپیاوانی لە مردن ڕزگار کردووە و ئەوان دوای چاک بوونەوەیان ملوانکەی زێڕ و کاسەی مسی زۆریان داوەتێ.

بەڵام پاتوور وتی: لەجیاتی هەر کەسێ کە چاک دەبێتەوە، دەیان و بگرە سەدان کەس بە دەستی من دەمرن. ئایا تۆ قەت بیستووتە فیرعەونێ لەدوای نەشتەرگەریی کاسەی سەری لە سێ ڕۆژ زیاتر ژیابێت؟

ئەوانەی کە دەڵێین کێردی نەشتەری کردنەکەم کە لەبەردی (سماق)ـە بەختەوەری ئەبەخشێ، لە لایەکەوە راست دەکەن، چونکە کاتێک کە کاهینێ یان شازادەیەک یان یەکێ لە خانەدانەکان، دوای هەڵکەندنی کاسەی سەریان بەم کێردە دەمرن، زێڕ و پارە و مەڕ و ماڵات و عەمباری دەغڵ و دانەکەیان بەر میراتگرەکان دەکەوێ و، ئەو میراتگرانە پێی بەختەوەر دەبن. یان هەر کاتێ

فیرعەون لە یەکێ لە ژنەکانی خۆی بێزار دەبێت دێتەلای من بۆ ئەوەی کە من بەم کێردە بەردینەم کۆتایی بە ژیانی بهێنم و هەندێ جار خودی فیرعەونیش هەروا...

بەڵام پاتوور لەم کاتەدا وەک بڵێی تێگەیشتبێ خەریکە شتێ بڵێ، کە دوایی لێی پەشیمان ببێتەوە، ئیتر بێدەنگ بوو و دوای چەند ساتێکی تر وتی: من زۆرشت دەزانم.. زۆر نهێنی لە دڵی مندا شاردراونەتەوە و خەڵکی کە ئەم بابەتە دەزانن لێم دەترسن، بەڵام من کابرایەکی چارەڕەشم، چونکە زۆرشت دەزانم و هەتا زانیاری مرۆڤ زیاتر بێت پتر هەست بە خەم و پەژارە دەکات.

لەم کاتەدا کەوتەگریان و فرمێسکەکانی چاوی بە پارچە کەتانەکەی دایکم سڕییەوە و بە باوکمی وت: تۆ پیاوێکی هەژاری ، بەڵام شەریفی و من پیاوێکی دەوڵەمەندم و لە بری ئەوە خراپم و لە ڕیخە مانگای سەرەڕێ کەمترم.

لەو کاتەی ئەم قسانەی دەکرد ملوانکە ئاڵتوونەکەی لە ملی لێکردەوە و خستییە ملی باوکمەوە، بەڵام باوکم وەری نەگرت چونکە دەیزانی ئەوەی لە کاتی سەرخۆشی ببەخشرێ دیارییەکی ڕاستەقینە نییە و لەوەیە ئەوەی دیارییەکە دەبەخشێ دوایی پەشیمان بێتەوە و ڕۆژی دواتر لێی بستێنێتەوە.

باوکم و پاتوور لە تەنیشت یەکەوە لە ژوورەکە نووستن و منیش لە هەیوانەکە خەوم لێکەوت. سبەینێ زوو لە خەو هەڵسام و سەیرم کرد پاتوور بەخەبەرە و دانیشتووەو بەهەردوو دەست سەری خۆی گرتبوو و دەیوت: ئێرە کوێیە؟ من بۆ لێرەم؟

من لێی نزیک بوومەوە و دەستم بە ئەژنۆمەوە گرت و داچەمیمەوە و وتم: پاتوور ئێرە ماڵی پزیشکی هەژارانە و تۆ دوێنێ شەو لێرە میوان بوویت و ئێستا لە خەو هەڵساوی.

لە قسەکردنەکەی ئێمە باوکیشم بەخەبەرهات و دایکم کە لە پێش ئێمەوە بەخەبەر بوو، گۆزەیەک دۆ و ماسیی سوێر کراوەی بۆ میوانەکەمان هێنا.



جارێکی تر ئاوم بەدەستی پاتووردا کرد و ئەو سەری دانەواندو وتی ئاو بەسەرمدا بکە و، دوایی دەست و سەریم بە کەتان وشک کردەوە.

(پاتوور) پێش ئەوەی پارووەیەک ماسی و قومێ دۆ بخواتەوە بەرەو باخچەکە ڕۆیشت و مەشخەڵدارەکەی خۆی بەلەقەیەک بەخەبەر کردەوە و بەدەنگی بەرز وتی: ئەی (جەعل)[٣]ی پۆخڵ ئاوها پارێزگاری لە گەورەکەت دەکەی؟ کوا ڕەش پێستەکان؟ کەژاوەکەی بۆ لێ نەماوە؟

مەشخەڵدارەکە هەڵسا و پاتوور پێی وت بیاندۆزێتەوەو، دوایی دەرکەوت کە قوڵە ڕەشەکان شەوی ڕابردوو دوای خەوتنی ئێمە چووبوون بۆ یەکێک لە ماڵە سۆزانییەکان و کەژاوەکەیان بە بارمتە دانابوو و بەو پشت ئەستوورییەوە تا درەنگ خەریکی ڕابواردن بووبوون و هێشتا بەخەبەر نەهاتبوون.

پاتوور حەڵقەیەکی مسی دایە مەشخەڵدارەکەی کە ئەم هەواڵەی هێنا، بۆ ئەوەی بچێ ڕەش پێستەکان و کەژاوەکە، کە بەبارمتە مابوونەوە بهێنێتەوە.

دوای ئەوە پارووەیەک ماسی-ی خواردو قومێ دۆی خواردەوەو وتی: ئێمە دوێنێ شەو نەمانتوانی لەبارەی ئەم کوڕە بدوێین و، من بۆ ئەم مەبەستە هاتبووم.. کوڕم.. ناوت چییە؟

وتم: ناوم سینۆهەیە

(پاتوور) وتی: خوێندن و نووسین دەزانی؟

وتم: بەڵێ

وتی: بڕۆ کتێبی (مردووەکان) بێنە

من ڕۆیشتم و دەستەیەک (پاپیروس) کە کتێبی (مردووەکان)ی تێدا نووسرابووەوە هێنام و ئەویش هەندێکی دەست نیشان کردو منیش بۆم خوێندەوە. پاشان چەند رستەیەکی وت و من نووسیم و چاوی لێکرد و پەسندی کرد و وتی: زۆر باشە پێم بڵێ حەز دەکەی ببی بە چی؟

وتم: ئەمەویت لە خانەی ژیان بخوێنم بۆ ئەوەی وەک باوکم ببم بە

پزیشک...

پاتوور وتی: سینۆهە هەندێ ئامۆژگاریت دەکەم، دەبێ باش گوێی لێ بگریت و لە یادی نەکەی، بەڵام من لەبیر بکە، کە ئەم شتانەت پێ دەڵێم و هەرگیز باسی ئەوە مەکە کە ئەم ئامۆژگارییانەت لە پزیشکی تایبەتی فیرعەون بیستووە. ئەو شوێنەی بۆ فێربوونی پزیشکی دەچیتە ئەوێ، جێگای کاهینەکانەو ژیان و پێشکەوتنی تۆ بەستراوەتەوە بە ویستی ئەوان و تۆ کە چوویتە ئەوێ دەبێ ملکەچ و گوێڕایەڵ و بێدەنگ بیت. هەرگیز نەکەی رەخنە لەشت بگری و بیروباوەڕی دەروونی خۆت ئاشکرا بکەیت و هەر چیشت پێ دەڵێن دەبێ رازی بی و ئەوەش بزانە کە مرۆڤ دەبێ لە ژیانیداو بەتایبەتی لە خانەی ژیان، وەکو ڕێوی فێڵبازو وەک مار بێ دەنگ بێ، بەڵام لە ڕواڵەتدا وەک کۆترێکی غەدر لێ کراو و مەڕێکی بێ ئاگا خۆی نیشان بدات.

لە بیری مەکە کە مرۆڤ تەنها لەو کاتدا دەتوانێ شێوەی ڕاستەقینەی خۆی دەربخات، کە هێز و دەسەڵات و زیرەکییەکی زۆری هەبێت و تا ئەو رۆژەی کە دەگەیتە ئەو هێز و دەسەڵاتە گوێڕایەڵ و لەسەرخۆ و مل کەچ بە.

پاشان پاتوور وتی: ئەمرۆ دەچم کاهینەکان رادەسپێرم کە لە قوتابخانەکەی پەرستگای ئاموون وەرت بگرن و پاش تەواوکردنی خولێکی سێ ساڵە دەتخەنە خانەی ژیانەوە.

پاشان پاتوور خواحافیزی لە باوکم و دایکم کرد و سواری کەژاوەکەی بوو و ڕۆیشت.

***

١ – پەیکان: بەردێکی نووک تیژ کە بۆ نووسین و وێنەکێشان بەسەر لەوحەکەدا دەیانهێنا – وەرگێڕی کوردی

٢– عەلاف: دانەوێڵە فرۆش ... ئەوەی دەغڵ و دان لە جووتیاران دەکڕێ و دەیفرۆشێتەوە –



وەرگێڕی کوردی.

٣– جەعل : قالۆنچە – سیسارک – زیندەوەرێکی وردە کەلەسەر شەقامەکان پاشماوەی ئاژەڵان کۆدەکاتەوە – وەرگێڕ .

# فێرگەی ئامادەیی پزیشکی

لەو سەردەمەدا خوێندنی بالاّ لە (تەبەس) بەدەست کاهینەکانی (ئاموون)ـەوە بوو، خانەی ژیان بە قوتابخانە و نەخۆشخانەیەک لەقەڵەم دەدرا کەلە ناو پەرستگاکەدا ئەرکەکانی جێبەجێ دەکرد. هەموو قوتابخانە بالاّکانی تەبەس بەهۆی دەستی کاهینەکانەوە بەڕێوە دەچوون و ئەوانیش لە هەڵبژاردن و وەرگرتنی قوتابییان زۆر وریا بوون، بۆ ئەوەی هەرکەسێ دژایەتییان بکات، لەو خوێندنگە بالاّیانە دووری بخەنەوە و بێ بەشی بکەن.

جگەلە قوتابخانەی پزیشکی، قوتابخانەی ماف و بازرگانی و ئەندازیاری و بیرکاری و ئەستێرەناسیش لە ناوپەرستگای (ئاموون)دا هەبوون[١].

کاهینەکان لەبەر ئەوە لە وەرگرتنی قوتابییان وردبین بوون، چونکە نیوەی خاکی میسر هی پیاوە ئایینییەکان بوو ، واتە بەڕوالەت هی (ئاموون) بووەو ئەوان نەیاندەویست جگە لە لایەنگرانی خۆیان کەس ببێتە پزیشک و مافپەروەر و بازرگان و ئەندازیار و ئەستێرەناس.

هەروەها لەبەر ئەوەی ئەفسەرەکانی سوپا پێش چوونە ناو لەشکرەوە دەبوایە خولێکی قوتابخانەی مافیان تەواو بکردایە، کاهینەکانی پەرستگەی (ئاموون) دەسەلاّتیان بەسەر هەموو دەزگاکانی بەڕێوەبردن و سەربازی میسردا سەپاندبوو. لەم قوتابخانانەدا دووانیان لەوانی تر بە بایەختر بوون کە یەکێکیان قوتابخانەی پزیشکی و ئەویتریان ماف بوو.

خولی ئامادەیی ئەم دوو قوتابخانەیە سێ ساڵ بوو، قوتابییان دەبووایە سێ ساڵ لەوێدا بمانایەتەوە تا لە دوای تاقی کردنەوە، ئەگەر خوا (ئاموون)یان ببینیایە ئەوسا ڕێگایان دەدا کە لە قوتابخانەی پزیشکی یان ماف وەربگیرێن.

من لە بەشەکانی داهاتوودا باسی ئەوە دەکەم کە قوتابییان چۆن خوا (ئاموون) یان دەبینی. مەبەستی سەرەکی کاهینەکانی میسر لەوەی کە قوتابییانیان سێ ساڵ لەو خولە دەهێشتەوە، ئەوەبوو کە هەموو بیرو بۆچوونێکی سەربەخۆی قوتابییەکان لەناو ببەن، کە لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی ئەواندا نەدەگونجا.

لەماوەی ئەم سێ ساڵە قوتابی لەم خولانەدا هیچ کارێکی نەبوو، جگەلە خواپەرستی و فێربوونی گێڕانەوە ئایینییەکان. کاهینەکان دەیانزانی کە ئەوانەی دێنە ئەو خولەوە هێشتا منداڵن و تازە هەنگاو دەنێنە قۆناغی لاوی. سەرەڕای ئەوەش تا پێش ئەو کاتە هەر یارییان کردووە و بیر و باوەڕێکی سەربەخۆیان نییە و لەو تەمەنەدا بۆ ئەوە دەچنە ئەو فێرگە ئامادەییانە کە ببنە خاوەن بیروڕا. کەواتە دەبوایە لەم خولانەدا ئازادیی بیروڕایان لە ناو ببەن و بیانکەنە بوونەوەرێک کە بەبێ چەند و چوون هەرچییان پێ وتن بیسەلمێنێ.

قوتابی کاتێ کە ئەم قۆناغەی بڕی و چووە قوتابخانەی ماف یان پزیشکی و خوێندنی ئەوێشی تەواوکرد، دەبێتە گەنجێکی تەواو بەلاّم جگە لەوەی کاهینەکان فێریان کردووە هیچی تری نەخوێندووە و نەبیستووە و بەشێوەیەک بیرکردنەوەی تەسک دەبێتەوە کە لەدوای دەرچوونی لەو قوتابخانە بالاّیانە ناتوانێ بەشێوەیەکی تر جگە لەوەی کاهینەکان پێیان وتووە بیربکاتەوە.

ئێمە کۆمەڵێکی بیست و پێنج کەسی بووین کە لەو خولە ئامادەییە دەستمان بە خوێندن کرد و هەموو بەیانیانێ زوو دەچوومە قوتابخانە و نانی ئەو ڕۆژەم لەگەڵ خۆم دەبرد و پێش خۆرئاوابوون دەگەڕامەوە ماڵی خۆمان.

لەدوای چوونم بۆ ئەو قۆناغە، زوو تێگەیشتم کە (پاتوور) ناهەقی نەبوو دەیوت دەبێ ملکەچ و گوێڕایەڵ بی و هەرگیز ڕەخنە نەگری و بیروباوەڕی خۆت نەدرکێنی. هەستم کرد کە کاهینەکان لە نێو قوتابییاندا جاسووسیان دانابوو و

هەر ئەوەندە قوتابییەک گومانی لە بابەتێ هەبووایەو بیوتایە وانییە و کاهینەکان درۆدەکەن، یەکسەر ئەو قوتابییەیان دەردەکرد و ئیتر مەحاڵ بوو بتوانێ بچێتە قوتابخانەیەک لەو قوتابخانە باڵایانەی تەبەس و بۆ دەرکردنیشی بەهانەی تەواویان هەبوو و دەیانوت کە (ئاموون) دەڵێ ئەم قوتابییە لێهاتوو نییە.

ئەو رۆژەی داخڵی قوتابخانە ئامادەییەکە کرام، تەمەنم سیانزە ساڵ بوو، ئەگەرچی یەکێک بووم لە قوتابییە کەم تەمەنەکانی ئەوێ، بەڵام لەهەموو قوتابییەکانی تر کە زۆربەیان کوڕی کاهینە گەورەکان و خانەدانەکان بوون لێهاتووتر بووم و دەتوانم بڵێم ئەگەر هەر ئەو کاتە منیان بخستایەتە قوتابخانەی پزیشکی، دەمتوانی بە ئاسانی بخوێنم و تێبگەم، چونکە جگە لە خوێندەواری، زانیاریی زانستیشم هەبوو، لەبەر ئەوەی باوکم پزیشک بوو و من لەژێر دەستیدا ناوی زۆر لە داو و دەرمانەکانم دەزانی و، دەمزانی برینێ کە کێمی نەبوو چۆن بەرۆن چارەسەر دەکرێ و بە چ شێوەیەک برینێ کە چڵک و کێمی دەکرد دوای دەرهێنانی کێم و جەراحەت و دەرمان کردن، بەئاگر داخی بکەم، کە ئیتر جەراحەت نەکات.

هەروەها من بینیبووم کە باوکم کاتێ بە هانای مامانێکەوە دەچوو، چۆن بەو کەرستە تایبەتییە کەلە داری (سەدر) دروست کرابوو، منداڵەکەی لەسکی دایکیدا لەت لەت دەکرد و دەیهێنایە دەرەوە، بۆ ئەوەی گیانی دایکی لە مردن رزگار بکات.

بەڵام سەرەڕای ئەوەی لە زۆربەی قوتابییانی ئەوێ لێهاتووتربووم بۆچوونە خانەی ژیان، منیان سێ ساڵ لەو ئامادەییە بەخۆڕایی ڕاگرت. ئەو قوتابییانەی کە باوکیان لە کاهینەکان و دەسەڵاتداران بوون دوای چەند هەفتەیەک دەنێردران بۆ خانەی ژیان و کاهینەکان دەیانوت (ئاموون) ئەمری کردووە کە بیانگوازینەوە بۆ خانەی ژیان . ئەگەرچی کاتەکانمان بە خواپەرستی و فێربوونی گێڕاوەی



ئاییني دەبردەسەر، بەڵام هەندێ کاتمان دەما کە تیایدا کاهینەکان کتێبی (مردووەکان) یان پێ دەنووسینەوەو لە حەوشەی پەرستگاکە دەیانفرۆشت. پاش بەسەرچوونی سێ ساڵ لەتەمەنم و کۆتایی خولەکە بەو قوتابییانەی کەلە گەورەکان نەبوون (منیش لەوان بووم) راگەیەندرا کە خۆیان بۆ خانەی ژیان ئامادە بکەن.

دەبوایە پێش رۆیشتن بۆ ماوەی هەفتەیەک لە پەرستگا بەرۆژوو بووینایە و لەوێ دەرنەچووینایە. لەشەوی کۆتاییدا دەبوایە خوا (ئاموون) خۆی نیشانی ئێمە بدایە و لەگەڵماندا بدوایە و ئەگەر بمانبینیایە و لەگەڵی قسەمان بکردایە ئەوسا شیاوی وەرگیران بووین لە خانەی ژیان وەکو باسم کرد دوای ئەو هەموو مێشک شۆرینەوەو پڕ کردنەوەیە لەبارەی (ئاموون)، ستەم بوو کە یەکێک بڵێ نەمبینیوە و قسەم لەگەڵ نەکردووە.

لە نێوان قوتابییاندا من لە هەموویان چاو کراوەتربووم، چونکە لەگەڵ باوکمدا دەچووینە دیار سەری زۆر نەخۆش و مردنییانم بەچاو دەدی و لە منداڵییەوە تا تەمەنی شانزدە ساڵی زیاتر لە پەنجا نەخۆشم بینی کەلە پێش چاومدا گیانیان دەرچوو.

من هەر چەند منداڵ بووم هەر لەو کاتەدا هەستم بەوەکرد کە هیچ شتێ وەکو مردن مرۆڤ ئاگاداری هەندێ قسەی پڕوپووچی کاهینەکان ناکاتەوە، چونکە بەچاو دەبینرێ کە مردنی مرۆڤ جیاوازی نییە لەگەڵ مردنی گیانەوەرانی تر و تێدەگات کە ئەگەر کاهینەکان وەکو خۆیان دەڵێن نوێنەر و هەڵبژێردراوی (ئاموون) ن لەسەر زەوی، بۆچی جڵەوی مردن ناگرن و هەر نەبێ وا بکەن خۆیان نەمرن.

مرۆڤ کاتێ مردن دەبینێ، ئینجا تێدەگات کە ئەو بیروباوەڕانە پڕوپووچن و بگرە بەبێ مانا دەڕوانێتە هەمووشتێ. قوتابییەکانی تر وەکو من چەندەها جار مردنیان نەدیبوو، بۆیە نەیاندەتوانی وەک من بیر لە گێڕانەوەی کاهینەکان

بکەنەوە. دوای تەواوبوونی ڕۆژی حەوتەم کەلە پەرستگاکە بەرۆژوو بووین، سەریان تاشیین و ئێمەیان لە حەوزی گەورەی پەرستگاکەدا شۆری و جلکێکی تایبەتی خانەی ژیانیان لەبەرکردین.

کاتی خۆرئاوابوون کە (ئاموون) لە پشت گردەکانی ڕۆژئاوا بزر بوو ( لێرەدا مەبەست لە ئاموون خۆرە کە خوای گەورەی میسرییەکان بووە - وەرگێڕ ) پاسەوانەکان فوویان کردە کەرەناکانیان و دەرگای پەرستگاکە داخراو لەو کاتەدا یەکێ لە کاهینەکان کە ئەوەندەی خواردبووەوە بەلادا دەهات، بانگی کردین و ئێمە بەدوای کەوتین و لە داڵانێکی (ڕێڕەو) درێژ تێپەڕ بووین و دەرگایەکی بۆ کردینەوە و چووینە ژوورێکی گەورەوە کە فەرشێکی تێدا ڕاخرابوو و، بینیم هۆدەکە تاریک بوو، بەڵام لە ناوەڕاست هۆدەکە پەردەیەک هەڵواسرابوو کە کەمێ تیشکی ڕووناکی لە پشتییەوە دەهاتە ئەم دیو. من تا ئەو کاتە نەچووبوومە ئەو ژوورەوە، بەڵام زانیم کە ژووری ئاموونە.

کاهینەکە پەردەکەی لابرد و لەوکاتەدا من بۆ یەکەمین جار چاوم بە خوا (ئاموون) کەوت کە وەک مرۆڤ وابوو و چونکە گەنج بووم و باوەڕم بە خوا (ئاموون) هەبوو لەشم لەرزی.

ئاموون کراسێکی لەبەردابوو و ئەو هەموو چرایە لە دەوری ئاموون داندرابوون و زێڕ و بەردە گرانبەهاکان لەسەر سەر و ملی ئەدرەوشاندەوە.

کاهینەکە وتی: ئێوە دەبێ ئەمشەو تا بەیانی بەخەبەربن و خواپەرستی بکەن، بەڵکو خوا (ئاموون) قسەتان لەگەڵ بکات و، ئەگەر لەگەڵتان دوا نیشانەی ئەوەیەکە ئێوە بەشیاو دەزانێ بۆ چوونە ناو قوتابخانەی خانەی ژیان و ئەگەر ئەم شەرەفەتان پێ بەخشرا ئەوا سبەینێ بەیەکەوە (ئاموون) دەشۆین و جلەکانی دەگۆڕین و ئەوسا دەچینە خانەی ژیان.

دواجار پەردەکەی بەڕووی ئاموون-دا دادایەوە و بەبێ ئەوەی دەست بخاتە سەر ئەژنۆی و سەردانەوێنێ لە ژوورەکە چووە دەرەوە و دەرگای داخست.



هەر ئەوەندە کاهینەکە چووە دەرەوە ئیتر ئەو قوتابییانەی کە لە من گەورەتر بوون، دەستیان کرد بە پێکەنین و قسەکردن و گۆشت و نانیان لە گیرفانیان دەرهێنا و کەوتنە خواردنی.

یەکێکیان چووە دەرەوە و، قوتابییەکان وتیان دەچێتە ژووری کاهین کە لەوێ نان بخوات و هەر لەوێش دەنوێت، چونکە ناتوانێ لەسەر بەرد بخەوێت.

بەڵام من بەرۆژووبووم و ئامادەنەبووم کە لە خواردنەکەی ئەوان بخۆم و، نان خواردنم لە کاتێکداکە ئاموون لەو دیو پەردەکەوە بوو بە کوفر دەزانی.

گەنجەکانی تر دوای گۆشت خواردن ، بە ئێسکەکان یارییان دەکرد و پاشان هەریەکەیان لەسەر بەردە سافەکانی ژوورەکەدا ڕاکشان و خەوتن، بەڵام من نەمدەتوانی بنووم و بەردەوام لە بیرکردنەوەی ئاموون-دا بووم و نزا ئاییینییەکانم دەخوێند و هەستم ڕاگرتبوو کەلە چ کاتێکدا گوێم لە دەنگی ئاموون دەبێت.

تا ئەو کاتەی سپێدەی بەیانی دەرکەوت من گوێ بیستی هیچ دەنگێک نەبووم و نزیکی خۆرهەڵاتن بە شێوەیەکی نادیار هەستم کرد کە پەردەکەی پێش ئاموون کەمێ جووڵایەوە.

بەرەبەیان پاسەوانەکانی پەرستگاکە نەفیریان لێداو دەرگاکانی پەرستگا کرانەوە و خەڵکی هاتنە ژوورەوە و گوێم لە دەنگە دەنگیان بوو کە وەک دەنگی شەپۆلەکانی دەریا وابوو کەلە دەرەوە ئەبیسترێ.

کاتێ هەتاو هەڵهات کاهینەکە لەگەڵ ئەو کوڕەی کە شەو چووە دەرێ لە جێگایەکی ئیسراحەت پشوو بدات و بخەوێ، هاتنە ژوورەکەوە و لەسەرو چاوی هەردووکیان هەستم کرد کە خواردوویانەتەوە. پاشان ڕووی کردە ئێمە و وتی: ئەی ئەو کەسانەی کە ئارەزوو دەکەن بچنە خانەی ژیان، ئایا شەو بەخەبەر بوون و خواپەرستیتان کرد؟

هەموو بەیەک دەنگ گوتمان بەڵێ کاهینەکە گوتی: ئایا (ئاموون) لەگەڵتان دواو دەنگی ئەوتان بیست؟ پاش کەمێک بێ دەنگی یەکێ لە قوتابییان کە

ناوی (مووسا) بوو وتی: بەڵێ، قسەی لەگەڵ کردین ... قوتابییانی تریش ئەم وتەیەیان دووبارە کردەوە ، بەڵام من هیچم نەوت، چونکە ئاموون قسەی لەگەڵم نەکردبوو و سەرم سوڕمابوو کە چۆن ئەوان دەیانوێرا ئەو درۆیانە بکەن.

ئەو کوڕەی کە شەو چووبووە هۆدەی کاهینەکە و لەوێ نووستبوو بەبێ شەرمییەکی سەرسوڕهێنەرەوە وتی: (ئاموون) هاتە لای منیش و چەند نهێنییەکی پێ وتم، بەڵام جەختی کرد کە لای کەس نەیدرکێنم و من بە بیستنی ئەو دەنگە هێمن و بەسۆزەی زۆر کەیف خۆش بووم.

مووسا وتی: کاتێ کە ئاموونم بینی دەستێکی بەسەرما هێناو وتی ئەی مووسا من فەڕ و پیرۆزی دەڕژێنم بەسەرخۆت و خێزانەکەتدا و تۆ لە داهاتوودا دەبیتە یەکێ لە پزیشکە بەناوبانگەکانی میسر.

لە دوای مووسا هەریەکە لە قوتابییان کورتە چیرۆکێکیان رێکخست، سەبارەت بە بینینی ئاموون و قسەکردن لەگەڵیدا، تا سەرە گەیشتە سەرمن و کاهینەکە لێی پرسیم: سینۆهە ئایا تۆ ئاموونت بینی و گفتوگۆت لەگەڵدا کرد؟

وتم: نا... من نە بینیم و نە گوێم لە دەنگی بوو و، تەنها بەرەبەیان هەستم کرد پەردەکەی کەمێ دەجووڵێتەوە.

کاهینەکە بەگرژی سەیرێکی کردم و بێ دەنگی دایگرتین. یەکێک لە گەنجەکان کەلە سەرەتای هاتنە قوتابخانەوە ببووە هاوڕێم دەستی کاهینەکەی گرت و بردییە پەنایەک و بە هێواشی قسەی لەگەڵیدا کرد و کاتێ گەڕانەوە لام، کاهینەکە بە رقەوە وتی: سینۆهە چونکە بێگومانم لە باوەڕی پاکی تۆ، وەرە لەوانەیە ئاموون قسەت لەگەڵدا بکات.

ئینجا بە ئیشارەتی ئەو کوڕە پەردەکەی لابرد و منی بردە بەرامبەر بتەکەی (ئاموون) و ناچاری کردم کە سەرم بخەمە سەرزەوی و هەر بەو حاڵە بەجێی هێشتم.

لە ناکاو بانگێک لە ژوورەکەدا دەنگی دایەوە و پێی وتم: سینۆهە...



سینۆهە... من دوێنێ شەو ویستم ئاخاوتنت لەگەڵدا بکەم، بەڵام تۆی تەمبەڵ خەوت لێکەوتبوو.

من سەرم هەڵبڕی و، وا تێگەیشتم کە دەنگەکە لەدەمی ئاموونەوە دێتە دەرێ و دواجار هەر ئەو دەنگە وتی: سینۆهە... من ئاموونم و لەسزای کەم تەرخەمییەکەی دوێنێ شەوت ویستم دەرخواردی خوای (تایبەت بە) قووت دانت بدەم، بەڵام چونکە دەزانم بیرو باوەڕت بە من پتەوە ئەمجارە لێت خۆش بووم و...

من ئیتر تێنەگەیشتم کە لەوە بەدواوە چی تری وت، چونکە زانیم کە ئەو دەنگەی من بە ئاموونم زانی بوو دەنگی کەس نەبوو جگە لە دەنگی کاهینەکە و لەم لێکدانەوانەدا تووڕەیی و نەفرەت و سەرسوڕمانێکی زۆر دایگرتم.

لە دواییدا کاهینەکە هات و منی لە زەوی بەرزکردەوە و وتی: وەرە لە شۆرین و جلک گۆڕینی ئاموون بەشداری بکە.

من بە تەواوی نایەتەوە یادم کە چۆن خەریکی شوشتن و جل و بەرگ گۆڕینی ئاموون بووین، چونکە فکرم پەرێشان بوو و وام هەست دەکرد پیاکێشانێکی بەهێزم بەرکەوتووە و کەلێنێک کەوتۆتە باوەڕمەوە کە بە هیچ شتێ پڕ نابێتەوە.

ئەو رۆژە رۆنی پیرۆزیان لەسەری من و ئەوانی تر داو (پاپیروس)ێکیان داپێم کە بڕیاری وەرگرتنم بوو لە خانەی ژیان.

کاتێ مەراسیمی ئەو رۆژەی وەرگیرانمان لە خانەی ژیان تەواو بوو، لە پەرستگا هاتمە دەرەوە کە بەرەو ماڵ بڕۆمەوەو لە بێزاری و کارتێکردنی ئەو رۆژەدا دڵم بەیەکدا دەهات .

***

١ - ئەو قوتابخانانە رۆڵی کۆلێژەکانی ئێستایان دەبینی و لە وەرگێڕانە فارسییەکە هەر بە قوتابخانە ناوبراوە - وەرگێڕی کوردی

# خوێندن لە خانەی ژیان

مامۆستاکانی خانەی ژیان، ئەو پزیشکانەبوون کە تایبەت بوون بە دەرباری فیرعەون و کەمتر دەهاتنە قوتابخانەکە، لەبەر ئەوەی سەرقاڵی چارەسەری ئەو دەوڵەمەندانەبوون کە دەهاتنە لایان و زۆربەی کاتەکان بە بینینی ئەوان خەریک دەبوون، بۆیە نەدەپەرژان لەوێ، وانەی پزیشکی بڵێنەوە.

هەندێ جار پزیشکە ئاساییەکان چارەسەری هەندێ لە نەخۆشییەکانیان پێ نەدەکرا، بۆیە داوایان لەو نۆژدارە تایبەتی و پسپۆرانە دەکرد کە بێنە خانەی ژیان و ئەو نەخۆشانە ببینن و بەم شێوەیە تەنانەت کەم دەرامەتترین نەخۆشەکان جارجار لەلایەن پزیشکە تایبەتییەکانی کۆشکەوە چارەسەر دەکران.

هەرچەندە لە تەبەس هەژارترینی خەڵک دەیانتوانی بێنە خانەی ژیانەوە و لەوێ چارەسەر بکرێن، بەڵام من قەت حەزم نەدەکرد لە جیاتی ئەوان بوومایە و بەخۆڕایی چارەسەربکرامایە، چونکە پزیشکە گەنجەکان و قوتابییانی ئەوێ هەموو جۆرە دەرمانێکی نوێیان لەسەر ئەم بیمارانە تاقی دەکردەوە، بۆ ئەوەی کاریگەرێتی ئەو دەرمانانە بزانن، هەروەها ئەگەر بیانویستایە برینێ نەشتەرگەری بکەن یان کاسەی سەری یەکێک کون بکەن یان سکی نەخۆشێکیان هەڵدڕیبایە بەبێ بەنج ئەم کارەیان دەکرد. ئەو دەرمانانەی بۆ نەهێشتنی ئازار و بەنج بەکار دەهات گران بوون و هەموو کەسێ توانای کڕینی نەبوو و زۆربەی کات لە خانەی ژیاندا ئەو دەرمانانەیان بۆ نەخۆشەکان بەکارنەدەهێنا، بۆیە جاری وابوو کە دەهاتییە ئەو نەخۆشخانەیە گوێت لە هاوار و ناڵەی ئەو بریندارانە دەبوو کە نەشتەرگەری دەکران و هاواریان دەروونی



مرۆڤیان دەهەژاند.

خولی فێربوون لە خانەی ژیان درێژخایەن بوو، چونکە قوتابی جگەلەوەی دەبووایە فێری زانستی پزیشکی و هونەری قڵێشاندنی سەر و هەڵدڕینی سک و چارەسەری سی و جگەر و گورچیلە و میزڵدان و نەخۆشی ژنان و نەخۆشییەکانی زگ و زابووایە، دەبووایە کارتێکردنی هەموو جۆرە دەرمانێکی بزانیبایە و بزانێ چۆن ئەو دەرمانانە لەگیایەکان دروست دەکرێن و کەی دەبووایە ئەو گیایەت هەڵبکەندایە و چۆن وشکیان بکەیتەوە. قوتابی لەوێ دەبوو جێگا و شوێنی ئەو گیایانە و وەرزی هەڵکەندنیانی بزانیایە و بەیەکەم بینین گیایەکە و وشکەوەبووەکەی بناسێتەوە.

بۆ نموونە سی جۆرە ڕەگی گیای پزیشکییان تێکەڵ دەکرد و لەبەردەم قوتابی دایان دەناو دەیانوت ئەم ڕەگە گیایانە لێک جیابکەرەوە و من دڵنیاتان دەکەمەوە کە جاری واهەبوو، پزیشکە تایبەتییەکانیش لەو لێک جیاکردنەوەیەدا هەڵەیان دەکرد، چونکە ڕەگی زۆر لەو گیایانە وەکویەک بوو و بە ئاسانی لێک جیانەدەکرانەوە. لەم کاتانەدا تەنها ڕێگەیەکی لێک جیاکردنەوە ئەوەبوو کە پزیشکەکە گیایەکەی بە ددان بجوویایەو بەتام بیزانیبایە کە چ جۆرە گیایەکە.

هەندێ لە پزیشکە بەساڵاچووەکان کە ددانیان نەبوو ناچاربوون ڕەگەکەیان بکوتایە و ئینجا بیکەنە دەمیانەوە و بە تامەکەی بیانزانیایە چ گیایەکە.

لە خانەی ژیان قورسترین بابەت ئەوەبوو کە ئێمە بتوانین بە پەنجەکان و چاوەکانمان هۆی نەخۆشییەکە بزانین و شوێنە بەئازارەکە لە لەشی نەخۆشەکەدا دەستنیشان بکەین و هەروەها ئەو ئازارە نیشانەی چ نەخۆشییەکە.

من لەم باوەڕەدام کە پزیشکی ڕاستەقینە ئەو کەسەیە کە سەیری دەم و چاوی نەخۆشەکەی کرد و چاوی بڕییە ناوچاوی هەست بە نەخۆشییەکەی بکات و کاتێ کە پەنجەکانی بەسەرلەشیدا دێنێ هەست بە ئازارەکە بکات. هەر لە بەرئەوەش بوو کە ئەو قوتابییانەی لە خانەی ژیان بوون جگەلە چەند کەسێکیان ئەوانی تر

هەر بەناو پزیشک بوون و تەنانەت ئەگەر ببوونایە بە پزیشکی فیرعەونیش هەر توانای ناسینی نەخۆشییەکانیان نەدەبوو.

لە خانەی ژیان دوو جۆرە نەخۆشی دەخوێنراو لێکوڵینەوەی لەسەر دەکرا کە یەکێکیان نەخۆشییەکانی لەش کە بەهۆی خواردنی چێشتی کوڵاو و بە ساڵاچوون تووش دەبوون و دووەمیان ئەو نەخۆشییانەی کە بەهۆی رووحەوە تووش دەبوون، چونکە رووح دەبووە هۆی نەخۆشی و بۆ ئەوەی نەخۆشی دروست بکات ئەم ئەرکەی بە رووحە بچووکەکان دەسپاردو ئەو رووحانە ئەوەندە وردن کە سەد هەزار دانەیان لەسەر نینۆکێکی دەست جێیان دەبێتەوەو هەریەکە لەو رووحانە بەتەنها دەتوانێ ببێتە هۆی نەخۆشییەک.

ئێمە دەبووایە بزانین چۆن بە دەرمانە هێورکەرەوەکان ئێش و ئازاری نەخۆشەکە کەم بکەینەوە، بۆئەوەی لە کاتی نەشتەرگەری هەست بەئازار نەکات. هەروەها دەبوو بمانزانیایە کە چۆن ئازاری نەخۆشەکە زیاد بکەین، چونکە هەندێ نەخۆشی هەتا ئازارەکەت زیاد نەکردایە چارەسەر نەدەکرا. یەکێکی تر لە بەشەکانی خوێندن ئەوەبوو کە چۆن بەتووش کردنی نەخۆشییەک ، نەخۆشییەکەی تر لە ناوببەین بە شێوەیەک کە نەخۆشییەکی ترسناکمان بە تووش کردنی نەخۆشییەکی بێ مەترسی چارەسەر دەکرد و دواجار بەئاسانی نەخۆشییە دروست کراوەکەمان دەرمان دەکرد.

ئێمە دەبووایە دەربڕینەکانی نەخۆشمان لێک جیابکردایەتەوە کە کامیان راستەقینەیە و کامیان لە ئەنجامی بیرکردنەوە و خەیاڵاتدا بەسەر دەمیدا دێت . لەبەر ئەوەی نەخۆش وەک بوونەوەرێک کە گرفتاری گیانە ئازار گەیەنەرەکان بووبێ تووشی خەیاڵات و واهیمەی ترسناک دەبێت و ئەو دەردە خەیاڵییانە لەلاشەیدا دروست دەبێت و لەگەڵ دەردە راستەقینەکاندا تێکەڵ دەبێت و بەوشێوەیە دەربڕینەکانی نەخۆش پزیشکەکە دووچاری هەڵەدەکات و بەبێ ئاگایی چارەسەری بۆ دادەنێت و لە ئەنجامدا نەخۆشەکە گیانی لەدەست دەدات.



کاتێ کەلە خانەی ژیان بووم هەستم بەو راستییە کرد کە زانایی و لێهاتوویی لە پێگەیاندنی پزیشکدا زۆر گرینگە و بۆم دەرکەوت کە ئەو لێهاتوویی و کارامەییە تەنانەت لە خودی خوێندنەکەش بەبایەخترە لە پەروەردەکردنی پزیشک و ئەگەر قوتابی ئەو زانایی و شیاوییەی نەبێ، ئەگەرچی لەو خوێندنگە گەورەیەشدا بخوێنێ ناتوانێ ببێتە پزیشکێکی راستەقینە.

ئەوەی بیەوێ ببێتە خانەی ژیانەوە دەبێ عاشقی پزیشکی بێت و ئامادەبێت لە پێناویدا هەموو شتێکی خۆی بەخت بکات و بە پلەی یەکەم پشوودان و حەسانەوە لە خۆی ببڕێ.

هەروەها هەستم بەوە کرد کە باوەڕی نەخۆشەکە بە پزیشکەکەی خۆی لەڕووی چارەسەرەوە زۆر گرنگە و نەخۆشەکە دەبێ ئیمانی بەوە هەبێ کە ئەو پزیشکەی چارەسەری دەکات زۆر زیرەک و بلیمەتە و لە کارەکەیدا هەڵە ناکات. لەبەر ئەوە پزیشک نابێ هەڵەبکات، چونکە ئەگەر کردی نەخۆشەکان ئەو متمانەیەیان پێی نامێنێ و هەر دەرمانێکیان بۆ ببڕێتەوە کاریگەرێتی نابێ.

من بە تێپەڕینی ئەو ماوەیەی خوێندنم لەم رستەیەی کە دەیانوت (پزیشکەکان هەموویان بەهاودەستی یەکتری، نەخۆشەکانیان دەنێژن) تێگەیشتم، چونکە کاتێ چەند پزیشکێ دەچنە دیارسەری نەخۆشی لە ماڵە دەوڵەمەندەکان، پزیشکی دووەم و سێیەم کە هەڵەی پزیشکی یەکەم دەبینن نایدرکێنن، بۆ ئەوەی کار لە باوەڕی خەڵکی نەکات. ئەوانەی داوایان لێ دەکرا بێن بۆ چارەسەری نەخۆشە دەوڵەمەندەکان پزیشکانی تایبەتی کۆشک بوون و ئەگەر خەڵکی بیانزانیبایە هەڵەیەکیان کردووە ئیتر باوەڕیان بەهیچ پزیشکێ نەدەما. بە تێکڕایی نابێ خەڵکی هەرگیز هەست بەهەڵەی پزیشک بکەن، چونکە ئەگەر هەستی پێ بکەن واتێ دەگەن کە هەموو پزیشکێ لەوەیە هەڵەبکات.

ئەمەیە کە هەر پزیشکێ بە وریاییەوە کاردەکات کە بێ دەنگ بێ لە هەڵەی

ئەوەی تر، بۆ ئەوەی هەر نەبێ پارێزگاری لە متمانەی خۆی بکات و هەر لەبەر ئەوەشە ئەو قسەیەیان بەسەردا دابڕاوە کە بەیەکەوە نەخۆشەکان دەنێژن.

ئەگەرچی لە خانەی ژیاندا خزمەتکار هەیە، بەڵام ئەوان ئیشیان نەدەکرد و هەموو کارەکانیان بە قوتابییە تازە وەرگیراوەکان دەکرد. ئەو گەنجەی کە بۆ خوێندن دەهاتە ئەوێ لە کەمترین کارەکەرەکان سووکتر بوو و خراپترین و پیس و پۆخڵترین کارەکانیان بەو دەکرد. تەنها کوڕی خانەدانەکان و دەوڵەمەندەکان بەبۆنەی دەوڵەمەندییەکەیان کاریان نەدەکردو، تەنانەت کارەکانی خۆشیان بە کوڕە کەم دەرامەت و فەقیرەکان دەسپارد، بۆیە قوتابیی هەژار لەوێ هەم خزمەتکاری خوێندنگەبوو، هەم خزمەتکاری کوڕە دەوڵەمەندەکان.

پێش ئەوەی توێژینەوەی پزیشکی دەست پێ بکات، دەبووایە قوتابییان لە هونەری پاک و خاوێنی ئاگاداربوونایە و ئەم گرنگییە بچووایەتە مێشکیانەوە کە هەرگیز لە هیچ کاتێکدا کێردێکی بەردین یان ئاسنین بەکار نەهێنن تا لە ئاگردا داخی نەکەن و، هیچ کاتێ پەڕۆییێک بەکارنەهێنن هەتا لەناو (شۆرە)[1] و ئاودا نەیکوڵێنن و هەموو کەرەستە دارییەکان کە نەدەکرا بخرێنەناو ئاگرەوە دەبووایە بۆ هەموو بەکارهێنانێ لە ئاودا بیکوڵێنن.

ئەم بابەتەی داخ کردنی کێردە بەردین و ئاسنییەکان و کوڵاندنی پەڕۆ لە ناو ئاو و شۆرەدا، ئەوەندە هەستمی پەرێشان کردبوو کە شەوان لەترسا لەخەو ڕادەپەڕیم و وام دەزانی کێردێکم بەبێ داخ کردن بەکارهێناوە. ئەم بابەتە لەهەموو پەرتووکە پزیشکییەکاندا باسی لێوە کراوە و لەوە زیاتر لێی نادوێم و ئاساییە هەرکەسێ کتێبی لەم بابەتانە بخوێنێتەوە دەتوانێ هەست بەمانە بکات، بەڵکو باس لە هەندێ شت دەکەم کە لەهیچ کتێبێک نەنووسراوە و لە داهاتووشدا باوەڕ ناکەم بنووسرێ.

لەخانەی ژیان جلێکی تایبەتی هەبوو و کە دەچووینە ژوورەوە ئەو جلکەمان لەبەردەکرد کە ئەویش وەک هەموو شتەکانی کە لەوێدا بەکاردەهێنران لە ئاو و



شۆرەدا گەرم کرابوو. هەموو قوتابییەکانی ئەوێ یەک جۆرە کراسیان لەبەردا بوو، بەڵام ملوانکەکانیان جیاواز بوو و قوتابی هەرچەندە لە ئاستەکانی خوێندنیدا بەرەوپێشتر دەچوو ملوانکەیەکی تریشی بە ملەوە زیاد دەکرد.

من وام لێ هاتبوو کە دەمتوانی ددانی زەلامێکی بەهێز دەربهێنم و دوومەڵ بکەمەوە و کێم و جەراحەتەکەی دەرکەم و ئێسکی شکاوم وەها دەهێنایەوە یەک کە بەزوویی لحێم دەبووەوە و لەگەڵ ئێسکی ساغدا فەرقی پێ نەدەکرا.

هەروەها بەشێوەیەکی باش لاشەکانم مۆمیایی دەکرد و مۆمیایی کردنی ئەو تەرمانە لەلای ئێمە کارێکی پزیشکی نەبوو، بەڵکو خەڵکی ئاسایی کە خوێندەواریشی نەبوو دەیتوانی لەژێر چاودێریی پزیشکدا لاشەیەک مومیایی بکەن.

من لە هیچ کارێکی سەخت ڕووم هەڵنەدەسووڕاند، چونکە حەزم بە پیشەکەم بوو و لەسەرداوای خۆم کاتی نەشتەرگەری و تیمارکردنی ئەو نەخۆشانەی کە چارەسەرنەدەکران پیسترینی ئەو کارانەم دەکرد بۆ ئەوەی بزانم کە پزیشکە تایبەتییەکان چۆن چارەسەری ئەو نەخۆشانەیان دەکرد کە چارەسەریان زۆر زەحمەت بوو، هەرچەند لە دە نەخۆش نۆیان دەمردن.

پزیشکە تایبەتییەکان بۆ چارەسەری ئەو جۆرە نەخۆشانە بەشێوەیەک نەشتەرگەرییان دەکرد کە تیمساحیش بەو دڕندەییە چارەسەر نەدەکرا و من باش تێگەیشتم کە خەڵکی بەخۆڕایی لەمردن دەترسن، چونکە خودی مردن ترسی نییە و بگرە بۆ هەندێ کەس خەڵاتێکی خواییە و وەک شەرەفی بینینی خوا (ئاموون)ە.

ئەو نەخۆشانەی چارەسەر نەدەکران تا ئەو ڕۆژەی زیندوو بوون لە ئازاردا ئەتلانەوە، بەڵام کاتێ کە دەمردن لە دەم و چاویاندا حەسانەوە و ئارامی بەدی دەکرا بەشێوەیەک کە هەرکەس بیانی ببینیایە ئەیزانی کە ئیتر ئاسوودە بوونە.

لەو کاتەی خەریکی فێربوونی هونەرەکانی پزیشکی بووم و لەژێردەست

پزیشکە تایبەتییەکاندا نەخۆشەکانم چارەسەر دەکرد لەناکاو هەستم بە شتێکی زۆر گرنگ کرد وەک ئەو هەستەی ڕابردوو کە لە قوتابخانە بەرەنگارم بووەوە و لە رووحمدا پرسیاری (بۆ چی؟) دروست بوو. من تا ئەو کاتە بیرم لە (بۆ چی؟) نەکردبووە و لەو کاتەدا تێگەیشتم کە (بۆچی؟) کلیلی هەموو نهێنییەکانە و ئەگەر کەسێ بتوانێ بەخۆی بڵێ (بۆ چی؟) و جوابی بۆچییەکەشی بەدڵنیایی بداتەوە هەموو نهێنییەکان و نەزانراوەکانی لەلا ئاشکرا دەبێت.

ئەو هۆیەی وای لێ کردم هەست بە بوونی (بۆ چی؟) بکەم دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی:

ڕۆژێک ئافرەتێ چل ساڵان کە تائەو تەمەنە منداڵی نەبوو بوو هاتە خانەی ژیان و بە پەرۆشەوە وتی عادەی مانگانەکەم وەستاوە و ئێستا کە گەیشتوومەتە تەمەنی چل ساڵان ئیتر بەیەکجاری منداڵم نابێت و، پرسیاری دەکرد ئایا عادە نەبوونەکەی هی بەساڵاچوونەکەیەتی یان رووحێکی ئازارگەیەنەر چووەتە لەشیەوە.

من پێم وت: بە پێی ئەوەی لە کتێبەکەدا هاتووە تاقی دەکەمەوە بۆ ئەوەی بزانم ئەو عادەنەبوونە هۆیەکەی دووگیانییە، یان نا. بەڵام دەبێ هەموو رۆژێ بێیت بۆ ئێرە و نموونەی میزەکەت بهێنی.

ئافرەتەکە پرسیی: ئێوە میزی منتان بۆچییە؟

من وتم: بەو میزە تاقی کردنەوە لەسەر چاندنی گەنم دەکەین.

دوایی بەو شێوەیەی کە لە کتێبدا نووسرابوو دوو دەفری بچووک لەگەنم لە دوو جێگا لەبەر هەتاودا چاند و ڕۆژانە یەکێکیان ئاوی ئاسابیم پێدا دەکرد و ئەویتریان میزی ئافرەتەکە و بە وریاییەوە نیشانەم کردبوو کە ئەو دوو کێڵگەیەم لێ تێک نەچێ، پاش ئەوەی چەند ڕۆژێ ئەم کارەم دووبارە کردەوە گەنمی ئەو کێڵگەیەی بە میزی ژنەکە ئاودێری کرابوو قەدی گەنمەکەی بەهێز بوو و گەنمی



کێڵگەکەی تر لاواز بوو و من بەژنەکەم وت دەبێ خۆشحاڵ بی لەبەر ئەوەی عادەنەبوونەکەت پەیوەندیی بە بەساڵاچوونەوە نییەو (ئاموون) سکی پێ بەخشیوی و تۆ ئێستا دووگیانی. ژنەکە لەخۆشی ئەم مزگێنییە هاتە گریان و حەڵقەیەکی زیوی داپێم کە کێشەکەی دوو (دنیە)[٢] دەبوو.

ئەو داماوە ئومێدی منداڵ بوونی نەمابوو و وای دەزانی هەرگیز منداڵی نابێت. دوایی لێی پرسیم: منداڵەکەم کچ دەبێ یان کوڕ؟

منیش چونکە دەمزانی دایکان حەز لە کوڕ دەکەن، وتم: منداڵەکەت کوڕە..

بەڵام ئەمەی دواییم هەر لە خۆمەوە وت و لە کتێبدا لەم بارەیەوە هیچ شتێ نەنووسراوە و من وام بیردەکردەوە کاتێ کە ژنێ دووگیان بێت شانسی کچ و کوڕ بوونی وەک یەکە.

لە دوای ئەوە کە ژنەکە بەشادمانییەوە لە خانەی ژیان چووە دەرەوە لە ناکاودا بیرم کردەوە کە (بۆچی؟) دەنکە گەنمێ توانای زانینی شتێکی هەبێ کە پزیشکی نەتوانێ ڕێی پێ ببات و بیزانێ؟

هیچ پزیشکێ ناتوانێ لە مانگی یەکەم و دووەمی دووگیانی ئافرەت و پێش هەڵاوسانی سکی بزانێ کە باردارە. مەگەر ئافرەت خۆی بەبۆنەی ڕاوەستانی عادەی مانگانەی بزانێ و ، مەرج نییە هەموو ئافرەتێ وەک ئەو ژنە هەست بەم شتانە بکات.

جا لەو ڕۆژەدا بۆ یەکەم جار واتای (بۆ چی؟) لە بیرمدا گیرسایەوە و چوومە لای یەکێ لە مامۆستاکان و لێم پرسی: بۆچی دەنکە گەنمێ ئەتوانێ بزانێ کە ژنێک دووگیانە یان نا، بەڵام ئێمە ناتوانین بزانین؟

مامۆستاکە بە سەرسوڕمانەوە سەیرێکی کردم و وتی: لەبەر ئەوەی کە ئەم بابەتە لە کتێبدا وەها نووسراوە.

بەڵام ئەم وەڵامە ڕازیی نەکردم و چوومە لای مامۆستایەکی تر کە منداڵانی کوشک بە دەستی ئەو لەدایک دەبوون و لێم پرسی: بۆچی مشتێ گەنم کەلە

زەویدا چێندراوە پێمان دەڵێ ژنێ دوو گیانە یان نا؟

ئەویش وتی: لەبەر ئەوەی ئاموون کە خوای هەموو خوایەکانە، وەهای داناوە کە ئەگەر گەنم بەمیزی ژنی دووگیان ئاو بدرێت باشتر گەشە دەکات.

کاتێ کە ئەم وەڵامەی دامەوە تێگەیشتم کە وەک لادێییەکی نەخوێندەوار سەیرم دەکات و بەم پرسیارە لەلای ئەو زۆر کەم بوومەتەوە، بەڵام وەڵامەکەی دڵنیای نەکردم و تێگەیشتم کە ئەویش وەک پزیشکەکانی تر هەر ناوەرۆکی کتێبەکانیان دەزانێ و لە هۆکارەکان و بۆچی بەکارهێنانی دەرمانەکان بێ ئاگابوو و هیچیان نەگەیشتبوونە ئەو ئاستەی لە خۆیان بپرسن بۆچی دەبێ کێردە بەردی و ئاسنییەکان پێش بەکارهێنانیان بەئاگر داخ بکرێن..؟

ڕۆژێکیان لە یەکێ لە پزیشکەکانی کۆشکم پرسی: بۆچی تاڵی هێلانەی جاڵجاڵۆکە و کەڕوو دەخرێتە سەر برین و چاک دەبێتەوە؟

لە وەڵامدا وتی: لەبەر ئەوەی کە لە کتێبدا وا نووسراوە و هەر واباوبووە.

لە کتێبەکەدا ڕوخسەت درابوو کە ئەوەی کێردی بەردی یان ئاسنی بەکاردێنێ دەتوانێ (١٨٢) نەشتەرگەری لەلەشی مرۆڤدا بکات و شێوەی هەر یەکە لە (١٨٢) نەشتەرگەرییەکەش لە کتێبەکەدا باس کرابوو و، کاتێ دەمپرسی بۆچی ناتوانرێ (١٨٣) نەشتەرگەریی پێ بکرێ؟ وەڵامیان دەدامەوە کە لە کتێبدا وا نووسراوە و هەروا باو بووە و دەبێ شوێن کەوتووی نووسینەکانی کتێب بین.

کەسانێ هەبوون کە لەڕو لاواز دەبوون و دەم و چاویان سپی هەڵدەگەڕا و پزیشکەکان نەیاندەتوانی نەخۆشییەکەیان بدۆزنەوە، بەڵام لە کتێبدا نووسرابوو کە ئەو کەسانەی بەبێ نەخۆشی لەڕ دەبن و ڕەنگیان سپی دەبێ، دەبێ جگەری ئاژەڵان بەکاڵی (بێ کوڵاندن) بخۆن و، کاتێ دەمپرسییەوە بۆچی ئەوانەی جگەری خاوی ئاژەڵان دەخۆن قەڵەو دەبن و سپێتی دەم و چاویان نامێنێ؟

دەیانوت: لەبەرئەوەی لە کتێبدا وا نووسراوە و ڕێ و ڕەسمی هەمیشەیی هەر وابووە...



من حاڵی بووم کە پرسیارەکانی من کاری کردۆتە سەر قوتابییان و مامۆستاکان و بە شێوەیەکی تر سەیرم دەکەن و وەک بڵێی گومانیان لە ژیری مندا هەبێ یان بە بێ عەقڵ و نەزانم تێ بگەن کە پرسیار لەو شتە ڕوون و ئاشکرایانە دەکەم.

ئێمە قەت لە خانەی ژیان نەدەچووینە دەرەوە، چونکە ئیش و کارەکانمان ئەوەندە زۆر بوون کە دەرفەتی چوونە دەرەوەمان نەبوو و، جگەلەوەش لە ساڵی یەکەم و دووەم چوونە دەرەوەی قوتابی قەدەغە بوو و پاسەوانەکان نەیاندەهێشت کەسمان بچینە دەرەوە ، بەڵام لەساڵی سێیەمەوە مەجالی قوتابییان دەدرا لە خانەی ژیان بچنە دەرەوە، بە مەرجێ کار لە خوێندنەکەیان نەکات.

ساڵی یەکەم و دووەم تەواوبوو و ساڵی سێیەم دەستی پێ کرد و لەم ساڵەدا بوو کە ئەو ژنە حەڵقە زیوەکەی داپێم و بۆ یەکەمین جار لە بیرمدا (بۆچی؟) گەڵاڵە بوو.

لە ساڵی سێیەمدا من لەڕووی دەرامەتەوە لەهەموو قوتابییان دەست کورتتر بووم و هەرلەبەر ئەمەش گواستنەوەی لاشەکانیان بەمن سپارد و کاتی نەشتەرگەری سەرێکیان دەکرد یان سکێکیان هەڵدەدڕی و ئەو کەسە دەمرد، دەبووایە لاشەکەیم لەخانەی ژیان دەربکردایە، بەڵام هیچ کەس جگە لەوانەی لەوێدا کاریان دەکرد نەیاندەزانی کەمن لاشەیەک دەبەمە دەرەوە، چونکە تەرمەکانم لە دەرگای دواوەوە دەردەکرد و دوای دەرکردنی هەر لاشەیەک لە حەوزی پشتەوەی خانەی ژیاندا کە بەردەوام ئاوی نیلی بەسەرەوە بوو خۆم دەشۆرد.

ڕۆژێکیان دوای دەرکردنی لاشەیەک لە حەوزەکە خۆم شۆری و جلەکانم لەبەرکردەوە و ویستم بگەڕێمەوە، لە ناکاو گوێم لە دەنگی ژنێک بوو کە وتی: کوڕە جوانەکە ناوت چییە؟

کە سەیرم کرد ئەو ژنەی لە ناوم دەپرسێ کراسێکی کەتانی لەبەردایە و

کراسەکەی ئەوەندە ناسک بوو کە سینگی دیاربوو دیاربووکە ژنێکی دەوڵەمەندیشە، چونکە زیاتر لە دە حەڵقەی زێڕ و زیوی لەدەستدا بوو و لێوی سوور بوو و چاوەکانی ڕەش بوو و لەپرچی سەری کە بە ڕۆن چەور کرابوو بۆنێکی خۆش دەهات. نازانم بۆچی منی کە لە خانەی ژیان ئەو هەموو ژنە نەخۆشەم بینیبوو کاتێک کە ئەو ژنەم بینی شەرم دایگرتم، کەچی شەرمم لەو ژنانە نەدەکرد کە کێردە بەردییەکانم بەسەر لەشیاندا دەهێنا.

ژنەکە نرەیەکی هاتێ و وتی: بۆ وەڵامم نادەیتەوە؟ ناوت چییە؟

وتم: ناوم (سینۆهە) یە...

وتی: ناوەکەت چەند خۆشە، تۆ بەم سەرە تاشراوەوە ئەوەندە جوان بی دەبێ بەقژەوە چەند جوانتر بی؟

وام هەست کرد بە بیستنی ئەم قسەیە لە شەرما سوور هەڵگەڕام، چونکە یەکەم جار بوو کە ژنێ بەو شێوەیە قسەی لەگەڵ دەکردم و بۆ ئەوەی تەریقیی خۆم بشارمەوە و قسەیەکم کردبێت وتم: ئایا تۆ نەخۆشی و بۆ چارەسەر هاتووی؟

ژنەکە بە پێکەنینەوە وتی: بەڵێ.. من نەخۆشم، بەڵام نەخۆشی ئاسایی نا، لەبەر ئەوەی کەسم نییە لەگەڵیدا ڕابوێرم، ئەمڕۆ هاتوومەتە ئێرە کەبزانم کام یەک لەگەنجەکانی ئێرە سەرنجی من ڕادەکێشێت. کاتێک کە ئەو ژنە ئەم قسەیەی کرد من ئەوەندە تەریق بوومەوە، کەترسام و ویستم بڕۆم و ئەو پرسی: (سینۆهە) بۆ کوێ دەڕۆی؟ وتم ئیشم هەیە و دەبێ بگەڕێمەوە. ژنەکە پرسییەوە (سینۆهە) تۆ خەڵکی کوێیت؟ وتم من خەڵکی ئێرەم. ژنەکە وتی درۆدەکەی چونکە ڕەنگی لەش و دەموچاوی تۆ سپییەو گوێچکەو لووت و دەستەکانت بچووک و جوانن و کاتێک کەمن تۆم لەدوورەوە بینی، وام زانی کە کچی و جلکی قوتابییەکانی خانەی ژیانت لەبەر کردووە.

کاتێک کە ئەم قسانەم بیست، نازانم بۆچی دڵم کەوتە لێدان و بارێکی نائاسایی و سەرسوڕهێنەرم لەخۆمدا هەست پێکرد و ئەو وتی (سینۆهە) ئایا تۆ



قەت لێوەکانت خستۆتە سەر لێوی ژنێکی گەنج و دەزانی چەندە لەزەتی هەیە. .
وتم نا... من هەرگیز لێوەکانم نەخستووەتە سەر لێوی ژنێکی گەنج. ... ژنەکە وتی ناوی من (نەفر)ە و لەبەر ئەوەی کەهەمووان پێم دەڵێن جوانی، بە (نەفر نەفر )[۳] بانگم دەکەن وەمن لەدوای هاتنم بۆ ئێرە جوانییەکەی تۆم پەسند کردووە و بانگهێشتت دەکەم کە بێیت بۆماڵی من بۆ ئەوەی بەیەکەوە بخۆینەوەو من فێرت دەکەم کە چۆن لەگەڵ ژنێکی گەنجدا رابوێریت.

هاتەوە یادم کەباوکم پێمی وتبوو ئەگەر ژنێک بەتۆی وت جوانی، دەبێ خۆتی لێ بپارێزی، چونکە لەسینەی ئەم جۆرە ژنانە ئاگرێک بڵێسە دەدات کە دەتسووتێنێ و وتم: (نەفر نەفر نەفر) (لە دووپات کردنەوەی ناوەکەشی چێژم وەردەگرت) لەسینەی تۆدا ئاگرێک هەیە کەمن دەسووتێنێ . ژنەکە پێکەنی و وتی کێ بەتۆی وتووە کە لەسینەی مندا ئاگرێک هەیە کەتۆ دەسووتێنێ. وتم باوکم ئەم قسەیەی کردووە. ژنەکە دەستی منی گرت و نای بەسینەی خۆیەوە واتە سەر کراسەکەی و وتی ئایا تۆ لێرەدا هەست بە بوونی ئاگردەکەیت و دەست دەسووتێ؟ وتم نا... ژنەکە کراسە کەتانەکەی بردەدواوەو دەستی خستە سەر سینەی خۆی و وتی لەوانەیە کراسەکەی من نەیهێشتبێ هەست بەو ئاگرە بکەیت و... دەستت لێرە دابنێ و بڕوانە ئایا ئاگر لەسینەی مندا هەیە یان نا؟ من نەتەنها هەستم بەئاگر نەکرد، بەڵکو هەستم کرد کاتێک کە دەستم خستەسەر سینگی، لەخۆمدا هەستم بە لەزەتێکی بێ هاوتاکردو ژنەکە کاتێک کە زانیی خۆڕاگریی منی تێک شکاندووە، وتی(سینۆهە) وەرە با بڕۆین بخوێنەوەو من وەکو کەنیزێ کە خۆی دەخاتە بەردەست خاوەنەکەیەوە، خۆم دەدەمە دەستتەوە. من کە لەپێشنیاری ژنەکە ترسا بووم، وتم (نەفر نەفر نەفر) چاوپۆشی لەمن بکە، چونکە من دەترسێم.

ژنەکە وتی لەچی دەترسێی؟ وتم لە تۆ دەترسێم و ناوێرم بێم بۆماڵت.

ئەو بە پێکەنینەوە وتی کوڕی فیرعەون لەئارەزووی مندایەو گەنجە

دەوڵەمەندەکان حەڵقەی زێڕم دەدەنێ کە ڕۆژێک یان شەوێک لەگەڵ مندا بەسەر ببەن و من داواکارییەکەیان ڕەت دەکەمەوەو لەبەر ئەوەی خوازیاری تۆم و تۆ جوانترین لاوی میسری و من هەرگیز پیاوێکم نەدیوە وەکو تۆ قۆز بێت.

وتم (نەفر نەفر نەفر) بەزەبیت پێمدا بێتەوە و رازی مەبە کە من خۆم وەکو پیاوەکانی تر لێ بکەم و پاکیی خۆم لەدەست بدەم. چونکە پیاوێک کەلەگەڵ ژنێکدا کە (ئاموون) بۆی دانەنابێت، بنوێت، پاکی خۆی لەدەست دەدات. ژنەکە بەپێکەنینەوە وتی (سینۆهە) تۆ زۆر سادەی و من پێم سەیرە کە ژنەکانی(تەبەس) چۆن هەتاوەکو ئێستا یەخەیان نەگرتووی. چونکە مەحاڵە کوڕێکی جوانی وەکو تۆ لەکۆڵانەکانی ئەم شارەدا پیاسە بکات و چەند کچێ شوێنی نەکەون، مەگەر ئەوەی کەبەردەوام لەگەڵ دایک و باوکتدا بسووڕێیتەوە.

پاشان وتی (سینۆهە) ئێستا کە ناتەوێت بێیت بۆ ماڵی من، کە لەوێ لەگەڵتدا رابوێرم، دیارییەکم بدەرێ. ویستم هەڵقە زیوەکەی کە ژنە دووگیانەکە دابووی پێم، بیدەمە ئەو، بەڵام ئەو وتی ئەم دیارییە شایستەی من نییە و تۆ دەبێ دیارییەکم بدەیتێ کەشایانی یەکێکی وەک من بێت.

وتم من گەنجێکی هەژارم و دایک و باوکیشم هەژارن و ناتوانم دیارییەکی گرانبەهات بدەمێ . ژنەکە وتی کەواتە تۆ دیارییەک لەمن وەربگرەو ئەنگوستیلەیەکی لەپەنجەی خۆی دەرهێناو روانیم ئەنگوستیلەکە نقێمێکی سەوزی لەسەرەو پێشکەشی منی کرد. ویستم ئەنگوستیلەکەی لێ وەرنەگرم، بەڵام ئەو وتی من ژنێکی دەوڵەمەندم و ئەگەر ئەم ئەنگوستیلەیە بدەم بەتۆ، کار لەمن ناکات بەڵام دەبێتە هۆی ئەوەی کە تۆ من فەرامۆش نەکەیت و بەڵکو رۆژێک بێت و تۆ واز لەم شەرم کردنە بهێنیت و بێیتەلام و لەو رۆژدا دەتوانی لەبری ئەم ئەنگوستیلەیە دیاریی گرانبەهام بدەیتێ. ئەنگوستیلەکەم لێی وەرگرت و ئەو بەبزەیەکەوە لێم جیا بووەوەو هەستم کرد کە لە دوای دەرچوون لەپەرستگا، سواری کەژاوەیەک دەبێت و دەگەڕێتەوە ماڵی خۆی.



***

(١) شۆرە: مادەیەکی سپی و بلوورینە کە وەکو خۆی وایەو لە زەوییە شۆرەکاندا بەدی دەکرێ و بە شێوەیەکی کیمیاویش دروست دەکرێ و بۆ دروست کردنی باروت بەکار دێت –ئەزۆتانی پۆتاسیۆم– و. کوردی.

(٢) دنیە: یان دین –کەمێک کەمتر لە یەک گرام واتە نۆسەد میلی گرام وە لەوانەیە هەر ئەم وشەیە بێت کە دواتر بووە بە دینار– و.

(٣) وشەی (نەفر) لە زمانی میسری کۆن بە واتای جوانەو، (نەفر نەفر نەفر) کە دووبارە کردنەوەی وشەی (جوان)ە، موبالەغەی سیفەتی جوانییەو ئەم جۆرە زێدە رۆییە لە زمانی فارسیشدا هەیە. وەک ئەوەی کە دەڵێن (زۆر زۆر وریا)، بەڵام لە نووسیندا ئەم جۆرە زیادە وەسف کردنە لە (فصاحە)وە دوورە تەنها لە قسەکردندا بەکار دێت – وەرگێڕ.

# ئامۆژگاری هونەرمەندی پەیکەرتاش

(پاتوور)پزیشکی دەسەڵاتدار کە بە سەرقڵێشێن ناوی دەرکردبوو ئەو رۆژەی کە هاتە ماڵمان و نانەکەی خوارد، لە لای باوکم پێی وتم لە خانەی ژیاندا دەبێ ملکەچ و گوێ رایەڵ بێ و هیچ کاتێ رەخنە نەگرێ و هەرچییان وت وەری بگرێ، بەڵام من کە نەمدەتوانی هەستی بە دووی راستی وێڵ بوونم دامرکێنم هەر دەمووت (بۆچی؟).

پزیشکەکانی پاشایەتی کە لە خانەی ژیان بوون و مامۆستامان بوون، هەروەها قوتابییەکانیش لەم لەشوێن گەڕان و پرسیارکردنەی من بێزار بوو بوون و ساڵی سێیەمی خوێندنم بە تەواوی تێگەیشتم کە (پاتوور) بۆچی ئەیوت نابێ رەخنە بگری و هەرچییان وت بێ چەند و چوون بیسەلمێنە. بەڵام باسم کرد کە زانایی وەک تێزابە و دەروونی مرۆڤ دەسووتێنی و پیاوی ژیر ناتوانێ وەک خەڵک خوی بێ عەقڵ بکات و وەک ئەوان نەزان بێت. یەکێک کە لە بنەڕەتدا نەفامە لە نەفامییەکەی خۆی دڵگران نابێ، بەڵام ئەو کەسەی هەست بە راستییەکان دەکات ناتوانێ خۆی هاوڕەنگی ئەو نەفامانە بکات.

کاتێ کە من دەمدی ئەو پزیشکانەی لە هەموو جیهاندا ناوبانگیان دەرکردبوو و نەخۆش لە نەینەوا و بابلەوە بۆ چارەسەرکردن دەهاتنە لایان و ئەوان ئەوەندە تێگەیشتوویان نەبوو کە بزانن بۆچی ئەم جۆرە دەرمانە دەدەنە ئەو نەخۆشە و هەر دەڵێن لە کتێب وانووسراوە، ئیتر من نەمدەتوانی بێدەنگ بم و خۆم پێ رانەدەگیرا. ئەنجامی رەخنە گرتن و پرسینەوەکانم وای کرد لە خانەی ژیان بەربەستیان خستە بەردەم پێشکەوتن و قۆناغ بڕینەکانم و نەیانهێشت



بچمە قۆناغی بەرزتر.

ئەوانەی پێکەوە قوتابی بووین پێش من کەوتن و چەند قوناغێکیان بڕی، بەڵام من لە ساڵی سێیەمدا لە خانەی ژیان بە جێ مام ئەگەرچی ئەتوانم بڵێم لەناو هەموو قوتابییانی ئەوێ هیچیان وەک من کارامە و لێهاتوو نەبوون و هیچیان ئەوەندەی من شەیدای کارەکەی نەبوو. بە خوشحاڵییەوە دەڵێم لەو ماوەیەی کە بە ئەمری پزیشکە تایبەتییەکان دووا کەوتبووم، ناوی (ئاموون)م بەسەر دەمدا نەهات و تەنها لێیانم دەپرسی (بۆچی؟).

چونکە ئەگەر باسی (ئاموون)م بکردایە و بمووتایە کە (ئاموون) نەیزانیوە و هەر لە بەر ئەو نەزانینەشی خەڵکیشی دووچاری هەڵە کردووە، لە خانەی ژیان دەریان دەکردم و ئیتر نەمدەتوانی لە تەبەس بخوێنم و ناچار دەبووم بڕۆم بۆ سووریا یان بابل لە ژێر دەست پزیشکێک هەتا کۆتایی ژیانم کارم بکردایە. بەڵام ئەو پزیشکانە بۆ دەرکردنی من هیچ بەڵگەیەکیان نەبوو و تەنها شتێ کە لە دەستیان دەهات ئەوەبوو کە نەهێڵن قۆناغی بەرزتر ببڕم.

پاش ئەوەی چەند ساڵێ بەسەر مانەوەم لەوێدا تێپەڕی، رۆژێکیان جل و بەرگی قوتابخانەم لەبەر داکەند و خۆم خاوێن کردەوە و بە جلکی ئاسایی چوومە دەرەوەی خانەی ژیان، بۆ ئەوەی سەرێک لە دایک و باوکم بدەم. کاتێ بەسەر شەقامەکانی ناوشاری تەبەس-دا تێدەپەڕیم، بینیم وەزعی شار زۆر گۆڕاوە و خەڵکێکی زۆر لە دانیشتووانی سووریاو ڕەش پێستەکان بە جل و بەرگێکی کەشخە بەناوشاردا دەسووڕانەوە، لە کاتێکدا کە پێشتر ژمارەیان نەدەگەیشتە ئەو هەمووە.

هەروەها لە هەرلایەکەوە دەنگی مۆسیقای سریانی (مۆسیقای وڵاتی سووریا-وەرگێڕ) دەهات کە تایبەت بوو بەو خانانەی ڕابواردنی تێدەکرا. ئەگەرچی لەشاردا ئاسەواری دەوڵەمەندی وخۆشگوزەرانی زیاد بوو بوو، بەڵام خەڵکیم پەرێشان دەبینی، وەک بڵێی چاوەڕوانی تووش بوونی کارەساتێک بن

و لەبەر ئەوە ناتوانن کەڵک لەم کاتەی ئێستا وەربگرن و دڵخۆش بن. منیش وەک ئەو خەڵکە دڵتەنگ بووم، چونکە دەمزانی تەمەنم بەخۆڕایی لەو خوێندنگەیەدا بەسەر دەچێ و ناهێڵن بۆ قۆناغی بەرزتر دەرچم.

کەچوومەماڵەوە بە بینینی دایک و باوکم کە هەردووکیان پیر بووبوون زۆر خەمبار بووم. باوکم لەبەر بەساڵاچوویی نەیدەتوانی بەئاسانی کاغەز بخوێنێتەوە و دەبووایە کاغەزەکەی بە لووتیەوە بنووساندایە و دایکم بەس باسی مردنی خۆی دەکرد و زانیم کە ئەوو باوکم بە لەدەم خۆ گرتنەوەیەکی زۆر و کەم خەرج کردن توانیویانە قەبرێ لەلای رۆژئاوای رووباری نیل بکڕن و منیان لەگەڵ خویاندا برد کە قەبری دایکم ببینم کە باوکیشم دەبووایە هەر لە ناو ئەو گۆڕەدا بشاردرایەتەوە، قەبرەکە بەخشت دروست کرابوو لە خانوویەکی بچووک پێک هاتبوو کە دیوارەکانی شکڵ و شێوە و وشەی ئاسایی پێوە بوو.

دایک و باوکم لە سەرەتای ژن و مێردایەتییەوە لە ئارەزووی ئەوەدابوون کە گۆڕێکی لەبەرد دروست کراویان هەبێ بۆ ئەوەی لە ئایندەدا هەتاو و باران و لافاوە نائاساییەکانی رووباری نیل کاری تێ نەکات و تێکی نەدات ، بەڵام بەو ئارەزووە نەگەیشتبوون و ناچار گۆڕەکەیان لە خشت دروست کردبوو.

ئەو شوێنەی گۆڕەکەی دایک و باوکمی لێ بوو قەبری فیرعەونەکانی میسر لە دوورەوە وەک قووچەک هەرەم ئەبینرا و، هەر کاتێ قووچەکەکانیان دەبینی هەناسەیەکی سارديان هەڵئەکێشا، چونکە دەیان زانی ئەو ئەهرامانە هەرگیز وێران نابن و باران و خۆر و هەڵسانی لافاوی نیل کار لە دیوارەکەی ناکات.

من کتێبێکی (مردووەکان)م بۆ دایک و باوکم نووسیبووەوە کە لە نووسیندا هەڵەی تێدانەبوو، بۆ ئەوەی دوای مردنیان ئەو کتێبە لە قەبرەکەیاندا بێت و لەو دنیا بەهۆی هەڵەی نووسینەکە رێگا ون نەکەن. کاتێ لەسەیر کردنی گۆڕەکە بووینەوە بەرەو ماڵ گەڕاینەوە و دایکم خواردنی بۆ هێناین و باوکم لە بارەی خوێندنەکەمەوە پرسیاری لێ کردم و وتی: کوڕم لە بارەی مردنی خۆت چ بیرێکت



کردۆتەوە؟[١]

وتم: باوکە من هێشتا هیچ دەرامەتێکم نییە کە جارێ بیرلە مردن بکەمەوە و هەر کاتێ شتێکم هەبوو ئەوسا بیر لە ژیانی ئەو دنیا دەکەمەوە.

کاتی رۆژئاوا دایک و باوکم بەجێ هێشت و پێم وتن دەچمەوە بۆ خانەی ژیان، بەڵام دوای دەرچوونم لە ماڵەوە بەرەو قوتابخانەی هونەرە جوانەکان کەلە پەرستگەیەکدا بوو کەوتمەڕێ، چونکە یەکێ لە هاوڕێ کۆنەکانم لەوێ بوو. ئەم هاوڕێیەم کوڕێک بوو ناوی (توتمس) بوو کە لێهاتوویەکی زۆری لە هونەرەجوانەکان هەبوو و ماوەیەک بوو نەمدیبوو.

کاتێ کە چوومە ژوورەوە بینیم کە قوتابییان بە رێنمایی مامۆستاکەیان خەریکی کارکردنن و بە بیستنی ناوی (توتمس) کە من پرسیم، بە ڕقەوە هەموویان تفیان کرد و یەکێکیان وتی: لێرە دەریان کردووە.

یەکێکی تر وتی: ئەگەر دەتەوێ بیدۆزیتەوە بچۆ بۆ جێگایەک کە جنێو بە خوایەکان دەدەن، چونکە توتمس جنێو بە خوایەکان دەدات. یەکێکی تر وتی هەر شوێنێک کە مشتومڕی تێدا دەکرێ توتمس لەوێدایەو لە دوای هەموو پێک دادانێک زامداری دەکەن.

بەڵام کاتێ مامۆستا چووە دەرەوەو قوتابییان زانییان لەوێ نەماوە وتیان: دەتوانی لە خواردنگەیەک کە ناوی (گۆزەی سووریا)یە بیبینی و ئەم دوکانە لە کۆتایی گەڕەکی هەژارەکان و سەرەتای گەڕەکی دەوڵەمەندەکانە و هونەرمەندە نەبووەکان و ئەوانەی لێرە دەردەکرێن شەوان لەوێدا کودەبنەوە و جێگای دانیشتنیان ئەوێیە.

من بەبێ ماندووبوون دوکانەکەم دۆزییەوە و سەیرم کرد توتمس بە کراسێکی کۆنەوە لە سووچێ دانیشتووە و وادیاربوو تازە بە شەڕ هاتبێ، چونکە نێو چاوانی ئاوساوییەکی پێوە دیاربوو. توتمس کە منی بینی دەستی هەڵبڕی و وتی: سینۆهە تۆ لە کوێ و ئێرە لە کوێ و چۆنە رێت کەوتۆتە ئێرە؟ من وام زانی بووی

به پزیشکێکی گەورە.

وتم: زۆر دڵتەنگم و پێویستیم بە هاوڕێییەکە لەگەڵیا دانیشم و کەمێ بخۆینەوە، چونکە باوکم دەڵێ کەمێ نۆشینەوە بۆ لابردنی خەم و پەژارە بەسوودە و لەو ڕووەوە دڵگرانم کە کەس نییە وەڵامی (بۆچی؟)یەکانم بداتەوە و کاتێ ناتوانن جوابم بدەنەوە بە چاوی شێتێ سەیرم دەکەن.

(توتمس) دەستەکانی نیشان دام کە پێم بڵێ بۆکڕینی خواردنەوە کانزای پێ نییە. بەڵام من دووحەڵقە زیوەکەی کەلە دەستمدا بوو نیشانم دا کە یەکێکیان هی ژنەدووگیانەکە بوو. بانگی خاوەن دوکانمان کردو کە هاتە پێشەوە دەستی بەئەژنۆیەوە ناو داچەمیەوە و من لێم پرسی: چ جۆرە خواردنەوەیەکتان هەیە؟

وتی: لێرەدا هەموو جۆرە خواردنەوەیەک هەیە و خواردنەوەکان لە پێکی ڕەنگاو ڕەنگ دێتە بەردەستتان بۆ ئەوەی بە سەیر کردنەکەی دڵتان زووتر شاد بێت.

توتمس پێی وت: خواردنەوەیەکمان بۆ بێنێ کە عەتری نێرگسی تێکەڵ کرابێ.

بەندەیەک هات و ئاوی بەدەستدا کردین و دوایی قاپێ ناوکە شووتی برژاویان لەسەر مێزەکە دانا و دوایی خواردنەوەی هێنا. ئەو پێکانەی شەرابەکەی تیا بوو تەنک و ڕەنگا و ڕەنگ بوو. توتمس خواردنەوەکەی بە یادی ئەوەی قوتابخانەی هونەرەجوانەکان و مامۆستاکانی تووشی خوای مرۆڤ قووتدەر بن نۆشی و منیش بە یادی تووش بوونی کاهینەکانی (ئامون) بە هەمان خودا نۆشیمەوە، بەڵام بە هێواشی قسەم دەکرد. توتمس وتی: مەترسە هەموو موشتەرییەکانی ئەم دووکانە وەک ئێمە خاوەن بیروڕای ئازادن. لە دوای دوو پێک خواردنەوە نووری شەرابەکە دڵی ڕووناک کردینەوەو من وتم: لە خانەی ژیان من لە ڕەش پێستەکان زۆر سووکتر سەیر دەکرێم و هەڵسوکەوتیان لەگەڵ مندا وەک تاوانبارێک وایە.



توتمس وتی: بۆچی ئەو ڕەفتارەت لەگەڵدا دەکەن؟

وتم: لەبەر ئەوەی کە دەپرسم (بۆچی؟).

توتمس وتی: تۆ شایانی گەورەترین سزاکانی، چونکە کاتێ کە دەڵێی (بۆچی؟) بە گژ ئایین و باوەڕ و سامان و توانای ئەو کەسانەدا دەچی کە لە میسردا فەرمانڕەوایی دەکەن و ئەوان دەزانن کە پرسیارەکەی تۆ بناغەی دەسەڵات و دەوڵەمەندی و بەختەوەرییان ئەلەرزێنێ و ناچار دەبن دەرت بکەن و پێم سەیرە چۆنە هێشتا دەرنەکراوی و چارەنووست وەک ئێستای منی لێ نەهاتووە. ئەمانەی تۆ دەیبینی ئەگەر چی لە ڕووی ڕووخسارو ڕەنگ و بالایان و تەنانەت باوەڕە ئایینیەکانیشیان لێک جیاوازن، بەڵام لە یەک ڕووەوە باوەڕیان وەک یەکەو لەسەری کۆکن، ئەویش ئەوەیە کە ئەم خەیاڵ و بیروباوەڕە پووچە و ئەم پێکهاتەیە رابگرن، چونکە ئەم پێکهاتەیە بەردەوام لە بەرژەوەندی خۆیان ومالّ و منداڵیاندایەو ئەوان لە مێژە دەسەڵاتیان ڕۆیشتووە بەسەر ئەم بارودۆخەداو هێز و توانا و دەوڵەمەندییان لە حیساب دەرچووە. جا تۆ کە دەڵێی (بۆچی؟) دەتەوێ بناغەی ئەم پێکهاتەیە بڕووخێنی و نەفامیی ئەوان ئاشکرا بکەی.

دەبێ بزانی ئەوان ئەگەرچی لە ناو یەکیشدا ناکۆک بن، بەڵام زۆر ئاساییە دژی تۆ یەک بگرن و لە ناوت ببەن، چونکە مەترسی تۆ لە ناکۆکییەکانی نێوانیان زیاترە. هەتا میسر بێ و قووچەکەکان لەم وڵاتەدا بمێنێ ئەوان ئەم پێکهاتەیە بە هەموو بیروباوەڕە پووچەکانیانەوە دەپارێزن ئەگەرچی سەدەهەزار کەسی وەکو تۆش لە ناو ببەن، چونکە دەستەبەری پایەداری و دەسەڵاتیانە و هەر کەسێ دژیان بوەستێ بە ناوی ئامون یان بە ناوی فیرعەونەوە دەیکوژن.

دوایی توتمس وتی: کاتێ کە چوومە خوێندنگەی هونەرەجوانەکانەوە ئەوەندە دڵخۆش بووم کەوام دەزانی لە دوای مردنم لە ئەهرامدا دەمنێژن. دەستم بەکار کردو بە پێنووس لەسەر لەوحەکان وێنەم دەکێشا و دوایی خاکی (ڕۆس)م[2] بۆ

دروست کردنی پەیکەر بەکاردەهێنا، لە پێشا قالّبی هەر پەیکەرێکم بە مێو پڕدەکردەوە بۆ ئەوەی لەسەر ئەو قالّبە پەیکەرە بەردییەکەی دروست بکەم، من وەک تینویەک وابووم کە گەیشتبێتە ئاو و هەموو کارێکم بە تامەزرۆییەکی زۆرەوە ئەنجام دەدا. تا ئەو رۆژەی کە ویستم بە حەز و ئارەزووی خۆم وێنە و پەیکەر دروست بکەم، بەلاّم لە پڕێکا مامۆستاکانی ئەوێ نارەزاییان دەربڕی و وتیان ئەم پەیکەرەی تۆ دەتەوێ دروستی بکەی پێچەوانەی یاسایەو، وەک چۆن پیتەکانی ئەلف و بێ یەک شێوەیان هەیە و بە جۆرێکی تر نانووسرێ، ئەو وێنە و پەیکەرانەش لە هونەرەجوانەکاندا شێوەیەکی دیاری کراوی هەبوو و نەدەبووایە لەوانە لات بدایەو شێوەیەکی تازەو رەنگێکی نوێت بەکاربهێنایە. لە سەرەتای دروست بوونی هونەرەجوانەکان شێوەی دانیشتنی پیاوێ کەلەسەر زەوی دانیشتبێ یان وەستابێ دیاری کرابوو و ئێمە دەبووایە وەک باوکانمان و پێشینەکانمان شێوەمان دروست بکردایە و لەسەرەتای دروست بوون، هونەرمەندان شێوەی هەلّبڕینی دەست و پێی گوێ درێژیان لە کاتی بەڕێ رۆیشتندا دیاری کردبوو و ئەگەر پێچەوانەی ئەو شێوەیە وێنەیەکمان دروست بکردایە بە کوفر لە قەلّەم دەدرا و بەو کەسەیان نەدەوت هونەرمەند، بەلّکو پێیان دەوت هەرکەس بە پێی یاسا وێنە بکێشێت و پەیکەر داتاشێ لێرەدا جێی دەبێتەوە و، کاغەزی (پاپیرۆس) و خاکی رۆست و بەرد و رەنگ و پێنووس و کەرستەی بەردتاشی دەدەینێ و، ئەوەی ئەمانە رەچاو نەکات و چاو لە پێشینەکان نەکات لە قوتابخانە دەری دەکەین.

سینۆهە، منیش وەک تۆ بووم و بەمامۆستاکانم دەوت بۆچی دەبێ وابێ؟... بۆچی ئاوها نەبێ؟ بۆچی دەبێ سینەی پەیکەر هەموو کاتێ رەنگی شین بێت و چاوەکانی سوور بێت...؟

ئایا باشتر نییە چاوی (بتەکە) رەش بکەین و کراسەکەی هاوڕەنگی پارچەکانی بەری بکەین؟...، بەلاّم کاهینەکان کە لە هەموو جێگایەک مامۆستا



و فێرکەرن، لەو قوتابخانەیە دەریان کردم و بۆیەش ئێستا لەم دوکانەدا بەسەرو چاوی شینەوەبوو دەمبینێ.

سینۆهە، هەرچەندە کاهینەکانی پەرستگە لەو قوتابخانانەی کە لە ناو ئەو پەرستگایانەدا دروستیان کردووە بەهەر دوو دەست بیروباوەڕ و رێ و رەسمەکانی خۆیان لە باوەش گرتووەو دەیپارێزن و هەوڵ دەدەن هەموو هزرێکی نوێ لە منداڵداندا بخنکێنن و هەموو هەنگاونان و گۆڕانێکی بەرەوپێش چوون بوەستێنن، بەلاّم من بە باشی هەست دەکەم کە ئەم دنیایە بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر گۆڕاوە. ئەم خەلّکەی ئەمڕۆ بەشەقامەکانی شاردا دەسووڕێنەوە ئەگەرچی هێشتا باوەڕیان بە ئاموون و خوایەکانی تر ماوە، بەلاّم ئێستا لێیان ناترسن و لە جل و بەرگ پۆشین زۆر کەم تەرخەم بوونە و ئەم گوێ نەدانە گەیشتۆتە رادەی بێشەرمی، لەبەر ئەوەی خەلّکی بە بێ ئابڕووییەکی زۆرەوە سنگ و سکی خۆیان بە پارچەی رەنگاو رەنگ دادەپۆشن. خوایەکان مرۆڤیان بە رووتی دروست کردووە بۆ ئەوەی بەردەوام رووت و قووت بن و هەرگیز لەشیان دانەپۆشن، تەنانەت ژنەکانیش وەک پیاوان بێشەرم بوونە و جلکەکانیان سینگ و سکیان دادەپۆشێ[٣].

من هەرکاتێ بیر لەم بارودۆخە دەکەمەوە لەو گومانەدام کە ئێمە لە کۆتایی دنیاداین و بەزوویی ئاخر زەمان (رۆژی دوایی) دێت. ئەگەر پەنجا ساڵ لەمەوبەر ژن یان پیاو کراسێکی لەبەر بکردایە کە سینگ و سکی داپۆشیبایێ، بەتاوانی رێز لێ نەنانی خوایەکان بەردباران دەکران و ئێستا هەمان ژن و پیاوانە بەئازادی لەشاردا دەسووڕێنەوە. ئاە..! کە ئەم دنیایە چەند کۆن بووە و خۆشی لەوانەی کە دوو هەزار ساڵ بەر لە ئێستا ئەم قووچەکە گەورەیەی فیرعەون و هەزار ساڵ بەر لە ئێستا ئەم قووچەکە بچووکانەیان دروست کردووەو رۆیشتن و نەمان کە ئەم بارودۆخە ببینن.

پێکەکانی شەراب جگەلەوەی دڵی رووناک کردبووینەوە گیانیشی سووک

کردبووین و دەتوت پەرەسێلکەین کەلە پاییزاندا دەردەکەوتین.

تۆمس وتی: وا باشترە کە هەڵسین و بچینە شوێنێ، سەماکردنی چاو لێ بکەین، بۆ ئەوەی ئەمشەو چی دی بیر لە (بۆچی؟) نەکەینەوە.

بانگی دوکاندارەکەم کردو کە نزیک کەوتەوە دەستی بە ئەژنۆیەوە ناو چەمییەوەو یەکێ لە حەڵقە زیوەکانم داپێی کە بەهای خواردنەوەو ناوکەشووتییە برژاوەکە هەڵبگرێ و دوای لێ دەرکردن چەند حەڵقە مسێکی دامەوەو یەکێ لە مسەکانم بە بەخشیش دایە ئەو بەندەیەی شەرابی بۆ هێنابین و ئاوی بەدەستدا کردین.

کە ویستمان بێینە دەرەوە مەی فرۆشەکە داچەمییەوە و وتی: ئەگەر حەزتان لە ئاوازی کچە سریانییەکانە من ئامادەم بتانبەمە ئەو گەڕەکانە، یان ناو و نیشانی گەڕەکی کۆچکەرەکانتان بدەمێ بە مەرجێ پارەی گۆزەیەک خواردنەوەم بدەنێ.

من وتم: مۆسیقای سریانیم حەز لێیە و ئەگەر بمانبەی، ئەو مەرجەت جێ بە جێ دەکەم...

بەڵام تۆمس وتی: من لەو کچە گۆرانی بێژە سریانییانە کە زۆربەیان وەکو دایکی من پیر و ناشیرین بوونە بێزارم و وابزانم ئەوانە ئەوەن کە باوکم کاتی گەنجێتی لەگەڵیاندا رایدەبوارد.

دوکاندارەکە وتی: حەز دەکەن ماڵی ئەوانەتان نیشان دەدەم کە مۆسیقا و ئاوازەکانیان دەنگێکی دڵگیریان هەیەو کە دڵتان پڕ لە شادی دەکات و ئەوان بە خۆشییەوە پێشوازی و میواندارییتان لێ دەکەن و دەبنە خوشکتان.

بەڵام تۆمس رازی نەبوو و منی لە دوکانەکە بردە دەرەوە و بە سەر شەقامەکانی شاردا کەوتینەڕێ.

شاری تەبەس شەو و رۆژی بۆ نەبوو و لەشەویشدا وەک رۆژ خەڵکی لە شەقام و کۆڵانەکانی شاردا هاتوچۆیان دەکرد. دەوڵەمەندە هەوەسبازەکان بە



سواری کەژاوەوە تێدەپەڕین و لەبەردەم ماڵە سۆزانییەکان و لەسەر چوار رێیەکان مەشخەڵیان هەڵکردبوو. لە هەندێ لەو گەڕەکانەدا دەنگی مۆسیقای سریانی (مۆسیقای سووریا) دەهات و لە هەندێ خانووی تر دەنگی تەپڵی رەش پێستەکان ئەبیستراو دەمانزانی ژنەکانی ئەو ماڵە رەش پێستن و تۆمس لەو باوەڕەدابوو کە هەندێ لە ژنە رەش پێستەکان جوانن و مرۆڤ ئەگەر بیانکاتە خوشکی خۆی بەختەوەر دەبێ[٤].

من چەندەها جار شەوان لەگەڵ باوکمدا بۆ چوونە ماڵی نەخۆشەکان بە شەقامەکانی شاردا دەڕۆیشتین، بەڵام تا ئەو شەوە چۆنیەتیی باری ناوەوەی ئەو ماڵانەم نەدەزانی. تۆمس منی بردە ناو خانوویەکی بچووک لەو ماڵانە کە ناوی خانووی (پشیلەی ترێ) بوو و لەوێدا فەرشی نەرمیان راخستبوو و لەبان چراکان سەرچرای زەردیان لێ دانابوو.

ژنە جحێڵەکانی ئەو جێگایە لە رۆشنایی ئەو تیشکە زەردانە جوانتر دەهاتنە بەرچاو و هەندێکیان خەریکی شمشاڵ لێدان بوون و هەندێکی تر سەرگەرمی عوود لێدان بوون. یەکێ لە کچەکان کاتێ کە منی بینی شمشاڵەکەی داناو هەڵسا هاتە لام و دەستی خستە سەر دەستم و کچێکی تر لە تۆمس نزیک بووەوە و ئەویش دەستی خستە سەر دەستی تۆمس و کچەکەی لای من دەستی بەرزکردمەوەو سەیری کرد، لە پاشان روانییە سەرە تاشراوەکەم و وتی: لە قوتابخانەی پزیشکی دەخوێنی یان ماف، یان بازرگانی و ئەستێرەناسی. دوایی سەیری تۆمسی کردو چونکە دەستی تۆمس لە دەستەکانی من دڕتر بوو هەمان کچ پێی وت: تۆ قوتابی هونەرە جوانەکانی چونکە دەستی پەیکەرتاشان لە دەستی قوتابییەکانی پزیشکی و قوتابیانیی شوێنەکانی تر زبرترە.

دواجار بە هۆی زیادەنۆشی تەواو لە بیرم نییە چی ڕوویدا و وا هەست دەکەم کە لەگەڵ رەش پێستێ دەستە و یەخەبووم و کاتێ هاتمەوە هۆش خۆم لە دەرەوەی ماڵەکەدا لە نێو جۆگەیەکی ئاو دییەوەو حەڵقە زیو و مسەکانم پێ نەمابوو و

بیرم لە وتەکانی باوکم کردەوە کە دەیوت مرۆڤ کە زۆری خواردەوە ئاکامەکەی ئەوە دەبێت کە خۆی لە جۆگەلە ئاوێکدا دەبینێتەوە. تومس بردمیە کەناری رووبارەکە بۆ ئەوەی لەوێ دەست و سەر و چاوە قوڕاویەکەم بشۆم.

کاتێ کە گەڕامەوە خانەی ژیان هەتاو هەڵهاتبوو، هەرچەندە لە بەر خواردنەوەی زۆر، نەهاتبوومەوە سەرخۆ، بەڵام خۆم گەیاندە بەشی نەخۆشییەکانی گوێ، چونکە لەو ڕۆژەدا دەبووایە لەوێ ئیشم بکردایە.

لە ڕێڕەوەکەدا مامۆستاکەم کە پزیشکی پاشایەتی و پسپۆری تایبەتی نەخۆشییەکانی گوێ بوو تووشم بوو و روانییە جلە دڕاوەکەم و ئاوساوییەکەی سەرم و وتی: ئایا دوێنێ شەو بەشەڕ هاتووی؟

من سەرم دانەواند و ئەو وتی: چاوەکانتم نیشان بدە. کە سەیری چاومی کرد دوایی زمانیشمی بینی و مەچەکی دەستی گرتم و هەستی لە لێدانی دڵم راگرت و وتی: تو دوێنێ شەو زۆرت خواردۆتەوە و بۆ قوتابیی خانەی ژیان زیادەنۆشی خراپە، چونکە ناهێڵێ کارەکانی ئەنجام بدات و ئەگەر خۆت چارەسەرنەکەی تا سبەینێ بێ حاڵ و شەکەت دەبی و ناتوانی بە ئاگاوە کار بکەیت، وەرە با هەندێ (مسهل)ت[٥] بدەمێ کە ناو سکت خاوێن بکاتەوە و ئاسەواری سەرخۆشیت پێوە نەمێنێ، بەمەرجێ چی دی نەڵێی (بۆچی؟) چونکە لە خانەی ژیان چوون بۆ ماڵەکانی رابواردن و خواردنەوە نا بەجێ نییە، بەڵام پرسیاری (بۆچی؟) عەیبێکی گەورەیە.

من تا ئەو شەوە هەرگیز لە نزیکەوە لەگەڵ ژنێکدا گفتوگۆم نەکردبوو و نەمدەزانی هاونشینی کردن لەگەڵ ژناندا تا ئەو رادەیە دەبێتە هۆی ئارامی و هێور بوونەوەی مرۆڤ. دوای ئەوە کەڵکم لە کاتەکان وەردەگرت و هەر زیو و مسێکم دەست بکەوتایە ئەچووم لەو ماڵانەدا سەرفم دەکردو لەبەرئەوەی، چونکە هەندێ لە نەخۆشەکان مس و ئەگەر رێ بکەوتایە زیویان دەداپێیان، پەیدا کردنی کانزا بۆ ئێمە زەحمەت نەبوو.



لەوە بەدواوە هەستم کرد مامۆستاکانی ئەوێ کە لە رابردوودا خراپ دەیان روانییە من، هەڵوێستیان گۆڕابوو، ئەگەرچی دەیانزانی بەمەبەستی ڕابواردن و خۆشگوزەرانی هاتوچۆی ئەو ماڵانە دەکەم و تێگەیشتبوون کە وەها خووم پێوە گرتووە کە ئیتر بیرم لە رەخنەگرتن نەدەکردەوە.

لە ماوەی ئەم بارودۆخانەدا فیرعەون کە ناوی (ئامن هوتپ) بوو بەسەختی نەخۆش بوو و پزیشکە تایبەتییەکانی کۆشک چارەسەریان پێ نەدەکرا. هەر چەندە لە پەرستگای ئامووندا رۆژانە قوربانییەکیان بۆ دەکرد، بەڵام ئاسەواری چاکبوونەوە لە جەستەی دەرنەدەکەوت. ئەیانوت پاشا لەگەڵ ئەوەشدا کە کوڕی خوایە لە خوا (ئاموون) تووڕە بووە چونکە چارەسەری ناکات .

فیرعەون دەستەیەک خەڵکی ناردە نەینەوا کە کەوتۆتە نێوان (دوو ڕووبار)، بۆ ئەوەی لە خوای نەینەوا کە ناوی (عەشتار)ە داوای یارمەتی بکەن بۆ چاک بوونەوەی. ئەوەندە ئەم بابەتە لە رووی نەتەوایەتییەوە سەر شۆڕی بوو، کە کەس نەیدەوێرا بە دەنگی بەرز بڵێ فیرعەون بۆ چارەسەر کردنی خۆی داوای یارمەتیی لە خوای نەینەوا کردووە و بەردەوام و بە هێواشی ئەم بابەتە باس دەکرا.

رۆژێ پەیکەری خوای نەینەوا هاتە (تەبەس)ەوە و بینیم هەندێ پیاوی ئایینی کە ریشی درێژ و لوولیان هەبوو دەورەی بتەکەیان دابوو.

لەگەڵ ئەوەشدا کە من خۆم بە قوتابییەکی رووناکبیر دەزانی، هاتنی خوای بیانیم لە لا گران بوو و زانیم کە هەموو قوتابییانی خانەی ژیان وەک من پێیان ناخۆشە.

خوای بێگانە ماوەی هەفتەیەک تا بەر لە بەرزبوونەوەی ئاوی نیل لە تەبەس-دا مایەوە، بەڵام ئەویش نەیتوانی هیچ شتێکی بەسوود بکات و چارەسەری پێ نەبوو و ئێمە هەموومان لەم سەرنەکەوتنەی خوای نەینەوا دڵخۆش بووین.

پاتوور سەر قلێشێنی کۆشک، وەک پزیشکەکانی تری تایبەت بە پاشایەتی

دەهاتە خانەی ژیان. ئەگەرچی ئەویش تا ماوەیەک وەک ئەوانی تر رووی لێم نەبوو، بەڵام کاتێ کە زانیی ئیتر چەند و چۆنیان لەگەڵ ناکەم و وازم لە (بۆچی؟)یەکان هێناوە لە گەڵمدا رووی کرایەوە و رۆژێک وتی: سینۆهە باوکت پیاوێکی گەورە و شەریفە، بەڵام وەک هەموو گەورە پیاوانی راستەقینە هەژارە و من بە پێزانینی دۆستایەتیی باوکت و ئەو رێز لێنانەی بۆ ئابڕوومەندی و گەورەیی ئەو دەیگرم دەمەوێ چاکەیەکت لەگەڵدا بکەم و یارمەتیت بدەم.

من نەمدەزانی (پاتوور) ئەیەوێ چ یارمەتییەکی من بدات تا ئەوەی رۆژێکیان بیستم وتیان پاتوور بۆ قلیشاندنی سەری فیرعەون دەچێتە کۆشکی پاشایەتی..

***

١ – خوێنەران دەبێ ئاگایان لە هەموو ئەو خاڵە گرینگانە هەبێ کە ئەیخوێننەوە و بزانن کە ئەمانە هەمووی راستییەکی مێژووییەو گرنگی و بەهای ئەم کتێبە کە وەرگێڕدراوەتەوە سەر هەموو زمانێکی زیندووی جیهان، لەوەدایە کە هەمووی واقیعییەو رووداوێکی مێژووییە . هەر بەم بۆنەیەشەوە لێرەدا باوکێکی پیر کە لەسەرە مەرگدایە لە کوڕەکەی دەپرسێ (چ بیرێکت لە مردن کردۆتەوە) چونکە لە میسری کۆن لەکاتی گەیشتنە تەمەنی روشد تا کاتی مردن هەر بیریان لە ئامادەکردنی کەل و پەلی ژیانی دوای مردن دەکردەوە و ئەهرامەکان (قووچەکەکانی) میسریش هەر بۆ ئەو مەبەستەیە – وەرگێڕ .

٢ – خاکی رۆس : گڵی سوور

٣ – خوێنەران دەبێ تێبینیی ئەوە بکەن ، ئەم شتانەی کە نووسراوە راستییەکی مێژووییە و لە میسری کۆن خەڵکی سینگ و سکی خۆیان دانەپۆشیوە. –وەرگێڕ .

٤ – چوار هەزار ساڵ لەمەو بەر لە وڵاتی میسر ژن و مێردایەتیی خوشک و برا شتێکی ئاسایی و باو بووە و هەر لەبەر ئەوەش ژنەکانی خۆیان بە خوشک ناو دەبرد – وەرگێڕ.

٥ – مسهل : دەرمانێکە مرۆڤ ئارام دەکاتەوە و گەدە و ریخۆڵەکان خاوێن دەکاتەوە – وەرگێڕی



کوردی.

**بەشی شەشەم**

# چووین سەری فیرعەون بقڵیشێنین

هەموو پزیشکەکان لە چارەسەری فیرعەون نائومێدبووبوون و تەنها ڕێگایەک مابوو، ئەویش ئەوەبوو کە پارچەیەک لە کاسەی سەری هەڵبگرن و تێی بڕوانن کە ئایا مێشکی عەیبی هەیە یان نا. هەر چۆنێ بێت ئەم کارە سوودمەند بوو چونکە ئەگەر عەیبەکە لە مێشکیدا بووایە چارەسەر دەکراو ئەگەر ئەویش عەیبی نەبووایە هەڵمە کوشندەکانی ناوسەری دەردەچوو و سەری سووکتر دەبوو.

لەو ڕۆژەی کە بڕیاربوو (پاتوور) بچێتە کۆشکی فیرعەون و سەری بقڵیشێنێ، سەرلەبەیانییەکەی هاتە خانەی ژیان و منی بانگکرد و سندووقێکی ڕەشی دایە دەستم و وتی: شتومەکی نەشتەرگەریی من کە بە ئاگر داخ کراوە یان کوڵێنراوە لەم سندووقەدایە و دەمەوێ پێش چوونە کۆشک لێرەدا سەری دوو کەس نەشتەرگەری بکەم بۆ ئەوەی دەستەکانم ڕابێن و ئەمەوێ تۆ ئەو شتومەکە بدەیتە دەستم.

تێگەیشتم یارمەتی دانەکەی کە دەیەوێ لە گەڵمدا بیکات ئەمەیە ، کاتێ قوتابییەک لە لایەن پزیشکی تایبەتییەوە دەستنیشان دەکرێ کە پێداویستییەکانی نەشتەرگەری بداتە دەستی، مانای ئەوەیە ئەو قوتابییە لێیەوە نزیکە و شایانی ئەوەی هەیە ببێتە یاریدەدەری پزیشکیی ئەو.

پاتوور لە پێشەوە و من لە دوایەوە چووینە بەشێ کە نەخۆشە بێ عیلاجەکان و ئیفلیجەکان و سەر شکاوەکان لەوێدا خەوتبوون.

(پاتوور) دوای چوونە ژوورەوە سەری هەندێکی پشکنی و دوو کەسی بۆ



قڵیشاندنی کاسەسەر هەڵبژارد. یەکێکیان پیرەمێردێک بوو کە چارەسەری نەبوو و مردن بۆ ئەو بەختەوەری بوو و، ئەوی تریان بەندەیەکی ڕەشی کەڵەگەتی بەهێزبوو کە بەردێکیان بە سەریدا کێشابوو و نەیدەتوانی قسە بکات و ئەندامەکانی لەشی بجووڵێنێتەوە.

هەردووکیان بردە قاوشی نەشتەرگەری و بێ وەستان یەکسەر شیرەی (تریاک)یان کردە دەماریانەوە بۆ ئەوەی هەست بە ئازار نەکەن.

من بەدەستوبردی سەری هەردووکیانم تاشی و تێکەڵەی (شنجرف)[1]و (کەڕوو)م پیاکرد، چونکە لە کتێبدا نووسرابوو پێش هەر نەشتەرگەرییەک دەبێ جێگای نەشتەرگەرییەکە بەم دەرمانانە خاوێن بکرێتەوە.

پاتوور کێردەکەی خۆی گرتە دەست و پێستی سەری بڕی و لە هەردوولاوە نوشتاندییەوە، لەم کاتەدا خوێن لە هەردوو قەراغی پێستەکە دەهاتەخوار، بەڵام پاتوور سەرنجی نەدەدایە. پاشان کەرەستەی سەر قڵیشێنەکەی گرتە دەست و بەسەریا کرد و هەر ئەوەندە کەمێ چووە ناوەوە سووڕاندی، بەشێوەیەک کە کەرتە ئێسکێکی بازنەیی لەسەری جیابووەوەو مێشکی دەرکەوت. پاتوور سەیرێکی مێشکی کرد و وتی هیچ عەیبێکی لێ نابینم و، ئێسکەکەی خستە شوێنی خۆی و پێستە قەدکراوەکەی هێنایەوە یەک و سەری پێچایەوە.

بەڵام لەو کاتەی کە خەریکی بەستنەوەی سەری بوو ڕەنگی نەخۆشەکە وەک وەنەوشەی لێهات و گیانی دەرچوو. کاتێ لاشەی ئەو پیاوەیان بردە دەرەوە بەرپرسی خانەی ژیان و هەندێ لە قوتابییان لەوێ بوون و (پاتوور) ڕووی کردە قوتابییان و وتی: یەکێکتان کەلە هەمووتان گەنجترە بچێت پیاڵەیەک خواردنەوەم بۆ بهێنێت، چونکە کەمێ دەستم دەلەرزی. یەکێکیان ڕۆیشت و پیاڵەیەک خواردنەوەی بۆ هێنا و دوای نۆشینی شەرابەکە لەرزینی دەستی نەما و ئەوسا فەرمانی دا بەندەکە بهێنن و بۆ نەشتەرگەری بیبەستنەوە و بە هێواشیش وتی: کەلوپەلی لە قاڵب دانی ئێسکی سەر ئامادە بکەن.

جارێکی تر من پێداویستییەکانی نەشتەرگەریم دایە دەستی و ئەو سەرەتا پێستی سەری هەڵدڕی و ئەمجارەیان بە فەرمانی ئەو دوو کەس لە راست و لە چەپ پێش خوێن بەربوونەکەیان دەگرت، چونکە نەیدەویست خۆی بەم کارە ساکارەوە خەریک بکات و لە ئیشە سەرەکییەکەی مەشغووڵی بکات.

لە خانەی ژیان پیاوێکی نەخوێندەوار هەبوو کە کاتێ دەهاتە دیار سەری نەخۆش خوێنی برینەکەی دەوەستا ، بەڵام لەو کاتەدا پاتوور نەیدەویست ئەو پیاوە بۆ ئەو ئیشە بەکاربێنێ و هەڵی گرتبوو بۆ کاتی سەر قڵیشاندنی فیرعەون.

کاتێ سەری بەندەکەی کون کرد، (پاتوور) ئێسکی سەری نیشانی ئێمە و قوتابییەکانی تر دا کە بەشێ لە ئێسکەکە بەهۆی پیاکێشانی بەردەکە بەناوا چووبوو.

ئینجا بە کێردە تایبەتییەکەو مشار ئەو بەشە ئێسکەو دەوروبەرەکەی لەسەری هەڵگرت، کەبە قەدەر لەپی دەستێکی بێ پەنجە دەبوو و مێشکی سپی رەش پێستەکە دەرکەوت، کە ئەجووڵایەوە و نیشانی هەموومانی دا.

کە سەیرمان کرد کەمێ خوێن رژابووە سەر مێشکی و لەوێدا مەیيبوو. (پاتوور) وتی: ئەم خوێنە مەییوەی سەرمێشکی بووەتە هۆی لەکارکەوتنی زوبانی و ئەندامەکانی تری لەشی. ئینجا خوێنە مەییوەکەی بەوردی کەرت کەرت کردو لەسەر مێشکی هەڵیگرت، لەگەڵ ئێسکێکی بچووکیش کە کەوتبووە سەر مێشکی.

لەو کاتەی ئەو خەریکی ئەم کارانە بوو ئەوانی تر بەپەلە لەسەر ئێسکەکەی سەری کە لێ کرابۆوە قاڵبیان دروست کرد، بە شێوەیەک کە ئێسکە قووپاوەکەیان بە چەکوشێکی دار راست کردەوە و دایانە دەست پاتوور و ئەویش ئەو زیوە، کە بە قەبارە و شێوە وەک کەرتە ئێسکە بڕاوەکە بوو خستییە سەر کونە گەورەکەی سەری و بە گیرەی بچووکی زیو بە قەراغەکەیەوە نووساند و



پێستی سەری دایەوە بەسەر زیوەکەو دووریییەوە پاشان برینەکەی پێچایەوەو وتی: ئێستا ئەم پیاوە هەڵسێنن، بەڵام نابێ تا سێ رۆژ بجووڵێتەوە. نەخۆشەکەیان هەڵساندەوەو ئەو قوڵەڕەشە کە پێش نەشتەرگەرییەکە نەیدەتوانی قسە بکات و لەشی بجووڵێنێ هەم قسەی کرد و هەمیش دەست و قاچی جووڵاندو پاتوور پێی وت نابێ تا سێ رۆژ سەرت بجووڵێنی.

کاتێ کە بەندەکەیان گواستەوە ژوورەکەی تر کە بنوێت پاتوور پێمانی وت: ئەگەر تا سێ رۆژی تر ئەم پیاوە نەمرێ چاک دەبێتەوە و دەتوانێ لە خانەی ژیان بچێتە دەرەوە و تۆڵەی خۆی لەو کەسە بکاتەوە کە سەری شکاندووە. دواییی قوتابییەکانی روخسەت دا و بە منی وت: ئێستا کاتی ئەوە هاتووە شتومەکەکانی من بخەنە ئاگرەوە و بیکوڵێنن، بۆ ئەوەی بچینەلای فیرعەون و تۆش لەگەڵ مندا دێیت.

من بە پەلە پێداویستییەکانی نەشتەرگەریم شۆری و نامە ئاگرەوە و کوڵاندم و لە خانەی ژیان هاتینە دەرەوە و من سندووقەکەی پاتوورم هەڵگرتبوو و سواری کەژاوەکەی بەردەم خانەی ژیان بووین کە چاوەڕوانی ئێمەی دەکرد و، لەگەڵ ئەو پیاوەی کە بوونی دەبووە هۆی وەستانی خوێن، بەرەو کۆشک بەڕێ کەوتین.

بەندەکان بەشێوەیەک کەژاوەکەیان هەڵگرتبوو و دەیانبرد، کە نەدەجووڵایەوە و من لە خۆما هەستم بە شکۆمەندی دەکرد، چونکە دەمزانی بەزوویی دەچینە کۆشکی پاشایەتی و فیرعەون لە نزیکەوە دەبینین.

پاش ئەوەی بەکەژاوەکە هەندێ رۆیشتین، گەیشتینە کەناری نیل و دابەزینە ناو بەلەمی تایبەتی کۆشک و بەرەو (خانووی زێڕ) واتە کۆشکی فیرعەون کەوتینە رێ. کاتێک لەوێ نزیک بووینەوە بەلەم و کەڵەکێکی زۆرمان تووش بوو و ئەوەندە زۆربوون ئاوی نیلیان داپۆشیبوو و ئەو بەلەمانە گرانبەهابوون و لە داری بەنرخ دروست کرابوون ، هەروەها بەلەمی تریشی لێ بوو.

خەڵکی دەم بە دەم دەیانوت ( سەرقڵیشێنی پاشایەتی هات)و هەموو

دەستیان بە نیشانەی ماتەم بەرزدەکردەوەو دەگریان، چونکە دەیانزانی تا ئێستا رووی نەداوە سەری فیرعەونێ کون بکەن و بتوانێ بە زیندوویی بمێنێ.

ئێمە بەرامبەر بە کۆشک لە بەلەمەکە دابەزین و لە دەروازەی کۆشک کە (زەنبەق)یان پێ دەوت، ئێمەیان کردە ژوورەوە. گەورەکان و پیاوانی دەسەڵاتدارێتی بەرامبەر ئێمە دەستیان بەئەژنۆیانەوە دەناو سەریان دائەنەواند، لەبەر ئەوەی دەیانزانی ئێمە هەڵگری مەرگین.

ئێمەیان بەرەو تەختی فیرعەون ڕێنومایی کرد و بینیم کە فیرعەون لەسەر قەرەوێڵەکەی راکشاوە، کە قەدیفەی بریقەداری پێوەبوو و قاچەکانی قەرەوێڵەکە بتی خوایەکان بوون.

لەوکاتەدا هیچ ئاسەوارێکی پاشایەتیی پێوە دیار نەبوو و دەموچاوی ئاوسابوو و ئەندامەکانی رووت دەهاتە بەرچاو و سەری بەلایەکدا سووڕاندبوو و لەگۆشەی دەمیەوە لیک دەهاتە خوارەوە. کاتێ فیرعەونم لەم وەزعەدا دی، زانیم دەسەڵاتی ئەم دنیایە ئەوەندە ناپایەدارە کە فیرعەون لە بەستەری نەخۆشی و مردن لەگەڵ هەژارترین نەخۆشەکانی خانەی ژیان کە چارەسەردەکران و دەمردن جیاوازی نەبوو، بەڵام جوانکارییەکانی ژوورەکەی شکۆمەند بوو و قەدی دیوارەکەی بەوێنەی گالیسکەی پاشایەتی نەخشێنرابوو کە فیرعەون لە ناو ئەو گالیسکانەدا تیری بۆ شێرەکان دەهاویشت. رەنگی ئاڵتوونی و شین و سووری سەردیوارەکان ئەدرەوشانەوەو، زەویی هۆدەکەیان لە شێوەی کانیاوێکی گەورە رازاندبۆوە کە ماسییەکان هاتوچۆیان تیادەکردو مراوی و قازەکان بەسەر کانیاوەکەدا دەفڕین.

ئێمە هەردوو دەستمان خستە سەر ئەژنۆمان و لەبەرامبەر فێرعەوندا سەرمان دانەواندەوە. من و (پاتوور) دەمانزانی کە هەڵدڕینی سەری فیرعەون هیچ سوودێکی نییە و وەزعەکەی وا دەردەکەوت کە دەمرێ، بەڵام داب و نەریت وابوو کە دەبوایە پێش مردنی، سەریان کون بکردایە کە هەڵمەکانی سەری



دەرچێ و نەڵێن کەس و کارەکەی ئەم دوا چارەسەرییەیان بۆ نەکرد.

من سندووقە رەشەکەی پاتوور کە لە داری (ئەبەنووس) دروست کرابوو، کردمەوە، بۆ ئەوەی پێداویستییەکانی بدەمە دەست. پێش هاتنەژوورەوەی ئێمە پزیشکەکانی پاشایەتی سەری فیرعەونیان تاشیبوو کە بۆ نەشتەرگەری ئامادەبێ.

پاتوور فەرمانی دا بەو پیاوەی کە لەدیار سەربوونی دەبووە هۆی وەستانی خوێن، کە بێتە دیار سەری فیرعەون و سەری بخاتە سەر لەپی هەردوو دەستی. بەڵام لەم کاتەدا شاژنی میسر کە ناوی (تی تی) بوو هاتە پێشەوە و وتی: نا...

تائەو کاتە بەبۆنەی گرنگیی جێگاکە و گەورەیی شوێنەکە نەمتوانیبوو شاژنی میسر و جێنشینەکەی فیرعەون و خوشکەکەی ببینم کە هەموویان بە رەسمی ماتەم دەستیان هەڵبڕی بوو.

من و جێنشینی فیرعەون هەروەکو لە پێشتریش باسم کرد، هەردووکمان لەیەک ساڵدا لە دایک بووین، بەڵام ئەو لە من باڵابەرزتر بوو و چەناگەی پان و سینگێکی بەناواچووی هەبوو و ئەویش وەک دایک و خوشکی بە بۆنەی ماتەم دەستی بەرز کردبۆوە.

خوشکەکەی یەکێک بوو لە جوانترین کچەکانی میسر، چونکە وێنەکەیم لە پەرستگەی (ئامون)دا بینیبوو و لەم بارەیەوە دەمزانی. لە بارەی (تی تی) شاژنی میسر کە ژنێکی ئەسمەری قەڵەو بوو زۆر قسە دەکرا و دەیانوت ژنێکە لە چینی سادەی خەڵکی و هەر لەبەر ئەوەش ناوی باو و باپیرانی لە بەڵگەنامە رەسمییەکاندا نەنووسرابوو.

ئەو پیاوەی دەبووە هۆی وەستانی خوێن کە شاژن وتی (نا)، دوو هەنگاو چووە دواوەوە ، ئەو کابرایە لادێییەکی سادە و نەخوێندەواربوو و بچووکترین زانیاریی لەبارەی پزیشکییەوە نەبوو و، چونکە وەستانی لەبان سەری نەخۆش

دەبووە هۆی وەستانی خوێن، لە خانەی ژیان دایانمەزراندبوو کە لە کاتی نەشتەرگەری بێتە دیار سەری نەخۆشەکە و ئەو خوێن بەربوونە بوەستێنێ. من وای بۆ دەچم کە هۆی وەستانی خوێن بە نزیک بوونەوەی ئەو پیاوە دەگەڕێتەوە بۆئەوەی ئەو پیاوە بۆنێکی ناخۆش و کارتێکەر و تیژی هەبوو و ئەم بۆنەی ئەوەندە تیژبوو کە هەرچەندە دەیانشوشت بۆنەکەی هەردەما و وەک بزمارێ کە بیکەی بە مێشکی مرۆڤدا ئەوها دەچووە ناو کاسەی سەرەوە و لەبەر ئەوەی کە مێشک و شادەماری مرۆڤ فەرمانڕەوای ئەندامەکانی تری لەشن خوێن هاتنەکە دەوەستا.

من بە دڵنیاییەوە ناڵێم کە بۆنەکەی لەشی دەبووە هۆی وەستانی خوێن، بەڵام چونکە هۆکارێکی ترنییە شایانی گومان لێ کردن بێت ئەوا دەڵێم، لەوەیە هەر ئەو بۆنەی بێت.

ژنەکەی فیرعەون وتی: من ناهێڵم ئەم پیاوە سەری خوابگرێ و بەدەستی خۆم سەری دەگرم.

پاتوور وتی: خانم کردنەوەی سەر دەبێتە هۆی خوێن رژان و بینینی خوێن بۆتۆ باش نییە.

بەڵام ئەو وتی: من لە سەیری خوێن ناترسم و خۆم سەری رادەگرم.

لەبەر ئەوەی پێش هاتنی ئێمە پزیشکەکانی تر فیرعەونیان بێهۆش کردبوو و پاتوور دەیزانی گوێی لە دەنگی ئێمە نابێت و ئەگەریش گوێی لێ بێت توانای بەرپەرچ دانەوەی نابێت، دەستی کرد بە قسەکردن و هاوکات بەکێردەبەردییەکەی خۆی پێستی سەری فیرعەونی هەڵدڕی و وتی: فیرعەون لە خوایەکانە و بەرەو ئاسمان دەچێت و لە بەلەمی زێڕینی (ئاموون)ی باوکی دادەنیشێ، فیرعەون لە خۆرە و بەرەو خۆر دەگەڕێتەوە و ناوی هەتا هەتایە دەمێنێتەوە ... ئەی کابرای بۆگەن... تۆ لە کوێی؟... بۆ نایەی خوێنەکە بوەستێنی.

پاتوور ئەم وشانەی دوایی لەگەڵ کابراکەبوو کە خوێنی دەوەستاند، چونکە



بەخوێن هاتنەکە پاتوور تێگەیشت کە کابرا لەوێ نەماوە ، بۆیە خوێنەکەی سەری فیرعەون ناوەستێ.

دەرکەوت کابرا لەترسی شاژن پاڵی بەدیوارەکە دابۆوە و کاتێ بیستی لەگەڵ ئەویانە لە قەرەوێڵەکە نزیک بووەوە و هاتە دیارسەری فیرعەون و دەستی هەڵبڕی و یەکسەر خوێنەکەی سەری فیرعەون، کە رژابۆوە سەر لەشی خێزانەکەی وەستا، بەڵام بۆنێکی زۆر ناحەز هۆدەکەی پڕ کرد.

پاتوور لە دوای خوێن وەستانەکە دەستی کرد بە بڕینی ئێسکی سەری و لە هەمان کاتدا قسەی دەکرد، بەڵام قسە کردنەکەی بۆئەوەبوو کە شتێکی وتبێ، چونکە دەیزانی پزیشک لەکاتی نەشتەرگەری نەخۆشەکەی دەبێت لەگەڵ کەس و کاری بدوێت ، بۆئەوەی هەستیان پەرت و بڵاو بکات کە ترس و پەرێشانی کاریان تێ نەکات.

پاتوور وتی: خانم خوا لە دوای چوونی بۆ ئاسمان لەلایەن ئاموون بەرەکەتی بەسەردا دەبارێ...

لەوکاتەدا جێنشینەکەی فیرعەون لە پاتوور نزیک بووەوە و وتی : تۆ لە هەڵەدای و (ئاموون) فەڕ و پیرۆزیی بەسەر نارژێنێ، بەڵکو (ئاتوون) پارێزگاری لێ دەکات.

پاتوور وتی: تۆ راست دەکەیت و من هەڵەم، باوکت (ئاتوون)پاڵپشتی لێ دەکات...

پاتوور ناهەقی نەبوو نەزانێ کە فیرعەون کام یەک لە خوایەکانی زیاتر خۆش دەوێت، چونکە جگەلەوەی کەس ناتوانێ هەر لەخۆیەوە بزانێ چ خوایەک زیاتر لە دڵی مرۆڤدا خۆشەویستە، لە میسردا زیاتر لە سەد خوای لێ بوو و تەنانەت کاهینەکان کە کاریان زانینی ناوی خوایەکان بوو ناتوانن بڵێن ناوی هەموو خوایەکان دەزانین.

کوڕەکەی کەوتە گریان و پاتوور لەگەڵ قسەکردنەکەیدا دڵی ئەویشی

دەدایەوە، تا ئێسکەکەی سەری بەتەواوی بڕی و ئێسکێک لەهەردوولایەوە بەقەدەر دوو گرێی پەنجەی لەکاسەی سەری فیرعەون هەڵگرت و هەردووکمان بەوردی سەیری مێشکی فیرعەونمان کرد کە ڕەنگی خۆڵەمێشی بوو و دەجوولایەوە.

پاتوور وتی : سینۆهە چراکە بێنە ئەملاوە بابەباشی سەیری ناوەوەی بکەم و من چراکەم بەشێوەیەک ڕاگرت کە ڕووناکییەکەی بدات لەناوسەری و پاشان پاتوور وتی: زۆر باشە..، زۆر باشە..، کاری من تەواوبوو و ئیتر چی ترم لەدەست نایەت بەڵکو (ئاموون) دەبێ بڕیاربدات، چونکە لێرەبەدواوە ئیشەکە دەچێتە دەستی خوایەکانەوە.

دوای بەستنی برینەکە پاتوور بە شاژنی وت: ئەگەر خوایەکان ڕوخسەت بدەن تاخۆرهەڵاتن زیندوو بمێنێ ئەوا دەژیت ، ئەگەرنا دەمرێ[٢].

لە کۆتاییدا پاتوور دەستی بە نیشانەی ماتەم هەڵبڕی و ئێمەش هەروەها دەستمان بەرزکردەوەو شتومەکی نەشتەرگەریم کۆکردەوەو دوای گەرم کردن و خاوێن کردنەوە کردمە ناو سندووقە ڕەشەکەوە.

شاژن وتی: من دیارییەکی بەرچاوتان دەدەمێ و، ڕوخسەتی ئێمەی داو ئێمە لەو هۆدەیەی فیرعەونی لێ نووستبوو هاتینە دەرەوە و چووینە ژوورێکی ترەوە و لەوێدا نانیان بۆ هێناین و بەندەیەک ئاوی بەدەستدا کردین.

من پرسیارم لە پاتوور کرد کە بۆچی کوڕەکەی فیرعەون دەیوت باوکی لایەنگری (ئاتوون)ـە نەک (ئاموون)؟

پاتوور وتی: ئەم بابەتە بەسەرهاتێکی دوور و درێژی هەیە ئەگەر لەسەرەتاوە دەستی پێ بکەم زۆر دەخایەنێت و هەر ئەوەندەت پێدەڵێم کە (ئامن هوتپ) کە ئێستا سەریمان قڵیشاند، ڕۆژی واهەست دەکات کە خوا (ئاتوون)ی هاتۆتەبەرچاو و بۆ ئەم خوایە پەرستگەیەکی لەم شارەدا دروست کرد کە جگە لە بنەماڵەی پاشایەتی کەس هەنگاوی تێ نانێ و کاهینی ئەم پەرستگەیە (ئامی)



ناوە و ئەم کابرایە و ژنەکەی بەخێوکەری جێنشینی میسرن کە تۆ ئێستا بینیت و شیری ئەو ژنەی خواردووە و (ئامی) کچێکی هەیە ناوی (نەفر تی تی)یە و چونکە بەیەکەوە شیریان خواردووە، ناچار ڕۆژێ دەبێتە خوشکی[٣].

پاتوور پێکێکی خواردەوەو وتی: سینۆهە بۆ پیرەمێردێکی وەک من هیچ شتێ لەوە بەتامتر نییە کە بخوات و بخواتەوەو لە بارەی ئەو ڕووداوانە بدوێت کە پەیوەندیی بەوەوە نییە. چونکە پیرەمێردەکان زۆر حەزیان بەقسە کردنە. من ئەگەر نێوچاوانی خۆم بقڵیشێنم ئەبینی نهێنییەکی زۆری تێدا کەڵەکەبووە، ئایا تۆ هەرگیز بیرت لەوەکردۆتەوە کە بۆچی ژنەکانی فیرعەون هەموو جارێ کچیان دەبێ نەک کوڕ؟

وتم: نا .. لەم بارەیەوە بیرم نەکردۆتەوە...

پاتوور وتی: ئەم فیرعەونەی ئێستا لەلای بووین، لە کاتی گەنجێتیی خۆیدا زیاتر لە پێنج سەد شێر و گاکێوی لە خوارووی سوودان ڕاوکردووەو پیاوێکی بەهێز بوو کە لە تەبەسدا هەر ڕۆژەو لەگەڵ کچێکدا جووت دەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا لەهەموو ئەو کچانە جگە لە منداڵی کچ، هیچی تری نەبوو و تەنیا لەم شاژنە کوڕێکی بوو کە ئێستا جێنشینەو ئایا تۆ ئەم بابەتە بە فەرمانێکی ئاسایی تێ دەگەی؟

ئەو هۆیەی کەوای کرد فیرعەون جگە لە کچ چیی تری نەبێت ئەوەیە کە شاژن بەهۆی پزیشکەکانی پاشایەتی خۆیان، نەیدەهێشت کە ئەو کوڕانەی لە ژنەکانی تر دەبوون زیندوو بمێنن و هەمووجارێ کە کوڕێ لەدایک دەبوو یەکسەر دوای بوونەکەی دەیانکوشت.

دوایی پاتوور چاوێکی لێ داگرتم و وتی: بەڵام سینۆهە تۆ باوەڕ بەم پڕوپاگەندانە مەکە، لەبەر ئەوەی کە شاژن ژنێکی میهرەبانەو لە باشترین ژنەکانی میسرە.

ئێمە ماوەیەک خەریکی خواردن و خواردنەوە بووین و من لەزەتم لەو

خواردنە پاشایەتییە دەکرد، چونکە چێژی من وای هەست دەکرد کە ئەو چێشتانەیان بە شێوەیەک لێ دەنا کە بەتامتر بوون لە خواردنەکانی خانەی ژیان.

کاتێکمان زانی شەو داهات و پاتوور وتی: سینۆهە دەستم بگرە و لێرە بمبەرە دەرەوە، چونکە خواردنەوە ئەگەر چی دڵمان شاد دەکات، بەڵام ئێمەمانان سەرخۆش دەکات و ئەگەر یارمەتیم نەدەی لەوەیە بکەوم.

من دەستیم گرت و لە کۆشک چووینە دەرەوە و کاتێ گەیشتینە دەرەوە بینیم رۆشناییەکانی شار لە لای رۆژهەڵاتەوە ئاسمانی رووناک کردۆتەوە. لەو رووەوە کە منیش زیادەم نۆشیبوو، لە خۆما هەستم بەتەنیایی و نامۆیی دەکرد و دڵم وەک کۆترێ لە سینەمدا لێی دەدا.

وتم: پاتوور من دەبێ برۆم و لەیەکێ لە خانووەکانی سەریانییەکان گوێ لە ئاوازی کچە گۆرانی بێژەکان رابگرم خەریکی رابواردن بم.

پاتوور وتی: هەموو پیاوێکی گەنج کاتی شەو دوای تەواوبوونی کاری رۆژانەی هەست بە تەنهایی دەکات و بەدوای (خۆشەویستی) عەشقدا دەڕوات، بەڵام هیچ عەشقێ لە کایەدا نییە.

وتم: پاتوور ئینکاری لە بوونی عەشق دەکەیت؟... ئەی ئەمە چییە کە ئێستا رووحی من بۆلای دنیای نامۆی کۆچکەرە سریانییەکان رادەکێشێ.

پاتوور وتی: ئەمەی ئێستا تۆ بۆ گەڕەکی کۆچکەرە سریانییەکان رادەکێشێ پێویستی تۆیە بۆ نەهێشتنی ماندوێتی، چونکە پیاو ئەگەر دوای رۆژی کارکردنی سەخت و گران نەتوانێ ژنێ پەیدا بکات و لەگەڵیدا کۆنەبێتەوە، غەمگین دەبێت، بەڵام دوای ئەوەی شەوەکەی خەریکی سەرگەرمی ئابڕووبەر و سووک بوو واتە ژنەکەی کردە خوشکی خۆی دیسانەوە غەم رووی تێ دەکات.

وتم: بۆچی پیاو ناتوانێ هەست بە بەختەوەری بکات و لە پاش هەر جارێک کە ژنێک دەکاتە خوشکی خۆی زیاتر لە پێشوو خەمبار دەبێت؟

پاتوور وتی: ئەم پرسیارەی تۆ دەیکەی پرسیارێکە خوایەکانیش ناتوانن



وەڵامی بدەنەوە. لەوەتەی دنیا هەیە واهاتووە، لەمەو بەدواش وادەبێت و من وای بۆ دەچم کە پیاو تەنانەت دوای ژن هێنانیش لەگەڵ خۆشەویستە دڵخوازەکەی خۆی و بگرە ئەو ساتانەش کە لە تەکیەوە دادەنیشێ زیاتر لەو ساتانەی کە هێشتا نەبووتە هاوسەری، بەڵام گرفتاری پەژارەیە.

وتم: پاتوور قەت ئەویندار بوویتە ؟

(پاتوور) وتی: ئەگەر بتەوێ لە بارەی عەشق لەگەڵ مندا بدوێیت ناچارم دەکەیت سەری تۆش وەک سەری فیرعەون کون بکەم، بۆ ئەوەی هەڵمەسووتێنەرەکان کەلە مێشکتدایە دەربچێ، چونکە ئەوەی دەبێتە هۆی بیرکردنەوەت لە ئەڤین هەمان ئەو هەڵمانەیە کە لەسەرتدا کۆبۆتەوە. لەبەر ئەوەی ئەڤین بوونی نییە و ئەوەی بە ناوی عەشق ناسراوە نیازێکی رووحییە بۆ ڕاکردن لە تەنیایی و هەمان هەستە کە ژن و مێرد رادەکێشێ بۆ هێنانەکایەی خێزان تاوەکو لە تەنیایی دەربچن.

دوایی پاتوور کە زۆری خواردبووە، ماندوێتی خۆی دەربڕی و وتی: من ببە و لەو ژوورە تایبەتەی کە بۆ من دانراوە بمخەوێنە و تۆش هەر لەوێدا بنووە ، چونکە ئێمە ئەمشەو دەبێ لە کۆشکدا بین، بۆ ئەوەی لەکاتی مەرگی فیرعەون دەرچوونی باڵندەکە لە لووتی ببینین.

وتم: پاتوور لە پیاوێکی وەک تۆ بەدوورە قسەی خۆڕایی بکەی...

وتی: بۆ من قسەی خۆڕایی دەکەم ...

وتم: بەڵێ... چونکە لەکاتی مردندا باڵندە لە لووتی مرۆڤدا نایەتە دەرێ و من پێش هاتنم بۆ خانەی ژیان و دوای هاتنم بۆ ئەم قوتابخانەیە زۆر کەسم بینی کە دەمردن و لە لووتی هیچ یەکێکیان باڵندە دەرنەچوو، سەرەڕای ئەمە زانستی پزیشکی دەڵێ لە لەشی مرۆڤدا تەنیا جێگایەک هەیە کە گیاندارێک بتوانێ ژیانی تێدا بباتەسەر ئەویش سکی ژنە لە کاتی دووگیانیدا و جگە لەوە هیچ جێگایەکی مرۆڤ نییە کە گیانەوەرێک تێیدا بژیت ، ئیتر بەم حاڵە چۆن

باڵندەیەک دەتوانێ لە لەشی مرۆڤدا ژیانی هەبێت و لە دواییدا لە لووتییەوە بێتە دەرێ.

(پاتوور) وتی: (سینۆهە)، هەرچەندە لەسەر ئەم رەخنەگرتنە پێشکەوتنەکانت لە خانەی ژیان بۆ ماوەیەکی زۆر وەستا، بەڵام هێشتا تەمێ نەبوویتە و دەستت لەم کارە هەڵنەگرتووە. فیرعەون چونکە کوڕی خوایە لەگەڵ خەڵکی جیاوازە و لەکاتی مردن باڵندەیەک لە لووتیدا دێتە دەرەوە کە ئەم باڵندەیە رووحی ئەوە کە دوای مردن زیندوو دەبێتەوە.

جارێکی تر پاتوور چاوێکی لێ داگرتم و وتی: ئەگەر دەتەوێ ببیتە پزیشکێک کە بتوانێ چارەسەری خەڵکی بکات و زۆربەی نەخۆشەکانی بمرێنێ و بەم شێوەیە دەوڵەمەندی بێ سنوور و بەندەو کەنیزی زۆرت دەست کەوێت و لە تەبەس ناوبانگت دەربچێ و هەموو شەوێ لە خانووەکەت میوانداری بەرپابکەی، دەبێ بڕوات بەوە هەبێ، لەکاتی مردنی فیرعەوندا باڵندەیەک لە لووتییەوە دەردەچێ. خەڵکیش وەک تۆ باش دەزانن لە نێوان مردنی فیرعەون و کەمترین دەرۆزەکەرەکانی شار لە رووی تایبەتییەکانی لەشیاندا جیاوازی نییە. بەڵام ئەوان زێڕ و پارە و بەندە و کەنیزی جوان و دەغڵ و دان و گۆشتیان دەوێ و دوایی وای دەردەخەن کە بەڕاستی رازین بەوەی کە فیرعەون کوڕی خوایە و پاش مردنی باڵندەیەک لە لووتییەوە دەردەچێ.

بەڵام ئەگەر تۆ سبەینێ لە خانەی ژیان بڵێی پاتوور ئەمشەو ئەم قسانەی پێ وتووم، من ئینکاری لێ دەکەم و دەڵێم بوختانم بۆ هەڵدەبەستێ و دڵنیابە قسەکەی من دەسەلمێنن و تۆ بە تاوانی تاوانبارکردنی پزیشکێکی پاشایەتی و مامۆستای خانەی ژیان لە قوتابخانە دەردەکرێی. لەبەر ئەوەی هەموو کارمەندەکانی پاشایەتی کە لە خانەی ژیان کاردەکەن، وەک من حەزیان بە زێڕ و پارە و خواردن و ژنی جوانە.

وەرە سینۆهە، من لە باوەش بگرە و بمبەرە ژوورەکەم، بۆ ئەوەی بنووم و تۆش



بنووە، چونکە سبەینێ بەرەبەیان دەبێ هاتنەدەرەوەی باڵندەکە لە لووتی فیرعەون ببینین و بە دەستوخەتی خۆمان بنووسین کە باڵندەکەمان بینیوە لەکاتی دەرچوونیدا و کەوتە شەقەی باڵ و فڕییە ئاسمان.

من وەک بەندەیەک کە گەورەکەی خۆی لە باوەش دەگرێ و بۆ ئەمبەر و ئەوبەری دەبات ئەو پیرەمێردەم، کە سووکیش بوو، لە باوەش گرت و بردمە کۆشکەوە و لە هۆدەکەی تایبەت بەخۆی خەواندم.

بەڵام خۆم نەمدەتوانی بنووم، چونکە گەنجێتی نەیدەهێشت خەوم لێ بکەوێ و لە کۆشک هاتمە دەرەوە و لە بەرامبەر کۆشک لە نێو گوڵەکاندا وەستام و تەماشای رۆشنایی شاری (تەبەس)م دەکرد و بە بینینی ئەستێرەکانی ئاسمان سەرگەرم بووم و لەکاتێکدا کە بۆنی گوڵەکانم هەڵدەمژی کەوتمە بیری ئەو ژنە جوانەی کە رۆژێ هاتە خانەی ژیان و وتی ناوم (نەفر نەفر نەفر)ە و داوای لێ کردم کە بچم بۆ ماڵەکەی، بەڵام من نەرۆیشتم، چونکە دەترسام داوای شتێکم لێ بکات کە لە توانای من بەدەربێت.

لەو شەوەدا ئارەزووی ئەو ژنەم لە دڵدا دەپەروەراندو بەخۆم دەوت چەند خۆش دەبوو ئەگەر سبەینێ بهاتبایەتە خانەی ژیان یان، من بمزانیبایە ماڵی لە کوێیە و خۆم بچوومایەتە لای.

***

١ – شنجرف : سولفوری جیوە – ئۆکسیدی سووری قورقوشم – یەکێک، لە جۆرەکانی بەردی کانی جیوە ، بۆ مەبەستی خاوێن کردنەوە بەکاردێت – وەرگێڕی کوردی .

٢ – هەروەکو کە دەبینن پاتوور بە شاژن دەڵێ (فیرعەون دەمرێ ) و هیچ تێبینی ئەوە ناکات کە دڵگران دەبێ و بەبێ پێشەکی ئەم قسەیەی پێ دەڵێ، چونکە لەمیسردا خەڵکی بەشێوەیەک شەو و رۆژ لە فکری مردندا بوون کە کەس بە بیستنی فلان کەس مردووە یان دەمرێ نەدەلەرزی ، بەڵام پێی تێک دەچوو – وەرگێڕ .

٣ – ئەم ناوانەی ئەیخوێننەوە ناوی مێژوویییە و (نەفر تی تی) ئەوەیەکە لە دواییدا دەبێتە شاژنی میسر و مەبەستی پاتوور لە بوونە خوشکی ئەوەیە کە جێنشینی میسر ئەو دەکاتە ژنی خۆی ،

چونکە ژن و مێردایەتی خوشک و برا ئەوسا ئاسایی بووە – وەرگێڕ .

## بەشی حەوتەم

# جێنشینی میسر و فێدارییەکەی

لە ناکاودا لە نێو گوڵەکاندا گوێم لە دەنگێ بوو و زانیم یەکێ لێم نزیک دەبێتەوە. کە لێم نزیک بووەوە سەیری کردم کە بمناسێت.

من ئەوم ناسی و زانیم جێنشینە و لەو کاتەدا بینینی ئەو پیاوە گەنجەم لەوێدا پێ سەیربوو و ترسام و دەستم بە ئەژنۆمەوە ناو داچەمیمەوە. جێنشین وتی: سەرت هەڵبڕە کەس لێرە ئێمە نابینێت و پێویست ناکات خۆت بچەمێنیتەوە ، ئایا تۆ ئەوە نیت کە ئەمڕۆ لە ژوورەکەی باوکمدا چەقۆ و چەکوشت دەدایە مەیموونە پیرەکە؟

من کە بە بیستنی ناوی مەیموونی پیر سەرم سوڕمابوو سەرم هەڵبڕی و ئەو وتی: مەبەستم لە مەیموونی پیر ئەم (پاتوور)ـەیە کە ئیمڕۆ سەری باوکمی هەڵدڕی و ئەم ناوە دایکم لێی ناوە و تۆ و ئەو، هەر کاتێ باوکم بمرێ دەکوژرێن.

لەم وتەیەی زۆر ترسام، چونکە نەمدەزانی ئەگەر سەری فیرعەونێک هەڵبدڕن و چارەسەر نەکرێ، ئەو پزیشکەی نەشتەرگەریی دەکات دەکوژرێ.

(پاتوور) ئەم بابەتەی بەمن نەوتبوو و من پێم سەیر بوو بۆچی ئەو پیاوە بێ دەنگی لێ کردبوو و، هەروەها من تاوانم نەبوو کە منیشی لەگەڵدا بکوژن. کەسێ کە لە کاتی نەشتەرگەری کێردو چەکوش دەداتە دەست پزیشکەکە گوناهبار نییە و نابێ بکوژرێ، چونکە چاک بوونەوەی نەخۆش بەدەست ئەو نییە.



جێنشین وتی: من ئەزانم ئیمشەو خوام لێ دەردەکەوێ، بەڵام لە کۆشکدا نایاتە لام، بەڵکو لەدەرەوەی کۆشک خۆی نیشانم دەدات ، دەزانم لەکاتی دەرکەوتنی خوا هەموو لەشم دەلەرزێ و دەنگم دەرناچێ و دەبێ یەکێک هەبێ یارمەتیم بدات و لەبەر ئەوەی تۆم لەسەر ڕێگاکەم دیییەوەو ئەزانم پزیشکی لەگەڵ خۆم دەتبەم... وەرە بڕۆین.

من نەمدەویست لەگەڵ ئەوکوڕە گەنجەدا بڕۆم، چونکە پاتوور پێی وتبووم کە دەبێ لەکاتی مەرگی فیرعەون لە کۆشکدا بین، بەڵام نەمدەتوانی لە فەرمانی جێنشین سەرپێچی بکەم و ناچار بووم لەگەڵیدا بڕۆم.

جێنشین سوخمەیەکی کورتی لەبەر بوو، بە شێوەیەک کە ڕانەکانی دیار بوو و من سەیرم کرد کە ئەو لە من باڵای بەرزترەو هەنگاوەکانی گەورەتر بوو. کاتێ گەیشتینە کەناری نیل جێنشین وتی دەبێ لە ڕووبار بپەڕینەوەو خۆمان بگەیەنینە ڕۆژهەڵات و گوریسی بەلەمێکی کردەوە کە لە کەناری ڕووباربوو و هەردووکمان تیایدا دانیشتین و من بە (سەوڵ) بەلەمەکەم لێخوڕی.

کاتێ گەیشتینە ئەوبەری ڕووبار جێنشین بەبێ ئەوەی بەلەمەکە ببەستێتەوە بەرەڵلای کرد و ئاو بەلەمەکەی برد و ئێمە بەرەو ڕۆژهەڵات کەوتینە ڕێ و، چونکە ئەو بە خێرایی دەڕۆی من ناچاربووم لە دوایەوە رابکەم و لەشم عارەقەی کرد، تا گەیشتینە شوێنێ کە شاری تەبەس و باخەکانی کەوتە پشتمانەوە و سێ شاخی نزم کە لە ڕۆژهەڵاتدا پاسەوانی (تەبەس) بوون دەرکەوت.

کاتێ گەیشتینە ئەو شوێنەی کە کەسمان لێوە دیار نەبوو و هیچ شتێ نەدەبیسترا، جێنشین لەسەر زەوی دانیشت و وتی : لەم جێگایەدا خوا خۆی ئاشکرا دەکات.

من سەرم سوڕما بوو کە چۆن خوا خۆی بۆ دەردەخات و ئایا منیش ئەیبینم یان نا؟ تا کاتێ کە هەتاو هەڵهات و جێنشین بانگی کردم: (سینۆهە) وەرە خوا هات... وەرە بمگرە دەستم دەلەرزێ.

من دەستم گرت و هەر چەندە هەتاو بەرزتر دەبووەوە شلەژانی جێنشین زیاتر دەبوو و کەوتە سەرخاک و بەدەوری خۆیدا سووڕایەوەو، ئەو ساکە من، کە لەو تێکچوونەی ترسابووم ئاسوودە بووم، چونکە زانیم کە جێنشین تووشی گەشکە بووە و ئەم جۆرە نەخۆشییەم لە خانەی ژیان بینی بوو.

کاتێ کە یەکێ فێ دەیگرێ لەوەیە زوبانی خۆی بە ددان بقرتێنێ، بۆیە کەرتە دارێ دەخەنە نێوان دوو ریزە ددانەکانی و من لەوێ دارم پێ نەبوو و ناچار بووم کەرتی لەکراسەکەی خۆم بدڕێنم و بیکەمە بەینی ددانەکانی بۆ ئەوەی زمانی نەبڕێ. ئەوسا بەو شێوەیەی کە لە کتێبدا نووسرابوو کەوتمە شێلانی لەشی و لەوکاتەدا کە خەریکی شێلانی بووم هەلۆیەک وەک ئەوەی لە خۆرەوە بێتە دەرێ دەرکەوت و بە بان سەری ئێمەوە دەفڕی و وەک ئەوە وابوو بیەوێ بنیشێتە بان سەری جێنشین.

من لە دڵی خۆمدا وتم: لەوەیە ئەو خوایەی کە جێنشین چاوەڕوانێتی ئەم هەلۆیە بێت. بەڵام چەند دەقیقەیەکی تر گەنجێکی جوان کە رمێکی بەدەستەوە بوو و وەک دانیشتووانی شاخەکانی سووریا سینەپۆشێکی لەبەردا بوو دەرکەوت.

ئەوەندە ئەو کوڕە جوان بوو، کە من لەبەرامبەریدا چەمیمەوە، چونکە وام زانی خوای (جێنشینە). گەنجەکە بە زمانی میسری لە منی پرسی ئەمە کێیە؟ ئایا نەخۆشە؟

من وتم: ئەگەر تۆ خوایت ، ئەم کوڕە چاک بکەوەو ئەگەر چەتەی بزانە کە ئێمە هیچمان پێ نییە بتدەینێ.

هەلۆکە ، کە لە ئاسماندا دەفڕی هاتە خوارەوە و لە سەر شانی کوڕەکە نیشتەوەو دوایی کوڕەکە وتی: من خوانیم و کوڕی ژن و پیاوێکی پەنیر فرۆشم، بەڵام توانیومە نووسین فێربم و ، پێشبینییان کردووە کە من دەبمە فەرماندەی خەڵک و ئێستا هاتوومە بچم بۆ شاری تەبەس بۆ ئەوەی لەلای فیرعەون خزمەت



بکەم، چونکە بیستوومە فیرعەون نەخۆشە و پاشایەکی نەخۆش لە هەمووکات زیاتر پێویستی بە هی وەک من هەیە کە پارێزگاریی لێ بکات.

دوایی سەیرێکی جێنشینی کردو وتی: ئایا ئەمە بەم نەخۆشییە دەمرێ؟

وتم: نا... نەخۆشییەکەی نابێتە هۆی مردن ، بەڵام مرۆڤ لە هۆش خۆی دەبات و ئاگای لە خۆی نامێنێت.

جێنشین هاتەوە هۆش، بەڵام لەبەر سەرمای بەیانی لەشی کەوتە لەرزین و ئەو گەنجەی رِمی پێ بوو سوخمەکەی خۆی داکەندو دای بەسەر جێنشینداو وتی: ئێستا چی دەکەی؟

وتم: ئەگەر تۆ یارمەتیم بدەی دەیبەینە شار و لەوێ کەژاوەیەک پەیدا دەکەین و دەیخەینە ناوی و دەیبەینەوە بۆ ماڵی خۆی.

کوڕەکە وتی: زۆر باشە من ئامادەم یارمەتیت بدەم و بیبەینەوە شار.

جێنشین دانیشت، بەڵام دەلەرزی بەشێوەیەک کە کوڕە رم بەدەستەکە یارمەتیی دا تا سوخمەکەمان لەبەر کرد و پێمی وت: ئەم کوڕە لە دەوڵەمەندەکانە چونکە پێستی لەشی سپییە و دەستێکی سپی و ناسکی هەیە. دوایی دەستەکانی منیشی گرت و وتی: تۆش دەستی نەرمت هەیە، ئیشی تۆ چییە؟

وتم: من پزیشکم و لە خانەی ژیان لە ناو پەرستگای ئاموون-دا فێری پزیشکی بوومە.

کوڕە رمدارەکە وتی: وادیارە ئەم کوڕە گەنجەت هێناوە لێرە چاکی بکەیتەوە، بەڵام باش بوو جلێکت لەبەر کرد، چونکە بەیانیان هەوای بیابان ساردە.

جێنشین بەهۆی گەرمیی کراسەکە و بەرزبوونەوەی خۆر لەرزینەکەی نەماو لە ناکاودا کە گەنجەکەی دی، وتی: ئەم کوڕە زۆر جوانە و... لێی پرسی: ئایا تۆ لەلایەن خوا (ئاتوون) هاتوویتەتە لای من؟

کوڕە نەیزەدارەکە وتی: نا...

جێنشین وتی: ئەمڕۆ من توانیم خوا (ئاتوون) ببینم و کاتێ کە خۆر هەڵهات بینیم و وام زانی تۆی ناردۆتە لای من.

کوڕەکە وتی: من لەلایەن خواوە نەهاتوومە بەڵکو دوێنێ شەو کەوتمە ڕێ کە ئیمڕۆ سەرلە بەیانی بگەمە تەبەس و بچمە ژێر دەسەڵاتی فیرعەونەوە و دوای خۆرهەڵاتن بینیم هەڵۆکەم بەرەو پێشەوە فڕی و زانیم لێرەدا شتێک سەرنجی ڕاکێشاوە و کاتێ هاتم ئێوەم بینی.

جێنشین وتی: ئەم ڕمەت بۆ بەدەستەوەیە؟

گەنجەکە وتی: سەری ئەم ڕمە لە (حەوجۆش)ـەو من هاتووم کە بە خوێنی دوژمنانی فیرعەون سووری بکەم.

جێنشین وتی: من لە خوێن ڕشتن بێزارم، لەبەر ئەوەی ڕشتنی خوێن خراپترین شتە.

گەنجەکە وتی: بەڵام من ڕایەکی پێچەوانەی تۆم هەیە و لەو باوەڕەدام ڕشتنی خوێن دەبێتە هۆی پاک کردنەوەی گەلان و بەهێزیان دەکات و خوایەکان خوێنیان خۆش دەوێت، چونکە بە خواردنی خوێن قەڵەو دەبن و تا ئەو ڕۆژەی شەڕ هەیە خوێن ڕشتن بەردەوامە.

جێنشین وتی: من کارێک دەکەم کە ئیتر شەڕ دروست نەبێت.

کوڕەکە سەیرێکی کرد و وتی: وابزانم ئەم کابرایە شێتە، چونکە شەڕ هەردەم هەبووە و بەردەوامیش دەبێت و خەڵکی هەرچییەک بکەن کەلە جەنگ دوورکەونەوە زیاتر لێی نزیک دەبنەوە. جەنگ وەک هەناسەکێشان پێویستە بۆ ژیانی میللەتان.

جێنشین سەیرێکی خۆری کرد و وتی: هەموو گەلان کوڕی ئەون ، چونکە ئەو (ئاتوون)ەو بە پەنجە ئیشارەتی بۆ خۆر کردو وتیەوە: هەموو زەمین و زەمانەکان هی ئەون، من لە تەبەس پەرستگایەکی بۆ دروست دەکەم و شێوەکەی بۆ هەموو پاشاکان دەنێرم و من لەوەوە دروست بوومە و دەگەڕێمەوە لای ئەو.



کوڕە ڕمدارەکە دوای بیستنی ئەم قسانە وتی: گومانم نییە کە ئەو شێتە و تۆ ناهەقت نەبووە هێناوتە بۆ ئەم بیابانە کە چاکی بکەیتەوە.

من وتم: ئەو شێت نییە، بەڵکو لەکاتی گەشکەکەیدا توانیویەتی خوای خۆی ببینێ و ئێمە مافی ئەوەمان نییە دەربارەی ئەوەی بینیویەتی ڕەخنەی لێ بگرین، چونکە هەموو کەسێ دەتوانێ هەر خوایەک کە خۆی حەزی لێیەتی هەڵیبژێرێ و بیپەرستێ و گوێڕایەڵی بێت.

دوایی جێنشینمان هەڵگرت و بەرەو شارمان برد و لەبەرئەوەی کە بەهۆی گەشکە گرتنەکەی لاواز بووبوو لە دوو لاوە قۆڵمان گرت و هەڵۆکەش لە پێش ئێمەدا دەفڕی و لە نزیکی شار بینیم کە کاهینێ بە کەژاوەیەک و هەندێ بەندەوە چاوەڕوانی جێنشینە و، بە گومانی خۆم وتم دەبێ ئەم کاهینە (ئامی) بێت.

یەکەم هەواڵێک کە ئامی بە جێنشینی ڕاگەیاند ئەوەبوو کە باوکی، (ئامن هوتپ)ی سێیەم کۆچی دوایی کردووە، پاشان کراسی کەتانی لەبەر کرد و کڵاوێکی خستە سەری[1].

(ئامی) وتی: سینۆهە ئایا ئەو توانی خوای خۆی ببینێ؟

وتم: خۆی دەڵێ خوام بینیوە، بەڵام من لەبەر ئەوەی ئاگام لێ بوو کە هیچی لێ نەبێت و چارەسەرم دەکرد خوایەکەیم نەبینی. بەڵام تۆ چۆن ناوی منت زانی، چونکە من باوەڕ ناکەم تۆم لە هیچ کاتێ بینیبێ؟

(ئامی) وتی: ئەرکی من ئەوەیە کە ناوی تۆ بزانم و لە ڕووداوەکانی کۆشک بەئاگابم و من زانیم کە جێنشین کە ئێستا فیرعەونە شەوی پێشوو تووشی گەشکە دەبێت و دەبێ تەنها بێت، چونکە هەر کاتێ هەست بکات ئەم نەخۆشییە ڕووی تێ دەکات تەنیایی هەڵدەبژێرێ و ئەگەریش نەیەوێت تەنها بێت ئێمە هەوڵ دەدەین کەسی لەلا نەبێت، لەبەر ئەوەی هیچ کەسێ نابێ گەشکەی جێنشین ببینێ و بڕوانێتە کەف کردنی دەمی. شەو کاتێ بینیم دوای دەرچوونی لە کۆشک گەیشتە تۆ ئیتر دڵنیابووم چونکە دەمزانی تۆ پزیشکی و

به کاهینی پەرستگەش لەقەڵەم دەدرێی، چونکە هەتا یەکێ نەبێتە کاهینی پەرستگە ناهێڵن بێتە خانەی ژیانەوە، من کاهینی پەرستگەی (ئاتوون)م و ئەگەرچی من و تۆ شوێن کەوتووی دوو خوای جیاوازین، بەڵام هێشتم جێنشین شەوی رابردوو لەگەڵ تۆدا بڕواتە دەرەوە بۆ ئەوەی پزیشکێ ئاگاداری لێ بکات و من دڵنیابووم لەوەی کە فێدەیگرێ.

دوایی ئیشارەتی بۆ گەنجە رم بەدەستەکە کرد و وتی: ئەمە کێیە؟

وتم: ئەوە گەنجێکە کە ئیمڕۆ بەیانییەکەی تووشی ئێمە بوو و هەڵۆیەک لە بان سەریەوە دەفڕێ و، ئەو باڵندەیەیە کە ئێستا لەسەر شانێتی.

(ئامی) وتی: ئایا کاتی گەشکە گرتنەکەی جێنشین ئەم جەوانە لەوێ بوو و دیمەنی نەخۆشییەکەی ئەوی بینی؟

وتم: بەڵێ

وتی: کەواتە دەبێ ئەم کوڕە بکوژرێت.

وتم: بۆچی؟

وتی: لەبەر ئەوەی جێنشین ئێستا فیرعەونە و ئەگەر خەڵکی بزانن فیرعەون تووشی نەخۆشی گەشکە بووە و جارجار ئەم بارەی تووش دەبێت و دەبوورێتەوە باوەڕی پێ ناهێنن.

وتم: ئەم گەنجەی دەیبینی ئەمڕۆ لە بیابان سینەپۆشەکەی خۆی داکەندو دای بە جێنشین کە لە سەرمادا نەلەرزێ و خۆی دەڵێ بۆ ئەوە هاتووە کە لەگەڵ دوژمنانی فیرعەوندا شەڕ بکات و جگە لەمانەش کوڕێکی سادەیە و عەقڵی بەوە ناشکێ جێنشین تووشی نەخۆشی گەشکە هاتووە.

(ئامی) بانگی کوڕەکەی کرد و وتی: بیستوومە تۆ ئیمڕۆ خزمەتێکت بە جێنشین کردووە و ئەم حەڵقە زێڕە پاداشتی خزمەتەکەی تۆیە. دوای ئەمە حەڵقە زێڕەکەی بۆ هەڵدا، بەڵام گەنجەکە حەڵقەکەی نەگرتەوە و کەوتە سەر زەوی.

(ئامی) وتی: بۆچی ئەو زێڕەی دەتدەمێ وەری ناگریت؟



کوڕەکە وتی: لەبەر ئەوەی من تەنها لە فیرعەون فەرمان وەردەگرم نەک لەکەسی تر و وابزانم فیرعەون ئەم گەنجەیە کە ئێستا کڵاوی لەسەردایە و، ئەمڕۆ هەڵۆکەی من بەرەو ئەوی هێنام. دوایی بەرەو فیرعەونی تازە رۆیی و وتی: من هاتووم کە خۆم بخەمە ژێر خزمەتی فیرعەون، ئایا تۆ کە ئیمڕۆ فیرعەونی ئامادەی من لە خزمەتدا وەربگری؟

فیرعەونی نوێ وتی: بەڵێ تۆ لە خزمەتی مندا دەبی، بەڵام بە مەرجێ رمەکەت بدەیتە دەست یەکێ لەم بەندانەی من، چونکە من لە رم کە وەسیلەی خوێنڕشتنە بێزارم و هەموو گەلان بە یەکسان دەزانم، چونکە هەموو کوڕی (ئاتوون)ن و لەبەر ئەوەش کەسیان نابێ یەکتری بکوژن.

پیاوە گەنجەکە دارە سەربە ئاسنەکەی دایە یەکێ لە بەندەکان و ئینجا فیرعەون سواری کەژاوەبوو و ئێمە بەپێ لە دوایەوە بەڕێ کەوتین تا گەیشتینە نیل و سواری بەلەم بووین و بەرەو کۆشک هەنگاومان نا. کۆشک پڕبوو لە قەرەباڵغی و فیرعەون دوای چوونە ژوورەوە، ئێمەی بەجێهێشت و چووە لای شاژن واتە دایکی.

کوڕە نەیزەدارەکە لە منی پرسی ئێستا من چی بکەم و بۆ کوێ بڕۆم؟

وتم: هەر لێرە بەو مەجووڵێوە، تا فیرعەون لە رۆژەکانی داهاتوودا دەتبینێ و جێگایەکت بۆ دیاری دەکات، چونکە فیرعەون خوایە و خوایەکان فەرامۆشکارن و ئەگەر ئەو تۆ نەبینێ قەت بیری ناکەوێتەوە کە تۆی هێناوەتە ژێر رکێفی خزمەتی خۆیەوە.

کوڕەکە وتی: من بۆ ئایندەی میسر زۆر بە پەرۆشم.

من وتم: بۆچی؟

وتی: لەبەر ئەوەی ئەم فیرعەونە نوێیەی ئێمە لە خوێن دەترسێ و حەزناکات خوێن بڕژێت و ئەڵێ هەموو میللەتان دەبێ یەکسان بن و من کە شەڕکەرێکم ناتوانم ئەم باوەڕە بسەلمێنم چونکە دەزانم ئەم بیر و باوەڕە بۆ سەربازێکی جەنگی

زۆر زەرەری هەیە و، بەهەرحاڵ من دەچم رمەکەی خۆم لە بەندەکە دەستێنمەوە.

وتم: ناوی من سینۆهەیە و لە خانەی ژیاندام کە لە پەرستگەی (ئاموون)ـە و ئەگەر کارێکت هەبوو وەرەلام. من لێی جیابوومەوە و بەرەو ئەو ژوورەی کە شەوی رابردوو پاتووری تێدا نووستبوو چووم و کەمنێ دی نارەزایی دەربڕی و وتی: سینۆهە تۆ هەڵەیەکی گەورەت کردووە کە لێخۆش بوونی نییە.

پرسیم: هەڵەی من چییە؟

پاتوور وتی: شەوی رابردوو کە فیرعەون کۆچی کرد تۆ لە کۆشک چوبوویتە دەرەوەو شەو لە یەکێ لە ماڵەکانی رابواردن بوویت و، بە هۆی لێرە نەبوونت کەس منی خەبەر نەکردەوە و من لە کاتی مەرگی فیرعەون لەوێ نەبووم و دەرچوونی باڵندەکەم نەبینی.

وتم: هۆی لێرە نەبوونم خەتای منی تێدانەبوو، بەڵکو جێنشین فەرمانی دا کە لەگەڵی برۆم و ئەوسا هەموو رووداوەکانم تا کۆتایی بۆگێڕایەوە.

پاتوور کاتێ گوێی لە قسەکانم بوو وتی: پەنا بە (ئاموون)، چونکە فیرعەونە نوێیەکەی ئێمە شێتە..

وتم: ئەو شێت نییە، بەڵکو تووشی نەخۆشیی گەشکە بووە و هەندێ جار ئەم نەخۆشییە دەیگرێ.

(پاتوور) وتی: فێدار و شێت یەک شتە، لەبەر ئەوەی یەکێ کە تووشی فێ دەبێت عەقڵی تەواوی نییە و بە زوویی دەبێتە وەسیلەی دەستی خەڵک و من بۆ گەلی میسر کە دەبێ لە ژێر دەسەڵات و فەرمانی ئەم فیرعەونە فێدارەدا بژین بە پەرۆشم.

لەم کاتەدا لە لایەن دادوەری گەورەوە خەبەریان هێنا کە بچینە لای بۆ ئەوەی بە پێی یاسا سزا بدرێین چونکە یاسا دەڵێ کاتێ فیرعەون بەهۆی کون کردنی سەری دەمرێ دەبێ ئەوانەی دەستیان لەم کارەدا هەبووە بکوژرێن.

من لەم هەواڵە لەشم لەرزی، بەڵام پاتوور دیسانەوە چاوێکی لێ داگرتم کە



نەترسم و بە هێواشی وتی: ئەم یاسایە هەرگیز بەمانا راستەقینەکەی جێبەجێ ناکرێ.

هەندێ سەرباز هاتن و ئێمەیان بردە لای دادوەری گەورە، کە لە کۆشک بوو و بینیم کە چل پێستی لوول دراو، کە یاسای چل دانەیی ولاتی میسرە، لەبەردەمیدایەو هەریەکە لەم لوول دراوانە (دەفتەرێکی درێژ)بوو کە یاسایان لە سەری نووسیبوو.

(پاتوور) دوای چوونە ژوورەوە، چووە شوێنی دادوەر و لەگەڵیدا دوا. ئێمە سێ کەس بووین کەبە پێی یاسا سزامان مردن بوو:- یەکەم پاتوور، دووەم من و، سێیەم ئەو کابرایەی خوێنی دەوەستاند. دوای ئامادەبوونمان لەبەردەم دادوەر سەربازەکان رێگاکانی چوونە دەرەوەیان گرت کە نەتوانین هەڵ بێین و دوایی (جەلاد) هاتە ژوورەوە.

دادپرسی گەورە وتی: ئێوە لەبەر ئەوەی نەتانتوانی فیرعەون چاک بکەنەوە شیاوی مردنن و دەبێ بمرن. کابرا چارە رەشەکەی خوێنی دەوەستاند لەشی دەلەرزی و پاتوور بە دەمە بێ ددانەکەی خۆی لێی پرسی تۆ دایکت ماوە یان نا؟

کابرا وتی: دایکی من چوار ساڵ لەمەوبەر مردووە.

پاتوور بە دادوەرەکەی وت: کەواتە لە پێشا ئەم پیاوە لە ناو ببەن، چونکە دایکی لەو دنیا ئابگۆشتی[٢] نۆک و لۆبیای بۆ لێناوە و چاوەڕوانی رۆیشتنی ئەم دەکات بۆ ئەو دنیا.

کابرای بێچارە کە نەیدەزانی ئەو قسانە گاڵتەیە لەبەردەم جەللادەکە ئەژنۆی خستە سەر زەوی و، جەللاد شمشێرە گەورەو گرانەکەی خۆی، کە رەنگی سوور بوو هەڵیسووڕاندو بە هێواشی خستییە سەر ملی پیاوەکە و هەر چەندە هیچ ئازارێکی پێ نەگەیشت ، بەڵام لە هۆشی خۆی چوو.

جەللاد بەسەربازەکانی وت لای ببەن و دوایی من ئەژنۆم دانەواند و جەللاد بە پێکەنینەوە شمشێرەکەی خستە سەر ملم و من بەبێ هیچ ئازار و برینێ

هەڵسامەوە.

کاتێ نۆرەی (پاتوور) هات، جەلالاد هەر ئەوەندە شمشێرەکەی خۆی لە بان سەری جوولآند. دوایی خەبەریان داپێمان فیرعەونی نوێ دەیەوێ پاداشتی ئێمە بداتەوەو ئێمەیان لە هۆدەی دادپرس دەرکرد، بەڵام هەرچەندە هەوڵیاندا کابرای لە هۆش چوو هەڵبستێنن نەیانتوانی و بەسەرسوڕمانەوە سەیرمان کرد مردووە.

من ناتوانم بڵێم هۆی مردنی ئەو پیاوە چی بووە، چونکە هیچ نەخۆشییەکی نەبوو مەگەر ئەوەی بڵێین لە ترسا مرد و ئەگەرچی کابرایەکی نەزان بوو، من بەمەرگی دڵگران بووم ، چونکە دووەم کەسێ نەبوو کە بتوانێ بە ئامادەبوونی لە دیار سەری نەخۆش خوێنەکەی بوەستێنێ و لە دوای ئەو لە هەموو سەردەمی پزیشکیی خۆمدا نەمدی کەسێ بتوانێ بە لە دیار سەربوونی خۆی خوێنی برین بەند بکات.

فیرعەونی نوێ ملوانکەیەکی زێڕی دایە پاتوور و ملوانکەیەکی زیوی دایە من، کە کردیانە ملمان و، هەردووکمان کراسی کەتانمان لەبەر کراو لە کۆشکی پاشایەتی گەڕامەوە خانەی ژیان. لەوێ هەموو قوتابییان بەرامبەرم داچەمییەوەو مامۆستاکان مەراییان لەبەر دەکردم.

کۆنووسی چۆنیەتیی نەشتەرگەرییەکی فیرعەون لە لایەن پاتوورەوە بە من سپێردرا و ئەو وتی: سینۆهە لەم ناوەرۆکەدا دەبێ هەندێ شت بنووسی، یەکەم ئەوەی کە کاتێ سەری فیرعەونمان کردەوە بۆنی عەترمان لێی کرد و، دووەم لە کاتی مەرگیدا باڵندەیەکمان بینی کە لە لووتییەوە هاتە دەرێ و یەکڕاست بەرەو خۆر چوو.

وتم: (پاتوور) ئەگەر لە هەڵەدانەبم کاتێ فیرعەون مرد هێشتا خۆر هەڵ نەهاتبوو.

پاتوور وتی: گەوجە خۆر هەموو کاتێ هەیە بەڵام هەندێ کات لە خوار ئاسۆوەیەو هەندێ کات لە سەریدایە.



وتم: زۆر باشە ئەمە دەنووسم...

پاتوور وتی: هەروەها بنووسە کە فیرعەون چەند ساتێ پێش مردنی چاوی هەڵهێناو بەخوایەکانی وت ئێستا بۆ لای ئێوە دێمەوە.

من باسێکی تێر و تەسەل و سەرنج ڕاکێشم لە بارەی مردنی فیرعەون نووسی، بەشێوەیەک کاتێ پاتوور خوێندییەوە کەوتە پێکەنین و وتی باشت نووسیوە و، دوایی کۆنووسەکە تا حەفتا ڕۆژ لە پەرستگەکانی (ئاموون) و پەرستگاکانی تری شاری گبس خوێندرایەوە. لەو حەفتا ڕۆژەی لاشەی فیرعەون لە (خانەی مەرگ)[۳] بۆ ژیانی دنیای تر ئامادە دەکرا و مۆمیاییان دەکرد، هەموو دوکانەکانی خواردنەوە و خانووەکانی خۆشگوزەرانی لە تەبەس داخرابوو، بەڵام لەم بارەیەوەش هەر وەک لە سێدارەدانی پزیشکەکان هەر بە ڕواڵەت یاسایان جێ بەجێ دەکرد، چونکە هەموو دوکانەکانی خواردنەوە و خانووەکانی ڕابواردن دوودەرگایان هەبوو و خەڵکی لە دەرگای دواوە دەچوونە ئەم جێگایانە و دەیانخواردەوە و کەیف خۆشییان دەکرد.

لەو ڕۆژانەدا کە تەرمی فیرعەون مۆمیایی دەکرا، مزگێنییان داپێم کە ماوەی خوێندنم لە خانەی ژیان تەواو بووە و دەتوانم لە هەر گەڕەکێکی شار کە بمەوێ خەریکی پزیشکی بم. خانەی ژیان چوارده بەشی پسپۆریی تایبەتیی هەبوو کە قوتابی کامیانی بەدڵ بووایە هەڵی دەبژارد و من بە ڕەزامەندییەوە لەم قوتابخانەیە هاتمە دەرێ و بە ملوانکە زیوەکەی فیرعەون دابووی پێم خانوویەکی بچووک و بەندەیەکم کڕی کە ناوی (کاپتا) بوو و یەک چاوی هەبوو و ئەو دوای ئەوەی زانیی من پزیشکم وتی: من لە هەموو شوێنێ دەڵێم هەر دوو چاوم کوێر بوو و گەورەکەم چاوێکمی شیفا داو چاکی کردەوە.

داوام لە (توتمس) دۆستە هونەرمەندەکەم کرد، خانووەکەم بە نەخش بڕازێنێتەوە و، ئەو خوای پزیشکی لە قەد دیواری هۆدەکەی مندا کێشا و وێنەی منیشی لە تەکیدا کێشا کە خوای پزیشکی دەیوت: سینۆهە باشترین قوتابیی

منه و زیرەکترین و سەردەرچووترین پزیشکی (تەبەس)ـە و من. چەند رۆژێ لە ماڵەوە دانیشتم، بەڵام کەس بۆ چارەسەر نەهاتە لام.

١- لێرەدا مەبەست لە کڵاو تاجە - وەرگێڕ .

٢ - ئابگۆشت : نۆکاوی بەگۆشت

٣ - خانەی مەرگ : دارالممات

**بەشی هەشتەم**

## بوومە پزیشکی هەژاران

رۆژێکیان لە عەیادەکەی خۆمدا چاوەڕوانی نەخۆشم دەکرد کە بینیم یەکێ لە پاسەوانەکانی کۆشک هاتە ژوورەوەو پرسیی: سینۆهە کێیە؟

وتم: منم

وتی: پاتوور بانگهێشتی جەنابتانی کردووە.

پرسیم: پاتوور لە کوێیە؟

وتی: ئەو لە کۆشکی پاشایەتی چاوەڕێت دەکات.

پرسیمەوە: نازانی چ ئیشێکی بەمنە؟

وتی: وابزانم لە بارەی تەرمەکەی فیرعەونی پێشووە...

هەڵسام چوومە کۆشک و پاتوورم بینییەوەو وتی: سینۆهە وەک دەزانی ئێمە ئاخرین کەس بووین کە فیرعەونمان چارەسەر کرد، لەبەر ئەوەش مۆمیایی کردنی دەبێ لە ژێر چاودێریی ئێمەدا بکرێت.

وتم: ئەم فەرمانە بۆ لەم کاتەدا بە ئێمەی دەسپێرن؟ چونکە وابزانم ماوەیەکە کەسانی تر دەستیان پێ کردووە.

پاتوور وتی: بوونی ئێمە لە ئەنجامدانی مەراسیمی مۆمیایی تەنها بە مەبەستی چاودێرییە، چونکە خۆم ناتوانم بەشداربم، ئەم کارە بە تۆ دەسپێرم.

وتم: ئێستا دەبێ چی بکەم؟

وتی: دەبێ ئێستا بچیتە (خانەی مەرگ)ەوە و وا باشترە خواردن و جل و بەرگی خۆت ببەی، چونکە مانەوەت لەوێدا زیاتر لە پانزە رۆژ دەخایەنێ و لەم



ماوەیەدا تو چاودێریی کارە کۆتاییەکانی مۆمیایی کردنەکە دەبی.

وتم: ئایا بەندەکەی خۆم ببەم؟

پاتوور وتی: باشتر وایە واز لە بردنی بەندە بهێنی، چونکە ئەو وەک تۆ پزیشک نییە و بە بینینی هەندێ شتی (خانەی مەرگ) دەحەپەسێ.

من کە پزیشکێکم تا ئەو کاتە وام دەزانی لە بارەی مردن ئەوەی پێویست بێت بینیومە و وام دەزانی کە ئیتر هیچ شتێ نییە پەیوەندیی بە مردنەوە هەبێ و من لە نزیکەوە نەمدیبێ.

لە پێشەکیی ئەم بەسەرهاتەدا باسم کرد، ئێمەی پزیشکانی میسر مۆمیایی کردنی مردووەکانمان بە بەشێکی زانستە پزیشکییەکان نەدەزانی، چونکە ئەم کارە کەسانێک کە پسپۆڕیش نەبوونایە دەیانتوانی ئەنجامی بدەن. دوای ئەوەی چوومە (خانەی مەرگ) هەستم کرد من زۆر بەهەڵەداچووم کە وەک هەموو پزیشکەکانی تری میسر پسپۆڕیم بەو کەسانەوە بەستبووەوە کە دەرچووی کۆلێژی خانەی ژیان بوون. ئێمەی پزیشک لە رووی خۆپەسەندییەوە وامان دەزانی تەنها رێگای پسپۆڕبوونی پزیشک، تەواو کردنی قوتابخانەی پزیشکی و خانەی ژیانەو ئەگەر کەسێ لەم قوتابخانەیە نەخوێنێ ناتوانێ ببێتە پزیشکێکی کارامە. بەڵام کاتێ چوومە خانەی مەرگ و ئەو کرێکارانەم بینی کە هەرگیز نەهاتبوونە خانەی ژیان و لەگەڵ ئەوەشدا کارامەیی ئەوان لە ئیش و کاری شیکردنەوەی تەرمەکان، لە من کە پزیشکێکی تایبەتی بووم زیاتر بوو[1].

پاش گەڕانەوەم بۆ عەیادەکەی خۆم تا چەند رۆژێ خۆم دەشۆری بۆ ئەوەی بۆنی (خانەی مەرگ)م پێوە نەمێنێ و ئەم جارەیان نەخۆشەکان دەهاتنە لام و بۆ دەردە جۆراوجۆرەکان داوای دەرمانیان لێ دەکردم.

لە ماوەیەکی کەمدا لە ناو فەقیرە کەم دەرامەتەکاندا خۆشەویستییەکی زۆرم پەیدا کرد، چونکە هەرچییەکیان لەبری چارەسەر بدایەپێم وەرم دەگرت و وەک پزیشکەکانی پاشایەتی لە خۆبایی نەبووم کە بڵێم دەست هەق، بەس زێڕ یان زیو

وەردەگرم.

شەوان بەبۆنەی ئەوەی کە دڵم گەرمیی گەنجێتیی تێدابوو، دەچوومە دوکانەکە و لەگەڵ توتمسی هاوڕێمدا دەمخواردەوە و لە بارەی بارودۆخی ئەو کاتە قسەمان دەکرد.

(ئامن هوتپ)ی سێیەم فیرعەونی پێشوو کە من چاودێری مومیاییکردنەکەی بووم، قووچەکی نەبوو کە تیایدا بینێژن و لە یەکێ لە گۆڕە ئاساییەکاندا ناشتیان. دوای ناشتنی فیرعەون (جێنشین)ی کوڕی هاتە سەر تەخت و وتی بەتەمایە سەرەتا لای خوایەکان خۆی پاک بکاتەوە و دوایی بەشێوەی رەسمی ببێتە فیرعەونی میسر و لە ماوەی چاوەڕوانیی بوونە فیرعەونی کوڕەکەی، دایکی ریشێکی بە چەناگەوە ناو کلکێکی شێری بەدوایەوە نووساند کەلەکاتی بەڕێ رۆیشتندا کلکەکەی بە دەوری پشتییەوە دەبەست و لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت و لە جیاتی کوڕەکەی بەبەڕێوەبردنی کاروباری وڵات خەریک بوو.

یەکەم کارێ کە دایکی (جێنشین) کردی ئەوەبوو کە دادوەری گەورەی لەکارخست و لە جیاتی ئەو (ئامی)ی کە کاهینی پەرستگەی (ئاتوون) بوو کردە حاکم و، ئامی لە شوێن دادرەسی پێشوو لە بەردەم چل پارچە نووسراوی چەرمی درێژ کە یاسای میسری تێدابوو دانیشت و دەستی بە دادوەری کرد.

بەهۆی ئەم رووداوەوە هەندێ لە خەڵکی خەوی سەیر سەیریان بینی و باری نائاسایی شاری گرتەوە و تادوو رۆژ باران باری و ئەم بارانە هەندێ لە گەنمەکانی کەناری نیل، کە کۆمەڵ کرابوو رزاندی، بەڵام کەس ئەم رووداوانەی پێ سەیر نەبوو، چونکە بەردەوام کاتی تووڕە بوونی کاهینەکانی (ئاموون) ئەم شتانە رووی دەداو لەم کاتەدا کاهینەکانی پەرستگای ئاموون بەبۆنەی گرتنەدەستی پۆستی دادرەسی گەورە لە لایەن (ئامی)یەوە کە پیاوێکی نەناسراو بوو، تووڕەبوون. لەگەڵ ئەوەشدا کە کاهینەکانی (ئاموون) نارازی بوون، بەڵام چونکە



مووچەی سەربازەکان بە رێک و پێکی دەدراو لە رووی خواردن و خواردنەوەوە گرفتیان نەبوو، هیچ کارەساتێکی ناخۆش رووی نەدا.

هەموو پاشاکان بەمردنی فیرعەون دڵگران بوون و لە وڵاتانی دراوسێ ئەلواحی گڵی رۆس (لە کووره گەرم کراو)یان نارده میسر کە لەسەری چەند وشەیەک بەبۆنەی دەربڕینی خەم و پەژارەیان نووسرابوو و پاشای (میتانی) کچە شەش ساڵانەکەی خۆی نارد کە ببێتە خوشکی جێنشینی میسر، واتە فیرعەونی نوێ[۲]. وڵاتی میتانی لە سووریایەو نزیک دەریایە و کەوتۆتە نێوان سووریاو وڵاتانی باکوور و کاروانەکانی کە لە وڵاتی دووئاوەوە دەهاتن بە میتانیدا تێدەپەڕین و دەگەیشتنە دەریا.

هەموو شەوێ من و توتمس چەند کاتژمێرێ پێکەوە لەدوکان دادەنیشتین و لەم قسانەمان دەکردو جاری وابوو دوای ئەوەی لە دووکانەکە دەهاتینە دەرەوە کاتژمێرێ بەناوشاردا پیاسەمان دەکرد و دەمانڕوانییە بەلەمەکانی سەر ئاو کە خەڵکە شەونخوونەکانیان پێ دەسووڕاندەوە. هەندێ کاتیش لە سەرداوای توتمس دەچووینە گەڕەکی سریانییەکان و گوێمان لە ئاوازی کچە گۆرانیبێژەکان دەگرت، یان سەیری سەمامان دەکرد ، بەڵام نە سەماو نە ئاوازەکەیانم بەدڵ نەبوو.

لەو رۆژەوەی کە (نەفر نەفر نەفر)م لە خانەی ژیان بینی هیچ دیمەنێکی تر نەدەهاتە بەرچاوم و رۆژ بەرۆژ ئارەزووی بینینی ئەو ژنە لە دڵمدا زیادی دەکرد. شەوان کاتێ دەگەڕامەوە ماڵ لەبەرخواردنەوە یەکسەر خەوم لێ دەکەوت و بەیانیان کە هەڵدەستام مەستییەکە لە گیانم دەچووە دەرێ. (کاپتا) بەندە یەک چاوەکەم ئاوی بە دەست و دەم و چاو و سەرم دا دەکرد و دوایی نان و ماسیی سوێری دەداپێم.

دوای ئەوەی تیکەیەک نانی بەیانیم دەخوارد لە ژووری نووستن دەچوومە ژووری عەیادەکەمەوە و خەڵکی هەژار بۆ چارەسەر دەهاتنە لام و منداڵی هەندێ لەو ژنانە ئەوەندە لاوازبوون کە بەندەکەی خۆم دەنارده بازاڕ بۆ ئەوەی گۆشت و

مێوەیان بۆ بکڕێ و بیانداتێ.

ئەگەر ئەم خەرجییە بێ سوودانەم نەکردایە ئەمتوانی دەوڵەمەندببم، بەڵام هەر چییەکم پەیدا دەکرد یان لە مەیخانەدا سەرفم دەکرد یان لەماڵەکانی خۆشگوزەرانی، وەیان دەستگیری هەژارانم پێدەکرد. ڕۆژێ توتمس هاتە عەیادەکەم و وتی: سینۆهە ئیمڕۆ لە ماڵی یەکێک لە گەورەکان ئاهەنگ دەگێڕدرێ و چەند هونەرمەندێکیان بانگهێشت کردووە بۆ ئەوێ، کاتێ کە بە منیان وت، وتم باشە لەگەڵ سینۆهەدا بەیەکەوە لەو جەژنە ئامادەدەبین.

پرسیارم کرد: کێیە ئەم میوانداریيە دەکات؟

وتی: ژنێکە بەڵام ژنێکی زۆر دەوڵەمەند کە دەتوانێ زێڕ وەک حەڵقەی مس خەرج بکات (حەڵقەی زێڕ و زیو و مس وەک پارەی ئێستا مامەڵەی پێوە دەکرا – وەرگێڕ).

هەردووکمان خۆمان خاوێن کردەوە و بۆنمان لەخۆمان دا و بەرەو ماڵەکەی توتمس دەیوت بەڕێ کەوتین و هێشتا تەواو نەگەیشتبووینە ئەوێ بۆنی عەترمان دەکرد و دەنگی مۆسیقا لە دوورەوە دەهاتە بەر گوێ.

چووینە ماڵەکەوە و هەنگاومان نایە تەلارێکی بەرفراوان و، بینیم ژمارەیەکی زۆر لە جوانترین ژنەکانی میسر لەوێ بوون و هەندێکیان مێردیان هەبوو و ئەوانی تر بێوەژن بوون، پیاوی گەنج و پیریشی هەر لێبوو و لەسەر تەلارەکە وێنەی خوای (مراز دان)[٣] کێشرابوو کەسەری لە شێوەی سەری پشیلە بوو. هەندێ لە ژنەکان کە لەو ئارەزووەدا بوون پیاوێکی دەوڵەمەندیان بە نسیب بێت، جامی مەیەکەیان هەڵدەبڕی و بەرەو ئەو خوایە ئیشارەتیان دەکرد و دەیاننۆشییەوە. بەندەکان لە تەلارەکەدا بە گۆزەی پڕ لە خواردنەوە دەسووڕانەوە و پێکەکانیان پڕ دەکرد. ئەوەندە گوڵ ڕژابووە سەر زەوی کە بنی هۆدەکە دیار نەبوو و (توتمس) وتی: سەیرکە ئایا لە هیچ جێگایەک و هیچ کات و سەردەمێکی ژیانت تەلاری وا ڕازاوەو شکۆمەندت بینیوە؟



وتم: نا ...

توتمس وتی: تۆ دەتوانی زێڕ و پارە پەیدا بکەی و بە زوویی خانوویەکی جوان بۆ خۆت بکڕی.

لە ناکاو ژنێک بە ناوەڕاست تەلارەکەدا تێپەڕی و بەرەو ئێمەهات و هەر ئەوەندە چاوم پێی کەوت، دڵم کەوتە لەرزین و وتم: توتمس من وا هەست دەکەم خوایەکانیش دڵیان بەم ژنەوەیە.

سەیرکە چۆن بەڕێدا دەڕوات، سەیرکە چ چاو و دەمێکی جوانی پێوەیە...

بەڵام سەرسوڕمانەکەم بەوە زیاتر بوو کە بۆچی کەس سەرنج ناداتە ئەم ژنە کە لە ناو هەموو ژنەکانی ئەوێ لە جوانیدا تاکە. (تۆتمس) وتی: ئەم ژنە خاوەنی خانووەکەیە و ئەم ئاهەنگەی بە بۆنەی خوای مرازدەرەوە بەرپا کردووە، بۆ ئەوەی ئەو ژنانەی مێردیان نییە بتوانن لەم جەژنەدا داوا لە خوا بکەن مێردیان بداتێ و ئەوانەی مێردیشیان هەیە داوا بکەن مێردی دەوڵەمەندتریان بە نسیب بکات.

وتم: توتمس من ئەم ژنەم بینیوەو ئەیناسم، ئایا ئەم ژنە (نەفر نەفر نەفر) نییە؟

توتمس وتی: بەڵێ خۆیەتی

وتم: کاتێ لە خانەی ژیان بووم جارێکیان هاتە لام و قسەی لەگەڵ کردم.

(نەفر نەفر نەفر) لێمان نزیک بووەوە و بەڕووی هەردووکماندا زەردەخەنەیەکی هاتێ و من بە سەرسوڕمانێکەوە بۆم دەرکەوت ئەگەرچی دەمی بەزەردەخەنەیە بەڵام چاوەکانی پێناکەنن.

(نەفر نەفر) دەستی خستە سەر دەستی توتمس و ئیشارەتی بە یەکێ لە دیوارەکانی هۆڵەکە کرد و وتی: من لە تۆ کە ئەم دیوارانەت نەخشاندووە زۆر ڕازیم، ئایا دەستهەقی تۆیان داوە؟

توتمس وتی: بەڵێ من پاداشتی خۆم وەرگرتووە.

تێگەیشتم من ناناسێتەوەو خۆم پێ ناساند و وتم: من (سینۆهە)ی

پزیشکم.

وتی: من سینۆهە ناوێکم دەناسی کە لە خانەی ژیان دەیخوێند.

وتم: من ئەو سینۆهەیەم

ژنەکە چاوەکانی بڕییە دەم و چاوم و وتی: درۆ دەکەی تۆ (سینۆهە) نیت، چونکە سینۆهە کوڕێکی گەنج بوو کە لۆچ لە دەم و چاویدا نەبوو و ئێستا دەبینم نێوان برۆکانت لۆچی تێکەوتووە، سینۆهە دەم و چاوێکی جوانی هەبوو، بەڵام تۆ شکڵ و شێوەیەکی سیسەوەبووت هەیە.

وتم: (نەفر نەفر) من هەمان سینۆهەم و ئەگەر باوەڕ ناکەیت من بەڵگەیەکت نیشان دەدەم کە بۆ ناسینەوەی من گومانت نەمێنێ و ئەویش ئەنگوستیلەکەیە کە لە خانەی ژیان پێمت بەخشی.

دوایی ئەنگوستیلەکەی دەستم نیشان داو وتم: هانێ بگرە لەبەر ئەوەی رقت لێمە ئەوە ئەنگوستیلەکەتە، با هیچکە یادگاری تۆ لە لای من نەمێنێ.

(نەفر نەفر) وتی: هەڵی بگرە، چونکە ئەمە بۆتۆ گرانبەهایە و کەمتر روودەدات من دیاری بە یەکێ بدەم. دوایی وتی: لێرە بمێنەوە و دوای رۆیشتنی میوانەکان قسەت لەگەڵدا دەکەم.

لەوکاتەدا ئیشارەتم بۆ یەکێ لە بەندەکان کرد کە پەیمانەکەم پڕ بکات و ئەوەی بۆی تێکردم بەتامترین خواردنەوەبوو کە لە ژیانمدا خواردبوومەوە، چونکە دەمزانی (نەفر نەفر) منی خۆش دەوێت و ئەگەر رقی لێم بووایە پێی نەدەوتم تا کۆتایی ئاهەنگەکە لێرە بمێنەوە. هەندێ لە میوانەکان لەبەر زۆر خواردنەوە تووشی رشانەوە بوون و بەندەکان دەفرێکیان دەداپێیان کە تیایدا بڕشێنەوە، تەنانەت توتمسیش لەبەر زۆر نۆشینەوە دڵی بەیەکا هات و رشایەوە و ئاگای لە خۆی نەما. بەڵام لەو ئاهەنگەدا دووکەس لە خواردنەوەی زۆر خۆیان پاراست، یەکێکیان خاوەن ماڵ و ئەوەی تر من کەبە ئارەزوو بووم قسەی لەگەڵدا بکەم.



کاتێ زەویی هۆدەکە بە گۆزە و پەیمانەی شکاو داپۆشرا و میوانەکانی ناو تەلار، کە تا ئەو کاتە مابوونەوە لە هیلاکیدا خەویان لێ کەوت و کەس نەیدەتوانی قسە بکات و گوێ بگری ، ئیتر مۆسیقا ژەنەکان دەستیان لە مۆسیقا لێدان هەڵگرت و بەندەکان هاتنە ژوورێ کە گەورە سەرخۆشەکانیان ببەنە ماڵەوە. لەو کاتەدا (نەفر نەفر) هاتە لام و منی لە تەلارەکەوە بردە ژوورێکی تر و لە تەک خویەوە داینیشاندم.

وتم: ئایا ئەم خانووە هی خۆتە؟

وتی: بەڵێ خانووی خۆمە.

وتم: بەو پێیە بێت تۆ زۆر دەوڵەمەندی؟

ژنەکە وتی: لە تەبەس-دا لەناو ئەو ژنە دەوڵەمەندانەی ناوت بیستوون هیچیان لە من دەوڵەمەندتر نین. دوایی دەستی نەوازش کردم و وتی: بۆچی ئەو رۆژەی کە پێتم وت وەرە بۆ ماڵی من نەهاتی؟

وتم: ئەو رۆژە لێت دەترسام چونکە منداڵ بووم.

(نەفر نەفر) وتی: دیارە لە دوای ئەوەی بووی بە پیاو لەگەڵ زۆر ژن ئاشناییت پەیدا کردووە؟

وتم : من ناڵێم بە درێژایی ئەم ماوەیە زۆر ژنم نەناسیوە، بەڵام تا ئەم ساتەی کە لە تەک تۆوە دانیشتووم هیچ ژنێ سەرنجی رانەکێشاوم .

(نەفر نەفر) وتی: درۆدەکەی چۆن دەبێت پیاوێکی جوانی وەکو تۆ بۆ هەموو جێگایەکی ئەم شارە چووبێت و هیچ ژنێ سەرنجی رانەکێشابێ؟

وتم : هەرکاتێ ژنێ بەرەو رووم دەهات تۆم بیردەکەوتەوە و کە شێوەت دەهاتەوە یادم بۆم دەردەکەوت کە ئیتر ئەو ژنە لە چاومدا جوانی نەماوە.

(نەفر نەفر) وتی : ئەگەر یەکتر ناسینەکەمان بەردەوام بێت و تۆ درۆت لەگەڵ کردبێتم رۆژێ هەر تێدەگەم و بۆم دەردەکەوێت تۆ درۆت لەگەڵ مندا کردووە.

وتم: من درۆت لەگەڵدا ناکەم و هەرگیز درۆم نەکردووە.

(نەفر نەفر نەفر) پرسیی : ئێستا ئەتەوێ چی بکەی؟

وتم: تا ئیمرۆ باوەڕم بە خوایەکان نەبوو و بڕواپێکردنی خوایەکانم بە شتێکی لە بنچینەدا نەبوو دەزانی، بەڵام ئێستا دەڕۆم و بە پێزانینی ئەوەی خوایەکان منیان گەیاندۆتە تۆ و تۆم دیتەوە، لە پەرستگاکاندا قوربانی دەکەم و عەتر بە دەرگای ماڵەکەتدا دەڕژێنم، بۆ ئەوەی کاتێ هاتییە دەرەوە بۆنی بکەی و گوڵ لێ دەکەمەوە و لە کاتی هاتنە دەرەوەتدا دەیڕێژمە ژێر پێت.

ژنەکە وتی: ئەم کارانە مەکە چونکە بەلای منەوە سەرنج ڕاکێش نین، چونکە خۆم هەم عەترم هەیە و هەم گوڵ و پێویستیم بە گوڵ و بۆنی تۆ نییە و ئەگەر میواندارییەکەی ئەمشەو ماندووی نەکردووی و حەزت بە پشوودان نییە وەرە بچینە باخەکەوە بۆ ئەوەی داستانێکت بۆ بگێڕمەوە.

وتم : (نەفر نەفر نەفر) من تۆم دەوێ نەک داستان...

ژنەکە وتی: ئەگەرمنت دەوێ دەبێ گوێ لە داستانەکەم بگری چونکە لەوەیە ڕۆژێ تۆم خۆش بوێ، حەز دەکەم بەیەکەوە نانێ بخۆین.

دوایی چووینە باخەکەوە و کاتێ بۆنی گوڵەکانی (ئاقاقیا)م کرد شادییەکی زۆرم لە خۆمدا هەست پێکرد کە هەر لە خۆمەوە کەوتمە گۆرانی وتن.

بەڵام (نەفر نەفر نەفر) خۆی لادا و وتی: جارێ گوێ لە داستانەکەی من بگرە. ڕووناکیی مانگ لە حەوزی باخەکەی دەداو گوڵەکانی (نیلوفەری) دەوری حەوزەکە لەبەر تاریکیی شەو، دەمیان هاتەوەیەک و تەیرەکانی شەو کەوتنە خوێندن. بەفەرمانی ژنەکە بەندەیەک مراوییەکی برژاو و خواردنەوەی بۆ هێناین و دەستمان بە خواردن کرد. هەرکاتێ دەمویست لە باوەشی بگرم، یان دەمویست لەبارەی خۆشەویستی ئەوەوە قسەیەک بکەم، دەیوت: بوەستە و جارێ گوێ لە بەسەرهاتەکە بگرە پاشان ئەگەر ئەوەی وتم پەسندت کرد ئەوسا قسە بکە.

بەڵام دیسانەوە پەرۆشی گەنجێتیم وای لێ دەکردم پەلاماری بدەم و نەهێڵم



داستانەکەی بڵێت و وتم: (نەفر نەفر نەفر) دەکرێ ئەمشەو لەژێر ڕووناکیی مانگ سەرە تاشراوەکەت ببینم؟

وتی: با وەختی خۆی بێت ئەوسا ئەم قژە دەستکردە لەسەرم لێ دەکەمەوە و دەهێڵم سەرە تاشراوەکەم نەوازش بکەی[٤].

***

١ – چونکە سینۆهە لە بەشەکانی داهاتوودا بەدرێژی باسی چۆنیەتیی مۆمیایی کردن لە خانەی مەرگ دەکات کە بە هۆی مومیایی کردنی لاشەی دووان لە خۆشەویستەکانی بوو، لێرە باسی چۆنیەتیی مۆمیایی کردنی لاشەی فیرعەون ناکات ، بە شێوەیەکی گشتی مۆمیایی کردنی فیرعەون و گەورەکانی پەرستگە و دەوڵەمەندەکان بەم شێوەیە بوو کە هەرچی لە ناو سک و سینە و کاسەی سەردابوو و هەروەها گلێنەی چاوی، دەردەکرا (چونکە بۆگەن دەبوو) و لاشەکەیان ماوەی چل تا شەست ڕۆژ دەخستە ناو خوێاوی خەست و دوایی دەریان دەکرد و کونەکانی لەشی و چاوەکانی پڕدەکرا لە (نیترۆن) . شارەزایانی مۆمیاکاری ئەمڕۆ هەروەکو وەرگێڕ لە ڕابردوودا لە گۆڤاری گرير (چارەسەر)ی فەرەنسیدا خوێندۆتەوە دەڵێن: میسرییەکان ڕۆنی کەرچەک یان ڕۆنی کونجییان بە نیترۆنەکە زیاد دەکرد و لاشەکەیان دەخستە ژوورێکی گەرمەوە بۆ ئەوەی شێی تەڕێتییەکەی نەمێنێ و دوایی بە پەتی پان کە قیریان پێوە کردبوو هەموو لەشیان دەپێچایەوەو چەند توێیەک لەم تێپی پەڕۆییە پانانەیان لێوە دەئالاند و تەرمی فیرعەون و گەورە پیاوان تا حەوت تۆییان لێ دەئالاند و دوایی بۆ ناشتن دەیانبردە گۆڕستان – وەرگێڕ

٢ – وڵاتی (میتانی) لە وڵاتە بەناوبانگەکانی دنیای کۆن بووە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئاسەوارناسان دەڵێن ناوەندی وڵاتی میتانی لەبەشی سەروو یان لە سەرچاوەکانی دوو ڕووباری دیجلە و فورات بووە و پاشاکانی میتانی هەندێ کات وڵاتەکەیان لە لای ڕۆژئاواوە تا کەنارەکانی دەریای ناوەڕاست کە ئێستا وشکانیی وڵاتی سووریایە بەرین دەکردەوە و وڵاتی دوو ئاو کە لە ناوەرۆکەکەدا دەیخوێننەوە (بين النهرين)ـە کە دوو ڕووباری دیجلە و فوراتی تێدایە – وەرگێڕ

٣ – مراز دان : خوای بەخشینی ویست و حەز و ئارەزووی دڵ – وەرگێڕی کوردی

٤ – هەر چەندە دووپات کردنەوەی ڕوونکردنەوەکان لە لایەن وەرگێڕەوە لەوەیە خوێنەران بێزار بکات بەڵام دەبێ بڵێم : چوار هەزار ساڵ لەمەو بەر لەوڵاتی میسر ژنی دەوڵەمەندەکان سەریان دەتاشی و قژی دەستکردیان لەسەر دەکرد و یەکێ لە گەورەترین حەزو دەستکەوتەکانی پیاو لە

لای ژن ئەوە بوو سەرە تاشراوەکەی ببینێ و دەستی بەسەردا بێنێ – وەرگێڕ

**بەشی نۆیەم**

# گریێنەرترین ڕووداوی جەوانیم

ئەوسا (نەفر نەفر نەفر) وتی: لە کۆنا پیاوێک هەبوو ناوی (ساتنێ) بوو، ڕۆژێکیان بۆ بینینی کتێبێکی نایاب دەچێتە پەرستگە و لەوێدا ژنێکی کاهینە دەبینێ و بەشێوەیەک لە یەکەم بینیندا دڵی کەوتە سەری، کەلە دوای گەڕانەوەی بۆ ماڵەوە بەندەکەی خۆی ناردەلای ئەو ژنە و داوای لێ کرد کە بێت بۆ ماڵی و یەک کاتژمێر ببێتە خوشکی و لە بری ئەوە حەڵقەیەکی زێڕی قورس وەربگرێ.

ژنەکە وتی: من نایەم بۆ ماڵی (ساتنێ)، چونکە هەموو دەمبینن و وادەزانن من ژنێکی ئابڕوو تکاوم و، بە گەورەکەی خۆت بڵێ با ئەو بێت بۆ ماڵی من و لەوێدا بەئاسانی دەتوانێ لەگەڵمدا بدوێت.

(ساتنێ) چووە ماڵی ژنەکەو حەڵقەیەکی زێڕیشی برد کە بیداتێ. ژنەکە کە دەیزانی ساتنێ بۆچی وتی: تۆ دەزانی من (کاهینە)م و ناتوانی ژنێکی کاهینە بکڕی.

(ساتنێ) وتی: ئەگەر تۆ کەنیز بوویتایە من تۆم دەکڕییەوەو ئێستا کە کەنیزنیت داواکارییەکم هەیە کە کاتێک ژنێک ئەو شتە بەپیاوێ دەسپێرێ، هیچ شتێکی لێ کەم نابێتەوەو بۆیە نرخی ئەو شتە لە هەموو شوێنێ هەرزانە.

ژنەکاهینەکە وتی: ئەم داواکارییەی تۆ لە دیدی مندا بێ بایەخترین شتە، بەڵام لەهەمان کاتدا بەگرنگترین شتیش لەقەڵەم دەدەن. ئەم داوایە بۆ ئەو کەسانەی بایەخی پێ نەدەن بێ بەهاترین کارە، بەڵام هەر ئەوەندە پیاوێ یان ژنێ بایەخی پێ بدات دەبێتە گرانبەهاترین شت و ئەوکەسەی بەڕاستی داواکاری



پێکەوە ژیان لەگەڵ یەکێکی ترە، دەبێت بەهایەکی گران بدات. ئێستا پێم بڵێ ئەگەر داواکارییەکەت جێبەجێ بکەم چی دەدەیت بە من؟

(ساتنێ) وتی: من ئامادەم هەرچی زێڕم هەیە بیدەمە تۆ بۆئەوەی داواکەم قەبووڵ بکەی.

ژنەکە وتی: ئەمە شایانی ژنێکی وەکو من نییە و تۆ دەبێ هەرچییەکت هەیە بیدەی بە من.

پیاوەکە لەبەرئەوەی لە ئارەزووی ژنەکەدابوو وتی : هەرچییەکم هەیە دەیدەم بەتۆ و، هەر ئەوکاتە نووسەرێکیان هێنا و پیاوەکە هەرچییەکی هەبوو لە خانوو و کێڵگەو بەندە و زێڕ و پارە و مس، هەمووی کردبە ناوی ژنەکەوە. ئینجا دەستی برد بۆ سەری کە قژەدەستکردەکەی لابدات و سەری ببینێ، ژنەکە نەیهێشت و وتی: دەترسم لەدوای ئەوەی منت هێنا پەشیمان ببیتەوە و بگەڕێیتەوە لای خێزانەکەت، لەبەر ئەوە ئەگەر دەتەوێ ببمە هاوسەرت دەبێ ئێستا بڕۆی ژنەکەت لە ماڵ دەربکەی.

پیاوەکە کە ئیتر چیی دی بەندەی نەمابوو، یەکێک لە بەندەکانی (کاهینە)کەی ناردو ژنەکەی دەرکرد، ئەوساکە ویستی دەست بۆ سەری ببات و ژنەکە دیسانەوە وتی: تۆ لەم ژنەی کە دەرت کرد سێ منداڵت هەیە و دەترسم ڕۆژێ خۆشەویستیی باوکایەتی بەرەومنداڵەکانت ببات و من فەرامۆش بکەیت و بۆ ئەوەی بێ خەم بم دەبێ منداڵەکانت بهێنی بۆ ئێرە بۆئەوەی من بیانکوژم و گۆشتەکەیان بدەمە سەگ و پشیلەکانم.

(ساتنێ) یەکسەر بەندەکانی ژنەکەی بەشوێن منداڵەکانی نارد و دوایی دایە دەست ژنەکەو ئەویش هەر سێکیانی بەکێردە بەردییەکەی خۆی سەربڕی و لەو کاتەی کابرا سەرقاڵی خواردنەوەبوو ژنەکە گۆشتی منداڵەکانی دایە سەگ و پشیلەکانی و، پاشان (کاهینە)کە وتی : ئێستا بڕۆ گۆزەیەک پەیدابکە و بیهێنە کەبەیەکەوە گۆزە بشکێنین[1] و دڵنیابە بەدڵسۆزییەوە دەبمە هاوسەرت،

چونکە ژن کاتێ ئامادە دەبێ بەخۆشەویستییەوە ببێتە هاوسەری پیاو، کە بزانێ خۆی بەکەم دانەناوە و لە بەهاکەی دانەبەزیوە. تاکە جیاوازیی نێوان ژنە ئاساییەکان لەگەڵ ژنانی تری وەک من ئابڕوومەند ئەوەیە کە، ئەوان، بۆ شوو پێکردنیان داوای هیچ لە هاوسەری داهاتوویان ناکەن، بەڵام ژنە بەشەرەفەکانی وەک من داوای شتی گرانبەها دەکەن.

وتم: (نەفر نەفر نەفر) من ئەم داستانەم بیستووە و ئەزانم هەموو ئەم ڕووداوانە لە خەودا ڕووی داوەو لە کۆتایی داستانەکە (ساتنێ) کە نووستبوو بەخەبەر دێت و سوپاسی خوایەکان دەکات کە منداڵەکانی ماون.

(نەفر نەفر نەفر) وتی: وانییەو هەر پیاوێ دڵبەستەی ژنێ بێت وەک (ساتنێ) وایە و بۆئەوەی بتوانێ دڵی بەدەست بهێنێ ئامادەیە ژن و ماڵ و منداڵی لە پێناویدا بەخت بکات و لەکاتی دروست کردنی قووچەکی گەورەوە تا ئێستا وابووە و تا کاتێ کە باو باران و خۆر بەیەکجاری لە ناوی دەبات هەر وادەبێت. ئایا تۆ دەزانی بۆچی سەری ئەو خوایەی کە لە خۆشەویستیدا مراز دەدات وەک سەری پشیلە دروستی دەکەن و ئەیکێشن؟

وتم: نا ...

وتی: لەبەرئەوەی بڵێن ژن وەک پەنجەکانی پشیلە وایە، چونکە کاتێ پشیلە دەیەوێت نێچیرەکەی خۆی فریو بدات پەنجە نەرمەکانی خۆی بەسەر لەشیدا دەهێنێ و ئەویش نەرمییەکەی لەلا خۆش دەبێت، بەڵام لە ناکاودا نووکە تیژەکانی چرنووکی لە ژێر پێستە نەرمەکەوە دەردێنێ و لە لەشی نێچیرەکە دەیچەقێنی. من چونکە نامەوێ لەمنەوە زیانت پێ بگات، کە دوایی بەخراپە ناوم بهێنی، هەر لە ئێستاوە پێت دەڵێم، سینۆهە لێرە بڕۆ و ئیتر بە ئێرەدا مەیەوە.

وتم: (نەفر نەفر) تۆ خۆت ئەمڕۆ وتت بمێنەوە و لەلام مەڕۆ بۆئەوەی قسەت لەگەڵ بکەم.



ژنەکە وتی: بەڵێ وام وت و ئێستا پێت دەڵێم بڕۆ، چونکە هەر کاتێ بتەوێ کەڵک لەمن وەرگری گران لەسەرت دەوەستێ و دوایی نزای خراپم لێ دەکەی کە بوومەتە هۆی زیان پێ گەیشتنت.

وتم: من هەرگیز گلەیی لە گیرۆدەیی و زیانەکانم ناکەم و ئەگەر مەبەستت زێڕ و زیو و مسە، هەرچییەکم هەیە ئەیدەم بە تۆ بۆ ئەوەی داواکارییەکەم قەبووڵ بکەی.

(نەفر نەفر نەفر) وتی: هەروەکو بینیت ئەمڕۆ ئاهەنگێکی گەورەمان هەبوو و ئەم میوانداربییە منی ماندوو کردووە و ئەمەوێ بنووم و تۆ بڕۆ و ڕۆژێکی تر وەرەوە.

هەرچەندە هەوڵم دا سەعاتێکی تر لەلای بمێنمەوە، نەیهێشت و، ناچار لەماڵەکەی هاتمە دەرەوەو گەڕامەوە ماڵ، بەڵام تا سبەینێ خەوم لێ نەکەوت.

ڕۆژی دوایی، سبەینێ زوو بە بەندەکەی خوم (کاپتا)م سپارد کە وەڵامی هەموو نەخۆشەکان بداتەوە و پێیان بڵێ ئەمڕۆ توانای دانیشتنم نییە و، دوایی چوومە سەرتاشخانە و خۆم خاوێن کردەوە و، بۆنم لە خۆم داو بەرەو ماڵی (نەفر نەفر) کەوتمەڕێ.

بەندەیەک لەوێ منی بردە ژوورەکەی و سەیرم کرد خەریکی خۆڕازاندنەوەیە و من کە پشتم بە دۆستایەتییەکەی دوێنێ شەوێ بەستبوو لێی نزیک بوومەوە، بەڵام ئەو خۆی لێ دوورگرتم و وتی: سینۆهە، بۆچی هاتووی بۆ ئێرە؟ ...بۆکاتم لێ دەگری؟

وتم: (نەفر نەفر نەفر) من تۆم خۆش دەوێت و ئەمڕۆ لەسەر قسەی خۆت هاتوومەتە ئێرە کە گوێم لێ بگری.

ژنەکە وتی: سینۆهە من ئەمڕۆ زۆر سەرقاڵم، چونکە بازرگانێ لە سووریاوە هاتووە چاوپێکەوتنم لەگەڵ بکات و لەبارەی کارێکی گرنگ گفتوگۆ دەکەین. دوایی لەسەر قەرەوێڵەکەی ڕاکشاو بەکەنیزەکەی وت: (تانی) ئەمەوێ پشوو

بدەم و لەگەڵ ئەم بچۆرە دەرەوە.

من کە نەمدەویست بڕۆم، پێی وتم سینۆهە بۆ سەرم دەیەشێنی و نارۆیتە دەرەوە؟

وتم: لەبەرئەوەی من خۆشم دەوێیت و، دەمەوێت تۆ ئەوکەسەبیت کە دەبێتە هاوسەری من.

(نەفرنەفرنەفر) وتی: جارێکی تر وەک دوێنێ شەو پێت دەڵێم کە نامەوێ ئازارت بدەم و پێت دڵێم برۆ بەدوای ئیشی خۆتەوە و واز لە من بێنە.

وتم: (نەفرنەفرنەفر) هەرچیت دەوێ دەتدەمێ بۆ ئەوەی تەنها ئەمرۆ لەم ماڵەدا بمێنمەوە.

وتی: تۆ چیت هەیە؟

وتم: هەندێ حەڵقەی زیو و مسم هەیە کە لەبری چارەسەر لە نەخۆشەکانم وەرگرتووە و خانوویەکیشم هەیە کە عەیادەکەمی تێدایەو ئەم خانووە قوتابییە دەرچووەکانی خانەی ژیان بەنرخێکی باش دەیکڕن.

(نەفرنەفرنەفر) کەلەسەر قەرەوێڵەکەی درێژ بوو بوو و کەنیزێک بە رۆنی بۆن خۆش لەشی چەور دەکرد لەگەڵ بیرکردنەوەدا یاری بە پەنجەکانی دەکرد، وتی: باشە.. برۆ و نووسەرێک بهێنە کە ئەم بابەتە بنووسێ و نووسراوەکە لای دادڕەسی گەورە دابندرێت بۆ ئەوەی گواستنەوەی شتەکانت بۆ من یاسایی بێت و لە داهاتوودا نەتوانی لێمی بسەنیتەوە.

من کە (نەفر نەفر نەفر)م بە لەشولارێکی لە مەڕمەڕ سپیترو خاوێنتر دەبینی، وەها گیرۆدەی بووبووم کە نەمدەتوانی بەسەرخومدا زاڵ بم و وام دەزانی بەخشینی هەموو داراییەکەم لە بری بینینێکی ئەو شتێکی بێ بەهایە و وتم: (نەفرنەفرنەفر) ئێستا دەڕۆم و نووسەر دەهێنم.

ژنەکە وتی: هەرچۆنێ بێت وەک پێم وتی ئەمڕۆ ناتوانم لەگەڵتدا بم، بەڵام تۆ نووسەرەکە بهێنە و شتەکان بکە بە ناوی منەوە، رۆژێکی تر دەهێڵم لەلام



بمێنیتەوە.

من بەزوویی نووسەرێکم هێناو هەرچییەکم لە پارەو مس و خانوو، تەنانەت بەندەکەشم بەناوی (نەفرنەفرنەفر)ەوە کرد، ئەویش بەڵگەنامەکەی، کە بە دوو وێنە نووسرابوو وەری گرت و یەکێکی هێشتەوە و ئەوەی تری دایە نووسەرەکە کەلەلای دادڕەسی گەورە دایبنێت و بینیم بەڵگەنامەکەی خۆی خستە ناو سندووقێکی بچووکەوە و وتی: زۆر باشە من ئێستا دەڕۆم و تۆ سبەینێ وەرەوە چاوم پێت دەکەوێت.

ویستم بڵێم ئەمەوێ لەلای تۆ بمێنمەوە، بەڵام بە دەنگێکی بەرز وتی: لێم دوورکەوە چونکە میوانم هەیە و تۆ رێگام لێ دەگری. دوایی سواری کەژاوەیەک بوو و لەگەڵ بەندەکانی رۆیشت و منیش گەڕامەوە بۆ ماڵی خۆم و شتەکانم کۆکردەوە بۆئەوەی کاتێ خاوەن خانووی نوێ دێت بتوانێ بێتەناوی.

کاپتا کاتێ بینی من خەریکی کۆکردنەوەی کەل و پەلی خۆمم وتی: مەگەر دەتەوێ بچی بۆ سەفەر.

وتم: نا.. من هەموو شتێکی خۆم داوە بە یەکێکی تر کە تۆش دەگرێتەوە و بەزوویی یەکێک دێت و ئەم خانووە و تۆش دەبنە هی ئەو و هەوڵ بدە کاتێ لەلای ئەو کاردەکەی کەمتر دزیی لێ بکەی، چونکە لەوەیە ئەو لەمن بێ بەزەییتر بێت و دارکارییەکی باشت بکات.

کاپتا بەرامبەر بەمن سەری نایە سەرزەوی و وتی: گەورەی من دڵە بەساڵاچووەکەی من تۆی خۆش دەوێت و من لەخۆت دوور مەخەرەوە، لەبەرئەوەی ناتوانم لەلای گەورەیەکی تر کاربکەم. راستە من هەندێ دزیم لێ کردووی، بەڵام هیچ کات دزییەکانم نەدەگەیاندە رادەی بێ ویژدانی و لە کاتە گەرمەکانی رۆژ کەتۆ لەماڵەوە پشووت دەدا، من دەچوومە کۆڵانەکانی تەبەس و مەدحی تۆم دەکرد و دەموت (سینۆهە) گەورەکەی من باشترین پزیشکی میسرە، تۆ دەزانی بەندەکانی تر بەردەوام جنێو بە گەورەکەی خۆیان دەدەن و لای خوایەکان نزای

مردنیان لێ دەکەن.

ئەم قسانەی کاپتا دڵتەنگی کردم و دەستم خستە سەر شانی و وتم: (کاپتا ) هەستەوە.... کەمتر ڕێک دەکەوت کە بەندەکەی خۆم بەناوی (کاپتا ) بانگ بکەم، چونکە دەترسام واهەست بکات کە لە ڕیزی مندایەو زۆربەی کات بە تیمساح یان دز، یان نەفام بانگم دەکرد.

کاتێ کە ناوی خۆی بیست کەوتە گریان و قاچەکانی منی خستە سەرسەری و وتی: گەورە جوامێرەکەم من دەرمەکە و ڕازی مەبە خەڵکی تر ئەم بەندە پیرەت دارکاری بکەن و بەردبکێشن بەسەریدا و خواردنی بۆگەنی دەرخوارد بدەن کە تەنها بۆ فڕێدان باشە.

هەرچەندە بەزەییم پێدا دەهاتەوە، بەڵام گۆچانەکەی خۆم (بەهێواشی) دا بە پشتیداو وتم: ئەی تیمساح هەڵسەوە، ئەوەندە مەگری، ئەگەر ئەبینی لە خۆمت دوور دەکەمەوە لەبەرئەوەیە کە ناتوانم خواردنت بدەمێ، چونکە هەموو شتێکی خۆمم بەخشیوە و گریانەکەت بێ سوودە.

کاپتا هەڵسایەوەو دەستی بە نیشانەی ماتەم بەرزکردەوە و وتی: ئەمڕۆ یەکێکە لە ڕۆژە شوومەکانی میسر. دوایی کەمێ بیری کردەوە و وتی: سینۆهە هەرچەندە تۆ گەنجی بەڵام یەکێکی لە پزیشکە گەورەکانی میسر و من پێشنیار دەکەم هەرچەندە زیو و مست هەیە هەڵیگرەو ئەمشەو سواری بەلەم دەبین و لێرە دەڕۆین و تۆ لە یەکێک لە شارەکانی میسر کە لە خوارووی ڕووبارەوەیە دەرمانگەکەت بکەرەوە و ئەگەریش وازیان لێ نەهێنا ئەتوانین بڕۆین بۆ وڵاتی سوور و لەو وڵاتە پزیشکە میسرییەکان ڕێزێکی زۆریان هەیە (مەبەست لە وڵاتی سوور عەرەبستانی ئێستایە کە لە ڕۆژهەڵاتی دەریای سوورەوەیە- وەرگێڕ) ئەگەریش ناتەوێ لەوێ بژین دەتوانین بۆ میتانی یان وڵاتی دووئاو بچین و من بیستوومە لە وڵاتی دووئاو دوو ڕووباری لێیە کە ڕەوت (ئاراستەی)ی ئاوەکەی بە پێچەوانەوەیە و لە باتی باکوور بەرەو باشوور



دەڕوات.

وتم: کاپتا من ناتوانم لە تەبەس ڕابکەم، لەبەرئەوەی ئەو (کەمەند)انەی دڵی منی بە ئێرەوە بەستووە لە لوول دراوی مس ئەستوورترە.

دوایی کاپتا لەسەر زەوی دانیشت و وەک ماتەم گێڕێ سەری تەکان دەداو وتی: خوا (ئاموون) ئێمەی بەجێ هێشتووە و خۆشی ناوێین، چونکە ماوەیەکە دیاریت بۆ پەرستگەکەی نەبردووە... من لەو باوەڕەدام ئەمڕۆ دیارییەک بۆ خوایەکی تر ببەین تابتوانین لە خوای نوێ بەهرەمەندبین.

وتم: کاپتا تۆ لەبیرت چووە کە من هیچم نییە پێشکەش بە خوایەکی تری بکەم و تەنانەت تۆش کە بەندەی من بووی ئێستا هی کەسێکی تری.

وتی: ئەم کەسە کێیە؟ ئایا ژنە یان پیاو؟

وتم: ژنە...

هەرئەوەندە کاپتا زانیی خاوەنەکەی ژنە کەوتە ناڵەناڵ و من ناچاربووم بۆ بێدەنگ کردنی هەڕەشەی گۆچانەکەمی لێ بکەم. دوایی وتی: ئەی دایە بۆ ڕۆژی لە دایک بوونەکەم بە ڕیخۆڵەی ناوکم نەتخنکاندم؟ بۆئەوەی نەمێنم و ئەم ناخۆشییانە نەچێژم. بۆچی من بە بەندەیی دروست کرام کە ئێستا گرفتاری ژن بم؟ چونکە هەمیشە ژنەکان لە پیاوان بێ بەزەییترن، ئەویش ژنێ وەک ئەم ژنەی هەموو شتێکی لە دەستت سەندووە، ئەو ژنە ڕۆژ تائێوارە ڕاکەڕاکەم پێ دەکات و ناهێڵێ ساتێ ئاسوودەبم و هەرگیز خواردنێکی ڕێک و پێکم ناداتێ، ئەویش ئەگەر لای خۆی ڕامبگرێ، ئەگەرنا دەمفرۆشێ بەخاوەن (کانگە)یەک کە لە کانەکەیدا ئیشم پێ بکات و دوای چەند ڕۆژ بەهۆی کاری کانگەوە بەسەختی دەمرم و کەس لاشەکەم مومیایی ناکات و گۆڕێکم نابێت کە تیایدا بنوم.[٢]

من دەمزانی کاپتا ڕاست دەکات و لە ماڵی (نەفرنەفرنەفر) جێگای مانەوەی پیرەمێردێکی وەک ئەو کەتەنها چاوێکی هەیە نییە و ئەو ژنە دەیفرۆشێتە یەکێکی تر و بەدڕەفتاری لەگەڵ دەکەن و لە ماوەیەکی کەمدا لەبەر سەختی ژیان

گیانی دەردەچێ و، گریانی ئەو منیشی هێنایە گریان، بەڵام نەمدەزانی بۆئەو دەگریم یان بۆخوم کە هەموو شتێکم لە کیس چووبوو.

کاتێ کاپتا بینیی من دەگریم ئارام بووەوە و هەڵسا و دەستی خستە سەرسەرم و وتی: هەموو ئەمانە تاوانی منە کە نەمدەزانی گەورەکەی من وەک پارچە قوماشێکی ئاو نەدیدە سادەیە و لە چونێتیی ژیان ئاگادارنییە و نازانێ پیاوێکی گەنج کاتێ شەوان دەگەڕێتەوە بۆ ماڵ پێویستی بە هاوسەرێکی میهرەبانە کە پارێزگاریی لێ بکات. من هەرگیز پیاوێکی گەنجی وەک تۆم نەدیوە لەبارەی ژنانەوە ئەوەندە کەمتەرخەم بێت. هیچ کاتێ رووی نەدا تۆ داوا لەمن بکەی ژنێکی جوانت بۆ داخوازی بکەم کەلەم شارەدا زۆرە. پیاوێکی گەنج کەلەبارەی کاروباری پەیوەست بە ژنانەوە ئەزموونی نەدیتبێت وەک مشتێ گیای وشک وایە و یەکەم ژنێ کە پێی دەگات وەک تەنوورەو چۆن کاتێ گیایەکی وشکت خستە تەنوورەکەوە یەکسەر ئاگر دەگرێت پیاوی جەوانی کەم ئەزموونیش هەرئەوەندە گەیشتە ژنێکی گەنج ئاگری تێ بەردەبێت و بۆئەوەی کەڵکی لێ وەرگرێ هەموو شتێکی خۆی لە پێناویدا بەخت دەکات و ئاگای لێ نییە چ زیانێ لە خۆی دەدات و من لام سەیرە بۆچی لەبارەی ژنانەوە پرسیارت لەمن نەکرد کە رێنوماییم بکردیتایە و پێتم بگوتایە لە دنیادا کاتێ ژن پیاوێکی خۆش دەوێت کە بزانێ نان و گۆشتی هەیە و، هەرئەوەندە کە بینی پیاوەکە هیچی نەماوە ئیتر بەرەڵای دەکات و دوای پیاوێک دەکەوێ کە نان و گۆشتی هەبێ. بۆ راوێژت لەگەڵ نەکردم کە پێت بڵێم پیاو کاتێ کە دەچێتە لای ژنێک دەبێ دارێ لەگەڵ خۆی ببات و لەگەڵ چوونە ژوورەوەدا بەر لە هەموو شتێ دارەکە بکوتێ بە تەوقی سەریا و ئەگەر ئەم دووربینییە نەکات هەمان رۆژ ژنەکە دەست و پێی بەپەت دەبەستێتەوە و ئیتر ئەو پیاوە لە دەست ئەو ژنە رزگاری نابێت، مەگەر کاتێ کە ببێتە گەدا (دەرۆزەکەر)، ئەوسا ئیتر ژنەکە بەرەڵڵای دەکات. هەرچەندە پیاو رووگرتووتر و شەرمنتر بێت زووتر گیرۆدەی ژن دەبێ و



زیاتر رەنج دەدات و تووشی زیان دەبێ. ئەگەر تۆ لە جیاتی ئەوەی بچیتە ماڵی ئەو ژنە، ئەو شەوە لەماڵەوە بوویتایە یان بۆکات بردنەسەر جێگایەکی ترت هەڵبژاردایە ئێمە ئەمڕۆ گرفتاری ئەم بەدبەختییە نەدەبووین.

بەندەکەم ماوەیەک قسەی کرد، بەڵام من گوێم نەدەدا بەقسەکانی، چونکە نەمدەتوانی بیرم لە (نەفرنەفرنەفر) دووربخەمەوە و هەرچییەکی پێ دەوتم لە گوێییەکم ئەچووە ژوورەوەو لەوەی تر دەردەچوو.ئەوشەوە تا سبەینێ زیاتر لە دە جار خەبەرم بووەوەو هەموو جارێ کەبەئاگا دەهاتم دەکەوتمەوە یادی (نەفرنەفرنەفر) و خۆشحاڵ بووم کە سبەینێ دەیبینم.

بۆ بینینی ئەو ژنە ئەوەندە بەپەلەبووم کە رۆژی دوایی کاتێ چوومە ماڵیان هێشتا لە خەو هەڵنەستابوو و وەک گەدا لە بەردەم دەرگاکەیان دانیشتم تا کاتی هەڵسانیان. کاتێ کە چوومە ژوورەکەیەوە کەنیزەکەیم بینی خەریکی باوەشێن کردنی بوو، کە منی بینی وتی: سینۆهە بۆچی لێم ناگەڕێی و بێ تاقەتم دەکەی؟

وتم: من ئەمڕۆ هاتووم لەلای تۆ بمێنمەوە و لەگەڵ تۆدا نان بخۆم، دوێنێ خۆت بەڵێنت دا ئەمڕۆ لەگەڵ مندا بەسەربەریت.

(نەفرنەفرنەفر) باوێشکێکی دایەوە و وتی: تۆ دوێنێ درۆت لەگەڵ کردم...

وتم: چۆن درۆم لەگەڵ کردووی؟

وتی: دوێنێ تۆ وتت جگەلە خانوو و بەندەکەت هیچی ترت نییە، بەڵام من لێکۆڵینەوەم کرد و زانیم باوکت کە ئێستا نابینابووە و ناتوانێ بنووسێت مۆری خۆی داوە بەتۆ و وتوویەتی تۆ دەبێ خانووەکەم بۆ بفرۆشی.

(نەفرنەفرنەفر) راستی دەکرد، باوکم کە چاوی کوێر بووبوو و نەیدەتوانی بنووسێ، مۆرەکەی دابوو بەمن کە خانووەکەی بۆ بفرۆشم، چونکە دایک و باوکم دەیانویست لەشاری تەبەس بچنەدەرێ و کێڵگەیەک لەدەرەوەی شار بکڕن و لەوێ بەسەر ببەن و، دایکم لەو کێڵگەیەدا کشتوکاڵ بکات و هەر لەوێدا بمێننەوە تاکۆتایی ژیانیان کە دەچنە ئارامگەکەیان.

وتم: مەبەستت چییە؟

وتی: تۆ تاکە کوڕی باوکتی و خوشکت نییە کە لەدوای مردنی باوکت بەشی زۆری میراتەکەی بەرکەویت و تۆ دەبیتە خاوەن هەموو میراتییەکەی. کەواتە مافی ئەوەت هەیە لەکاتی زیندوویێتی باوکت خانووەکەی بگوازیتەوە بۆمن، لەبەرئەوەی ئەو مۆرەکەی خۆی داوە بەتۆ و بۆ فرۆشتنی خانووەکە تۆی سەرپشک کردووە.

کاتێ کە ئەم وتەیەم لێی بیست لەشم کەوتە لەرزین، چونکە من دەسەڵاتی خانووی خۆمم هەبوو، بەڵام نەمدەتوانی خانووی باوک و دایکم بدەم بە (نەفرنەفرنەفر) و وتم: ئەم داوایەت زۆر سەیرە، لەبەرئەوەی ئەگەر خانووەکەی ئەوان بدەم بە تۆ ئیتر کێڵگەیان نابێت کە ئەم ماوەیەی کۆتایی تەمەنیان تیایدا بژین.

(نەفرنەفرنەفر) بە کەنیزەکەی خۆی وت بچێتە دەرەوە و منی بانگ کرد بۆلای خۆی و وتی: سینۆهە وەرە سەیری سەرم بکە و من هەڵسام و دەستم بە تەماشاکردنی سەری کرد.

ژنەکە وتی: تۆ دەبێ بزانی من ژنێک نیم کە خۆم بەکەم بزانم و خانووەکەی تۆ کە دوێنێ داتپێم شایانی منی نییە و ئەگەر مەیلت لێیە ببیتە هاوسەری من دەبێ خانووەکەی باوکیشتم بدەیتێ بۆئەوەی بزانم بەڕاستی دڵت بەمنەوەیە.

وتم: (نەفرنەفرنەفر) دوێنێ کاتێ بەڵێنی ئەمڕۆت داپێم باسی خانووی باوکمی تێدانەبوو.

ژنەکە وتی: لەبەرئەوەی دوێنێ من نەمدەزانی تۆ دەسەڵاتی فرۆشتن یا گواستنەوەی خانووی باوکیشت هەیە و، دوێنێ، دوێنێ بوو و ئەمڕۆ ڕۆژێکی نوێیە، ئەگەر خانووەکەی باوکیشت بگوازیتەوە سەرناوی من ئەوا تا خۆرئاوا لەماڵی مندا دەبیت، بەمەرجێ لە پێشا بچی نووسەرێک بهێنی و بەڵگەنامەی گواستنەوەی خانووەکە بدەی بەمن، تا بتوانی لێرە بمێنیتەوە و قسەم لەگەڵدا



بکەی، چونکە باوەڕم بە پیاو نییە، لەبەرئەوەی دەزانم درۆزنن.

وتم: (نەفرنەفرنەفر) هەرچییەک تۆ بڵێی من وادەکەم...

ئەوسا منی لەخۆی دوورکردەوە و وتی: کەواتە لە پێشا بڕۆ نووسەرێک بهێنە و کاری گواستنەوەکە تەواوبکە، پاشان وەرە لام و ئەگەر شتێکت هەیە بیڵێ.

من لە ماڵەکەی هاتمە دەرەوە و جارێکی تر نووسەرم هێناو ئەم جارەیان خانووەکەی باوکم، کە دشمزانی جگە لە گۆڕەکەیان تاکە دارایی ئەوانە گواستمەوە بۆ سەرناوی (نەفرنەفرنەفر).

کاتێ نووسەرەکە ویستی بڕوات من زیوم پێ نەبوو بیدەمێ و ژنەکە حەڵقەیەکی باریکی زیوی داپێی و وتی: ئەمە هەق دەستی تۆیەو، نووسەرەکە ڕۆیشت.

(نەفرنەفرنەفر) فەرمانیدا بەندەکان نانی بەیانیمان بۆ بهێنن و ئەوان ماسیی شۆرو ئاوی جۆیان هێناو دوایی وتی: تۆ ئەمڕۆ تا خۆرئاوا لەم ماڵەدا میوانی و دەخۆیت و دەنۆشی و لەگەڵ مندا دەردەدڵ دەکەی. لەو کاتەوە تا پێش خۆرئاوابوون (نەفرنەفرنەفر) لەماڵەکەیدا لەگەڵ من بە خۆشەویستییەوە هەڵسوکەوتی دەکرد و هێشتی بڕوانمە سەری و، دەیوت: ئەمڕۆ دەبێ هەندێ شت بەتۆ بڵێم کە زانینی بۆتۆ پێویستە، چونکە تۆ گەنجێکی سادە و خۆش باوەڕی و لەم سەردەمەدا کە هەرکەس لە فکری خۆبەتی ئەو خۆش باوەڕییە بۆ مرۆڤ دەبێتە مایەی دەردەسەری و ناخۆشی، چونکە لەبەر ئەم جۆرە ئاکارانە گیرۆدەی داوی فێڵبازان دەبێ و ژیانی لەناودەچێت.

کاتێ کە خۆر گەیشتە جێگەیەک کە دیاربوو شەو نزیک بووەتەوە، ژنەکە پێمی وت: سینۆهە ئێستا کاتی ئەوە هاتووە بەجێم بهێڵی و بڕۆی، چونکە ماندوو بوومە و دەبێ پشوو بدەم و لەبیری ئارایشتی سبەینێ بم، مووەکانی سەرم ڕواوەتەوە و زیادی کردووە، دەبێ ئەمشەو بۆمی بتاشن کە بۆ سبەینێ

لووس بێت.

من لەگەڵ خەم و پەژارەی لێ جیابوونەوەی بەڕێ کەوتم و دوای ساتێ سووڕانەوەم لەناوشاردا ڕێگای ماڵەوەم گرتەبەر، هەرچەندە دەمزانی ئەو خانووە مافی بەسەر منەوە نەماوە. کە گەیشتمە ماڵەوە شەو داهاتبوو. شەرمەزاری و پەشیمانی زۆر هەندێ جار وەک تریاک خەوهێنەرە و من لەو شەوەدا لە شەرمەندەیی فرۆشتنی خانووەکەی باوکم یەکسەر خەوم لێ کەوت و چونکە بەرلەوە زۆرم خواردبۆوە تا سبەینێ بەئاگا نەهاتم.

بەرەبەیان کاتێ چاوم هەڵهێنا کەوتمەوە یادی (نەفرنەفرنەفر)و سەری و هەستم کرد ناتوانم لەماڵەوەدا بمێنمەوە ئەویش ماڵێک کە ئیتر هی من نییە. پاشان هاتمە دەرەوە و بەرەوماڵی ئەو ژنە کەوتمە ڕێ. من وام زانی نووستووە، بەڵام دوایی دەرکەوت بەخەبەرە و لە باخچەکەدایە، کاتێ منی بینی وتی: سینۆهە بۆ هاتووی و چیت لەمن دەوێت؟

وتم: هاتوومە لەتەک تۆوە بم و وەک دوێنێ سەیری سەرت بکەم و داوات لێ بکەم قسەم لەگەڵدا بکەی.

وتی: ئایا شتێکت هەیە بیدەی بەمن کە لەبری ئەوە ئەمڕۆ کاتەکانم بۆتۆ تەرخان بکەم؟

وتم: خانووەکەی خۆم و خانووی باوکیشم داوە بەتۆ و ئیتر هیچم نییە، بەڵام من چونکە پزیشکم و دەرچووی خانەی ژیانم لە ئایندەدا کە زەنگین بووم دەتوانم دیاریی ئەمڕۆت بدەمێ.

(نەفرنەفرنەفر) پێکەنی و وتی: باوەڕ بە بەڵێنی پیاو ناکەم، چونکە تا کاتێ لەسەر بەڵێن و پەیمانی خۆیانن کە سروشتیان ئارەزوو بکات ژنێ ببینن و سەرنجی ڕاکێشن و هەرئەوەندە توانییان بۆلای خۆیانی ڕاکێشن وەها فەرامۆشی دەکەن کە تاکۆتایی تەمەنیان ناکەونەوە یادی. بەڵام لەبەرئەوەی دوێنێ شوێن ڕێنماییەکانی من کەوتی و داواکارییەکانمت جێبەجێ کرد، لەوەیە ئەمڕۆش بمەوێ



قسەت لەگەڵ بکەم و ڕێگاچارەیەک بۆ دیارییەکەی ئەمڕۆ بدۆزینەوە.

من بەوپەڕی سادەییەوە لە تەنیشتی دانیشتم و بانگی کرد خواردن و خواردنەوەیان بۆ هێناین و وتی: لەوەیە ئەمڕۆ لای من بمێنیتەوە بۆیە لە ئێستاوە دەست بەخواردن و نۆشینەوە دەکەم.

پاش ئەوەی هەندێکمان نۆشییەوە (نەفرنەفرنەفر) وتی: سینۆهە بیستوومە دایک و باوکت گۆڕێکیان هەیە کە دروستیان کردووە و ڕازاندوویانەتەوەو تۆش دەسەڵاتی دەست بەسەراگرتنی داراییەکانی باوکت هەیە و دەتوانی ئەویشم بدەیتێ.

وتم: (نەفرنەفرنەفر) ئەم قسەیەی تۆ دەیکەی من گرفتاری تووڕەیی خوا (ئاموون) دەکات، چۆن دەتوانم گۆڕی دایک و باوکم بدەم بەتۆ و ببمە هۆی بەدبەختیی ئەو ژن و پیاوە لە دنیای تردا، کە بێ جێگا بمێننەوە و لاشەکەیان وەک تاوانباران و بەندەکان فڕێ دەنە ڕووباری نیلەوە.

(نەفرنەفرنەفر) وتی: چۆن ڕازی نابی دایک و باوکت بێ جێگا بمێننەوە، بەڵام ڕازی دەبی من خۆم سووک بکەم.

وتم: من دوێنێ دوو دیاریم دا پێت، ئایا بایی ئەوەندە نابێ کە ئەمڕۆ بەبێ دیاری لەگەڵ مندا ببەیتەسەر؟

ژنەکە وتی: ئەم دوو دیارییەت بایی نیوڕۆژ لە جوانییەکەی من نابێت، ئێستا پیاوێ کە خەڵکی وڵاتی دووئاوە هاتووەو ئامادەیە بۆ هێنانی یەکێ لە خزمەتکارەکانم (کەنیز) سەد (دێبن)[٣] زێڕی تەواو بدات. دوایی جامێکی تر خواردنەوەی داپێم و دووپاتی کردەوە کە تۆ دەبێ بزانی من ژنێکی هەژار نیم، ئەگەر حەزدەکەی لەلای من بەڕێزبیت و بمکەیتە هاوسەری خۆت، دەبێ گۆڕی دایک و باوکیشتم بدەیتێ.

وتم: باشەو، هەرئەوەندە زانیی ڕازی بوومە بە بەناوکردنی گۆڕکەی دایک و باوکم، خێرا ناردی بەشوێن نووسەرێکدا و بەڵگەنامەکە ڕێکخراو خۆشی هەق

دەستی نووسینەکەی داپێی، چونکە من هیچم نەبوو بیدەمێ. ئینجا پێمی وت با هەڵسین و، لە باخەکەدا هەڵسایین و چووینە ژوورەوە، چونکە هەوای باخەکە گەرم بوو وتی لەوێدا ناتوانین پشوو بدەین.

دوای ئەوەی چووینە ژوورەکەی وتی: من ژنێکم کە بەڵێنی خۆم دەبەمەسەر و تۆ لە ئایندەدا ناڵێی هەڵی خەڵەتاندووم، لەبەرئەوەی ئەمڕۆ دیارییەکت داوەپێم تاخۆرئاوابوون لەلات دەمێنمەوەو، دوایی یەکێک لە خزمەتکارەکانی خۆی کە کچێکی جوان بوو بانگ کرد و وتی: (ساز)مان بۆ لێ بدات و هەر ئاوازێ خۆی حەزی لێیە بۆمان بڵێت.

بەندەکانی پێنج جۆرە گۆشتیان بۆ هێنایین، بەڵام هەستم دەکرد هەموو جارێ لەپشت سەرمەوە گاڵتەم پێ دەکەن، چونکە هەموو دەیانزانی من تەنانەت گۆڕی دایک و باوکیشم داوە بە (نەفرنەفرنەفر) بۆئەوەی بتوانم ڕۆژێ لەگەڵی بم.

نازانم بۆچی ئەو ڕۆژە ئەوەندە بەزوویی تێپەڕی و بۆچی ئەو خۆشییانەی مرۆڤ بەپارەیەکی زۆر دەیکڕی لەچەند ساتێکدا کۆتایی پێ دێت، بەڵام ڕوژە ڕەشەکان تەواوبوونیان نییە و کاتێکم زانی ڕۆژ کۆتایی پێهات و شەوداهات و (نەفرنەفرنەفر) وتی: ئێستا کاتی ئەوەیە لێرە بڕۆیتە دەرەوە چونکە دەبێتە شەو و من ماندووم و دەبێ خۆم بۆ سبەینێ ئارایش بکەم.

وتم: (نەفرنەفرنەفر) من حەزدەکەم ئیمشەویش لێرە لەلات بمێنمەوە و سبەینێ بەیانییەکەی لێرە دەڕۆم.

وتی: بۆئەوەی ئەمشەو لەلام بیت چیم دەدەیتێ؟

وتم: من هیچ شتێکم نەماوە پێشکەشتی بکەم و، لەبەرخاتری تۆ دایک و باوکمم لەو دنیا بێجێگاو ڕێگا کرد و ئێستا گرفتاری تووڕەیی ئاموون بوومە.

ژنەکە وتی: جانەهاتیتایە بۆئێرە، ئایا من ناردوومە بەشوێنتدا کە بێی و لێرە سەرم بیەشێنی؟

زۆر هەوڵمدا شەو لەلای بمێنمەوە، بەڵام (نەفرنەفرنەفر) وتی: ئەمشەو بازرگانێ کە خەڵکی دووئاوە دێت بۆئێرە و سەد (دێبن) زێڕ دەدات و من ناتوانم لەو هەموو زێڕە چاوپۆشی بکەم. هێشتا ئەگەر تۆ شتێکت هەبووایە و بتدایە بەمن لەوەیە هەندێ لە زەرەرەکەم ببژاردایە، بەڵام چونکە هیچت نییە دەبێ بڕۆی.

پاشان لە تەنیشت منەوە هەڵسا بڕوات، بەڵام من دەستەکانیم گرت کە نەهێلم بڕوات و لەو کاتەدا بەهۆی ئەوخواردنەوانەی پێی نوشیبوومەوە نەمدەزانی چی دەڵێم و کە بینیی دەستەکانیم بەتوندی گرتووەو ڕێم لە ڕۆیشتنی گرتووە بانگی بەندەکانی کرد و وتی: کێ پێی وتوون ئەم پیاوە سواڵکەرە بکەنە ژوورەوە؟ زوو لێرە بیبەنە دەرەوە و ئەگەر بەرگری کرد ئەوەندە بەدار لێی بدەن کە نەتوانێ بجووڵێتەوە.

بەندەکانی شاڵاویان بۆهێنام و من ئەگەرچی سەرخۆش بووم ویستم بەرگری بکەم و نەچمە دەرەوە و ئەوان ئەوەندە داریان بەسەر و گوێلاکمدا کێشا کە خوێن لەسەر و دەم و چاو و سینە و سکمەوە هاتە خوارێ و دوایی منیان گرت و فڕێیان دامە دەرەوە. کاتێ خەڵک لەسەرم کۆبوونەوە و پرسییان بۆچی ئەم کابرایەتان وا لێ کردووە، وتیان: لەبەرئەوەی بێ ڕێزیی بە خانمەکەمان کردووە و هەرچەند پێمان وت تۆ پیاوێکی سووک و بێنەوای و خانمەکەی ئێمە ژنێ نییە ببێتە هاوسەری تۆ، مێشکی وەری نەگرت و ئەیەویست بەزۆر بچێتە ژوورەکەیەوە و ئێمەش دەرمان کردە دەرەوە.

من ئەم قسانەم لەکاتی نیوە بێهۆشیدا گوێ لێ بوو و ئەوەندەم لێدان خواردبوو کە نەمدەتوانی لەوێ بڕۆم و هەر بەو لەشە خوێناوییەوە خەوم لێ کەوت.سبەینێ زوو لە دەنگی پێی ڕێبواران و دەنگی گالیسکەکان بەئاگاهاتمەوە. هەموو لەشم ژانی دەکرد و مەستیی شەرابەکە لە گیانم دەرچووبوو، بەڵام ئەوەندەی لەشەرمەزاری و پەشیمانی ڕەنجم دەبرد لە ژانەکەی لەشم هەستم بەئازار نەدەکرد.

بەرێ کەوتم و خۆم گەیاندە کەناری نیل و خوێنەکانی لەشم شوشت و دوایی بەرەو دەرەوەی شار کەوتمەڕێ، چونکە ئەوەندە شەرم و تەریقی دایگرتبووم کە نەمدەتوانی بگەڕێمەوە بۆماڵ. ماوەی سێ ڕۆژ لە قامیشەڵانەکانی کەناری نیل مامەوە و لەم ماوەیەدا جگەلە ئاو و هەندێ گیا هیچی ترم نەخوارد. دوای ئەو سێ ڕۆژە گەڕامەوە ماڵ و بینیم ناوی پزیشکێکی تر لەسەر خانووەکەم نووسراوە و دیاربوو فرۆشرابوو.

کاپتا لەخانووەکە هاتە دەرەوە و کە منی بینی کەوتەگریان و وتی: گەورە بەدبەختەکەی من، پزیشکێکی گەنج خانووەکەتی داگیرکردووە و ئێستا من بەندەی ئەوم و کاری بۆ دەکەم. دوایی وتی ئەگەر بمتوانیبایە تاکە چاوەکەی خومم دەداپێی کە لەم چارەڕەشییە ڕزگارت بکەم، چونکە دایک و باوکیشت ماڵئاواییان لێ کردین.

دەستەکانم بەرزکردەوە و وتم: پەنابە (ئاموون)، دایک و باوکم چۆن مردن؟

کاپتا وتی: لەبەرئەوەی تۆ خانووەکەیانت فرۆشتبوو، ئەم بەیانییە لەلایەن دادوەری گەورەوە چوونە سەریان کە دەریان بکەن و بیدەنە خاوەنەکەی کە دەستی بەسەردا بگرێ، بەڵام دایک و باوکەکەت لەسەر زەوی کەوتبوون و نەدەجووڵانەوە و هێشتا نەزانراوە خۆیان مردوون یان دوای ئەوەی زانیویانە لەو خانووە دەردەکرێن خۆیان ژەهرخواردوو کردووە و کۆتاییان بە ژیانیان هێناوە، بەڵام دەتوانی بچی و تەرمەکانیان کە هێشتا لە خانووەکەدا ماوەتەوە ببینی و دوایی بیبەی بۆ (خانەی مەرگ).

وتم: ئایا تۆ دایک و باوکمت نەبینی؟

کاپتا وتی: دوێنێ کاتێ گەورە تازەکەم هاتبوو ئێرە ببینێ و دایکیشی ئیشی پێ دەکردم، بینیم کە باوکت هاتە ئێرە و لەبەرئەوەی نابینابوو دایکت دەستی گرتبوو و هەردووکیان هاتبوون تۆ ببینن و، من بینیم دایکیشت لەبەر بەساڵاچوویی نەیدەتوانی بەباشی بەڕێدا بڕوات. ئەوان وتیان پێم



فەرمانبەرەکانی دادڕەسی گەورە هاتوونە و مۆریان لەهەموو شتێ داوە و وتوویانە بەزووترین کات دەبێ خانووەکە بەجێ بهێڵن ئەگەرنا دەتانکەینە دەرەوە. باوکیشت وتبووی بۆچی دەتانەوێ لە خانووەکەدا دەرمان بکەن . ئەوان لە وەڵامدا وتبوویان سینۆهەی کوڕتان هەڵخەڵەتاوە و ئەم خانووەی داوە بە ژنێکی بەدناو و ئێستا ئەو ژنە خاوەنیەتی.

باوکت داوای لێ کردم کە پێت ڕابگەیەنم کە بچیتە لایان، بەڵام من نەمدەزانی لە کوێی. لەو کاتەدا باوکت کە کوێربوو دەیویست شتێ بنووسێ، بەمنی وت کەرتە مسێکی باریکم بدەرێ کە بتوانم بەهۆی نووسەرەوە نامەیەک بنووسم کە لە دوای مردنم نامەکە بدەنە کوڕەکەم، دانیشتم و وتم: کاپتا هەرچییەک مس و زیوت پاشەکەوت کردووە بیهێنە و بیدە بەمن، چونکە دایک و باوکم مردوونە و بۆ مۆمیایی کردنیان هیچ کانزایەکم نییە. ئەگەر بمێنم مس و زیوەکەت دەدەمەوە و ئەگەریش مردم ئاموون پاداشتی تۆ دەداتەوە.

کاپتا دەستی کرد بەگریان و وتی: ئەگەر تاکە چاوەکانمت دەوێ ئامادەم بیدەم بەتۆ، بەڵام زیو و مسم نییە.

من ئەوەندە لێی پاڕامەوە هەتاکو ڕۆیشت و دوای ئەوەی بەوردی ڕوانییە دەوروبەری خۆی کە کەس نەیبینێ، بەردێکی لە باخچەکە هەڵگرت و لە ژێریەوە پەڕۆ کۆنەیەکی هێنایە دەرەوە کە چەند کەرتە زیو و مسێکی تێدابوو و بەمنی وت: ئەی گەورەی بەڕێزم ئەم زیو و مسە پاشەکەوتی هەموو تەمەنمە و جگەلەمە لەم دنیایەدا هیچی ترم نییە.

وتم: کاپتا من لەبەرئەوەی پزیشکم ئەگەر بمێنم دە ئەوەندەی ئەمەت دەدەمەوە... من دەمتوانی بڕۆم لەو کاتە نائاساییەدا لە پاتوور پزیشکی پاشایەتی، یان تومتسی هاوڕێم هەندێ کانزا قەرزبکەم، بەڵام لەبەرئەوەی گەنج و بێ ئەزموون بووم وام بیردەکردەوە ئەگەر داوای قەرزیان لێ بکەم کەسایەتی و ئابڕووم لەلایان کەم دەکات.

کاتێ گەیشتمە ماڵی دایک و باوکم، جیرانەکانم بینی کۆبوونەتەوە و دەم و چاوی دایک و باوکم رەش ببوو و لە ناوەڕاستی هۆدەکەدا ئاگردانێکی لە خشت دروست کراوی گەورەی لێ بوو کە هێشتا ئاگری تێدابوو. زانیم کە دایک و باوکم بە خەڵووز خۆکوژییان کردبوو و ئاگردانە گەورەکەیان پڕکردووە لە خەڵووز و ئاگریان داوە و لەبەرئەوەی دەرگای هۆدەکە داخرابوو خنکابوون. پارچەیەکم هەڵگرت و دایک و باوکم پێچایە ناویەوە و خاوەن گوێ درێژێکم بانگ کردو کەرتە مسێکم داپێی کە دایک و باوکم بۆ بگەیەنێتە خانەی مەرگ، لەوێ ئامادەنەبوون دایک و باوکم وەربگرن و وتیان لە پێشادەبێ پارەی مۆمیاکردنەکەی هەردووکیان بدەی، بۆئەوەی بیانکەینە ئاو و خوێوە.

من وتم: تائێوە مۆمیایی دەکەن من پارەکەی پەیدا دەکەم، بەڵام کرێکارەکانی خانەی مەرگ رازی نەبوون. هەتا یەکێک لەوان کە بەساڵاچووبوو و لە کاتی مۆمیایی کردنی لاشەی فیرعەون ببووبە هاوڕێم و لەناویاندا دەستی دەڕۆیشت، کەفیلی منی کرد کە هەقدەستەکەیان لە ماوەی مۆمیاکردنەکە بەیەکجاری یان بەش بەش بدەم.

دوایی گوریسێکیان بەپێی دایکم و یەکێکی تریشیان بە پێی باوکمەوە گرێدا کەلەگەڵ مردووەکانی تر نەگۆڕێن و خستیانە حەوزی خوێواوی تایبەت بەڕاگرتنی تەرمی هەژاران. کاتێ کە دڵنیابووم لاشەکان لە خوێواودا جێی خۆیان گرتووە، گەڕامەوە ماڵ بۆئەوەی ئەو پارچەیەی لەوێ هەڵم گرتبوو بۆئەو خانووەی بگەڕێنمەوە، چونکە ئەو پارچەیە مافی بەئێمەوە نەمابوو و هی خاوەنە تازەکەی خانووەکەبوو و، ئەگەر نەمدایەتەوە دەیکردە دزی.

کاتێ ویستم لە ماڵەکە دەرچم و بگەڕێمەوە خانەی مەرگ پیاوێک کە لەسووچی کۆڵانەکە لەنزیک دووکانی نانەواخانەکە دادەنیشت و کاغەزنووسی دەکرد، هەڵساو بانگی کردم سینۆهە... سینۆهە... من لێی نزیک بوومەوە و ئەو پاپیروسێکی (کاغەزی میسری) داپێم و وتی ئەم نامەیە باوکت بۆ تۆی



نووسیوە و رایسپاردم کاتێ کەتۆ هاتی بیدەمە دەستت.

من نامەکەم کردەوە و وام خوێندەوە:-

(سینۆهە.. کوڕە ئازیزەکەمان.. لەوەی گۆڕەکەی ئێمەت فرۆشتووە خەمبارمەبە، چونکە هەرئەوە باشترە کە ئێمە گۆڕمان نەبێت و بەیەکجاری لە ناو بچین، بۆئەوەی لە دنیای تردا تووشی ئازار و مەینەتی سەفەرە دوورو درێژەکەی ئەو جیهانە نەبین. تۆ کاتێ هاتییە ماڵی ئێمە هەردووکمان پیربووین و هاتنی تۆ بۆ ماڵی ئێمە، ساڵەکانی دوایی تەمەنمانی پڕ کرد لەشادی و، ئێمە لەخوایەکانی میسر داواکارین بەئەندازەی ئەوەندەی کەتۆ بوویتە هۆی خۆشی و بەختەوەریی ئێمە، منداڵەکانت ئەوەندە ببنە مایەی بەختەوەری و خۆشیت. ئێمەبەئاسوودەیی و دڵنیاییەوە ئەم دنیایە بەجێ دەهێڵین و بەبێ گۆڕ بەرەو نەمانێکی رەها دەچین، بەڵام دەزانین کە تۆ خۆت نەتدەویست ئێمە بێ گۆڕ بمێنینەوە، بەڵکو ئەو رووداوانەی کە جڵەوی لە دەسەڵاتی تۆ دەرچووبوو، بووە هۆی ئەم پێشهاتە[٤].

کاتێ ئەم نامەیەم خوێندەوە، ماوەیەک گریام و هەرچەندە نووسەرەکە دڵی دەدامەوە ئارامم نەدەگرت و کاتێ فرمێسکەکانی چاوم تەواوبوو، بەنووسەری نامەکەم وت: من دراوێکم نییە کە پاداشتی گەیاندنی ئەم نامەیەت بدەمەوە، بەڵام ئامادەم لەبری ئەوە سوخمەکەی خۆمت بدەمێ. سوخمەکەم لەبەرم داکەند و ئەو بەسەرسوڕمانەوە کراسەکەی لێ وەرگرتم و هەندێ سەیری کرد کە بزانێ گرانبەها و نوێیە یان نا و لە ناکاو شادمان بوو و، وتی: سینۆهە ئەگەرچی خەڵکی بەخراپە باست دەکەن و دەڵێن خانووی دایک و باوکت و تەنانەت گۆڕەکەشیانت فرۆشتووەو ئەوانت بێ جێگاو رێگا کردووە، بەڵام بەخشندەیی تۆ گەلێک زۆرەو لەمەو بەدوا هەرکەسێک بیەوێ بە خراپە باست بکات لەسەرت دەکەمەوە، بەڵام ئێستا کە سوخمەکەت داوە بەمن خۆت بێ کراس ماویتەوە و گەرمی خۆر شانەکانت و لەشت دەسووتێنێ و دەیکاتە برین و کێم و خوێنی لێ

دێت.

وتم: تۆ نازانی بەگەیاندنی ئەم نامەیە چ خزمەتێکی گەورەت بەمن کردووە و چەند منت شادمان کرد، هەڵی بگرە و خەمی منت نەبێ.

کاتێ پیاوەکە ڕۆیشت، من کەلە سینەپۆشێک زیاترم لەبەردا نەبوو، بەرەو خانەی مەرگ کەوتمەڕێ بۆئەوەی لەوێ وەک کرێکارێکی ئاسایی کاربکەم تا مۆمیایی کردنی لاشەی دایک و باوکم تەواو دەبێت. وەستا بەساڵاچووەکەی خانەی مەرگ کەلە رابردوودا منی بینی بوو و سەرنجی دابووم، ناوی (راموز) بوو و پێم وت: دەمەوێ ببمە شاگردی تۆ و لەلای تۆ کاربکەم.

ئەو وتی: من بەخۆشحاڵییەوە ئامادەم تۆ ببیتە شاگردی من، بەڵام تۆ دەرچووی خانەی ژیانی و پزیشکی، چۆن خۆت رازی دەکەی کە بێیت و لێرە شاگردیی من بکەی؟

وتم: مەیلی ژنێک منی هەژار کردو هەرچی هەم بوو لێی سەندم و ئێستا دەرمانگەم نییە کە پزیشکی تێدابکەم و کەسیش نییە بتوانم زێڕ و پارەی لێ قەرز بکەم و خانووی پێ بکڕم.

(راموز) بە تێڕامانێکەوە سەری جووڵاند و وتی: هەرکاتێ دەبیستم پیاوێ تووشی بەدبەختی بووە دەزانم کە ژنێک ئەوی وا لێکردووە.

من ماوەی چل شەو و ڕۆژ لە خانەی مەرگ مامەوەو، لەم ماوەیەدا وەک کەمترین کرێکارەکانی ئەو دامەزراوە خەریکی مۆمیایی کردنی لاشەکان بووم، کرێکارەکان کە دەیانزانی من لە چینی ئەوان نیم و بێ شانسی منی هێناوەتە (خانەی مەرگ) پیسترین کارەکانیان بە من دەکرد، تا بەم شێوەیە تۆڵە لەمن بکەنەوە کە خوێندەواری و بڕوانامەم هەبوو و لەوان بەرزتر بووم.

منیش بەناچاری فەرمانەکانیانم جێبەجێ دەکرد بۆئەوەی بتوانم دایک و باوکم مۆمیایی بکەم و تەنها دڵخۆشی من ئەوەبوو کە دەمتوانی وەکو یەکێ لە دەوڵەمەندەکان تەرمی هەردووکیان مۆمیایی بکەم.



بەدەستی خۆم بە خۆشەویستی و دڵپاکییەوە سک و سینەی باوک و دایکە شیردەرەکەم هەڵدڕی و گەدە و ریخۆڵەکان و دڵ و سی و جگەریان و ئەندامەکانی تری ناوەوەیانم دەرکردو ناو سک و سینەیانم پڕ کرد لە قامیشی پڕ لە ڕۆن، بەشێوەیەک کە لە خانەی مەرگ کاتی مۆمیایی کردنی لاشەی فیرعەون فێری بووبووم. پاشان وەک شێوەی کاری (راموز) کە جاری پێشوو لە خانەی مەرگ بینی بووم، مێشکی هەردووکیانم لە ڕێگای کونە لووتیانەوە دەرکرد و ناو کاسەی سەریانم پڕ کرد لە ڕۆنی مۆمیایی (ڕۆنی مۆمیایی ئەوەیە کە ئێمە قیر - زفت -ی پێ دەڵێین - وەرگێڕ) دایک و باوکم ددانی دەستکردیان نەبوو، هێشتا خۆشم ددانی دەست کردم دروست نەکردبوو. ئەگەر زووتر هەستم بەم داهێنانە بکردایە، ددانی دەستکردم بۆ هەردووکیان دروست دەکرد، کەلەو دنیا بە ئاسوودەییەوە خواردنی پێ بخۆن[٥].

ئەی خوایەکان ئاگاداربن کە من بۆ مۆمیایی کردنی تەرمی دایک و باوکم ڕۆن و دەرمان و پارچەکانی خانەی مەرگم نەدزیوە، بەڵکو وەک کرێکارێکی سووک... وەک بەندەیەک... لەوێدا کارم کردو خواردنی باشم نەخوارد و شەرابم نەنۆشییەوەو بەو مسەی لەبری کارکردن دەیاندا پێم، ڕۆن و دەرمان و پارچەم پێ دەکڕی تاوەکو مۆمیاییەکەیان تەواوبوو.

لە (گەرم خانە) هەموو ڕۆنەکانی ناو کاسەی سەر و سینەو سکی تەرمی دایک و باوکم چووە گۆشتەکەیانەوە و دوایی ئەو گۆشتە وشک بووەوە و، هەموو ئاوی ناو گۆشتەکەیان بوو بە هەڵم.

کاتێ قۆناغی دوایی کۆتایی پێ هات و دەبووایە تەرمەکانم ببردایەتە دەرەوە، بینیم کێشی جەستەی دایک و باوکم بووەتە یەک لە سێی کێشی پێشوویان (واتە ئەو کاتەی کە تازە هێنابوومە خانەی مەرگەوە). لەو چل شەو و ڕۆژە کە من لە خانەی مەرگ بووم هەڵسوکەوتی کرێکارە بێ تەربێت و توورەکان لەگەڵمدا گۆڕا و باشتربوون، ئەگەرچی هێشتا هەر جنێویان دەدا و سووکایەتییان

پێ دەکردم، بەڵام تووڕەییان نەما و ئەوان خوویان بەو بێ ڕێزییەوە گرتبوو و نەیاندەتوانی ڕەفتاری خۆیان بگۆڕن. کاتێ زانییان دەمەوێ تەرمی بەخێوکەرەکانم لەوێ ببەمەدەرەوە، یارمەتییان دام و پێستێکی مانگای باشیان بەپارەی خۆم بۆ کڕیم و لاشەی دایک و باوکمم خستە ناویەوە و بە سیرمە دووریمەوە.

ئەو ڕۆژەی ویستم لە خانەی مەرگ بڕۆم (ڕاموز) وتی: لێرە مەڕۆ و تاکۆتایی تەمەنت لێرەبە، چونکە دەرامەتی کرێکارانی ئێرە لە پزیشکێکی پاشایەتی کەمتر نییە و ئەگەر تۆ نیوەی دەرامەتەکەت پاشەکەوت بکەی لەهی کاتی پیریدا دەتوانی وەکو کاهینێک ژیان بەسەر ببەیت و بەندە و کەنیزت هەبێ و. خەڵکی چونکە لەکار کردنی ئێرە بێزارن پێشبڕکێی ئێمە ناکەن.

بەڵام من نەمدەتوانی لەوێ بمێنمەوە، لەبەرئەوەی وام بیر دەکردەوە پیاوێ کە بتوانێ کارێکی گەورەتر بکات نابێ بەکارێکی بچووکەوە خەریک بێت. لە نێوان قسەی ناشیرین و پێکەنین و گاڵتەی کرێکاران خواحافیزیم لە (ڕاموز) کرد و پێستی مانگاکە، کە لاشەی دایک و باوکمی تێدابوو کردمە سەرشانم و لەوێ هاتمە دەرەوە. خەڵکی لە کۆڵانەکاندا لێم دوور دەکەوتنەوە و لووتی خۆیان دەگرت کە بۆنی من نەکەن، چونکە وەها بۆنی خانەی مەرگم لێ دەهات کە هەموو کەسێکی بێزار دەکردو دەیترساندن.

تەبەس دوو شاری گەورەی هەبوو، کە یەکێکیان شاری زیندووەکان بوو و ئەوەی تر شاری مردووەکان. شاری مردووەکان کەوتبووە ئەوبەری نیل و لەکاتی شەودا شاری مردووەکان کە دەکاتە چەقی گۆڕەکان باشتر لە شاری زیندووەکان پارێزگاریی لێ دەکرا. من دەمزانی کە بە هیچ شێوەیەک ناتوانم بچمە شاری مردووەکانەوە، لەبەرئەوەی پاسەوانەکان یەکسەر دەیانکوشتم، بەڵام دەکرا بچم بۆ (دۆڵی دەسەڵاتداران)[٦] و ئەو دۆڵەش لەوبەر نیلەوە بوو، بەڵام لەسەرووتری شاری مردووەکان و لەلای باشوور بوو و هەموو فیرعەونەکانی میسر لە سەرەتای



جیهانەوە تا ئەمڕۆ لە دۆڵی دەسەڵاتداران نێژرابوون.

کاتی شەو دۆڵی دەسەڵاتداران وەک شاری مردووەکان پاسەوانی لێ نەدەکرا، لەبەر ئەوەی پاسەوانەکان و خەڵکیش دەزانن کە کاهینەکان کاتێک فیرعەونێک دەخەنە ناو گۆڕەکەوە، بەشێوەیەک ئارامگاکەی تەلەسم دەکەن کە هەر کەسێک بیەوێت بچێتە ناویەوە، دەمرێت، من باوەڕم بەتەلەسم نییەو لەو باوەڕەدانیم بتوانێ مرۆڤ بکوژێ، بەڵام واهەست دەکەم کاهینەکانی میسر پاش ناشتنی فیرعەون دەرگا و دیوار و هەموو کەل و پەلەکانی ئارامگەکە تەنانەت دارە تەرمەکەی فیرعەونیش جۆرە ژەهرێکی بەهێزی لێ دەدەن کە بە درێژایی کات کاریگەرێتییەکەی دەمێنێ و ئەگەر کەسێ بەمەبەستی دزی بچێتە ناویەوە و بیەوێ کەل و پەلە گرانبەهاکانی ببات بەهۆی ئەو ژەهرەوە دەمرێ. من داواکاری مردن بووم و پێشوازیم لێ دەکردو بە خۆمم دەوت ئەگەر بتوانم گۆڕێک بۆ دایک و باوکم پەیدا بکەم مردنی من گرنگ نییە، گرنگ ئەوەیە ئەو دووانە لە ناو نەچن و لەو دنیا زیندوو ببنەوە و ڕێڕەوییە دوور و درێژەکەیان دەست پێ بکەن و بۆئەوەی لە ناونەچن دەبێ لاشەکەیان لە گۆڕێکدا بشاردرێتەوە ئەگەرنا ئەو تەرمە مۆمیایی کراوانە لەبەر گەرمیی هەوا تێک دەچوون.

لەکاتی ڕۆژدا لاشەکانم خستە سەرشانم و بردمە بیابان تا لە دیدی خەڵکی بەدووربم. کاتێ شەو داهات وەستام کە کەمێکی پێ بچێ تاوەکو چەقەڵ و کەمتیارەکان بکەونە دەنگە دەنگ، ئەوسا گەڕامەوە شار و قولێنگێکم بۆ هەڵکەندنی زەوی کڕی. کاتێ گەیشتمە دۆڵی دەسەڵاتداران نیوەشەو بوو و هەرچەندە دەمبینی مارەکان بەبەینی بنچکە گیایەکاندا هاتوچۆیان دەکرد، بەڵام لێیان نەدەترسام و لە هەندێ شوێندا دووپشکی گەورەم دەبینی کە لەوانیش مەترسیم نەبوو، چونکە ئارەزووی مردنم لە خوایەکان دەکرد و بنچینەی گشتی ئەوەیە کە کاتێ مرۆڤ خوازیاری مردن بێت، مەرگ بەلایەوە نایەت.

من لە شوێنی بازگەکانی چاودێری ئەوێ ئاگادارنەبووم و نەمدەتوانی

خۆمیانی لێ دووربخەمەوە، بەڵام هیچ کامێکیان منیان نەبینی و رێگایان لێ نەگرتم ، لەوەشە منیان بینیبێ و وایان زانیبێ یەکێک لە مردووەکانم کە خواردنەکەی خۆی بە کۆڵەوەیە و بەناوگۆڕی فیرعەونەکاندا هاتوچۆدەکەم. ماوەیەک لە نێوان گۆڕی فیرعەونەکاندا سووڕامەوەو بەدوای ئارامگەیەک دەگەڕام کە بتوانم دەرگاکەی بکەمەوەو تەرمی دایک و باوکم بکەمەناوی، بەڵام زانیم کە هەموو دەرگاکان داخراون و کردنەوەیان گومان دروست دەکات و پاسەوانەکان یەکسەر هەستی پێ دەکەن کە مردوویەکیان لە گۆڕی فیرعەوندا ناشتووە. من لە مردن نەدەترسام و لەو شتەی تەلەسمی[٧] فیرعەونیان پێ دەوت بێ باک بووم و ئەگەر بمتوانیایە گۆڕێکیان بۆ پەیدا بکەم خەیاڵم ئاسوودە دەبوو، ئەگەرچی دوایی یەکسەر بمردمایە.

کاتێ تێگەیشتم کە ناتوانم دەرگای هیچ گۆڕێکیان بکەمەوە لەبەردەم یەکێک لە ئارامگەکاندا لە دەرەوەی گۆڕەکە بەوپاچەی لەگەڵ خۆمدا هێنابووم گۆڕێکم لە سەر زەوییە لمییەکە هەڵکەند و بۆلابردنی خاکەکە جگەلە هەردوو دەستم هیچی ترم پێ نەبوو و بەهۆی لێ خشاندن و لابردنی وردە بەردەکانەوە دەستم بریندار بوو، بەڵام گوێم نەدەدایە.

ئەوەندە زەوییەکەم هەڵکەند تا بووە چاڵێکی گەورە بەئەندازەی قەبارەی هەردوو تەرمەکە و دوایی پێستی مانگاکەم کردە چاڵەکەوە و خۆڵم بەسەردا کرد و لەبەرئەوەی بەردەم گۆڕی فیرعەون زیخ (چەو)بوو لە ناوبردنی ئاسەواری هەڵکەندن ئاسان بوو. ئەوسا هەناسەیەکی ئاسوودەم هەڵکێشا، چونکە دڵنیابووم کە دایک و باوکم لەبەرئەوەی لە نزیک فیرعەونەوەن لەو دنیا لە رووی خواردنەوە سەغڵەت نابن، چونکە بەردەوام لەگەڵ فیرعەوندا بەسەردەبەن و نان و گۆشت و شەرابی ئەو دەخۆن.

کاتێ کە خەریکی خۆڵ بەسەردا کردنی تەرمەکان بووم دەستم بەر شتێکی رەق کەوت و کاتێ هەڵم گرتەوە زانیم گۆیەکی بچووکی گرانبەهایەو کە وردە



بەردی بەنرخیان بە بانیەوە نووساندبوو و زانیم لەو کەل و پەلانەیە کە لە کاتی ناشتنی فیرعەون بۆ ناو گۆڕەکەیان هێناوەو لەوێ کەوتووەو دوایی بەهۆی دروستکردنی ئارامگەکەیەوە کەوتۆتە ژێرخاک.

گۆیەکەم هەڵگرتەوەو دەستم هەڵبڕی و خواحافیزیم لە دایک و باوکم کرد و وتم ئومێدەوارم لاشەکەتان بۆ هەمیشە بمێنێتەوە.

کاتێ لە دۆڵی دەسەڵاتداران هاتمە دەرەوە و خۆم گەیاندە کەناری نیل سپێدەی دابوو و قولێنگەکەم فڕێ دایە ئاوی رووبارەکەوەو لە کەناری ئاوەکە راکشام، بەڵام بەهۆی ماندوێتییەوە لەشم زۆر بەئازاربوو و نەمدەتوانی بنووم، تائەو کاتەی لەبەر هیلاکی زۆر ئاگام لە خۆم نەماو نووستم و کاتێ دەنگی مراوییەکان هات بەخەبەر هاتمەوە و بینیم هەتاو بەرزبۆتەوە و کەشتیوانەکان لە رووباردا خەریکی هاتوچوون و ژنە جل شۆرەکان لە کەناری رووبارەکەدا قسەیان دەکرد و خەریکی کاربوون. بەیانییەکی رووناک و ئومێدبەخش بوو، بەڵام دڵی من پەژارەی هەبوو و ئەوەندە خەمبار بووم کە هەستم بەلەش و لاری خۆم نەدەکرد، کراسەکەم تەنیا بریتی بوو لە سینەپۆشێک و گەرمای هەتاو پشتمی سووتاندبوو، کەرتە مسێکیشم نەبوو کەنان و ئاوی جۆی پێ بکڕم. لەشم بۆنی بۆگەنی خانەی مردووەکانی لێ دەهات چونکە هێشتا لە نیلدا خۆم نەشۆریبوو.من بەو بارە بەزەیی هێنەرەوە نەمدەتوانی روو لە دۆستەکانم بکەم و داوای یارمەتییان لێ بکەم، چونکە ئەگەر منیان ببینیایە دەیانزانی من گرفتاری تووڕەیی خوایەک بوومە و هەروەها هەموو دەیانزانی من خانووی خۆم و خانووی باوک و دایکم و تەنانەت ئارامگەکەشیانم بە ژنێک فروشتووە و نەمدەتوانی بەم بەدناوییەوە خۆمیان لێ نزیک بکەمەوە.

لەو بیرەدابووم کە چی بکەم و چۆن سکی خۆم تێربکەم کە لەناکاو هەستم کرد مرۆڤێ لە نزیک منەوە دەجووڵایەوە، ئەوەندە چارەی ئەو پیاوە ترسناک بوو کە سەرەتا تێ نەگەیشتم کە مرۆڤە، چونکە لە جیاتی لووتی کونێکی بەرین لە

ناوەڕاست دەم و چاویدا دەبینرا و گوێچکەی نەبوو و دیاربوو کە گوێچکەکانیان بڕیوەتەوە. ئەو کابرایە لاواز دەهاتەبەرچاو و دەستی گەورە و گرێ گرێی هەبوو و کاتێ زانیی من هەستم بەوکردووە، پرسیی: چی لە ناو مشتە بەستراوەکەت دایە؟

من پەنجەکانم کردەوە و ئەو گۆیەکەی فیرعەونی بینی و ناسیی و وتی: ئەمە بدە بەمن بۆئەوەی بەختم بکرێتەوە، چونکە زۆر پێویستیم بە شانس هەیە و بیستوومە هەرکەسێ گۆی وەهای هەبێت بەختەوەر دەبێ.

وتم: من پیاوێکی هەژارم و جگە لەمە هیچم نییە و دەمەوێ هەڵی بگرم بۆئەوەی ببێتە هۆی بەختەوەریم.

پیاوەکە وتی: ئەگەرچی من هەژارم، بەڵام لەبەرئەوەی دەبینم تۆش نەبووی ئامادەم لە جیاتی ئەوگۆیە حەڵقەیەکی زیوت بدەمێ.

دوایی حەڵقەیەکی زیوی لە ژێر پشتێنەکەیەوە دەرهێناو بۆمنی درێژکرد و من وتم: گۆیەکەم نافرۆشم.

وتی: تۆ لە بیرت چوو کەمن دەمتوانی بەبێ بەرامبەر ئەم گۆیە لە تۆ بستێنم. چونکە تۆ لە خەودابووی و دەمتوانی بتکوژم و گۆیەکە بفرێنم.

وتم: بە گوێ و لووتە بڕاوەکانتدا وادەردەکەوێ کە پیاوێکی تاوانبار بوویتە و دوای بڕینەوەی گوێ و لووتت بۆ کارکردن ناردرابێتی بۆ (کانگە) و ئێستا لەوێ هەڵهاتووی، دەبێ بەزوویی لێرە بڕۆی، چونکە ئەگەر ئێشکچی بێت و لێرە بتبینێ دەستگیرت دەکات و دەتگەڕێنێتەوە بۆ (کانگە) و ئەگەر منت بکوشتایە، بەقاچ هەڵیان دەواسیی تاکو دەمردی.

کابرا وتی: تۆ خەڵکی کوێیت و لە کوێوە دێیت کە هێشتا نەتزانیوە هەموو ئەو بەندانەی کە لە کانگەکاندا کاریان دەکرد ئازادکراون.

وتم: چۆن شتی وادەبێت، بەندەکان چۆن لە کانگەکان ئازاددەکرێن؟

پیاوەکە وتی: فیرعەونی نوێ کە تازە لەسەر تەخت دانیشتووەو پێشتر



جێنشین بوو، دوای هاتنە سەرتەخت هەموو بەندەکانی لە کانگەکان ئازادکرد و لەمەوبەدوا تەنیا ئەو کەسانەی کە ئازادن لە کانگە کاردەکەن و پاداشت وەردەگرن.

بە فکری خۆم بۆی چووم کە ئەو پیاوە راست دەکات، چونکە من چل شەو و چل رۆژ لە خانەی مەرگدا بووم و لە هیچ جێگایەک هەواڵم نەبیستبوو و، نەمدەزانی فیرعەونی جەوان و نوێ ئەوانی لە کانگەکان ئازاد کردووە.

پیاوەکە وتی: ئەگەرچی من بەندەبووم و لە کانگە کارم دەکرد، بەڵام لە خوایەکان دەترسێم و هەر لەبەر ئەوەش کاتێ خەوتبووی تۆم نەکوشت و ئێستا ئەتوانی گۆیەکەت رابگری و بۆ دەستکەوتنی خۆشبەختی کەڵکی لێ وەربگری.

بەڵام من لام سەیربوو کە فیرعەونی نوێ واتە (ئامن هوتب)ی چوارەم چۆن بەندەکانی لە کانگەکان ئازاد کردووە، ئایا نازانێ کە هەرگیز پیاوێکی ئازاد ناچێت لە کانگە کاربکات. مرۆڤ ئەگەر شێت نەبێت ئەو بەندانەی کەلە ناو کانگەکاندا کاردەکەن ئازاد ناکات، چونکە لەناکاودا ئیش و کاری کانەکان دەوەستێ. هەروەها زۆربەی بەندەکان کەلەوێدا کاردەکەن لە تاوانبارەکانن و ئازادییان دەبێتە هۆی پەیدابوونی ئاژاوەی گەورە.

پیاوە گوێ و لووت بڕاوەکە وەک بڵێیی لە بیرکردنەوەکەم تێ گەیشتبێ وتی: من وادەزانم کە خوای فیرعەونە نوێیەکەمان خوایەکی شێتە..

وتم: بۆچی؟!

وتی: لەبەرئەوەی خوا، فیرعەونی نوێی ناچارکردووە کە هەموو تاوانباران ئازاد بکات و ئێستا ئەوان بە ئازادییەوە لەناو شار و بیابانی میسردا دەسووڕێنەوە و ئیتر لە کانەکان یەک (دێبن) کانزا دەرناکرێ و میسر تووشی هەژاری و نەبوونی دەبێت. ئەگەرچی من بێگوناح بووم و بەناهەق منیان حوکم داو لە کانگەکاندا کاریان پێ کردم، بەڵام لە جیاتی هەر بێ تاوانێ هەزار تاوانباری راستەقینە لەو کانگانەدا کاریان دەکرد کە ئێستا ئازادبوونە.

لەو کاتەی ئەو پیاوە قسەی دەکرد دەیڕوانییە ئەندامەکانی لەشم و هەستم کرد کە بۆنی خانەی مەرگ کە لەمنەوە دەهات لەلای ناخۆش نەبوو و وتی: هەتاو پێستی لەشی سووتاندوویتە، بەڵام من ڕۆنم هەیە و دەتوانم لەشتی پێ چەور بکەم.

کاتێ کە لەشی منی بە ڕۆنەکە دەشێلا وتی: من پێم سەیرە بۆچی پارێزگاری لەتۆ دەکەم، چونکە کاتێ کە لە منیان دەداو لەشم بریندارەبوو و جنێوم بە خوایەکان دەدا کە بۆچی منیان دروست کردووە و گرفتاری ستەمی خەڵکیان کردووم، هیچ کەسێ پارێزگاریی لێ نەدەکردم.

من دەمزانی هەموو تاوانبارکراوەکان و بەندەکان خۆیان بە بێ گوناح دەزانن و ئەو پیاوەشم وەک ئەوان دەهاتە بەرچاو، بەڵام چونکە ئەو چاکەی لەگەڵ کردبووم و لەشمی بەڕۆن چەور کردبوو سەرەڕای ئەوە لەوکاتەدا تەنیابووم، لێم پرسی: ئەو زۆرداریيەی لەگەڵ تۆدا کردیان چی بوو و ئەم جەورەم بۆ باس بکە بۆئەوەی منیش هاوبەشی خەمەکەت بم.

پیاوەکە وتی: من کە ئێستا بەرامبەربەتۆ لەسەر زەوی دانیشتووم و لووت و گوێم نییە ڕۆژگارێ بوو خانوو و کێڵگە و مانگام هەبوو و لە ماڵمدا نان و گۆزەی ئاوی جۆم هەبوو، بەڵام لەبەر چارەڕەشی لە تەک خانووەکەی مندا پیاوێکی لێ دەژیا کە ناوی (ئانوکیس) بوو، ئەم پیاوە ئەوەندە زەوی و زارو کێڵگەی هەبوو کە چاو بڕی نەدەکرد کۆتاییەکەی ببینێ و مانگای زۆری هەبوو و ژمارەی بەندە و خزمەتکارەکانی ئەو لە زیخی بیابانەکان زۆرتربوو، بەڵام من لە خوایەکان داواکارم لاشەی بڕزێن و هەرگیز سەفەرەکەی دوای مەرگی دەست پێ نەکات. ئەو کابرایە بەو هەمووکێڵگەو مانگایەی کە هەیبوو، چاوی لە کێڵگە بچووکەکەی من بڕیبوو و بۆئەوەی لەژێر دەستم دەری بهێنێ بەهانەی پێدەگرتم و هەموو ساڵێ لەوەرزی پاییز دوای هەڵچوونی ئاوی نیل کاتێ کە ئەندازیارەکان دەهاتن زەوییە کشتوکاڵییەکانیان دەپێوا من بەسەرسوڕمانەوە دەمڕوانی



کێڵگەکەم بچووک بۆتەوە و ئەندازیارەکان کە (ئانوکیس) دیاری دەدا پێیان لە زەوییەکەی منیان دەخستەسەر زەوی (ئانوکیس) و لەگەڵ ئەوەشدا من بەرگریم دەکرد و ئامادەنەبووم زەوییەکەی خۆم بەرامبەر بە چەند حەڵقە زێڕ و زیوێ بدەم بەو.

لەو سەردەمەدا خوایەکان پێنج کوڕ و سێ کچیان داپێم و کچە بچووکەکەم لە هەموویان جوانتربوو و هەرئەوەندە (ئانوکیس) کچە بچووکەکەی منی بینی، شەیدای بوو و یەکێ لە بەندەکانی خۆی ناردە لای من و وتی کچە بچووکەکەت بدە بەمن، ئیتر وازت لێ دەهێنم. من کە دەمویست جوانترین کچەکەم بدەم بە مێردێ کە لەکاتی پیریمدا یارمەتیم بدات، کچەکەم نەدا بە ئانوکیس. تا ئەوەی ڕۆژێکیان (ئانوکیس) هەرلەخۆیەوە وتی (من لە ساڵێکدا کە دانەوێڵە کەم بوو دەغڵ و دانم داوە بەتۆ و، تۆ هێشتا قەرزەکەت نەداوەتەوە بەمن). من سوێندم بە خوایەکان خوارد کە وانییە، بەڵام ئەو هەموو بەندەکانی خۆی شایەتی بۆدان و لە هەمان ڕۆژدا بەندەکانی لە کێڵگەکەدا دایان بەسەر منداو ویستیان بمکوژن و منیش جگەلە دارێک هیچ شتێکی ترم پێ نەبوو کە پارێزگاری لە خۆم بکەم و دارەکەم دا بەتەوقی سەری یەکێک لەو بەندانە و مرد.

دوایی منیان گرت و گوێ و لووتیان بڕیم و منیان ناردە (کانگە)و ئەو پیاوە خانوو و زەوییەکەی منی لە بری قەرزە خەیاڵییەکەی خۆی داگیرکرد و ژن و منداڵەکانمی فرۆشت، بەڵام کچە بچووکەکە (ئانوکیس)ی کڕییەوە و دوای ئەوەی ماوەیەک وەک کەنیز خزمەتی خۆی پێ کرد، کردییە ژنی یەکێک لە بەندەکانی. من دەساڵ لە کانگە کارم کرد، تائەوکاتەی بە فەرمانی فیرعەونی نوێ منیان ئازادکرد و کاتێک کە گەڕامەوە خانوو و کێڵگەکەی خۆم، هیچ ئاسەوارێکی لێ نەمابوو و کچە بچووکەکەم کە خوشکی (ئانوکیس) بوو دیارنەمابوو و دەڵێن لە تەبەس لە ماڵێکدا وەک خزمەتکار کاردەکات. ئەو کاتەی لە کانگەدا کارم دەکرد (ئانوکیس) مرد و لە شاری مردووەکان ناشتیان، بەڵام من زۆر حەزدەکەم

برۆم و بزانم لەسەر گۆڕەکەی چی نووسراوە، چونکە بێ گومان تاوانکارییەکانی ئەو پیاوەلەسەر گۆڕەکەی نووسراوە، بەڵام لەبەرئەوەی خوێندەواریم نییە ناتوانم نووسینەکانی سەرگۆڕەکەی بخوێنمەوە.

وتم: من خوێندەواریم هەیە و ئەتوانم نووسینەکانی سەر گۆڕەکەی (ئانوکیس) بخوێنمەوە و ئەگەر حەزت لێیە دەتوانم لەگەڵتدا بێم بۆشاری مردووەکان و هەرچییەک لەسەر گۆڕەکەی نووسراوە بۆتی ئەگێڕمەوە.

پیاوەکە وتی: ئومێدەوارم تەرمەکەت هەمیشە بمێنێ و ئەگەر ئەم چاکەیەم لەگەڵدا بکەی خۆشحاڵم دەکەی.

وتم: بە خۆشحاڵییەوە ئامادەم لەگەڵتدا بێم بۆشاری مردووەکان و نووسراوەکەت بۆ بخوێنمەوە، بەڵام مەگەر نازانی بەم وەزعە ناهێڵن بچینە شاری مردووەکانەوە.

پیاوە لووت بڕاوەکە وتی: من تێگەیشتم کە تۆ ئاگات لە هیچ شتێ نییە، چونکە ئەگەر ئاگاداربوویتایە دەتزانی فیرعەونی نوێ دوای ئازادکردنی بەندەکان بڕیاری داوە لەبەرئەوەی چەند ساڵێکە لە دیداری مردووەکانی خۆیان بێ بەش بوونە مافیان هەیە بچنە ئەو شارەو مردووەکانی خۆیان بەسەربکەنەوە.

من و ئەو بەڕێ کەوتین تاگەیشتینە شاری مردووەکان و ئەو پیاوە کە نیشانەی گۆڕەکەی وەرگرتبوو، منی بردەسەری و بینیم لەبەردەم گورەکەی هەندی گۆشتی کولاو و میوەو گۆزەیەک شەراب داندرابوو، پیاوە لووت بڕاوەکە هەندێ شەرابی خواردەوە و بە منیشی داو داوای کرد نووسینەکەی بۆ بخوێنمەوە و من وام خوێندەوە:

(( من کە " ئانوکیس "م گەنمم تۆوکرد و نەمامم چاند و بەروبوومی زەوی و باخەکەم فراوان بوو، چونکە لە خوایەکان دەترسام و (پێنج یەکی)[٨] دەرامەتەکەم دەدایە خوایەکان و رووباری نیل یارمەتیی دام و بەردەوام ئاوی دەگەیاندە زەوییەکانم و کەس لە کێڵگەکانی مندا برسی نەبوو و هیچ یەکێک لە



جیرانەکانی زەوییەکانیشم تووشی برسێتی نەدەهاتن، چونکە لەو ساڵانەی بەروبووم باش نەبوو یارمەتیی هەموویانم دەداو دانەوێڵەم دەدا پێیان... من فرمێسکی چاوی هەتیوانم دەسڕییەوەو هەوڵم نەدەدا قەرزەکانم لەو بێوەژنانە بستێنمەوە کە مێردەکانیان لێیان قەرزکردبووم و هەرکاتێ پیاوێک دەمرد بۆئەوەی ئازاری ژن و منداڵەکانی نەدەم داوای قەرزەکەم لێیان نەدەکردەوە و لەبەرئەمەش لە سەرتاسەری وڵاتدا خەڵکی بە چاکە ناویان دەهێنام و لە من رازی بوون. ئەگەر مانگای یەکێ دیارنەبووایە من مانگایەکی ساغ و قەڵەوم لە جیاتی ئەوەی خۆیان پێ دەبەخشی و نەمدەهێشت ئەندازیاران زەوییە کشتوکاڵییەکان بە ناهەق بپێون و زەویی یەکێکی تر بخەنەسەر ئەوەیتر... ئەمەیە کارەکانی من (ئانوکیس) کە ئەنجامم داوە، بۆ ئەوەی خوایەکان لێم رازی بن و لەسەفەرە دوور و درێژەکەی دوای مردن یارمەتیم بدەن...))

کاتێ کە گەیشتمە کۆتایی خوێندنەوەی ئەم نووسراوە، کابرا لووت بڕاوەکە دەستی بەگریان کردو، من پرسیم: بۆچی دەگریت؟

وتی: لەبەرئەوەی دەزانم لەبارەی (ئانوکیس)ەوە هەڵەبوومە، چونکە ئەگەر ئەم پیاوە کابرایەکی چاکەکار نەبووبێ لەسەر گۆڕەکەی وا نەدەنووسراو، ئێستاش هەرچییەک لێرە نووسرابێ راست و دروستەو تادنیا بمێنێ خەڵک ئەم نووسراوە لەسەر گۆڕەکەی دەخوێننەوەو لەبەرئەوەی تەرمی پیاوچاکێکە هەرگیز لەناوناچێت و زیندوو دەمێنێتەوە، بەڵام من دوای مردن نامێنمەوە، چونکە لاشەی خراپەکاران دەخەنە ناو نیلەوە و ئاو دەیانباتە ناو دەریاوە و دەبمە خۆراکی گیانەوەرانی دەریا.

من لەم قسەیەی پیاوە لووت بڕاوەکە سەرم سوڕما و ئەو کاتە تێگەیشتم کە چۆن نەفامیی جۆری مرۆڤ هەرگیز لەناو ناچێت و لەهەموو سەردەمێکدا دەتواندرێ کەڵک لە نەزانی و پڕوپووچ پەرستی خەڵکی وەربگیردرێ. هەزارەها ساڵە کاهینەکانی میسر بەهۆی نووسینەکانی کتێبی مردووەکان کە خۆیان

نووسیویانە و دەڵێن لە لایەن خوایەکانەوە هاتووە، خەڵکیان کردۆتە بەندەی خۆیان و هەموو سوودەکانی میسر هی ئەوانەو، بۆئەوەی نەهێڵن نەفامی خەڵکی چاک ببێتەوە دەڵێن هەر وشەیەک لە کتێبی مردووەکان، جگەلەوەی لەسەر زەوی نووسراوەتەوە لە ئاسمانیش لەلای خوایەکان هەیە و پارێزراوەو هەرگیز لەناو ناچێت.

هەروەها بۆئەوەی باوەڕی خەڵکی بەکتێبی مردووەکان نەگۆڕێ وای دەردەخەن کە هەر نووسراوێک، لەبەرئەوەی نووسراوە، راستەو بە شێوەیەک ئەم باوەڕەیان لە مێشکی خەڵکیدا بەهێزکردووە کە پیاوێکی وەک ئەو بوونەوەرە بەدبەختە کە گوێ و لووتی نییە، لەگەڵ ئەوەشدا کە بەهۆی دوژمنایەتی و ویستی خراپی (ئانوکیس) کردوویانەتە بەندە و دەساڵ لە کانگە بووە، کاتێ دەبینێ لەسەر گۆڕەکەی (ئانوکیس) ئەم شتانە نووسراوە، وادەزانێ راستەو لە هەڵەدا بووە کە ئانوکیسی بە پیاوێکی بێ بەزەیی و ستەمکار لە قەڵەم دابوو.

پیاوە گوێ بڕاوەکە فرمێسکەکانی سڕییەوە و گۆشت و میوەکەی ئەوێی هێنایە پێشەوە و وتی: بخۆو .. سکی خۆت تێر بکە، چونکە ئەمڕۆ کە ڕۆژی ئازادیی بەندەکانی کانگەیە و ڕێگامان پێ دەدەن بێینەئێرە دەتوانین لەم خواردنانە بخۆین.

دوای ئەوەی بەهۆی خواردنی گۆشت و میوە و شەراب هاتەوە سەرکەیف، رووی کردە گۆڕەکەی (ئانوکیس) و وتی: هەروەکو لە سەر گۆڕەکەت نووسراوە، تۆ پیاوێکی باش بوویت و شیاوە کە هەندێ لە کاسە زێڕینەکان و کاسە زیو و مسییەکانی ناو گۆڕەکەت بدەی بە من و ئەمشەو دێم و لێتی وەردەگرم.

من لە ترسا هاوارم کرد: ئەتەوێ چی بکەی!؟ ئایا دەتەوێ ئەمشەو بێیت و دزی لەم ئارامگەیە بکەی؟ مەگەر نازانی هیچ تاوانێ لەوە گوناهتر نییە دزی لە گۆڕی خەڵکی بکەی؟ ئەم تاوانە لە لایەن خوایەکانەوە لێ خۆش بوونی نییە.

پیاوە لووت بڕاوەکە وتی: بۆچی قسەی بەلاش دەکەی، مەگەر تۆ لەسەر



گۆڕەکەی نەتخوێندەوە کە ئانوکیس چەند پیاوێکی چاکەکار بووەو ئەم پیاوە کە بە پێی فەرمانی خوایەکان هەڵسوکەوتی کردووە هیچ رازی نابێت قەرزاری من بێت و ئەگەر زیندوو بووایە خۆی قەرزەکەی منی دەهێنایەوە، چونکە گومانی تێدانییە ئەو خانوو و زەوی و ماڵ و منداڵی منی کردە هی خۆی و ماڵ و ژن و منداڵەکەمی فرۆشت و کچە بچووکەکەمی وەک کەنیزێ لە خزمەت خۆیدا راگرت، کەواتە ئانوکیس کە قەرزاری منە بەخۆشحاڵییەوە قەرزەکەی خۆی دەداتەوە بە من و ئەمشەو بۆ وەرگرتنەوەی داواکارییەکەم دێم و تۆش دەتوانی لەگەڵ مندا بێیت و بەشێکت بەرکەوێت، چونکە ئەو دەبێت قەرزەکەم بداتەوە و ئەوەی لێی دەستێنم بۆمن حەڵاڵەو دەتوانم دوای ئەوەی لێم سەند هەندێ لەو داراییانەم بدەم بەتۆ و خۆت لە ئارامگەکەدا دەری بهێنی.

ئازادیی بەندەکانی کانگەو ڕێگاپێدانیان بۆ شاری مردووەکان بەتەواوی رووخسارو ئارامی شاری مردووەکانی شێواندبوو و ئەو شارەی، کە لە جێگای زیندووەکان زیاتر پارێزگاری لێ دەکرا، لەو شەوەدا کەوتە بەر تاڵان کردن. من و بەندەکە پێکەوە چووینە ناو ئارامگاکەی ئانوکیسەوە و هەرچەندەی توانیمان لەو قاپ و کەل و پەلە زێڕین و مسی و شتە بەنرخەکانی ئارامگەکەمان هەڵگرت. بەندە ئازادکراوەکە دەیوت ئەوەی من دەیبەم مافی خۆمە و کارەکەی من دزی نییە. کاتی کە زێڕ و مسەکانمان دەگواستەوە بینیم هەموو پاسەوانەکان کە ئەرکیان گرتنی دز و گومان لێکراوەکان بوو وەک بەندەکان دەستیان کردبوو بە تاڵان و کاتێ گەیشتینە وشکانیی نیل هێشتا لەشاری مردووەکان دزی و تاڵان بەردەوام بوو.

کاتی خۆرهەڵاتن، ئێمەگەیشتینە وشکایی کەناری نیل و لەوکاتەدا هەندێ لە مامەڵەچییەکانی سووریا لەوبەر رووبارەوە چاوەڕێ بوون کەل و پەلە تاڵان کراوەکان لە دزەکان بکڕنەوە. ئەوەی ئێمە هێنابوومان لە لایەن کڕیارێکی سووریاوە بە چوارسەد (دێبن) کڕدرایەوە. لەم زێڕە دووسەد (دێبن) بەرمن کەوت

و ئەوەی مابوو بەربەندە لووت بڕاوەکە کەوت و وتی: بۆ بەدەست هێنانی زێڕ و پارە ڕێگایەکی ئاسانمان پەیدا کرد چونکە ئەگەر پەنجا ساڵ لەم دارە رایانەی کەناری نیل حەماڵیمان بکردایە نەماندەتوانی ئەم هەموو زێڕە بەدەست بهێنین.

دوای ئەوەی زێڕەکانمان بەش کرد لە یەکتر جیابووینەوە و ئەو بەرەو لایەک چوو و منیش بەرەو لایەکی تر ڕۆیشتم. بۆ ئەوەی بۆنەکەی لەشم نەهێڵم هەندێ کافور و بیخەکەم (بیخەک جۆرە گیایەکە کە دوای ئەوەی دەیکوتن بەکاری دەهێنن و، وەک سابوون کەف دەکات و مرۆڤ پاک دەکاتەوە - وەرگێڕ) کڕی و لە کەناری نیل خۆم پێ شۆری و بەتەواوی بۆنی خانەی مەرگم لێ ڕۆیشت و ئیتر خەڵکی خۆیان لێ دوور نەدەخستمەوە. دوایی کراسێکم پێ کڕی و چوومە خواردنگەیەک نان بخۆم، کاتێ کە خەریکی خواردن بووم گوێم لە دەنگە دەنگی شاری مردووەکان بوو و سەیرم کرد نەفیرێ لێ دەدەن و گالیسکە جەنگییەکان کەوتنەڕێ. لەوانەی ئاگادارتربوون پرسیم: دەنگ و باس چییە؟

وتیان: رمدارەکانی تایبەت کە پاسەوانی فیرعەونن پێیان سپێردراوە کە بەندە ئازادکراوەکان سەرکوت بکەن کەلەوە زیاتر شاری مردووەکان تالان نەکەن.

ئەو ڕۆژە پێش ئەوەی خۆرئاوابێت زیاتر لە سەد کەس لە بەندە ئازادکراوەکان کە پێشتر لە کانگە کاریان دەکرد سەرەوخوار لە دیوارەکانی شاری گبس هەڵواسران و مردن و لە دوای ئەوە ئاژاوە و تالانی شاری مردووەکان دامرکایەوە. ئەو شەوە لەخانوویەکی گشتیدا مامەوە و مەبەستم ئەوەبوو کە خۆم سەرگەرم بکەم، بەڵام لەو ماتەم خانەیەدا تەنیا خەمەکانم زیادی دەکرد.

دوای هاتنە دەرەوەم لە خانە گشتییەکەدا چوومە میوانخانەیەک و نووستم و بەیانی ڕۆژی دواتر بەرەو خانووەکەی پێشووی خۆم کەوتمەڕێ کە قەرزەکەی (کاپتا) بدەمەوە و سوپاسی بکەم، چونکە ئەگەر ئەو پاشەکەوتە کەمەکەی خۆی نەدەداپێم نەمدەتوانی تەرمی دایک و باوکم ببەمە خانەی مەرگ.

کاپتا کاتێ کە منی بینی کەوتە گریان و وتی: گەورەم.. وام زانی مردوویتە،



چونکەلە دڵی خۆمدا دەموت ئەگەر زیندوو بووایە دەهات بۆئەوەی دیسانەوە پارەو مسم لێ بستێنێ، لەبەرئەوەی تۆ جارێ پارەت و مست لێ سەندووم و ئەو کەسەی جارێک کانزا بداتە یەکێک دەبێ هەتا ماوە هەر پارەی بداتێ. من ئەگەرچی وام دەزانی مردوویتە، بەڵام دووربین بووم و بۆ یارمەتیی تۆ لە گەورە نوێیەکەم و دایکی (کە خوایەکان لاشەکەی پەرش و بڵاوبکەن) دزیم دەکرد و دایکی ئەو بەردەوام دارکاریی دەکردم و بەم زووانە هەڕەشەی ئەوەی لێ کردم کە دەمفرۆشێ و لەبەرئەوەی ئێستا تۆ هاتووی واباشە کە بەیەکەوە خۆمان لێرە قوتاربکەین و بڕۆینە جێگایەک کە لەم تیمساحە بەدووربین.

من لە وەڵام دانەوەی دوودڵ بووم و ئەو وتیەوە: گەورەم ئەگەر بۆ خەرجی ژیانت تەنگاوی من هەندێ پارەم هەیە و دەتوانین سەرفی بکەین و کاتێ کە پارەکە تەواوبوو من کاردەکەم و ناهێڵم تۆ برسی بیت، بەمەرجێ تۆ لەدەست ئەم ژنە (کەوەک تیمساحە) و کوڕە گەوجەکەی رزگارم بکەی.

وتم: کاپتا من ئەمڕۆ بۆئەوە هاتوومەتە ئێرە کە قەرزەکەت بدەمەوە، چونکە دەزانم ئەوەی تۆ دات بەمن سەرجەمی پاشەکەوتی چەند ساڵەی تۆ بوو.

دوایی هەندێ پارەی زۆر لەوەی خۆی زیاترم پێدا لە بری قەرزەکەی و، ئەو لە خۆشیا کەوتە سەماکردن و دوایی تێگەیشت کە هەڵپەڕکێ بۆ یەکێکی وەک ئەو بەساڵاچوو جوان نییەو، وەستایەوە و وتی: گەورەی من دوای ئەوەی کانزاکانم دا بەتۆ دەستم کرد بە گریان چونکە وامدەزانی جارێکی تر چاوم پێیان ناکەوێتەوە، بەڵام گلەیی لە من مەکە لەبەرئەوەی کەسێ کە هەموو تەمەنی بەندە بووبێ دڵێکی بەهێزی نییە و ناتوانێ کانزاکانی خۆی بداتە یەکێکی تر و ئاسوودە بێت، ئەگەرچی ئەوکەسە پێشتر گەورەی بووبێ.

وتم: کاپتا جگەلەوەی قەرزەکەتم دایەوە لە جیاتی ئەو چاکەیەی لەگەڵ من کردت دەمەوێت تۆ لە خاوەنەکەت بکڕمەوە و ئازادت بکەم.

کاپتا وتی: تۆ ئەگەر من بکڕیتەوە و ئازادم بکەی من هیچ جێگایەکەم نییە

بۆی بچم و کەسێ کە هەموو تەمەنی بەندە بووبێ ناتوانێ بە ئازادی بژیت، من بەندەیەکی یەک چاوم کە دەبێ بەردەوام (گەورە)م هەبێت و بە بێ خاوەن لە مەڕێکی یەک چاوی بێ شوان دەچم، من ئامۆژگاریت دەکەم کە کانزاکانت بۆ کڕینی من بەخۆڕایی بەفیڕۆ مەدە، چونکە من هی تۆم و دەتوانی من لەگەڵ خۆتدا ببەی. دوایی تاکە چاوەکەی لێ داگرتم و وتی: گەورە بەخشندەکەم، من چونکە دووربین بووم هەموو ڕۆژێ لە بارەی بەڕێکەوتنی کەشتییەکان لێرە زانیاریم بەدەست هێناو دەزانم لەم کاتەدا کەشتییەک لێرەوە بەرەو (ئەزمیر) دەڕوات و ئێمە دەتوانین سواری ئەم کەشتییە ببین و خۆمان بگەیەنینە ئەزمیرو تاکە گرفتێ کە دەمێنێتەوە ئەوەیە کە بەر لە ڕۆیشتنمان دەبێ دیارییەک بە خوایەکان بدەین بۆئەوەی بە ساغی بگەینە شوێنی مەبەست و، من دوای ئەوەی باوەڕم بە (ئاموون) نەما هێشتا خوایەکی ترم نەدۆزیوەتەوە کە دیاری بدەمێ و لە خەڵکیشم دەپرسی ئایا دەکرێ ڕێنومابییم بکەن و خوایەکم نیشان بدەن کە بتوانم بیپەرستم و دیاریی بدەمێ؟ ئەوان وتیان(خوای فیرعەون بپەرستە کە ناوی ئاتوونە...) پرسیم: ئەم خوایە (ئاتوون) بەچی دەژیت و خواوەندی دەکات؟ وتیان(خوای ئاتوون بەهۆی ڕاستییەوە دەژیت و خواوەندی دەکات...) من تێگەیشتم کە ئەم خوایە بەکەڵکی من نایەت، چونکە خوایەک کە بیەوێ بە ڕاستەقینە حەقیقەت بژیت و خوایەتی بکات بێ گومان خوایەکی سادەو بێ ئاگایە، ئەگەر نا دەیزانی کە ڕاستی شتێکە کە هەرگیز جێبەجێ نابێت. ئێستا گەورەم تۆ دەتوانی پێم بڵێی چ خوایەک بپەرستم.

من گۆیەکەی خۆم کە لە بەردەم ئارامگەی فیرعەون و لەکاتی ناشتنی بەخێوکەرەکانم دۆزیبوومەوە دام پێی و وتم: ئەم خوایە بپەرستە.

کاپتا وتی: ئەمە چییە..؟

وتم: فیرعەون باوەڕی بەم خوایە بوو و وای هەست دەکرد کە مایەی بەختەوەرییە و منیش لەو ڕۆژەی دەستم کەوتووە هەست دەکەم بەرەو بەختەوەری



دەچم، چونکە بوومەتە خاوەن زێڕ و ئەگەر تۆش ئەم گۆیە لەلای خۆت ڕابگری لەوانەیە بەختەوەری ڕووت تێ بکات و منیش لەو بەختیارییەت کەڵک وەربگرم. کەواتە ئێستا کە ئەم گۆیەت هەیە خۆت بگۆڕە و کراسێ وەک دانیشتووانی سووریا لەبەر بکە کەبەو کەشتییەی، دەڵێی ئامادەی بەڕێ کەوتنە بڕۆین و من وابیردەکەمەوە کە قسەکەت ڕاستە کە دەڵێی نابێ پارەکەت بە کڕینی من بەفیڕۆبدەی، چونکە لێرەوە تا ئەزمیر خەرجیمان دەوێت و دوای گەیشتنمان بۆ ئەو شارە دەبێ هەندێ کانزامان هەبێت کە خەرجی بکەین تاکو من دەست بە پزیشکی دەکەم. دەبێ پێت بڵێم منیش بەپەلەم کە هەرچی زووتر لەم شارە بڕۆم، چونکە کاتێ لە کۆڵانەکانی تەبەس هەنگاو دەنێم واهەست دەکەم هەرکەسێ دەمبینێ جنێوم پێ دەدات و دوای ئەوەی لەم شارە ڕۆیشتم هەرگیز ناگەڕێمەوە.

(کاپتا) وتی: گەورەم، هیچ کات لە بارەی داهاتوو بڕیاری یەکجاری مەدە، چونکە تۆ نازانی کە لە ئایندەدا چی دەبێ و چی ڕوودەدات و لەبەرئەوە لە ئەمڕۆوە بڕیاری نەگەڕانەوە بۆ تەبەس مەدە، چونکە لەوەیە ڕۆژێ بێت گەڕانەوەت قازانجی فراوانی تێدابێت. سەرەڕای ئەوەش هەرکەسێ بە ئاوی نیل تینوێتی خۆی بشکێنێ ناتوانێ بەردەوام لە ئاوەکانی تر خۆی تێرئاو بکات و نیل بەرەو خۆی ڕایدەکێشێتەوە. من نازانم تۆ لێرە تووشی چ کردەوەیەک بوویتە کە بەم شێوەیە (تەبەس)ت لەبەر چاو کەوتووە، بەڵام بڕیاری لێرە ڕۆیشتنەکەت بەشتێکی ژیرانە دادەنێم. سینۆهە من دڵنیات دەکەم کە ئەم کردەوەیەت هەرچییەک بێت فەرامۆشی دەکەی، چونکە گەنجەکان دوای چەندین ساڵ ڕووداوەکانی ڕابردوو لە بیردەکەن و کەسانی پیریش ئەگەر وەک گەنجەکان تەمەنی درێژیان هەبووایە ڕووداوەکانی ڕابردوویان لەبیر دەکردەوە، بەڵام چونکە تەمەنیان درێژ نابێت مەجالی بەیاد سپاردنی ڕووداوەکانی ڕابردوویان دەست ناکەوێت. هەر کردەوەیەک کەلە مرۆڤ ڕوودات وەک بەردێک وایە کە فڕێی

بدەنە ناو دەریاوە، ئەم بەردە دوای ئەوەی کەوتە دەریاوە دەنگێکی گەورە دروست دەکات و ئاوەکە دەشڵەقێنێ و مرۆڤ وابیردەکاتەوە کە هەرگیز ئاوسەواری ئەو پەشۆکان و شڵەقاندنە لەناو ناچێت، بەڵام دوای چەند ساتێک ئاوەکە ئارام دەبێتەوە بەشێوەیەک کە مرۆڤ بەخۆی دەڵێ بەهیچ شێوەیەک ئەم ئاوە بەردی تێ نەکەوتووە ئەگەر نا ئەوها هێمن نەدەبوو. تۆش دوای چەند ساڵ بەتەواوەتی ئەم رووداوەی کەلەم شارە بەسەرتدا هاتووە لە بیردەکەی و بە دەوڵەمەندی و دەسەڵاتەوە دەگەڕێیتەوە تەبەس و ئەگەر تائەو کاتە ناوی من لە لیستی بەندە هەڵهاتووەکان بوو تۆ دەتوانی پارێزگاریم لێ بکەیت و نەهێڵێ ئازارم بدەن.

وتم: هەرکاتێ دەسەڵات و دەوڵەمەندیم هەبێ ئامادەم کە پشتگیریت لێ بکەم، بەڵام من بۆئەوە لێرە دەڕۆم کە هیچ کات نەگەڕێمە.

لەم کاتەدا دایکی گەورەکەی کاپتا بانگی کرد و ئەویش پێش ئەوەی بڕوات پێی وتم: لە پێچی کۆڵانەکەدا چاوەڕێم بکە کەمێکی تردێم.

من لە بەرامبەر قاپییەکە دوورکەوتمەوەو لە پێچی کۆڵانەکەدا لە چاوەڕوانی ئەودا وەستام. ئەوەندەی پێ نەچوو کاپتا هات و سەبەتەیەکی بەدەستەوە بوو و کڵاوێکی گەورەی بارانی لەبان سەری دانابوو و بینیم لە دەستەکەی تری چەند حەڵقە مسێکی پێ بوو و نیشانی منی داو وتی: ئەم ژنە کە دایکی هەموو تیمساحەکانە من بۆ شت کڕین دەنێرێتە بازاڕ، بەڵام من هیچی بۆ ناکڕم چونکە کەل و پەلی تایبەتی و پێویستی خۆم کە بۆم هەڵدەگیردرێ هێناومە و کردوومەتە ئەم سەبەتەیەوە کە لێرە بڕۆین و، ئەم حەڵقە مسانە سەرمایەکەمان بۆ دابین کردنی خەرجی سەفەر زیاد دەکات.

سەیرم کرد لە سەبەتەکەیدا کراسێک و قژێکی دەستکردیشی پێ بوو. کەلەخانووەکە دوورکەوتینەوە و گەیشتینە کەناری نیل جلەکانی گۆڕی و قژەکەی کردە سەری. منیش دارێکی تاشراوم بۆ کڕی، چونکە بینیبووم خزمەتکاری پیاوە بەرزەکان داربەدەستەوە دەگرن، دوایی لە دارەڕای کەشتییەکانی سووریا نزیک بووینەوە و سەیرم کرد کەشتییەک ئامادەیە و خەریکە بەڕێ دەکەوێ.

کەشتیوانەکە خەڵکی سووریا بوو و کاتێ زانیی من پزیشکم و دەچمە ئەزمیر بە خوشحاڵییەوە من و کاپتای وەرگرت، لەبەرئەوەی لە کەشتییەکەیدا هەندێ لە مەلەوانەکان نەخۆش بوون و بەئومێد بوو من لە رێگا چارەسەریان بکەم. دەرکەوت کە گۆیەکەی باسمان کرد بەختەوەری بۆ هێنابووین، چونکە کارەکانمان ئاسان بوو و دەمانتوانی بەئاسانی سەفەربکەین و کاپتا کە کاریگەرێتی گۆیەکەی بینی وەک خوایەکی راستەقینە کەوتە پەرستنی.

***

١- مەبەست لە گۆزەشکاندن مەراسیمی ژن هێنانە کە ئەوسا وا باوبووە - وەرگێڕی کوردی .

٢- لەکۆن کرێکارەکان ئامادەنەبوون لە کانگە کاربکەن و کانزا دەربهێنن ، لەبەرئەوە بەندەکانیان بەزۆر دەخستە سەرئەم کارە قورسە -وەرگێڕ.

٣ - دێین : پێوانەی میسری - نزیکەی یەک غرام - وەرگێڕ .

٤- کە گەیشتمە ئەم بەشە لە بیرەوەرییەکانی سینۆهە بە پێنووسی (میکا ڤالتاری) گریانم هات و هۆی گریانەکەم ئەوەبوو کە لە بنەماڵەیەک کە من یەکێک بووم لەئەندامەکانی گەنجێکی وەکو سینۆهە هەموو شتێکی خۆی لە پێناوی هەواو هەوەس داناو هەژارکەوتەوە- وەرگێڕ .

٥- سینۆهە پزیشکی میسری هەروەکو خۆی لە پەرتووکەکەیدا دەڵی داهێنەری ددانی دەستکردەو بێگومان ئەو یەکەم کەسە کە توانیویەتی ددانی دەستکرد لە ماددەیەک جگەلە شفرەی فیل دروست بکات و، ئەگەر پێش ئەویش ددانی دەستکرد هەبووبێ بەس بە شفرە فیل دروست کراوە و لەبەرئەوەش هەژاران نەیاندەتوانی لە تەمەنی پیریدا تاقمی ددان بکەن، چونکە پارەی شفرەیان پێ نەدەدرا- وەرگێڕ.

٦- وادی السلاطین .

٧- تەلەسم : جادوو

**بەشی دەیەم**

# نەخۆشییەکی پەرەسێن و نەناسراو

کەشتییەکە کەوتەڕێ و ئێمە ماوەی بیست و چوار ڕۆژ بەسەر ئاوی نیلەوە ڕۆیشتین تا گەیشتینە دەریا. لەم بیست و چوار ڕۆژەدا بە بەردەم شارو پەرستگە و کێلگە و مێگەلی زۆردا تێپەڕین. بەڵام من لە بینینی دیمەنی ئەو دەوڵەمەندییانەی میسر چێژم وەرنەدەگرت، چونکە بە پەلەبووم هەرچی زووتر لەو وڵاتە بڕۆم و خۆم بگەیەنمە جێگایەک کە لەوێ نەمناسنەوە. کاتێ لە نیل چووینە دەرەوەو کەشتی کەوتە دەریاوە، ئیتر کاپتا نەیدەتوانی وشکاوییەکانی نیل ببینێ و پەرێشان بوو و بەمنی وت: ئایا باشتر نییە لەکەشتی دابەزین و بە وشکاییدا بڕۆین بۆ ئەزمیر؟

وتم: ڕێگای وشکانی چەتەی لێیە و هەرچییەکمان هەبێ لێمانی دەستێنن و لەوەیە بمانکوژن.

مەلەوانەکانی کەشتییەکە کاتێ دەریایان بینی وەک خووی پێشوویان دەم و چاوی خۆیان بە بەردی تیژ ڕنییەوە تاکو خوایەکان بکەنە دۆستی خۆیان و بەسەلامەتی بگەنە جێی مەبەست. ڕێبوارەکانی کەشتییەکە کە زیاتر خەڵکی سووریا بوون بە دیتنی ئەم دیمەنە کەوتنە مەترسی و میسرییەکانیش کە لەو کەشتییەدا بوون ترسان. میسرییەکان لە خوای خۆیان (ئاموون) داوای یارمەتییان دەکردو سریانییەکان هاواریان بو (بەعل) دەکرد و کاپتاش خوایەکەی خۆی دەرهێنابوو و لەبەردەمیدا دەگریا و بۆ ئەوەی دەریا بکاتە دۆستی خۆی حەڵقەیەکی مسی خستە ئاوەکەوە، بەڵام دوایی بۆ لە دەست چوونی



مسەکەی زۆر دڵگران بوو.

ئەم ڕووداوانە ماوەیەکی خایاند تاکو سەوڵ لێدەرەکان کە تا ئەو کاتە لە نیل و لە دەریادا سەوڵیان لێ دەدا دەستیان هەڵگرت و مەلەوانەکانی کەشتی بۆ بەردەوامی بەرەو پێش چوونی کەشتییەکە چارۆگەکانیان هەڵکرد. لەو کاتەدا هەموو شتێ ئارام بوو و ئیتر مەلەوانەکان دەموچاوی خۆیان بریندا نەدەکرد و ڕێبوارەکانی دەریا بانگی خوایەکانیان نەدەکرد. دوای ئەوەی چارۆگەکان هەڵکران کەشتییەکە خێراتربوو و گرفتاری جووڵەی شەپۆلەکانی دەریابوو. کاپتا کاتێ کە بینی کەشتییەکە بەو شێوەیە تەکانی دەدا ترساو یەکێ لە گوریسەکانی کەشتییەکەی بەقایم گرت و دوای چەند ساتێ بەناڵەوە بەمنی وت : بەشێوەیەک گەدەم بەرزدەبێتەوە کە خەریکە لە دەممەوە دێتە دەرێ و بێ گومان دەمرم.

کاپتا وای دەزانی دەمرێ و بە منی وت: گەورەم لە تۆ دڵڕەنجاو نیم، چونکە تۆ منت بۆ ئێرە نەهێناوە، بەڵکو خۆم بووم کە بەتۆم وت دەبێ لە تەبەس دەربچین و بڕۆینە شارێکی تر. کاتێ کە مردم لاشەکەم فرێ دەرە ناو دەریاوە، چونکە ئاوی دەریا شۆرەو وەک حەوزەکانی خانەی مەرگ وایەو ناهێڵێت لەشم پەرت و بڵاوبێت.

مەلەوانەکانی کەشتییەکە کە لە زمانی میسری تێ دەگەیشتن کاتێ ئەم قسانەیان گوێ لێ بوو، کەوتنە پێکەنین و پێیان وت: ئەی کابرای یەک چاو لەم دەریایەدا گیانەوەری وەها هەیە کە ددانەکانی لە ددانی تیمساح گەورەتر و تیژترەو پێش ئەوەی لاشەکەت بگاتە بنی دەریاوە کەرت کەرتت دەکەن و قووتت دەدەن.

کاپتا کە تێگەیشت تەرمەکەی لە ئاوە سوێرەکەی دەریادا نامێنێتەوە و دەبێتە خۆراکی گیانەوەران، دوای بیستنی قسەکەیان دەستی بەگریان کرد. دوایی پاش کەمێکی تر کەوتە ڕشانەوەو لە دوای ئەو ڕێبوارانی کەشتییەکە چ میسری و چ سریانی هەموویان گرفتاری ڕشانەوەبوون و هەرچییەک لە گەدەیان

دابوو هاتە دەرەوەو ڕەنگیان ڕەش هەڵهات و دوایی سەوز هەڵگەڕا.

من بە بینینی نەخۆشییە بە کۆمەڵەکەیان سەرم سوڕما، چونکە لەخانەی ژیان مامۆستاکانمان ئەم نەخۆشییەیان بە ئێمە نەوتبوو و نەمدەزانی ئەو نەخۆشییە چییەو نەخۆشییە هەمەگیرەکان کە لە ناکاودا کومەڵێ زۆر تووشی دەبوون ناسراوبوون و هەموو پزیشکەکانی دەرچووی خانەی ژیان لێی بەئاگابوون. هەزارەها ساڵ بوو کە ئەم نەخۆشییانە ناسراوبوون و دەرمانیشی هەبوو و نیشانەکانی ئەو نەخۆشییانە دیاربوون و دەناسرانەوە، بەڵام ئەم نەخۆشییە لە هیچ یەک لەو نەخۆشییانە نەدەچوو و من وام هەست کرد کە ئەگەر هەموو پزیشکەکانی پاشایەتی کۆببنەوە ناتوانن ئەو نەخۆشیە هەمەگیرە بناسنەوە کە لە ناکاو هەموو گەشتیارانی گرتەوە.

ئەو نەخۆشییە نە پەتای سک چوون و ڕشانەوە بوو و، نە تاعوون و نە ئاوڵە، چونکە لە هەریەکە لەم سێ نەخۆشییە نەخۆشەکە تای لێ دێت، بەڵام ئەو کەسانەی دەڕشانەوە تاو ژانەسەریشیان نەبوو. من بۆنی دەمیانم کرد کە بزانم ئایا وەک نەخۆشیی پەتا دەمیان بۆنی ناخۆشی لێ دێت، بەڵام هیچ بۆنێک لە دەمیان نەدەهات و، نەرماوی ڕانیانم پشکنی کە بزانم ئایا وەک نەخۆشیی تاعوون لەتەک ڕانیانەوە غودەیەک هاتۆتەدەرێ، بەڵام غودەشم نەدی و لەسەر ڕووی لەشیانیش تلۆقی تایبەت بە ئاوڵە بەدی نەدەکراو تەنانەت لە ناو هەموو ئەوانەی دەڕشانەوە یەکێکیان نێوچاوانی گەرم نەبوو.

پێم سەیربوو کەئەمە چ نەخۆشییەکە کە نیشانەکانی لە هیچ کام لە کتێبە کۆنەکاندا نەنووسرابوو و، بەترسەوە چوومە لای کەشتیوانەکە و وتم: لە کەشتییەکەتدا نەخۆشییەکی ترسناک پەیدابووە کە تا ئەمڕۆ نموونەی نەبووە، چونکە من کە پزیشکێکی میسری و دەرچووی خانەی ژیانم لەم نەخۆشییە بێ ئاگام و پێت دەڵێم کە بە زووترین کات بەرەو وشکانی بڕۆ بۆئەوەی نەخۆشەکان بگەیەنینە وشکانی.



کەشتیوانەکە وتی: مەگەر تۆ تا ئێستا لە دەریادا سەفەرت نەکردووە؟

من وتم: نا ...

وتی: ئەم نەخۆشییە کە پزیشکێکی میسری وەکو تۆ لێی بێ ئاگایە بیماری دەریایەو هۆی دروستبوونی ئەم نەخۆشییە زۆر خۆرییەو، لەم کەشتییەدا ئەو ڕێبوارانەی کە حەزیان لێ بێت لەسەر خەرجی نووسینگەی سریانی کە خاوەنی ئەم کەشتییەیە خواردن دەخۆن و خەرجی خواردنەکەیان لەگەڵ کرێی سواربوونی کەشتییەکەی پێکەوە داوە، بەڵام تۆ (سینۆهە) کاتێ هاتییە کەشتییەکەوە وتت لەسەر حسابی خۆم خواردن دەخۆم و هەر لەبەر ئەوەش لە خواردنی زۆر خۆت پاراستووەو ئێستا کە هەموو نەخۆشن تۆ ساغی، بەڵام ئەمانە کە دەزانن خواردنەکەیان لەسەر حسابی نووسینگەکەیە تا بتوانن سکی خۆیان پڕ لە خواردن دەکەن تا گوایە هەڵنەخەڵەتابن. تا کاتێ کە بەسەر نیلەوەبووین زۆرخواردنیان زیانی نەبوو، چونکە نیل ڕووبارەو شەپۆلی نییە، بەڵام ئێستا کە هاتووینەتە دەریاوە ئەمانە دوای هەر ژەمێ خواردنی زۆر تووشی ئەم نەخۆشییە دەبنەوەو ئەوەی کردوویانەتە گەدەیانەوە بەهۆی ڕشانەوە دێتە دەرەوە کە هۆیەکەی تەکانەکانی کەشتییەکەیە کە ئەویش بەهۆی شەپۆلەکانی دەریاوەیە.

وتم بۆچی لەم هەوا ناخۆشە تۆفانییەدا کەشتی لێ دەخوڕی کە ڕێبواران تووشی ئەم نەخۆشییە بن؟

وتی: ئەم هەوایە تۆفاناوی نییە، بەڵکو باشترین هەوایە بۆ کەشتیوانی، چونکە تا با هەڵنەکات ناتوانی کەڵک لە چارۆگەکان وەربگری.

دوایی وتی: سینۆهە، ئەگەرچی تۆ پزیشکێکی میسری بەڵام ئەم زانستە لە من فێربە کە چارەسەری نەخۆشی دەریا تەنیا کەم خواردنەو ئەگەر ڕێبوارانی کەشتی خواردن کەم بخۆن دووچاری ئەم نەخۆشییە نابن.

وتم: ئایا ئەمانەی نەخۆش دەکەون دەمرن؟

کەشتیوانەکە وتی: کاتێ گەیشتینە وشکانی و ئەمانە دابەزین لەهەموو ئەو

کەسانەی لە وشکانیدان ساغتر دەبن، چونکە قورسایی گەدەیان بەهۆی رشانەوە یەک لە دوای یەکەکانەوە نامێنێ و نەخۆشیی دەریا بەس ئەو کاتانە هەیە کە کەشتی لەسەر دەریا دەڕوات و، کە گەیشتە وشکانی نامێنێ.

لەم قسانەدا بووین کە شەوداهات. لە کاتێکدا کەلەهیچ لایەکەوە وشکانی دیارنەبوو، بە کەشتیوانەکەم وت: لەم شەوە تاریکەدا چۆن ڕێگاکەت ون ناکەیت و لە جیاتی ئەوەی بۆ ئەزمیر بچی بۆ سەرزەمینی مرۆڤ خۆرەکان ناچی؟[1]

وتی: من یارمەتی لە خوایەکان وەردەگرم و ڕێگا ون ناکەم. تا کاتێ کە ڕۆژە خوای خۆر یارمەتیم دەدات و کاتی شەو خوای مانگ و خوای ئەستێرەکان یارمەتیم دەدەن و ناهێڵن بەرەوشوێنی زەلام خۆرەکان بڕۆم.

پاشان کەشتیوانەکەم بەجێ هێشت و چوومە گۆشەیەکەوە کە بنووم، بەڵام تا بەیانی بەهۆی ڕۆیشتنی کەشتییەکەو دەنگی چارۆگەکان و شەپۆلەکانی دەریا خەوم لێ نەکەوت. ڕۆژی دوایی هەندێ خواردنم بۆ کاپتا برد و ئەو نەیخوارد و ئەوسا دڵنیابووم کە دەمرێ، چونکە هەرگیز رووی نەدابوو کە کاپتا هۆو دەرفەتێکی بۆ خواردن دەست بکەوتایەو کەڵکی لێ وەرنەگرتبێ. حەوت شەو و حەوت ڕۆژ ئێمە لە دەریادا بووین و لە ڕۆژی هەشتەم ئەزمیر دەرکەوت. کاتێ گەیشتینە ناو بەندەرەکە چارۆگەکانیان هێنایەخوارەوە و مەلەوانەکانی کەشتییەکە سەوڵیان بەدەستەوە گرت کە کەشتییەکە بگەیەننە پەراوێز و، من بە سەرسوڕمانەوە سەیرم کرد بەندەکەم و هەموو ڕێبواران کە بێ هێزبوون، هەرئەوەندە کەشتییەکە گەیشتە بەندەر هەڵسان و بەڕێ کەوتن و هەموویان دەیانوت برسیمانە و داوای خواردنیان دەکرد.

من هیچ کاتێ نەم بینیبوو کە کومەڵێ نەخۆش کە وات دەزانی دەمرن لە ناکاو بەوشێوەیە ساغ ببنەوە و بکەونەڕێ و قسەبکەن و پێ بکەنن. ئەوساکە زانیم کە زانست کۆتایی نییەو مرۆڤ هەرچەندە شت فێربێت هێشتا داماوە و پێویستی بە فێربوونی ترە، چونکە ئەگەرچی ئێمەی پزیشکی میسری باشترین



پزیشکەکانی جیهانین، بەڵام هێشتا بەقەدەر کەشتیوانێکی نەخوێندەوار زانیاریمان نییە و هاوکارەکانی من لە تەبەس لە بوونی نەخۆشییەکی ئەوتۆ کە لەناکاودا چارەسەر دەبێ بێ ئاگابوون[2].

سووریا بە وڵاتی سوور ناسراوەو میسر بە وڵاتی رەش (بەهۆی رەنگی خاکەکەیان) و هەروەکو رەنگی خاکیان جیاوازە، هەموو شتێکی سریانییەکان لەگەڵ میسرییەکان جیاوازە.

میسر وڵاتێکی تەختەو چیای نییە، بەڵام سووریا وڵاتێکی شاخاوییە و لە نێوان دوو چیادا دەشتێک هەیە و لەهەر دەشتێک لەو دەشتانە گەلێک ژیان بەسەر دەبەن و، پاشایەکیان هەیەو هەموو ئەم پاشایانە خەراج (سەرانە)یان دەدایە فیرعەون.

لە کەنارەکانی سووریا خەڵکی بەهۆی ماسیگرتن و دەریاوانی دەژیان و لە ناو زەوییەکان هۆی ژیان کشتوکاڵ و چەتەیی (ڕێگری)بوو و لەشکرەکەی فیرعەون هەرگیز نەیتوانیبوو ڕێگرەکانی سووریا سەرکوت وبن بڕبکات.

لە میسر خەڵکی زیاتر رووت بوون، بەڵام لە سووریا خەڵکی سەرتاپا پۆشتە بوون و جل و بەرگی خۆیان لە خوری دەچنی، بەڵام هەمان خەڵکی کە سەرتاپا پۆشرابوون کاتێ کە دەیانویست پێویستییە سروشتییەکانی خۆیان جێبەجێ بکەن بەبێ ئەوەی بڕۆنە جێگایەکی تایبەت و ئەم کارەیان لەوێ بکردایە لە هەموو جێگایەکدا بێ ڕەچاوکردنی دید و بینینی خەڵکی کارەکەیان دەکرد و گوێیان نەدەدایە.

پیاوەکانی سووریا ریش و قژی درێژیان هەیە و هەر شارێ لە وڵاتەکەیان خوایەکی تایبەتی هەبوو و مرۆڤیان بۆ خوایەکان قوربانی دەکرد. هەندێ لە کردەوەکان کە لە میسردا ناشیرینە ، لە سووریا ڕێگای پێ دراوە و لەوانە دۆستایەتی و هەڵسوکەوتی ژن و پیاوە و، لە هەندێ لە جەژنەکان پیاوەکان و ژنەکان بە شێوەیەکی ئاشکرا تێکەڵی یەکتر دەکەن.

هەر جارێ فیرعەون کاربەدەستێکی دەنارد کە لە پاشاکانی سووریا سەرانە وەربگرێ، ئەو کاربەدەستە ئەم فەرماندەی بە دوورخستنەوە دەزانی، چونکە میسرییەکان جگە لە کەمێکیان ئەوانی تر نەیان دەتوانی لەگەڵ وەزعی ژیانی دانیشتوانی سووریا بسازێن. لەگەڵ ئەوەشدا لە ئەزمیر پەرستگایەکی لێ بوو بەناوی (ئاموون) و میسرییەکانی دانیشتووی ئەو شارە دیارییان بۆ ئەم پەرستگەیە دەبرد.

ماوەی دووساڵ من لە ئەزمیر مامەوە و لەم ماوەیەدا زمان و خەتی بابلی فێربووم، چونکە پێیان گوتم یەکێ کە زمان و نووسینی بابلی بزانێ دەتوانێ بۆ هەموو ولاتە بەناوبانگەکانی دنیا سەفەربکات و لە هەموو شوێنێ لەگەڵ خەڵکی خوێندەوار قسەبکات. خەتی بابلییان لەسەر لەوحەی خاکی (ڕۆس) کە لە شێوەی هەویرە دەنووسی، پاشان لەوحەکان کە بە پەیکان (شتێکی نووک تیژ) لەسەری نووسرابوو دەیانکردە ئاگرەوە و وەک خشت رەق دەبوو. من لە پێشا پێم سەیربوو بۆچی خەتی بابلییان وەک خەتی میسری لەسەر پاپیروس نەدەنووسی، بەڵام دوایی تێگەیشتم کە کاغەز لەناودەچێت ، بەڵام لەوحەی لەکوورە گەرم کراو دەمایەوە و ئەمە نیشانی دەدا کە پاشاکان و دەسەڵاتداران بە چ خێراییەک پەیمان و بەڵێنەکانیان فەراموش دەکەن.

یەکێک لەو شتانەی لە سووریا هەیە و لە میسر نییە ئەوەیەکە لە سووریا پزیشک دەبێ بچێ بۆ ماڵی نەخۆش و هەرگیز نەخۆش نانێرێ بەشوێن پزیشکدا. کاتێ پزیشک دەچێتە ماڵی نەخۆش وا تێدەگەن کە خوایەکان ئەویان ناردووە و دەست هەقی پزیشکەکە پێش چارەسەرکردن دەدەن و ئەم بابەتە بەقازانجی پزیشکە، چونکە نەخۆش کاتێ کە چارەسەرکرا کرێ پزیشکەکە لەبیردەکات.

هەریەکە لە دەوڵەمەندەکانی سووریا پزیشکی تایبەت بەخۆیان هەبوو و تا کاتێ کە ساغ بن دیاری دەدەنێ، بەڵام دوای ئەوەی نەخۆش کەوتن دیارییەکەی



کە دەبێ بیدەنێ نامێنێ تائەوکاتەی دووبارە چاک دەبێتەوە. بەندەکەی من لەو ڕۆژەی کە هاتینە ناو ئەزمیرەوە منی ناچار کرد هەندێ لە هەقدەستەکەم بدەم بەو کەسانەی بۆ شوێنە جیاجیاکانی شاردەڕۆن، بۆئەوەی بلیمەتیی من لە پزیشکیدا بە خەڵکی رابگەیەنن.

کاپتا دەیگوت: ئەگەر لەم شارەدا ناوبانگت هەبێ مەجبوور نابی بۆ چارەسەری نەخۆشەکان بچی بۆ ماڵیان، بەڵکو ئەوان خۆیان دێن بۆلای تۆ.

هەرچەندە من دەمگوت لە سووریا نەخۆش ناچێتە ماڵی پزیشک بەڵکو پزیشک دەبێ بچێتە لایان، نەیدەسەلماند و دەیگوت: لەسەرەتادا وایە، بەڵام پاش ئەوەی خەڵکی لەسەری راهاتن ئیتر ئەوان دێن بۆلای تۆ، لەبەرئەوەی خەڵکی نەزانن و بەزوویی ملکەچی مۆدیلی ڕۆژ دەبن، بەتایبەتی ئەگەر ئەو مۆدیلە لە ولاتێکی بیانییەوە هاتبێ، ئەوان هەر ئەوەندە بزانن کە ڕۆیشتن بۆ ماڵی پزیشک بووەتە مۆدیلی ڕۆژ، ئیتر واز لە راهاتنەکەی پێشوویان دەهێنن و شێوەی باوی میسری دەگرنەبەر.

یەکێکی تر لە کارەکانی کاپتا کە بەمنی کرد ئەوەبوو کە لە کوڵان و شەقامەکان بچمە لای پزیشکە سوورییەکان (چونکە ئەو پزیشکانە کە ناچاربوون بچن بۆ ماڵی نەخۆشەکانیان هەمیشە لە کوڵان و شەقامەکاندا دەبینران) و پێیان بڵێم:

(من .. پزیشکی ناسراوی میسریم کە خوێندنم لە خانەی ژیان تەواو کردووە و لە هەموو دنیادا ناوبانگم هەیە و ئەوەندە زانستم هەیە کە ئەگەر خوایەکان بهێڵن مردوو زیندوو دەکەمەوە و کوێر بینا دەکەم، بەڵام زانست لەهەموو جێگایەک وەک یەک نییە و نەخۆشییەکان لە هەر ولاتێ جۆرێکی تایبەتیان هەیە. بۆیە هاتوومەتە شاری ئێوە کە نەخۆشییەکانی ئەم شارە بناسم و چارەسەریان بۆ بدۆزمەوەو لە زانستی ئێوە ئاگاداربم. من نامەوێت پێشبڕکێ لەگەڵ ئێوە بکەم، چونکە بۆ پەیدا کردنی زێڕ و پارە نەهاتووم و زێڕ و زیو لەلای

من وەک ئەم خاکەی ژێر پێم وایە. کەواتە هەرکاتێ ئێوە بینیتان خوایەکان لەیەکێک تووڕەن و تووشی نەخۆشییەکی بێ عیلاجیان کردووە بینێرنە لای من بەڵکو بەکێردەکەی خۆم بتوانم چارەسەری بکەم، چونکە دەزانم ئێوە هەرگیز بۆ چارەسەری نەخۆشەکانتان کێرد بەکارناهێنن. ئەگەر توانیم ئەو نەخۆشانەی کە ئێوە رەوانەی لای منی دەکەن بەکێرد چاکیان بکەمەوە، هەرچییەک زێڕ و پارەم وەرگرت لەگەڵتاندا نیوەی دەکەم و ئەگەر نەمتوانی چارەسەریان بکەم دەیان نێرمەوە لای خۆتان و ئەگەر شتێکیشم بدەنێ هەمووی دەدەمەوە بە خۆتان).

کاتێ بەم شێوەیە لەگەڵ پزیشکێکی سووری قسەم دەکرد ئەو ریشی خۆی دەخوراند و دەیوت: گومانی تێدانییە کە خوایەکان زانستیان داوە بەتۆ، چونکە وتەکانت بەتایبەتی ئەو بەشەی لەمەڕ نیوەکردنی زێڕ و پارەکانە دڵخوشکەرەو لەبەرئەوەی تۆ بە کێرد چارەسەری نەخۆش دەکەی، ئەگەر بشتەوێ ناتوانی لەگەڵ ئێمەدا کە نەخۆش بەدەرمان چارەدەکەین پێشبڕکێ بکەی. ئێمە لەو باوەڕەداین نەخۆش بەکێرد چارەسەرناکرێ، بەڵکو دەمرێ و تەنها. راسپاردەیەکت پێ دەڵێین و ئەویش ئەوەیە کە هەرگیز بەهۆی جادووگەرییەوە کەس چارەسەرمەکە، چونکە ئەگەر بتەوێ بەهۆی جادووەوە خەڵکی چاک بکەیتەوە لەو کەسانەی کە لە تۆ فێڵبازترن دوادەکەوی.

من باوەڕم بەم قسەیە دەکرد و دەمزانی لە سووریا جادووگەرەکان لەشەقام و کۆڵانەکاندا وەک پزیشک ئەسووڕێنەوەو بەو پیشەیە خەڵکی ساکار و خۆش باوەڕ چارەسەر دەکەن . ئەوانیش یان دەمردن یان بەهۆی بەسەراچوونی کات چاک دەبوونەوە.

لەمیسری ئێمەش جادووگەری هەیە، بەڵام لە لای ئێمە جادووگەری هونەرێکە تایبەتە بە کاهینەکان و تەنها کاهینەکان، ئەویش لەناو پەرستگاکاندا جادوو دەکەن و ئەگەر یەکێک لە دەرەوەی پەرستگا جادووبکات سزایەکی سەخت دەدرێ.



ئاکامەکانی شێوەی چارەسەرکردنەکەم لە ئەزمیر زۆر سەنج راکێش بوو و ئەوەندەی پێ نەچوو ناوبانگم کەوتە ناوەوە و دەرەوەی شار. من لەگەڵ ئەو پزیشکانەی کە نەخۆشە بێ چارەسەرەکانیان دەنارده لام بەدروستی رەفتارم دەکرد و ئەوەی لێیانم دەستاند نیوەم دەدایە ئەو پزیشکە سریانییەی کە نەخۆشەکەی دەناردەلام و بە نەخۆشەکەشم دەگوت بچێتەلای پزیشکەکە و پێی بڵێ چەندت پارە داوە بەمن.

کەرەستەی چارەسەرکردنەکەی من کێردبوو و هەموو جارێ پێش بەکارهێنان لەئاگردا خاوێنم دەکردەوەو هەرلەسەر شێوەی کاری خانەی ژیان خۆشم خاوێن رادەگرت.

رۆژێکیان پیاوێکی کوێر هاتەلام و دیاربوو کە ماوەیەک بوو لای پزیشکە سوورییەکان چارەسەردەکرا، بەڵام خراپتربوو بوو. ئەوەی کە ئەوان بۆ چارەسەری چاوی بەکاریان هێنابوو تف و خۆڵ بوو کە تێکەڵیان دەکرد و دەیانخستە بان چاویەوە. بەڵام من بۆ چاک کردنەوەی ئەو پیاوە دەرزیم بەکارهێنا و لە پێشا دەرزییەکەم کردە ئاگرەوە و دوای خاوێن بوونەوە بەو دەرزییە چاویم چاک کردەوە و بینایی هاتەوە. بەڕادەیەک ئەم بابەتە یارمەتیی ناو دەرکردنی دام کە لە تەواوی شاری ئەزمیر منیان بەنوێنەری خوایەکان دەزانی و دەیانگوت (چۆن خوایەکان دەتوانن چاو بە نابینا ببەخشن، سینۆهەش ئەوها دەتوانێ چاویان پێببەخشێ).

بازرگانەکان و دەوڵەمەندەکانی سووریا لە بازرگان و دەوڵەمەندەکانی لای ئێمە زۆرخۆرتر بوون و رۆژانە چەند ژەم خواردنی کولاویان دەخوارد و ئەو خواردنە کولاوە لەشیانی قەڵەوکردبوو و گرفتاری نەخۆشیی گەدەو تەنگەنەفەسی کردبوون.

ئەمانە لەدوای ناودەرکردنی من بەبێ ئەوەی لە پێشا بچنە لای پزیشکەکانی تر، یەکراست دەهاتنە لای خۆم و من، بەکێرد چاکم دەکردنەوە و خوێنەکەیانم

وەک خوێنی بەراز کەسەری دەبڕی دەرژاندە خوارەوە. من دەرمانەکانم بەگوێرەی توانای نەخۆش دەفرۆشت و ئەگەر بمزانیبایە نەخۆشێک زەنگینە دەرمانەکەم بەگران پێ دەفرۆشت و ئەگەر بمبینیبایە دەرامەتی نییە و فەقیرە زۆر بەهەرزان دەرمانەکەم دەدا پێی و لەو باوەڕەدابووم کە دەبێ لە دەوڵەمەند بسەنی و بیدەی بەهەژار، بەتایبەتی ئەگەر لە چینی بەندەکان و کرێکارەکان بووایە.

بەندەکەی منیش (کاپتا)، دیاریی لە نەخۆشەکان وەردەگرت و زۆر لە نەخۆشەکان پێش ئەوەی بێنە لای من دەچوونەلای کاپتا کە بەهۆی ئەوەوە زیاتر وردبینی و یارمەتیدانی من بۆ خۆیان بەدەست بهێنن. کاپتا هەموو رۆژێ هەندێ لە دەرۆزەکەرەکانی لەماڵی مندا میوانداری دەکرد و خواردنی دەدا پێیان کە بڕۆن لە دەوروبەری شار باسی چارەسەرە موعجیزەئاساکانی من بکەن و بڵاوی بکەنەوە کە ئەم پزیشکە میسرییە لە جیهاندا هاوتای نییە.

من زێڕ و پارەیەکی زۆرم دەست کەوت و زیادەی ئەو زێڕ و کانزایانەم لە کۆمپانیاکانی کەشتیوانی دەخستەگەڕ. لە سووریا کۆمپانیای زۆر هەبوو کە سەرمایەکەی بۆ بەشی بچووک دابەش کرابوو و ئەم بەشە بچووکانە لەلایەن خەڵکییەوە دەکڕدرایەوە. بەشە بچووکەکانیش دیسانەوە بۆ چەند بەشێکی بچووکتر دابەش دەبوون و ناوی یەک لە دەو.. یەک لە سەدو.. یەک لە هەزاریان لێ نابوو. هەموو دانیشتووانی ئەزمیر تەنانەت سواڵکەرەکانیش ئەم بەشە بچووکانەیان دەکڕی و لە ئاکامدا شەریکی سەرمایەی کۆمپانیاکانی کەشتیوانی دەبوون. هەندێ جار کەشتی دوای چوونە دەریاوە نوقوم دەبوو و نەدەگەڕایەوە، بەڵام کاتێ دەگەڕایەوە قازانجێکی بەرچاو بەر خاوەن سەرمایەکان دەکەوت. من تا لە توانامدابوو لەم بەشانەم کڕییەوە کە لە سوودەکەی بەشدار بم.

لە میسردا ئەم شێوەیە باونەبوو و هەر لەبەرئەوەش کەشتیی گەورەی وەک کەشتییەکانی سووریای لێ نەبوو. لە وڵاتەکەی ئێمەدا لەگەڵ مردنی خاوەن کەشتییەکە، کەشتییەکەی لەناودەچوو، بەڵام لە سووریا لەبەرئەوەی کەشتییەکە



هی کۆمپانیابوو و خەڵکی لە سەرمایەکەیدا بەشدارن، مردنی یەک یا چەند کەسێک کار لە بارودۆخی کەشتیوانییەکە ناکات و لە ئەزمیر من کۆمپانیای وەهام دەبینی کە پێنج سەد ساڵ بەسەر تەمەنیدا تێدەپەڕی. یەکێک لە سوودەکانی بەکارخستنی سەرمایەکەم لە کۆمپانیاکاندا ئەوەبوو کە هیچ کاتێ زێڕ و کانزای زۆرم لە ماڵەوە نەدەهێشتەوە کە دزەکان تەماحی تێدا بکەن و بە مەبەستی دزینی بێن و بمکوژن.

لە کاتێکدا کە من دەوڵەمەند دەبووم کاپتاش قەڵەو دەبوو و جل و بەرگی جوانی لەبەردەکرد و لەشی بە رۆنی بۆن خۆش عەتراوی دەکرد و لەگەڵ ئەوەشدا کە بەساڵاچوو بوو بەڵام ژنی گەنجی لەباوەش خۆیدا دەخەواند و زیادی دەخوارد و جاری وا دەبوو وەها لەخۆبایی دەبوو کە تەنانەت بەرامبەر بە منیش خۆی بەشت دەزانی و لەو کاتانەدا دەستم دەدایە گۆچانەکەم و چەند دارێکی بەهێزم دەکێشا بە شان و ملیدا.

ئەوەندە زێڕ و پارەم دەست کەوت کە هەندێ کات بۆ بەکارخستنی تووشی گرفت دەبووم و نەمدەزانی چی لەو هەموو کانزایانە بکەم. هۆی سەرکەوتنی من دوو شت بوو، یەکەم ئەوەی کە لەگەڵ پزیشکە سوورییەکاندا پێشبڕکێم نەدەکرد، چونکە بەشێوەیەکی گشتی ئەو نەخۆشانەم چارەسەردەکرد کە ئەوان روخسەتیان دابوون. دووەم ئەوەی کە لە بەکارهێنانی کێرددا نەترس بووم ، چونکە کاتێ پزیشکێکی سووری نەخۆشێکی ئێزن دەداو دەیگوت دەمرێ، خەڵکی ئەو نەخۆشەیان بە مردوو لەقەڵەم دەداو، ئەگەر من دوای بەکاربردنی کێرد سەرکەوتنم بەدەست بهێنایە و چاک ببووایەتەوە هەموو زانستەکەمیان بەرز دەنرخاند و ئەگەریش نەخۆشەکە بمردایە کەس بە خراپە باسی منی نەدەکرد، چونکە دەیانزانی نەخۆشەکە لە مردندایە.

لەبەرئەوە بەبێ خەم و بێ ترس لە مردنی نەخۆشەکە، کێردەکەم لە لەشیاندا بەکاردەهێنا. هەندێ کاتیش لە زانستی پزیشکەکانی سووریا سوودم وەردەگرت،

چونکە هەندێ لە زانینەکانیان بەتایبەتی لەبارەی بەکارهێنانی کانزاکان کە توانای گەرم بوونیان هەیە بۆ چاک کردنەوەی برینەکان، کەڵکی لێ وەردەگیرا.

کاتێ کە ئەوەندە زێڕم دەست کەوت کە ئیتر هەستم کرد پێویستیم پێی نەماوە، زێڕ لەبەر چاوم کەوت و لەوە بەدوا هەندێ جار نەخۆشە هەژارەکانم تەنها لەبەر ئەوە چارەسەردەکرد کە زانیاریی خۆمی پێ زیاد بکەم. لەماوەی ئەم دوو ساڵەدا کەلە ئەزمیر بووم لە تەنیایی ئازارم دەچێشت، چونکە ژنێکم دەست نەکەوت لەگەڵ سروشتمدا کۆک بووایەو لە ژنەکانی هەموو شوێنێ بیزاربووم، چونکە (نەفرنەفرنەفر) بەجورێک منی لەو ژنانە، کە بۆ زێڕ و زیو و مس بە حیلە و فێڵ چاوپێکەوتنیان لەگەڵ پیاوادادەکرد رق ئەستور کردبوو، کە تەنانەت بەبیستنی ناوی ئەو جۆرە بوونەوەرانە رقم لێیان هەڵدەستا. لە ئەزمیر پیاوێ کە بیویستایە ژنێک بۆ ماوەیەکی کاتی بهێنێت دەچووە پەرستگە، بەڵام من کاتێ کە لە پەرستگەشدا بووم سەیری ژنەکانم نەدەکرد.

سووریا خوای زۆری هەبووکە ناسراوترینیان ناوی (بەعل) بوو. (بەعل) خوایەکی خوێن مژ بوو کە پێویستی بە قوربانی هەبوو و ئەم خوایە دزی کردنی ئاسایی قەدەغە کردبوو و لە جیاتی ئەوە دزییەک کە فرت و فێڵی تێدا بەکارهاتبێ ئازاد کردبوو. لە ئەزمیر ئەگەر یەکێک بۆ تێرکردنی سکی ژن و منداڵی خۆی ماسییەکی بدزیبایە دەیانبردە پەرستگای (بەعل)و لەبەردەم ئەو خوایە (بەعل) کەرت کەرتیان دەکرد، بەڵام ئەگەر یەکێک زیوی تێکەڵی زێڕ بکردایە و دوایی ئەو حەڵقە کانزاییەی بە زێڕی پەتی بدایە بە خەڵکی، کەس رەخنەی لێ نەدەگرت، چونکە فێڵی تێدا بەکارهێناوە و لەسووریا هەڵخەڵەتاندن و فێڵ لێکردن هونەرێکی دەستخۆشی لێکەر بوو. هەرلەبەر ئەوەش لەم وڵاتەدا هەموو لە ناسینەوەی زێڕ و کانزا وەستابوون و کە حەڵقەی زێڕ، یان کانزای تریان بەدەستەوە بگرتایە یەکسەر دەیانزانی پەتییە یان شتێکی تێکەڵ کراوە.

خوایە مێیەکەی دانیشتووانی ئەزمیر خوایەکە ناوی (عەشتار)ە کە هەموو



رۆژێ کراسەکەیان دەگۆڕێ. ئەو خوایە لە پەرستگەیەکی گەورەدا نیشتەجێ بوو و لەو پەرستگەیەدا سەدان کیژۆڵەی جوان پێسپێردراوی ئەرکی خزمەتگوزاری ئەوبوون. بەڵام ئەمانە تەنها بەشێوەیەکی رەسمی خزمتگوزاری (عەشتار) بوون و بە پێچەوانەی ناوەکەیان ئەرکی ئەوان ئەوەبوو کە لە شێوەی رێ و رەسمی خۆیان میوانداریبیان لەو کەسانە دەکرد کە دەهاتنە پەرستگەکە.

لە ئەزمیر پەرستگای (عەشتار) وەک خانووەکانی رابواردنی تەبەس بوو و ژنەکان لەوێدا میوانداریبیان لە پیاوەکان دەکرد و هەر چییەک پیاوەکان بیاندایە بەوان لە پارێزگاری کردنی (عەشتار)دا سەرف دەکرا. لە میسر ئەگەر پیاوێ لەناو پەرستگادا لەگەڵ ژنێک کۆببووایەتەوە، پیاوەکەیان بۆ کارکردن دەنارده کانگە و ژنەکەیان لەپەرستگە دەردەکرد، بەڵام لە ئەزمیر ئەم جۆرە پەیوەندییە لە ناو پەرستگەی عەشتاردا ئازادە و سریانییەکان دەڵێن لەبەرئەوە (عەشتار) ئەم کردەوەیەی لە پەرستگاکەیدا ئازادکردووە کە بەم شێوەیە دەرامەتێکی زۆری دەست کەوێت و ئەگەر پیاوێ نەیەوێت بچێتە پەرستگای (عەشتار)، تەنها دەمایەوە یان دەبووایە ژنی بهێنایە یان کەنیزێکی بکڕیبایە.

لەوەیە لە هیچ جێگایەکی جیهان بەئەندازەی سووریا کەنیز و بەندەی فرۆشتنی لێ نەبێت، چونکە هەموو رۆژێ کەشتیوانەکان لە شوێنە دوورەکانەوە دەهاتن و ئەو بەندە و کەنیزانەی کە لەگەڵ خۆیاندا دەیان هێنان، بۆ فرۆشتن دەیان ناردنە بازاڕ. لە نێوان ژنە کەنیزەکاندا بەپێی ئارەزووی هەرپیاوێک هەموو جۆرە ژنێک هەبوون و بەهاکەیان گران نەبوو و هەموو کەسێ دەیتوانی کەنیزێ بەدڵی خۆی بکڕێ و بیباتەماڵەوە.

بەندە و کەنیزە کەم ئەندامەکان لەلایەن حکومەتی ئەزمیرەوە دەکڕدرایەوە. ئەم کۆیلانە بە بەهایەکی زۆرکەم دەکڕدران و میری ئەوانی بۆ کارکردن یان جوانی نەدەویست، بەڵکو مەبەستی ئەوەبوو بیانبات بۆ پەرستگەی (بەعل) و لەوێدا لەبەردەم ئەو خوایە بیانکەن بە قوربانی. ئەو حکومەتە لەو باوەڕەدابوو کە

(بەعل) ناتوانێ تێبگات کە ئەوان فریوی دەدەن و ژن یان پیاوێکی کەم ئەندامی بۆ قوربانی دەکەن. هەندێ کات کە کەنیزەکان یان بەندەکان زۆر پیربوونایە و ددان لە دەمیاندا نەبووایە، کاتێ کە دەیانویست لەو پەرستگەیەدا قوربانیان بکەن پارچەیەکیان بەدەم و چاوی (بەعل)دا دەدا بۆ ئەوەی قوربانییەکانی خۆی نەبینێت. منیش لەبەر ئەوەی دانیشتووانی ئەزمیر رێزم لێ بگرن قوربانیم بۆ خوای (بەعل) دەکرد، بەڵام من لە جیاتی کوشتنی بەندە یان کەنیز، بەهای قوربانییەکانم بەپارە دەدا بەپەرستگەکەو، ئەو زێڕ و پارەیەی من پێشکەشی پەرستگەکەم دەکرد زیاتر لە قوربانی کردنی ئەو بەندەو کەنیزانە لەبەرچاو بوو.

ئەو ژنانەی لە پەرستگای (عەشتار)دابوون جوانییەکی بێ وێنەیان هەبوو، چونکە رێ و رەسم وابوو کە جوانترین کچەکانی سووریا بۆ خزمەتگوزاری لەو پەرستگایەدا هەڵدەبژێردران و کاتێ کە دەگەیشتنە تەمەنی پێ گەیشتن هەندێ هونەری دڵڕفاندنیان فێردەکردن کە بزانن چۆن سەرنجی ئەو پیاوانە رادەکێشن کە دێنە ئەوێ، بۆ ئەوەی زێڕ و زیوێکی زیاتریان بۆ پەرستگاکە لێ بسەنن. هەرکاتێ دەرۆیشتمە پەرستگای (عەشتار) لەگەڵ یەکێ لە کچەکانی پەرستگا دەمبردە سەر. من ئیتر ئەو سینۆهە سادە و شەرمنە نەبووم کەشەوان بۆ جێگاکانی رابواردنی تەبەس دەچووم، بەڵکو شارەزاییەکی تەواوم لە چێژ وەرگرتن لە ژنان پەیا کردبوو و دەمزانی کە کاتێک پیاوێک دەیەوێت لەگەڵ ژنێکدا رابوێری چۆنی سوودی لێ وەربگرێ.

دوای ئەوەی چەند جارێ چوومە پەرستگەی عەشتار بینیم ژنەکانی ئەوێ هەریەکەیان بە جۆرێکی تایبەتی خزمەتی میوانەکان دەکەن و ئەمەش یەکێک بوو لە سوودەکانی ئەو رێ و رەسمە بۆ دەستکەوتنی دەرامەتی زیاتر. ئەو کەسانەی دەچوونە پەرستگەکە هەر جارەو بەرەورووی سەرگەرمییەکی تازە دەبوونەوە و هەر ئەمەش وای کردبوو کە دیسانەوە بۆ کات بردنەسەر بچنە ئەوێ.



من لە ژنەکانی ئەوێ زۆرشت فێربووم و وردە وردە لە هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ خەڵکیدا شارەزاییم پەیداکرد. لەگەڵ ئەوەشدا کە هەر جارێ دەچووم بۆ پەرستگە هەستم بەئاسوودەیی دەکرد، بەڵام لە دڵمدا لە ژنەکانی ئەوێ بێزاربووم، چونکە دەمزانی کە لەگەڵ ژنە ئاساییەکانی تەبەسدا جیاوازن.

کاپتا رۆژێکیان بە وردی روانییە من و وتی: ئەی گەورەم ئەگەر چی لاوی، بەڵام لە دەم و چاوت چرچ و لۆچی بەدی دەکرێ.

وتم: وانییە...

وتی: با وایە.. و هۆیەکەشی ئەوەیەکە تۆ لەگەڵ ئەو ژنانەدا رادەبوێری کە لە دڵتدا خۆشت ناوێن و ئەگەر یەکێ هاودەمەکەی خۆی خۆش بوێت لە هاونشینی کردن لەگەڵیدا پیر نابێت. من لە دوو شت دەترسم، یەکێکیان ئەوەی کە تۆ بەهۆی هەڵسوکەوت کردنی ئەوانەی لەگەڵیاندا بێگانەی پیر ببی، چونکە دەزانی کە دۆستی تۆ نین، دووەم ئەوەی کە رووداوی (نەفر نەفر نەفر) دووبارە ببێتەوەو فریودەرێکی بێ بەزەیی ئەسیری خۆیت بکات و دیسانەوە تێک بشکێین.

وتم: دڵنیابە کە جارێکی تر من ناکەومە داوی (نەفر نەفر نەفر)و نموونەی تری وەک ئەو.

کاپتا وتی: تا ئەو رۆژەی کە پیاوێک وزەی پیاوەتییەکەی بمێنێ دوورنییە بکەوێتە داوی ژنێکی بێ ویژدان و تەماحکار و هەموو شتێکی خۆی لە کیس بدات. من بەتەمام بۆ ئەوەی تۆ لە مەترسیی ژنە دنیا پەرستەکان دووربخەمەوە کەنیزێکت بۆ بکڕم.

پێنج رۆژ دوای ئەوە، شەو کە چوومە ژوورەکەی خۆمەوە، روانیم کاپتا لەگەڵ ژنێکی گەنجدا هاتە ژوورەوە. ژنەکە نە میسری بوو، نە خەڵکی سووریاش بوو و، زیاتر لە هۆزە زەلام خۆرەکان دەچوو، چونکە قژی زەرد و دەموچاوی سپی و چاوەکانی شین بوون. هەروەها نە باڵابەرز و نە لاوازیش بوو و سینگی بچووک

بوو و من وام بیرکردەوە کە ئەگەر هەموو ژنەکانی زەلام خۆرەکان وەک ئەو ژنە بوونایە، سەرزەمینی ئادەم خۆرەکان لە خانەی خوایەکانیش خۆشتر دەبوو.

کاپتا کاتێ کە هێنایە ژوورەکەی منەوە کراسەکەی لەبەر داکەند کە وەکو خۆمان (وەک میسرییەکان) بێت و دوایی دەستی کرد بە باسکردنی جوانییەکانی و وتی : ئەم ژنە کەنیزێکە کە دەریاوانەکانی ئێمە لە کەنارەکانی گەلە ئادەمخۆرەکانەوە رفاندوویانەو من ئەمڕۆ لەبازاڕی کۆیلە فرۆشەکان لەمە جوانتر هیچ کەنیزێکم نەدی.

هیچ نیشانەیەکی ترس لەژنەکەدا بەدی نەدەکرا و پێ دەکەنی و ددانە سپی و بریقەدارەکانی نیشان دەدام و هەندێ لە ئەندامەکانی تری لەشی، کە ئاماژە پێ کردنی جوان نییە ئەو ئیشارەتی بۆ دەکرد و من بۆم دەرکەوت کە هەتا ژنێ لەو گەلە کێوی و زەلام خۆرانە نەبێت بەو شێوەیە بێ شەرم نابێت.

ئەم ژنە بەزوویی بەشێوەیەک خووی بەمنەوە گرت کە بوونی ئەو ببووە زەحمەتێکی بەردەوام بۆمن، چونکە ئەو دەیەویست هەمیشە بۆ هەر شوێنێ دەڕۆم لەگەڵمدا بێت، بەڵام من کە لە دەست و پێگیرییەکەی بێزاربووم ئەوم بەکاپتا بەخشی. بەڵام ژنەکە لەگەڵیدا هەڵی نەدەکرد و لە (کاپتا)ی دەداو لەلای ئەو هەڵدەهات و دەهاتە لای من. کاتێ کە من لێم دەدایەوە خۆشحاڵ دەبوو و دەیوت : لەبەرئەوەی تۆ بەهێزتری باشتر دەتوانی لەگەڵمدا رابوێری.

پەیوەندییەکانی ئێمە و ئەم ژنە بەم شێوەیە بەردەوام بوو تاوەکو رۆژێ یەکێ لە پاشاکانی سووریا، کە باسم کرد ژمارەیان زۆرە، گەیشتە ئەزمیر و بۆ چارەسەر هاتە لای من و کە چاوی بە کەنیزەکەم کەوت حەپەسا، من وا تێگەیشتم کە رەنگە سپییەکەی پێستی و قژە ئاڵتوونییەکەی بوو کە زیاتر سەرنجی راکێشا، چونکە کەنیزەکەی من لە دیدی ئەو پاشایە کە هەرگیز ژنێکی بیانیی نەدیبوو بوونەوەرێکی سەیر دەهاتە بەرچاو.

من کە بینیم چاو لە ژنەکە هەڵناگرێ بەئەوم ناساند و بە کەنیزەکەم وت



خواردنەوەی بۆ بهێنێ و دوای ئەوەی پاشا زانیی کەنیزی منە وتی: سینۆهە دەمەوێ ئەم کەنیزە لە تۆ بکڕمەوەو هەر چەندت بوێ لە باتی ئەو زێڕ و کانزات دەدەمێ.

هەتا ئەو رۆژە لە دەست و پێ گیری کەنیزەکەم بێزاربووم کە وەک سێبەر بەردەوام بەدوامەوە بوو. بەڵام هەر ئەوەندە کە زانیم ئەو پاشایە داوای دەکات لام حەیف بوو ئەو کەنیزە جوانەی خۆمی بدەمێ، چونکە دەمزانی هەر چۆنێ بێت هەندێ شەو پێویستم پێی دەبوو و ئەگەر ئەوم لەلا نەبوایە، ناچار دەبووم بۆ پەرستگای عەشتار بڕۆم و لەگەڵ ژنەکانی ئەوێدا جووتبم. جگەلەوەش هەر ئەوەندە ئەو پاشایە داوای کەنیزەکەی کردم ئیتر رێزو بەهاکەی لەلام زیادی کرد، چونکە تاکاتێ کە شتومەکی مرۆڤ کڕیاری نەبێت لە بەرچاویدا بێ بەهایە، بەڵام هەرئەوەندە کڕیارێکی بۆ پەیدابوو ئیتر دێتەوە بەرچاوی.

ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کە دەبێ چەند وشەیەک لە بارەی داهێنانەکەی خۆم بڵێم : من ئەوکاتەی لە خانەی مەرگ کارم دەکرد هەستم بەوەکرد کە ئەگەر بکرێ ددانەکان بە رووکەشێک داپۆشرێت، لە تێکچوون و رزین پارێزراو دەبێت. کاتێک کە لە خانەی مەرگ مردووە دەوڵەمەندەکانیان مۆمیایی دەکرد ددانەکانیان بە رووکەشێکی تەنکی زێڕ دادەپۆشی و ئەم رووکەشە زێڕە بەگۆشتی پووکەوە دەنووسا. لە ئەنجامی ئەوە لە دوارۆژدا کاتێک کە ئاسەواری رزین لە مۆمیایی کردنەکەدا دەردەکەوت ددانەکان لە پووکی ناودەم جیانەدەبوونەوە و دوای هەزارەها ساڵ ریزی ددانەکان وەک دۆخی یەکەم جاری دەمایەوە. ددانەکانی مردوو دوای مۆمیایی کردن خراپ نابن، چونکە ددان دوای مردن نارزێت، بەڵام لەپووک جیادەبێتەوە و لەبەرئەوە بە زێڕ بە پووکی ناودەمەوە دەیانلکاند کە لێک جیانەبێتەوە.

من وام بیردەکردەوە کە ئەگەر ددانی مرۆڤێکی زیندوو بە رووکەشێکی زێڕ داپۆشرێت، لە رەشبوونەوە و کلۆربوون پارێزراو دەبێت.

تا کاتێ کە لە تەبەس بووم دەرامەتم ڕێگای پێ نەدەدام دەست لەم ئارایشتە وەربدەم و تاقی بکەمەوە، بەڵام دوای ئەوەی ڕۆیشتم بۆ ئەزمیر و لەوێ زێڕ و پارە لەلام بێ بایەخ بوو، بڕیارم دا ئەم بابەتە تاقی بکەمەوە و دوایی بۆم دەرکەوت کە پۆشاندنی ددانەکان بەو رووکەشە زێڕە ددان لە تێکچوون دەپارێزێت. ئەو پاشایەش کە باسم کرد بۆ چارەسەرکردن هاتبووە لام، دەیویست ددانەکانی چاک بکەمەوەو ڕازی بوو کە بەو رووکەشە ئاڵتوونییە ددانەکانی داپپۆشم بۆ ئەوەی لە داهاتوودا نەڕزن.

دوای ئەوەی ددانەکانیم بەو رووکەشە جوانکاری کرد، بەشێوەیەک کە یەکێک بەسەر ددانەکانی سەرەوە و ئەوەی تر بەسەر ددانەکانی خوارەوەدا، وتی: سینۆهە تۆ زۆر بەمنەوە ماندوو بوویت و ددانەکانمت لە تێکچوون پاراست و ئەو دەست هەقەی من داومە بەتۆ ئەگەرچی زۆرە بەڵام بەقەدەر زانستەکەی تۆ نابێت. سینۆهە ، ئەگەر چی مافت بەسەرمەوە هەیە، بەڵام من لەبەر ئەوەی پیاوێکی ڕاستگۆم پێت دەڵێم داواکاری کەنیزەکەتم و ئەگەر ئەم کەنیزەم پێ بفرۆشی نرخێکی باشت دەدەمێ و ئەگەریش پێمی نەفرۆشی لێتی دەڕفێنم و ئەگەریش بتەوێ بەرگری بکەی دەتکوژم، من تا ئێستا کەنیزێکم نەبینیوە لە گەلە زەلام خۆرەکان بێت و تۆ دەبێ پێمی بفرۆشی بۆ ئەوەی بیکەمە هاوسەری خۆم و بزانم کە ئایا لەزەتی ڕابواردن لەگەڵ ژەنە چاوڕەش و پرچ ڕەشەکان خۆشترە، یان کۆبوونەوە لەگەڵ ژنێک کە لەهۆزە زەلامخۆرەکان بێت و پرچی زەرد بێت.

کاتێ کە پاشا ئەم قسانەی دەکرد، (کاپتا ) کە لە دوای هاتنی بۆ سووریا لە مامەڵەچییەکانی ئەوێ فێری بازاڕ گەرم کردن بوو بوو، بۆ ئەوەی بازاڕی مامەڵەکەمان گەرم بکات و هانی پاشاکە بدات کە بەهایەکی زیاتر بەو کەنیزە بدات، کەوتە شیوەن کردن و وتی : ئەمڕۆ شوومترین ڕۆژی ژیانی گەورەکەمە. خۆزگە لە سکی دایکم دەرنەدەچووم و ئەم ڕۆژەم نەدەبینی، چونکە لەم ڕۆژەدا تۆ دەتەوێ کۆتایی بە ژیانی گەورەکەم بهێنی و لە تاقە یارمەتیدەر و



بەردەستیکەرەکەی بێ بەشی بکەی و ئەو کەنیزەی کەهەموو شەوێ لەباوەشی خۆیدا دەیخەوێنێت لێی بستێنی و من دەزانم کە هەرگیز هیچ ژنێکی تر ناتوانێت وەکو ئەم ژنە دڵی گەورەکەم ڕازی بکات، چونکە ژنی وەها جوان لەهیچ جێگایەکدا نییە. سەیرکە و بڕوانە دەمووچاوی لەمانگی بازنەیی شەوی بەدر جوانترەو دوو گۆیەکەی سەر سینگی لەنارنجەکانی ئەزمیر بچووکترە. ئایا سکە سافەکەیت بینیوە کەهیچ هەڵاوساوییەکی تیادا بەدی ناکرێت و ئایا لەناوەڕاستی سکیدا چاڵاییەکەی ناوکی دەبینی، بڕوانە لەهەموو لەشی ئەم ژنەدا تەڵە موویەک نادۆزیتەوەو لەشولاری ئەم ژنە لەشیری مانگا سپیتر و لەپاقلەی کوڵاو نەرمترەو من دڵنیام کە خوایەکان هەموو ڕەنگە قەشەنگەکانیان کۆکردۆتەوەو لەدەموچاوو لەشی ئەم ئافرەتەدا بەکاریان هێناوە. چونکە قژی ئاڵتونی و چاوەکانی شین و لێوی سوور و نینۆکەکانی خەنەیی و لەشی سپی و نووکی گۆیەکانی سەر سینگی ئەرخەوانییە.

کاتێ کە بەندەکەم بەو شێوەیە کەوتە بازاڕ گەرمی، پاشا بەڕادەیەک بۆ ئەو کەنیزە شپرزە بوو کە لە تاو دڵگرتنەکەی هەناسەبڕکێی پێ کەوتبوو و وتی: سینۆهە من دەزانم کەنیزەکەت زۆر جوانە، بەڵام من هەر چەندێکت بوێت دەتدەمێ و ئەگەر بە فرۆشتنیشی ڕازی نەبی ناچارم بتکوژم.

من دەستم بەرزکردەوە کە بەندەکەم وا لێ بکەم بێدەنگ بێت و دوای ئەوەی دەستی لە شیوەن کردن هەڵگرت، ڕووم کردە پاشا، کە لەوکاتەدا دەسەڵاتداری وڵاتی (ئامورۆ) بوو لە سووریاو وتم: ئەم ژنە بەلای منەوە زۆر ئازیزە و ئەگەر لە بری زێڕ پێتی بفرۆشم خیانەتم لەخۆم کردووە و هەر لەبەر ئەوەش حەز ناکەم ناوی فرۆشتنی لێ بنێم، بەڵام ئامادەم بەبێ بەرامبەر پێشکەشتی بکەم بۆ ئەوەی بتوانی بیکەی بە هاوسەری خۆت و وەکو خۆت دەڵێی بەختەوەر ببێت.

پاشای (ئامورۆ) کە زانی من ئامادەم کەنیزەکەی خۆمی بدەمێ بەڕادەیەک خۆشحاڵ بوو کە هاواری کرد: (سینۆهە) ، من لەو باوەڕەدا نەبووم کە خەڵکی

میسر بەخشندەیەکی تێدابێت، چونکە لە منداڵییەوە تا ئەمڕۆ هەر میسرییێکم بینیبێ، فەرمانبەری فیرعەون بوونە کە دەهاتن بۆ سەندنی سەرانەو بەردەوام دەستیان بۆ وەرگرتن درێژدەکرد و هەرگیز دەستیان نەدەبرد شتێ بدەن بە کەس. بەڵام تۆ یەکەم میسریت بە منت سەلماند کە لەوەیە لە میسردا کەسانێ هەبن سەخی بن و ئەگەر ڕۆژێک بێیت بۆ وڵاتی (ئامورۆ) من پەیمانت دەدەمێ کە تۆلە لای راستی خۆمەوە دادەنیشێنم.

دوایی بەندەکەم کراسی بۆ کەنیزەکە هێنا و ئەویش لەبەری کرد و لەگەڵ پاشای (ئامورۆ)دا کە پیاوێکی گەنجی بەهێزو کەڵەگەت بوو و ریشێکی درێژی هەبوو چووە دەرەوەو کاتێ کە دەڕۆیشتن هەستم کرد کەنیزەکەم بە بینینی ئەو پیاوە بەهێزە کەیف خۆش بوو کە لەمەودوا دەبێتە گەورەی نوێی ئەو.

دوای رۆیشتنی پاشا، (کاپتا) سەرزەنشتی کردم و وتی: بۆچی هیچت لە پاشای (ئامورۆ) نەسەند لە کاتێکدا کە ئەو ئامادەبوو هەرچییەکت بویستایە بیدایە پێت.

وتم: من لەو رووەوە کەنیزەکەم بەبێ بەرامبەر داپێی کە هیچ کەسێ ئاگاداری دوارۆژ نییە و نازانێ ئەم دنیایە چی لێ دێت و بوونی دۆستی گەورە بۆ رۆژی تەنگانە سوودمەندە و لەوەیە رۆژێک دابێت بۆ دڵنیابوون لە مەترسی دوژمنان بچم بۆ وڵاتی ئەوان و ئەگەرچی ئەو پیاوە وڵاتێکی بچووکی هەیە و لە سنوورەکەیاندا جگە لە مەڕو گوێدرێژ هیچ شتێکی تر دەست ناکەوێت، بەڵام دۆستایەتی ئەو بۆ من لەکاتی بەرەوڕووبوونەوەی مەترسیدا دەستکەوتێکی بە بایەخە.

پاشای ئامورۆ تا سێ رۆژی تر لە ئەزمیر مایەوە و کاتێ کە ویستی لەوێ بڕوات بۆ خواحافیزی هاتەلای من و وتی : سینۆهە ئەگەر تۆ هەموو زێڕ و زیوی میسرت بدایە بەمن بەئەندازەی ئەم کەنیزەی داوتە پێم دڵخۆشت نەدەکردم، چونکە ئەم کەنیزە خوشەویستترین ژنێکە کە من تا ئێستا بینیومە و دڵنیام کە



هەرگیز لێی جیانابمەوە، ئەگەر تۆش رۆژێ بێیت بۆ وڵاتی من هەر چییەکت بوێ دەتدەمێ جگە لە دوو شت، یەکێکیان ئەم کەنیزەیە و ئەوی تریان ئەسپە، چونکە لە وڵاتی مندا ئەسپ زۆرکەمە و ئەو ژمارەکەمەی کە لەوێدا هەیە بۆ گالیسکە جەنگییەکانی من پێویستن. لەم دووانە بەولاوە هەر چییەکت بوێ من ئامادەم و هەر کەسێکت بوێ بۆتی دەکوژم و ئەگەر کەسانێک هەن کە لە ئەزمیردا دوژمنایەتیت دەکەن پێم بڵێ کە بەدستی بەکرێگیراوەکانی خۆم لەم شارەدا بیانکوژم و دڵنیابە کەس ناوی تۆ ناهێنێ.

دوای ئەم قسانە منی ماچ کرد و رۆیشت، بەڵام من دوای چەند رۆژێ لە دووری کەنیزەکەم خەمباربووم، چونکە هەندێ شتم فێرکردبوو و لە زۆربەی کاتەکان بەتایبەتی کاتی هاتنی نەخۆشەکان یارمەتیدەری من بوو و هەرچەندە زۆرجار رێی لێ دەگرتم و زۆر بڵێییەکانی تووڕەی دەکردم، بەڵام هاودەمێتییەکەی خوشحاڵی دەکردم.

بەزوویی هەوا بەرەو گەرمی رۆیشت و کەوتینە نیوەی بەهار و گوڵەکان پشکووتن و پەڕەسێلکەکان کەوتنە فڕین و کەشتییەکان لە بەندەری ئەزمیر ئامادەی بەرێکەوتن بوون بۆ وڵاتانی تر کە لەوێوە بەندەو کەنیز و کەل و پەل بهێنن. لە نیوەی بەهاردا شاری ئەزمیر کەوتە جموجووڵ، چونکە جەژنی دەرهێنانی خوای تەمووز لە ژێرخاکەوە نزیک ببۆوە. قەشەکانی سووریا هەموو ساڵێ لە وەرزی پاییزدا خوای تەمووزیان بەخاک دەسپاردو لە نیوەی بەهار، لە رۆژێکی گەرمدا لە ژێرخاک دەریان دەهێنایەوە.

رۆژی دەرهێنانی پەیکەری خوای تەموز، رۆژی شادمانیی گشتی بوو و لەم رۆژەدا ژن و پیاو لەشار دەچوونە دەرەوە بۆ بیابانەکان و تا خۆرئاوابوون خەریکی خواردن و خواردنەوە و هەڵپەڕکێ و شادی دەبوون.

من لەو رۆژەدا چوومە بیابان بۆ ئەوەی بزانم خەڵکی چی دەکەن و بینیم قەشەکان پەیکەری خوای تەمووزیان لەژێر خاک هێنایە دەرەوە و خەڵکی کەوتنە

خۆشی و هەڵپەڕکێ و دەیانگوت : خوای تەمووز زیندوو بۆتەوە و ئەو خوای گەرمایە و هەروەک چۆن زەوی و هەوا گەرم دەکاتەوە گەرمیش دەداتە لەشی مرۆڤ و ئەم گەرمییە ئەو هێزە ژیان بەخشەیە کە ژن و پیاو دەخاتە کەیف خۆشی و شادی.

لەو کاتەی کە خوایەکەیان دەردەهێنا بینیم هەندێ لە ژنەکان گالیسکەیەکیان رادەکێشا و لەسەر گالیسکەکە بتی یەکێک لەئەندامەکانی لەشی پیاو، کە ناوهێنانی جوان نییە، دانرابوو کە ئەم بتەیان لەدار تاشیبوو.

من سەرم سوڕما کە مەبەستیان لەم کارە چییە، تا کاتێک کە لە ناکاودا ژن و پیاوەکان تێک رژان و بەبێ ئەوەی شەرم لە یەکتری بکەن لەگەڵ یەکتریدا جووت بوون و ئەم کردارە ئاژەڵانەیە هەتاوەکو شەو بەردەوام بوو.

وەحشێتی هەندێ لەگەل و هۆزەکان لە ئەم جۆرە ئاکارانەدا دەردەکەوێت ، چونکە لەمیسر کە گەلێکی شارستانی هەیە، لەم جۆرە رەفتارانە روونادات.

هەندێ لەپیرێژنەکان کە نەیانتوانیبوو کەس پەیا بکەن، لەپیاوەکان دەپاڕانەوە کە بێبەشیان نەکەن و لەبەر ئەوەی کە من وەک تەماشاچییەک لەوێ بووم، زیاتر داوایان لەمن دەکرد، بەڵام من بەنەفرەتەوە ئەو ژنە بەساڵاچووانەم لەخۆم دەوور دەخستەوە و پێم دەوتن: خوایەکان سنوورێکیان بۆ ژنان داناوە و کاتێک کە تەمەنی ئەو ژنە لەو قۆناغە تێپەڕی، ئیدی نابێت بیر لەوە بکەنەوە کە لەگەڵ پیاواندا رابوێرن.

چونکە ئەگەر خوایەکان بیانویستایە ژنەکانیش وەکو پیاوان تا کۆتایی تەمەنیان لەگەڵ جنسی تردا کۆببنەوە، سروشتیان سنووردار نەدەکرد.

***

١ – لەچوارهەزار ساڵ لەمەوبەر نەتەوەکانی دانیشتووی باکووری دەریای ناوەڕاست نیوە کێوی بوونە و میسرییەکان وایان زانیوە، زەلام خۆرن – وەرگێڕ .



٢ – دەریا بەردەوام شەپۆلی هەیە و کەشتی تەکان دەدات و تەکانی کەشتی دوو جووڵە دروست دەکات، یەکێکیان لە راستەوە بۆ چەپ و بە پێچەوانەوەو، ئەوی تریشیان لە پێشەوە بۆ دواوە و بە پێچەوانەوە ، ئەم دوو جووڵەیە دەبێتە هۆی رشانەوەی بەردەوامی گەشتیاران و بێ تاقەت دەبن و من خۆم (وەرگێڕی فارسی) دووجار لەسەفەری دەریایی تووشی ئەم رووداوە بوومە کە نەخۆشی دەریای پێ دەڵێن. بەڵام هەرئەوەندە کە کەشتییەکە گەیشتە کەنار یان بەندەر (کە شەپۆلی تێدانییە) هەموو نیشانەکانی نەخۆشییەکە دەڕەوێنەوەو رێبواران هەست بەسەلامەتی دەکەن. لە فڕۆکەکانی ئەمڕۆش لەکاتی بای بەهێز جووڵە دروست دەبێت و ئەوانەی جاری یەکەم و دووەمیانە بە فڕۆکە سەفەر دەکەن تووشی ئەم رووداوە دەبن کە بیماری دەریای ناوەو کەشتیوانەکەی سینۆهە لەهەڵەدابوو کە دەیگوت هۆیەکەی زۆرخۆرییە ، چونکە ئەوەی خواردنیش نەخوات لەوانەیە تووش بێ ، بەڵام کاتی رشانەوە زەرداو لە دەمیان دێتەدەرێ و ، لە ناو کەشتییە گەورەکاندا کە دیواری تێدایە و درێژی دیواری قەدی کەشتییەکە ٣٠٠ مەترە گەشتیار تووشی نەخۆشی دەریا نابێ چونکە یەکێک لە دوو جووڵەکان دروست نابێت کە پێش و پاشەکەیە، بەڵام جووڵەی تر کە راست بۆ چەپ و بە پێچەوانەوەیە دروست دەبێت و بە یەکێک لەو جووڵانە ئەم نەخۆشییە دروست نابێت – وەرگێڕ .

## بەشی یانزدەهەم

# (هورم هەب) ئاشنای رابردوو

لە دوای ئەم جەژنە لە مەرزی سووریاوە هەواڵ گەیشت کە هۆزەکانی خەبیری دیسـانەوە هێـرشیـان کـردۆتەوە. هێـرش بردنی ئەم هۆزانە شـتـێکی تازە نەبوو، چونکە هەمـوو کـاتێ بە گەیشـتنی وەرزی بەهار دەسـتیـان بەدەسـتدرێژی دەکـرد بەڵام لەو ساڵەدا توند و تیژییان زیاتر بوو و دەگەیشتنە هەرشوێنێک سەربازانی سـەربازگـەی مـیـسـرییـان دەکـوشت و، لە هەندێک شـوێن تەنانەت سـەرۆکی ناوچەکـەشیـان دەکوشت. لە شارێکی بچـووکدا پاشا و تەواوی دانیـشـتـووانی تەنانەت ژن و منداڵیشیـان دەکوشت. ئەم هەواڵە کاتێ گـەیشـتـە فیـرعـەون بۆ بەرەنگاربـوونەوەی هۆزەکانی خەبیری لەشکرێکی لە میسرەوە نـاردە سووریاو، من زانیم کە لە نێوان لەشکری میسر و هۆزەکانی خەبیریدا شەڕێکی خوێناوی روودەدات. من لە هیچ کـاتێکدا مـەیدانی شـەڕم نەدیبـوو و لە بارودۆخی برینداراەکانی مەیدانی شەڕ زانیاریم نەبوو و نەمدەزانی گورز و شمشێر و نەیزە چ برینێک لە لەشـدا دروست دەکـات و پێـویسـتی لێکۆڵینەوە لە بـارودۆخی بریندارەکـانی جـەنگ هانی دام کـە ئەو گـۆڕەپانە ببـینم و هەرلەبەر ئەوەش لە ئەزمیر بەرێکەوتم و لە شارێکی بچووک بەناوی (ئورشەلیم) گەیشتمە لەشکری مـیـسـر، کـەلە پەراوێزگـەی نیلەوە هاتبـوون. ئەم لەشکرە بە پێـچـەوانەی ناوبانگەکەیەوە زۆر بەهێـزیش نەبوو و پێکهـاتبـوون لە دەسـتـەیەک گـالیـسکەی جەنگی و دوو هەزار تیرهاوێژ و نەیزەدار. ئەو رۆژەی چوومە کومەڵگاکە ویستم فەرماندەی لەشکرەکە ببینم و پرسیم: فەرماندەی ئەم لەشکرە کێیە، بۆ ئەوەی رووخسەتی لێ وەربگرم کە لە مەیدانی جەنگدا پزیشکی و برین پێچی بکەم.



پێیـان وتم: فـەرمـاندەی ئەم هێـزە پیـاوێکی گەنجی جوانە کە ناوی (هورم هەب)ـە من داوام لێکردن ببەنە جێگاکەی ئەو کە لە دوورەوە سەرنجم دا هەستم کـرد لەلام نامـۆ نییـەو کـاتێک کـە نزیکی کـەوتمەوە بیـرم هاتـەوە (هورم هەب)ە کوڕە گەنجـەکەیە کە ئەو رۆژەی من لەگـەڵ جێنشینی میسر چوومە بیابان ئەو لەکاتی خۆرهەڵاتن بەخۆی و هەڵۆیەکەی دەرکەوتن، دوایی چووە ریزی لەشکری جێنشین، واتە فیرعەونی نوێی میسر.

(هورم هەب) منی ناسـیـیـەوەو وتی: ئای... (سینۆهە).. تۆ چی دەکـەی لێـرە؟ لەمـیـسـر خەڵکی هەمـوو دەڵێن تۆ مـردوویت و دەڵێن نەفرەتی دایک و باوکت کە گۆڕەکەیانت فرۆشتبوو تۆی لەناوبردووە.

دوایی بەسـەرهـاتی منی پرسی و منیش تـا ئەو شـوێنەی پێم کـرا بۆم روون کردەوە و وتم: من بووم بە بەڵاوگێڕی ژنێک کە ناوی (نەفر نەفر نەفر) بوو.

(هورم هەب) وتی: منیش لەگـەڵ ئەو ژنەدا خـەوتم، دەیـویست هەرچییـەکم هەیە لێمی بستێنێ، بەڵام من بە پێچەوانەی تۆوە خانوو و گۆڕی دایک و باوکم پێ نەفرۆشت و، بەڵکو بەم قامچییەی لە دەستم دایە دارکارییەکی باشم کرد. (سـینۆهە) دەبێ پێت بڵـێم کە ژن تا ئەو کـاتە شایانی رێزە، کـە نەبووبێ بە تیـمـسـاح و، هەرکـاتێ لە چاوچنۆکیـدا وەک تیـمـسـاحی لێ هات دەبێ وەکـو سووکترین بەندەکان رەفتاری لەگەڵدا بکەیت.

دوایی من لـە بارودۆخی مـیـسـر و تەبەس پرسـیـارم لێ کـرد و (هورم هەب) وتی نازانم گەلی میسر چ گوناحێکیان هەیە کە خوایەکان گرفتاری پاشایەتی ئەم فیرعەونەیان کردووە، چونکە ئەم فیرعـەونە بێ عەقڵ و شێتە. ئەو خوایـەش کە فـیـرعـەون رێنومـایی لێ وەردەگـرێ وەک خـۆی شـێـتـە و هەندێ شت دەڵـێ کـە شێتەکانیش نایڵێن. ئایا بیرت ماوە کاتێ کە ئەم فیرعەونە بوو بە پاشا هەموو بەندەکـان کـەلە کـانگـەکـاندا کـاریان دەکـرد ئەو ئازادی کـردن؟ ئایا بیـسـتت یان بینیت کـە ئازادیی بەندەکـان چ ئاژاوەیەکی نایەوە و بە چ شـێـوەیەک بۆ دابین

كردنى ئاسايش له تەبەس ناچار بووين بيانكوژين؟

وتم: بەڵێ .. كاتێ كە بەندەكانيان ئازاد كرد، من لە تەبەس بووم و بينيم چۆن هەڵمەتيان برد بۆ شارى مردووەكان و هەموو شتێكيان تالاّن كرد.

(هورم هەب) وتى: لەگەڵ ئەوەشدا كە فيرعەون بينيبى ئازادكردنى ئەو بەندانەى لە كانگەكاندا كاريان دەكرد چ ئاشووبێكى نايەوە، بەلاّم هێشتا لە قسەو بڕيارەكانى خۆى پاشگەز نەبۆتەوەو دەڵێ لە نێوان بەندەيەك و شازادەيەكدا هيچ جياوازييەك نييە و بەندەكان و گەورەكان لەلاى خواى ئەو يەكسانن و نابێت ئەوان ناچار بكرێن لە كانگەكاندا كاربكەن. من دڵنيام كاتێ كە فيرعەونەكانى پێشووى ميسر كە لە قووچەكەكاندان ئەم قسانە دەبيستن دێنە لەرزە، چونكە لە سەرەتاى جيهان تاوەكو ئەمڕۆ هيچ پاشايەك نەبووە كە بڵێ لە نێوان بەندە و شازادەدا جياوازى نييە و ئەمە وەك ئەوە وايە كە بڵێين لە نێوان عارەق و هەنگوين جياوازى نييە. يەكێك لە قسە سەيرەكانى ئەم فيرعەونە ئەوەيە كە بە منى دەوت هۆزەكانى خەبيرى بە شێوەيەك دابمركێنەوە كە خوێنى تێدا نەڕژێ. ئايا بەبێ خوێن ڕشتن دڕەندەكان ماڵى دەبن؟ (سينۆهە) تۆ كە پزيشكى، ئايا دەتوانى بەبێ ڕژانى خوێن سكى يەكێك هەڵبدڕى و ريخۆڵە زيادەكەى تێدا دەربكەى بۆئەوەى نەبێتە هۆى مردنى نەخۆشەكەت؟ فيرعەون دەنگى شەڕى ئەم هۆزانەى نەبيستووە و نازانێ كە لە دەنگى دڕندەكان ترسناكترە هەتا تێ بگات كە لەگەڵ ئەمانەدا ناتوانرێ بە هێمنى ڕەفتار بكرێت.

دواى ئەم قسەيە (هورم هەب) پێكەنى و وتى: بەلاّم من گوێ نادەمە وتەى فيرعەون و بە شێوەيەك خوێنيان دەڕژێنم كە هەموويان پەشيمان ببنەوە كە بۆچى لەدايك بوونە. من وام بڕيارداوە كە بە جورێك ڕەگى ئەم هۆزانە بسووتێنم كە لە داهاتوودا هەرگيز نەتوانن لە وەرزى بەهاردا هەڵمەت ببەن. بەلاّم، (سينۆهە) تۆ هەقت بەگەردنى منەوە هەيە، چونكە من لە بيرى ناكەم ئەو ڕۆژەى لەگەڵ جێنشين لە بيابان گەڕاينەوەو ويستيان من بكوژن تۆ هەندێ قسەت كرد و



نەتهێشت ئەم كارە بكەن و لەو ڕۆژەدا تۆ بە ژيريى خۆت گيانى منت كڕييەوە.

لەبەرئەوە ئێستا من لە لەشكرەكەى خۆمدا ڕێز لە تۆ دەگرم و رووخسەتت دەدەم كەلە جەنگدا ئامادە ببى و سەربازەكان چارەسەر بكەى و دەستهەقى تۆش لە گيرفانى فيرعەون دەدەم و هەركاتێ كە من بێ ئيش بووم تۆ لەگەڵ مندا دەبيت و نان خواردنمان بەيەكەوە دەبێت.

لەو كاتەدا (هورم هەب) جامى شەرابى نۆشييەوە و وتى: كاتێ هەواڵى هێرشى خەبيرييەكان گەيشتە تەبەس فيرعەون ويستى لەشكرێك بنێرێتە سووريا، هيچ يەكێك لەو سەردارانەى لە تەبەس بوون ئامادە نەبوون فەرماندەيى ئەم هێزە بگرنە ئەستۆى خۆيان، چونكە دەيانزانى هۆزەكانى خەبيرى خەڵكێكى خوێنمژ و شەڕكەرن و، هەريەكەيان بە بەهانەيەك لەو فەرمانە خۆيان بەدوورگرت. لەبەر ئەوەى جگەلەوەى ترسى كوژرانيان هەبوو دەشيانزانى كە لە زێڕ و مس و كانزاكانيان دووردەكەونەوە، چونكە لە بيابانەكانى سووريادا زێڕ و پارە نييە، بەلاّم لە دەوروبەرى فيرعەوندا ئەو شتانە بەدى دەكرێت، بۆيە من لەگەڵ ئەوەشدا كە لە هەموو سەردارەكانى فيرعەون گەنجتر بووم، ئەم ئەركەم گرتە ئەستۆى خۆم بۆئەوەى مەترسيى خەبيرييەكان لە ناو ببەم و كارێك بكەم كە ئيتر نەتوانن هێرش ببەنە سەر سووريا. سەردارەكانى فيرعەون كە زۆر زەنگينن، لەگەڵ كاهينەكاندا هاودەست بوونە و هەوڵدەدەن دەسەلاّتى خوايەكەيان (ئاموون) لە ناو نەچێت. ئەمڕۆ لە ميسردا لە نێوان خواى فيرعەون، واتە (ئاتوون) و خواى كۆنى ميسر (ئاموون) ركەبەرايەتييەكى زۆر هەيە و هێشتا ديار نييە كە كاميان سەردەكەوێ. هەروەكو من تێى گەيشتووم، (ئامى) دادوەرى گەورەى ميسر كە كاهينى خوا (ئاتوون)ـە بەتەمايە (ئاموون) لەميسردا لە ناو ببات و لەم كارەيدا فيرعەون پاڵپشتى لێ دەكات. فيرعەون دەزانێت كە خوا (ئاموون) لە ميسردا بەڕادەيەك بەهێزبووە كە كاهينەكانى (ئاموون) گوێ ڕايەڵيى فەرمانى فيرعەون ناكەن و لە هەر كاتێكدا كە

فـەرمـانەکـەی فـیـرعـەون دژی بەرژەوەندی ئەوان بێت فـەرمـانێک بەناوی (ئاموون)ەوە دەردەکەن کە فەرمانەکەی فیرعەون هەڵبوەشێنێتەوە.

فیرعەون و دادوەری گەورە کە ناتوانن لەمە زیاتر لە ژێر فەرمانڕەوایی خوای (ئاموون) و کاهینەکانی ئارام بگرن، هەوڵ دەدەن کە خوا (ئاتوون) بەڕادەیەک گەورەبکەنەوە کە (ئاموون) لە ناو بچێت و لەبەر ئەوەش فەرمانیان بەمن داوە کە لەم سەفەرەمدا گەیشتمە هەر شارێک، پەرستگەیەک بۆ خوای (ئاتوون) دروست بکەم و من یەکەم پەرستگەم لەم شاری ئورشەلیمەدا دروست دەکەم. من نە باوەڕم بە (ئاموون)ە و نە بە (ئاتوون)، بەڵام وابیردەکەمەوە کە فیرعەون لەم بەشەدا هەڵە ناکات و رامیارییەکەی راستە، چونکە لەگەڵ ژێریدا ناگونجێ فیرعەون پاشای میسر بێت و کاهینەکانی (ئاموون) لە جیاتی ئەو فەرمانڕەوایی بکەن. مەبەستم ئەوەیە کە سەردارەکانی میسر لەو رووەوە کە لەگەڵ کاهینەکانی ئاموون دەستیان تێکەڵ کردووە و ئێستا بەرژەوەندییەکانیان لە مەترسی دەبینن نایانەوێت لەم کاتە ناسکەدا لە میسر دوور بکەونەوە و بەرگری لە سوودە تایبەتییەکانیان نەکەن. ئەگەر ئەوان لە گۆڕانکاریی سیاسی لە میسردا مەترسییان نەبووایە لەوەیە یەکێکیان فەرماندەیی ئەم هێزەی بخستایەتە ئەستۆ و لە میسر دەربچووایە و بەرەو سووریا بهاتایە.

وتم: من دژی سیاسەتەکەی فیرعەون نیم و بگرە مافیشی پێ دەدەم کە بیەوێت لە هێزی کاهینەکانی ئاموون کەم بکاتەوە، ئەو شتەی لەگەڵ باوەڕی مندا یەک ناگرێت ئەوەیە کە فیرعەون دەڵێت حەز دەکەم راستەقینە (حەقیقەت) فەرمانڕەوا بێت، من لەم بابەتە مەترسیم هەیە، چونکە (حەقیقەت) وەک شمشێرێکی تیژ وایە کە هەرگیز نابێت بیدەیتە دەست منداڵێک، جا نەخوازە بیدەی بەدەستی پیاوێکی شێتی وەک فیرعەون.

کاتێ کە شەو داهات لە یەکێک لە خێمەکان، نزیک خێمەی (هورم هەب) پشووم داو سەربازەکان کاتێ کە زانییان من پزیشکم هەوڵیان دەدا بینە هاوڕێم،



لەبەرئەوەی هەموو سەربازێ حەز دەکات کە دۆستایەتیی پزیشکێک بۆلای خۆی رابکێشێ بۆئەوەی لەکاتی برینداریدا چارەسەری برینەکەی بکات.

سبەینێی رۆژی دواتر نەفیرەکان دەنگیان بەرز بووەوە و سەربازەکانی لەخەو هەڵستاند و هەر سەر دەستەیەک بەرامبەر بەشەکەی خۆی راوەستا. کاتێ ریزی سەربازەکان رێکخرا، (هورم هەب) کە قامچییەکەی بەدەستەوە بوو لە خێمەکەی خۆی هاتە دەرەوە و بەندەیەک چەترێکی بەبان سەریەوە راگرتبوو و بەندەیەکی تر باوەشێنی دەکرد کە مێشەکانی لێ دوور بکاتەوە.

(هورم هەب) بەرامبەر بە سەربازەکان بەم شێوەیە دوا:

(ئەی سەربازانی میسر کە لە نێوانتاندا، رەش پێستە پیس و پۆخڵەکان و نەیزەدارە تەوەزەلەکانیش هەن و هەمووتان هەر لەشکری میسرن و وەک گایەک دەبۆڕێنن.. من ئەمڕۆ دەمەوێت بتانبەم بۆ مەیدانی جەنگ، بۆئەوەی ببینم لەگەڵ خەبیرییەکاندا شەڕتان پێ دەکرێت یان نا.. ئەگەریش توانای شەڕکردن لەگەڵ ئەوانتان نەبێت هیوادارم تا دوایین کەستان بکوژرێن بۆئەوەی ناچارنەبم لەش و لارە ناقۆڵاکانتان لەگەڵ خۆمدا ببەمەوە بۆ میسر و بە تەنها خۆم بڕۆم و لەگەڵ دەستەیەک لە سەربازانی راستەقینە بگەڕێمەوە...) (هۆو... تۆ، سەرپەلی لووت قلێشاو، شەقێکی قایم لەو سەربازە نەفامە بدە بۆ ئەوەی لەکاتێ کە من قسە دەکەم با دواوەی خۆی نەخورێنێ و لەمەوبەدوا لە کاتی ئاخاوتنی مندا خەریکی خۆخوراندن نەبێت...) (ئەمڕۆ لە کاتێکدا کە هێرش دەکەینە سەر خەبیرییەکان، من لە پێشەوەی هەمووتان دەبم و لەگەڵ ئێوە لەگەڵیاندا دەجەنگم و ئاگام لە هەر هەمووتان دەبێت، بۆئەوەی بزانم چ کەسێ لە مەیدانی شەڕدا پاشەکشێ دەکات، یان بە باشی شەڕ ناکات.) (دڵنیاتان دەکەمەوە کە ئەمشەو لەم قامچییەی من خوێن دەتکێتەوە و ئەم خوێنە لە لەشی ئەو کەسانە دێتە دەرەوە کە لە گۆڕەپانی شەڕدا بەباشی ناجەنگن و دڵنیابن قامچییەکەی من لە نەیزەی خەبیرییەکان ترسناکترە، چونکە نەیزەی ئەوان پەیکانی مسی پێوەیە و

زوو دەشکێت.) (خەبیرییەکان لە پشت ئەم چیایەوەن کە دەیبینن و ئەمشەو پێ سپێردراوەکانی پشکنینی من ڕۆیشتن کە بزانن ژمارەیان چەندە، بەڵام ترسان و هەڵهاتن و نەیانتوانی ژمارەیان بە دروستی بزانن...) (خەبیرییەکان تەنها یەک شتی ترسناکیان هەیە، ئەویش دەنگیانە، بەڵام ئەگەر لە دەنگیان دەترسن هەویری گڵی سوور بکەنە گوێتانەوە بۆ ئەوەی دەنگیان نەبیستن، بەڵام لە بەرئەوەی ئەم هەویرە دەبێتە هۆی ئەوەی گوێتان لە دەنگی فەرماندەکانتان نەبێت، هەرواباشترە کە واز لەمەش بهێنن.) (وای بۆ ئەو کەسەی کە لە خۆڕاییی و بێ نیشان گرتن تیرهاوێژی بکات...) (لەشەڕدا سەرکەوتن تەنها ئەوە نییە کە سەرباز دلێر بێت، بەڵکو ئەوەشە کە سەربازەکان وەک ئەوەی یەک جەستەبن گوێڕایەڵی فەرمانی بەرپرسەکانیان بن) (ئەگەر ئێوە ئەمڕۆ سەرکەوتن، دەبنە خاوەنی هەموو ماڵ و سامان و مانگاو مەڕی خەبیرییەکان و من نە حەڵقەیەکی زێڕ و زیوم دەوێت و نە مانگاو مەڕوماڵاتیان) (خەبیرییەکان لەم کاتەدا زۆر دەوڵەمەندن، چونکە شار و گوندێکی زۆریان تاڵان کردووە و ئەگەر سەربکەون هەموو سامانی ئەوان بەر ئێوە دەکەوێت..) (هەروەها ئەگەر سەرکەوتوون هەموو ئەندامانی خێزانەکەشیان دەبنە موڵکی ئێوە و دەتوانن دواتر بیانفرۆشن. بەڵام ئەگەر تێک بشکێن قامچییە خوێن مژەکەی من ئەمشەو میوانداریتان لێ دەکات).

سەربازەکان کاتێ ئەم قسانەیان بیست شمشێرو نەیزەکانیان ئەدا بە قەڵغانەکانیاندا و کەوانەکانیان بەرزدەکردەوە و هورە بەرزییان دەنواند.

(هورم هەب) وتی: دەبینم مەیلی ئەوەتان هەیە هەرچی زووتر لەگەڵ خەبیرییەکاندا بجەنگن، بەڵام ئێمە بەرلەوەی بۆ شەڕ بچین دەبێت لێرە پەرستگەیەک بۆ خوای فیرعەون دروست بکەین. خوای فیرعەون کە ناوی (ئاتوون)ە خوایەکی جەنگی نییە و بە کەڵکی ئێوە نایەت، چونکە یارمەتیتان نادات و لەبەر ئەوە پێویست ناکات بۆ مەراسیمی بیناکردنی ئەم پەرستگەیە



هەمووتان لێرەبن و تەنها پاشڕەوەکانی لەشکر لێرە دەمێننەوە و ئەوانی تر ئێستا دەبێ بەڕێ بکەون. ئێوە ئەمڕۆ دەبێت ڕێگا ببڕن هەتاکو دەگەنە هۆزەکانی خەبیری، بەڵام پێویستە بزانن کاتێک کە ماندوون دەبێ لە گەڵیاندا نەبەرد بکەن، بۆئەوەی کەستان دەرفەتی خۆ قوتارکردنی نەبێت.

دوایی (هورم هەب) قامچییەکەی ڕاتەکاند و سەربازەکان کەوتنەڕێ و هەر دەستەیەک لە دواوەی نیشانەکانی خۆیان دەڕۆیشتن. نیشانەی هەندێ لە دەستەکان کلکی شێربوو و دەستەکانی تر بە دوای سەری تیمساحەوە دەڕۆیشتن. لە پێش و پاشی سەربازەکان، گالیسکە جەنگییەکان دەڕۆیشتن بۆئەوەی ببێت بە قەڵغانی سەربازەکان و نەهێڵێ بەرشالاوی لە ناکاوی دوژمن بکەون.

کاتێ کە سەربازەکان ڕۆیشتن، پاشڕەوەکانی لەشکر لەگەڵ (هورم هەب) و هەندێ لە بەرپرسەکان بەرەو ئەو جێگایەی پەرستگەی (ئاتوون)یان لێ دروست کردبوو بەڕێ کەوتن و منیش لەگەڵیاندا بەڕێ کەوتم و گوێم لێ بوو لێپرسراوەکان بەیەکەوە گفتوگۆیان دەکرد و دەیانگوت: ئەم شێوەی جەنگە نوێیەی ئەمڕۆ (هورم هەب) دایڕشت لەگەڵ ژیری ناگونجێ، چونکە ئەوەندەی ئێمە بزانین لەکاتی جەنگدا گەورە لێپرسراوەکانی لەشکر دەبێت لە دواوەی سوپادا جێگیربن و لە کەژاوەکاندا چاودێری سەربازەکانیان بکەن کە هەڵنەیەن، بەڵام ئێستا (هورم هەب) دەڵێت خۆم لە پێشەوەی سەربازەکان لەگەڵ دوژمندا دەجەنگم و ئێمەش دەبێ چاو لەو بکەین و بچینە پێشەوە، جا بەم شێوەیە چ کەسێ پێش لە هەڵهاتنی سەربازەکان دەگرێت و کێ کردەوەکانیان تۆمار دەکات؟ خۆ سەربازەکان خۆیان خوێندەوارییان نییە کە هەڵسوکەوتی هاوڕێکانی خۆیان بنووسن و تەنها پلەدارەکان خاوەن نووسینن و دەتوانن بنووسن کە کام سەرباز ئازایەتیی زیاتری نواندووە و کامیان ترسنۆک بووە یان ڕای کردووە.

(هورم هەب) کە لە پێشەوە دەڕۆیشت ئەم دەربڕینانەی گوێ لێ بوو و هەندێ جار قامچییەکەی دەجووڵاندەوە و بزەیەکی دەهات، تا کاتێ کە گەیشتینە

پەرستگەکە.

بەشی دوانزدەهەم

# خوایەکی نائاسایی (بۆ میسرییەکان)

پەرستگەکە بچووک بوو و، بەبۆنەی نەبوونی ماوە نەپەرژان سەقفی بۆ دروست بکەن و هەندێ دار و (گڵی سوور)یان بۆ دروستکردنی بیناکە بەکارهێنا. کاتێ گەیشتینە بەردەم پەرستگەکە و چووینە ژوورەوە بینیمان پەیکەری خوایەکی تێدانییە. سەربازەکانی پاشڕەو زیاتر لە ئێمە لە نەبینینی خوا سەریان سوڕما و بە یەکتریان دەگوت: ئەمە چ پەرستگەیەکە، کە خوای نییە؟ منیش وەک سەربازەکان پێم سەیربوو، چونکە تا ئەو ڕۆژە پەرستگەی بێ خوام نەدیبوو و هەموو جارێ کە دەچوومە ئەو شوێنانە بتی خوایەکەم دەدی.

(هورم هەب) کە هەستی بە سەرسوڕمانی هەمووان کرد، وتی: ئەو خوایەی کە فیرعەونی ئێمە دەیپەرستێ خوایەکی سەیرە کە من ناتوانم پێتانی بناسێنم، چونکە خۆشم نازانم کە ئەم خوایە چۆنە. ئەم خوایە سەرسوڕهێنەرە نەچاوی هەیە و نە دەم و نەسک و نە دەست و پێ و نە دەخوات و، شەراب و بیرەش نانۆشێتەوەو فیرعەون دەڵێت خوای ئەو وەک مرۆڤ نییە و نابینرێت، بەڵام ئەگەر ئێوە دەتانەوێت بیناسن دەتوانن شتێکی بازنەیی وەک خۆر بهێننە بەرچاوی خوتان.

سەربازەکان سووڕانەوە و سەیرێکی خۆریان کرد و بەناڕەزاییەکەوە کەوتنە ورتە ورت و ئاگام لێ بوو دەیانگوت: فیرعەون شێت بووە، چونکە ئەگەر یەکێک تووشی شێتی نەبووبێ خوای بێ چاو و دەم و سک و دەست و پێ ناپەرستێ.



(هورم هەب)یش وەک سەربازەکانی بیری دەکردەوە و فیرعەونی بە شێت دەزانی. دوایی کاهینێکی گەنج کە قژی سەری نەتاشیبوو و سوخمەیەکی کەتانی لەبەردا بوو هات و گۆزەیەک شەراب و دەفرێ ڕۆنی زەیتوون و چەپکێ گیای تازەی بەهاریی خستە پەرستگەکەوە و دوایی دەستی بە خوێندنی سروود کرد. دەیانگوت: ئەو سرووده خودی فیرعەون بۆ خوایەکی خۆی هۆنیویەتییەوەو ئێمە لەو سرووده هیچ تێنەگەیشتین و دیارە سەربازەکانیش کە نەخوێندەواربوون هەر تێنەدەگەیشتن. لەم سروودەدا باسی ئەوەی دەکرد کە (ئاتوون) خوایەکە کە نابینرێ، بەڵام لە هەموو شوێنێکدا هەیە و بە ڕووناکی و گەرمیی خۆی زەوی ڕووناک و گەرم دەکات و هەموو خۆشییەکان و خەڵاتەکانی سەرزەوی و ڕووباری نیل هی ئەون.

هەروەها وتی: ئەگەر ئاتوون نەبێت شێر ناتوانێت لە شەودا ڕاوبکات و مار لە کون و جوجک لە هێلکە نایەتە دەرەوە و ئەگەر ئاتوون نەبێت خۆشەویستی نایەتە کایەوەو هیچ پیاوێک ناتوانێ ژنێ بکاتە هاوسەری خۆی و هیچ منداڵێ لە سکی دایکی هەنگاو نانێتە سەر زەوی[1].

کاهینە گەنجەکە لە دوای ئەم وتانە وتی: پاشای میسر کوڕی خوایە و وەک باوکی بە دەسەڵاتە و لە وڵاتی میسر و وڵاتەکانی تر کە لە لایەن میسرەوە بەڕێوە دەبردرێ و پشتگیریی لێ دەکرێ فەرمانڕەوایی دەکات.

کاتێ کە سەربازەکان ئەم وتەیەیان بیست شمشێر و نەیزەکانیان کوتا بە قەڵغانەکانیان و بەم شێوەیە شادیی خۆیان دەربڕی، چونکە ئەوان تەنها لەم بەشە بەباشی تێگەیشتبوون، لەبەرئەوەی دەیانزانی گومانی تێدانییە کە فیرعەونی میسر کوڕی خوایە، چونکە بەردەوام وابووە و لە داهاتووشدا پاشای میسر کوڕی خوا دەبێت.

بەم شێوەیە مەراسیمی کردنەوەی پەرستگە کۆتایی پێهات و دوایی ئێمە بەڕێ کەوتین. مەبەستم لە ئێمە، پاشڕەوەکانی سوپا و پلەدارەکانە کە بە

فەرماندەیی (هورم هەب) بەڕێ کەوتین.

(هورم هەب) بە سواری گالیسکە جەنگییەکەی خۆی لە پێشەوەی هێزەکەدا دەڕۆیشت و لەدوایەوە هەندێ لە بەرپرسەکان و دواتر سەربازەکان و لە دوای ئەوانیشەوە هەندێکی تر لە کەژاوەدابوون. بەڵام من سواری گوێدرێژێک بووم و سندووقی داو و دەرمان و کەرستەکانی نوژداریشم لەگەڵ خۆمدا هەڵگرتبوو.

ئێمە تا کاتێ کە سێبەرەکان درێژ بوونەوە ڕێگامان بڕی و تەنها لە ناوەڕاستی ڕۆژدا کەمی ڕاوەستاین بۆ نان خواردن و، پاقلەی زەردکراومان خوارد کە ڕۆنی زەیتوونیان پێدا کردبوو. هەندێ جار چەند سەربازێکی ماندوو یان پەککەوتە دوادەکەوتن و لە قەراغی ڕێگاکە دادەنیشتن و لەوکاتەدا بەرپرسەکان کە لە دواوە دەهاتن بە قامچی دەکەوتنە گیانیان.

جارێکیان بینیم گالیسکەی جەنگی یەکێک لە لێپرسراوەکان لە بەردەم سەربازێکی ماندوو ڕاوەستا، کە لە قەراغ ڕێگادا لەسەر پشت ڕاکشابوو و ئەو بەرپرسە لە گالیسکەکەی خۆیەوە بەهەردوو پێی بازی دایە سەر سکی سەربازەکە، بەشێوەیک کە لەدوای ئەم بازدانە بەهێزە سەربازەکە یەکسەر گیانی سپارد، بەڵام کەس ڕەخنەی لێ نەگرت، لەبەرئەوەی ئەو سەربازەی کە بۆ شەڕکردنی مەیدانی جەنگ بەکرێ دەگیردرێ نابێ تەمبەڵی بکات.

کاتێ سێبەرەکان درێژ بوونەوە گەیشتینە هەندێ گرد، کە سەرەتای هەرێمێکی شاخاوی بوو و لە ناکاودا بارانی تیر بەسەر سەربازەکاندا باری و دەرکەوت کە هەندێ لە خەبیرییەکان لە پشت گردەکانەوە بۆسەیان بۆ سەربازەکانی ئێمە دانابوو. لەبەر ئەو تیربارانە ئەو سەربازانەی خەریکی گۆرانی وتن بوون، وسکت بوون، بەڵام (هورم هەب) بایەخی بەو تیربارانە نەدەدا لەبەرئەوەی ئێمە بەبەشی گرنگی سوپاکەوە لکابووین و سەربازەکانی پێشەوە و پاشڕەوەکان و ناوەندی لەشکرەکە بەیەکەوە بوون.

(هورم هەب) فەرمانی دا سەربازەکان خێراتر بڕۆن و لەوێ دووربکەونەوە



بۆئەوەی بتوانن هەڵمەت ببەنەسەر بەشی گرنگی هێزی خەبیری و کات و وزەکەیان بە دەستەویەخەبوونی تیرهاوێژەکانی قەراغ ڕێگا بەفیڕۆ نەچێت.

گالیسکە جەنگییەکانی ئێمە بەیەک هەڵمەت تیرهاوێژەکانی لە قەراغ ڕێگا دوورخستەوە و ئێمە بەردەوام بووین لە بەرەوپێش چوون. لە تەنیشت منەوە بەرپرسێکی لێ بوو کە سواری گوێ درێژێک بوو و لێپرسراوی ئازووقەی سوپا بوو و لەبەرئەوەی لە بەیانییەوە تا ئێوارە لە تەنیشت یەکەوە ڕێگامان دەبڕی لەگەڵیدا ببوومە هاوڕێ و داوای لە من کرد کە ئەگەر کوژرا من هەوڵ بدەم لاشەکەی لە ناونەچێت و تەرمەکەی بگەیەنمە کەس و کارەکەی کە مۆمیایی بکەن.

ئەو دەیگوت: خەبیرییەکان خەڵکانێکی ئازاو بێ بەزەیین و تا کاتی تاریک بوونی هەوا هەمووما ن دەکوژن. هێشتا یەک لەسەر چواری ڕۆژ مابوو کە دەشتێکی فراوان لە ناوەڕاستی گردەکانەوە دەرکەوت و دیاربوو کە ئەوێ خێوەتگەی خەبیرییەکانە و تا چاو بڕی دەکرد خێمەی ڕەشی یەک لە دوای یەکی لێ هەڵدرابوو. لەبەردەم خێمەکاندا خەبیرییەکان بە قەڵغان و نەیزەی بریقەدارەوە هاواریان دەکرد بە شێوەیەک کە نەعرەیان لە بیاباندا دەنگی دەدایەوە و مەترسی دەخستە ناو دڵەوە.

(هورم هەب) سەربازەکانی خۆی ڕێک خست و ڕمدارەکانی کردە ناوەڕاستەوە و تیرهاوێژەکانی لە هەردوولای لەشکرەکەیدا جێگیر کردو دوایی فەرمانی بە گالیسکە جەنگییەکان دا کە لەگەڵ فەرمانی من هەڵمەت ببەن و ئێمە لە دوای ئێوەوە دەگەینە سەریان. چەند گالیسکەیەکی قورسیشی لەگەڵ خۆی هێشتەوە و پێی وتن: بەردەوام لەگەڵم بن و لێم دوور نەکەونەوە.

(هورم هەب) چونکە تێگەیشت سەربازەکانی لە هات و هاواری خەبیرییەکان و بریقەی قەڵغان و نەیزەکانیان ترساون، هاواری کرد: ئەی پیاوانی میسر و سووریا ئێوە ئەی ڕەش پێستەکان ئەی سوپای میسر.. ترستان لە دەنگی

هاواریان نەبێت چونکە هەر چەندە دەنگیان زل بێت هەر بایەکە و ناتوانێ زیانتان پی بگەیەنێت و بزانن کە ژمارەی سەربازەکانی ئەوان زۆر نییە.. ئەم خێوەتانەی دەیبینن جێگای ژن و منداڵەکانیانە و ئەو دووکەڵانە نیشانەی ئەوەیە چێشت لێ دەنێن و ئەگەر ئێوە ئازایەتی بنوێنن ئەمشەو چێشتەکەیان دەخۆن و ژنەکانیان دەبێتە هی ئێوە، منیش وەک تیمساحێکی برسی وام و حەزدەکەم شەڕ هەرچی زووتر بەسەرکەوتنی ئێمە کۆتایی پێ بێت کە بتوانم شیو بخۆم.

بەرلەوەی (هورم هەب) فەرمانی هێرش بردن بدات سەربازە خەبیرییەکان بە دەنگێکی گوێ کەرکەرەوە هێرشیان کردە سەرمان و من بینیم کە ژمارەی سەربازەکانیان لە سەربازەکانی ئێمە زیاترە. کاتێ کە رمدارەکانی ئێمە ئەو سەربازە ترسناکانەیان دی کە نزیک دەکەونەوە سەیرێکی دواوەیان کرد و منیش وەک ئەوان ئاوڕێکم بۆ دوای خۆمەوە دایەوە کە بزانم لە چ رێگایەکەوە دەکرێ پیاو خۆی قوتار بکات، بەڵام لە دوامانەوە ئەفسەرەکانی بەش قامچییە ترسناکەکانی خۆیان دەسووڕاندەوە کە بەردیان بە سەرەوە بەستبوو و شمشێرەکانیان ئەدرەوشایەوە و سەربازەکانی ئێمە تێگەیشتن کە رێگای راکردن نەماوە و جگە لەوەش هەموویان ماندوو و برسی بوون و دەیانزانی کە ئەگەر رابکەن سەربازە خەبیرییەکان چالاکانە دەیانگەنێ و هەموویان دەکوژن.ئەوەبوو کە بیرۆکەی راکردنیان گۆڕی و لە یەکتر نزیک بوونەوە کە کەلێنیان نەمێنێ و دوژمن نەتوانێ بە نێوانیاندا تێ پەڕێت.

کاتێ لە ئێمە نزیک بوونەوە تیرهاوێژەکانی ئەوان تیرەکانیان هاویشت و ئەگەرچی دەنگی ووززز...ووززز...ی تیرەکانیان هورە رووخێنەربوو و مردن هەر چرکەیەک هەڕەشەی لە مرۆڤ دەکرد، بەڵام من لەو دەنگانە زیاتر دەخرۆشام لەبەرئەوەی ئەو دیمەنەی دەمبینی و ئەو دەنگانەی دەمبیست تا ئەو کاتە گوێم لێ نەبووبوو و نەمدیبوو.

(هورم هەب) لەم کاتەدا قامچییەکەی خۆی هەڵبڕی و داینەواندەوە و کەڕەنا



لێ دراو یەکسەر دوای ئەوە گالیسکە جەنگییە تیژڕەوەکان کەوتنە رێ و لە دواوەی ئەوان هەموو سەربازەکانمان کەوتنەڕێ و بەشێوەیەک نەعرەیان لێ دەدا کە هەستم کرد دەنگی ئەوان لە دەنگی شەڕکەرە خەبیرییەکان بەرزتربوو.

من کە دەمزانی سەربازەکانی ئێمە بۆ دوورخستنەوەی مەترسی لە خۆیان، هاواریان دەکرد وەک ئەوان منیش کەوتمە نەعرەلێدان و لە کاتی هاوارکردنمدا هەستم دەکرد کە ناترسێم. سەربازە خەبیرییەکان ئەگەرچی ئازابوون، بەڵام گالیسکەی جەنگیان نەبوو و گالیسکەکانی ئێمە قلێشێکی لە نێوانیاندا دروست کرد کە رێگای بۆ نەیزەدارەکان خۆش کرد و هەر ئەوەندە نەیزەدارەکان هاتنە ناو کەلەبەرەکەوە ئیتر لە سەر فەرمانی (هورم هەب) تیرهاوێژەکانی ئێمە کەوتنە تیربارانی دوژمن.

لەمە بەدوا سەربازەکانی دووبەرەی شەڕ تێک رژان. لە دوورەوە کڵاوخودەکەی (هورم هەب) دیاربوو کە پەڕی درێژی (حوشتر مورغ)ی[٢] پێوە کردبوو و بەردەوام لە پێشی پێشەوەی سەربازەکاندا شەڕی دەکرد. گوێدرێژەکەی من لە هات و هاواری مەیدانی جەنگ تۆقی بوو و خۆی خستبووە ناوەندی گوڕەپانەکە و هەرچەندە ویستم پێشی لێ بگرم نەمتوانی و دەمبینی سەربازەکانی خەبیری بە چەلەنگییەوە دەجەنگان و کاتێ دەکەوتنە سەر زەوی هەوڵیان دەدا بە شمشێر یان نەیزە ئەسپ و سەربازەکانمان بکوژن.

دەمڕوانییە هەر لایەک هەر خوێنم دەدی و ئەوەندە کوژراو و بریندار کەوتبوون کە لە ژمارە نەدەهاتن، لە ناکاودا سەربازەکانی خەبیری هاوارێکیان کرد و پاشەکشەیان کرد و هۆیەکەی ئەوەبوو کە گالیسکەکانی ئێمە توانیبوویان ریزەکانیان تێک بشکێنن و خۆیان بگەیەننە خێمەکان و ئەوێ ئاگر تێ بەربدەن. خەبیرییەکان کاتێ بینییان ژن و منداڵ و مانگا و مەڕەکانیان کەوتوونەتە بەر مەترسی، بۆ رزگارکردنیان بەڕاکردن بەرەو خێوەتەکانیان دەڕۆیشتن و هەر ئەم کارەیان بووە هۆی لە ناوچوونیان، چونکە گالیسکەکانی ئێمە بەرەو ئەوان

گەڕانەوە و سەربازەکانمان کە لە دوای گالیسکەکانەوە بوون گەیشتن و خەبیرییەکان لە نێوان دوو تاقمی هێرش بەر قەتڵوعام کران، بەشێوەیەک کە بەو هەموو ئازایەتییەی کە هەیانبوو شکان و ئەوانەی زیندوو مانەوە لە ترسی گیانیان هەڵهاتن. هەر سەربازێکی خەبیری کاتێ کە دەکوژرا لەلایەن سەربازەکانەوە دەپشکنرا و هەر چییەک کە بە کەڵک با لێیان دەدزی و دەستێکیشیان لێ دەکردەوە بۆئەوەی دوای تەواوبوونی شەڕ لە خێوەتگەی میسرییەکاندا لەبەردەم جێگای فەرماندەی سوپا کەڵەکەی بکەن.

دوای ئەوەی دەرکەوت خەبیرییەکان لەشەڕدا شکاون و توانای بەرگرییان نەماوە دڕندەیی سەربازەکانی داگرتەوە و ئەوەی دەجووڵایەوە دەیانکوشت و تەنانەت مێشکی منداڵیان بە گورز پرژ و بڵاو دەکرد و مانگاو مەڕومالاتەکانیش لەو زیانە بەدوور نەبوون.

ئەو کاتە (هورم هەب) ئەمری کرد کۆتایی بەشەڕ بهێنرێ و لە کوشتنی زیندووەکانی پاشماوەی شەڕ دەست هەڵبگرن و تەنها بەدیل بیانگرن بۆ ئەوەی دوایی بتوانن ئەو گیراوانە بفرۆشن. تا کۆتایی شەڕ، گوێ درێژەکەم هەر بۆ ئەملاو ئەولا ڕاکەڕاکی بوو و جووتەی دەهاویشت و من بە زەحمەت خۆم لەسەر پشتی ڕادەگرت بۆ ئەوەی نەکەوم، لەو کاتەدا یەکێ لە سەربازەکانی ئێمە بە داری نەیزەکەی خۆی کێشای بە لمۆزی گوێدرێژەکەم و ئارامی کردەوەو من توانیم دابەزم و سەربازەکان کە لەو ڕۆژەدا بینیبوویان وڵاخەکەم منی زۆر ماندوو کردبوو لەوە بەدوا ناوی کوڕی کەریان لێ نام.

لەو کاتەی کە سەربازەکانی دیکە سەرقاڵی کۆکردنەوەی مانگا و مەڕەکان و تالانی سەرو سامانی خەبیرییەکان و دەست بەسەراگرتنی ژنەکانیان بوون، من لە مەیدانی شەڕدا بەهاوکاری چەند سەربازێک بریندارەکانم تیمار دەکرد و کاتێ کە شەو داهات، لە ڕووناکیی ئاگرە بریسکەدارەکاندا برین پێچیم دەکرد کە ئەو ئاگرانە لە کەنار ڕێگاکاندا هەڵ کرابوون. نەیزە و شمشێرو گورزی خەبیرییەکان



هەندێ لەسەربازەکانی ئێمەی بەسەختی زامدار کردبوو و من دەبووایە بۆچارەسەر کردنیان هەوڵم بدایە و دەست و بردم بکردایە.

لەو کاتەی بریندارەکانی من لە تینی ئازارەکانیان دەیانناڵاند، گوێ بیستی هاوار و ناڵەی بەرز لەلای خێوەتگاوە بووم کە دەنگی ئەو ژنانە بوو کە سەربازەکانمان لە نێوان خۆیاندا بەشیان دەکرد و سوودیان لێ وەردەگرتن. هەندێ جار من ناچاربووم پێستی سەری بریندارەکە کە کەوتبووە سەر چاوی بەرزی بکەمەوەو بیدوورمەوە و هەندێ جاریش ڕیخۆڵەی سەربازێکی ترم دەخستەوە ناوسکی و تەقەڵم لە سکی دەدا. کاتێکیش کە دەمزانی یەکێکیان ئومێدی چاک بوونەوەی نییە هەندێ تریاکی زۆرم دەکردە ناو دەماریەوەو ئاوی جۆم دەرخوارد دەدا کە بەبێ هەست کردن بەئازار گیان بدات.

من تەنها سەربازە میسرییەکانم چاک نەدەکردەوە، بەڵکو بریندارە خەبیرییەکانیشم چارەسەردەکرد، لەبەرئەوەی بەزەییم پێیان دەهاتەوە، بەڵام لە دوای ئەوەی چەند بریندارێکی سەختم چارەسەرکرد و برینەکانیانم پێچایەوە، ئەوان دەنگی ئەو ژنانەیان بیست کە کەوتبوونە بەر دەستدرێژیی سەربازەکانی ئێمەو پەڕۆی برینەکانیان لێ دەکردەوە کە لە زامەکەیانم پێچابوو و دوایی بەهۆی خوێن بەربوون گیانیان دەردەچوو.

من لەو ڕووەوە بەزەییم پێیان دەهاتەوە کە دەمزانی سەرکەوتنی سوپای میسر بەسەر ئەواندا، بۆ لەشکری میسر و فیرعەون مایەی شانازی نەبوو، چونکە خەبیرییەکان چەکداری سەربازی نەبوون، بەڵکو بە عەشایر لە قەڵەم دەدران و برسێتی وای لێ کردبوون بکەونە تالان کردن و ئەوانیش وەکو دانیشتووانی تری سووریا لەلایەن فیرعەونی میسرەوە پاڵپشتییان لێ دەکرا. یەکێک لەو شتانەی جێگەی داخ بوو، ئەوەبوو کە بینیم هەموو سەربازەکانی خەبیری چاویان عەیبدارە و من لە نێوانیاندا تەنانەت یەک کەسی چاو ساغم نەبینی و بۆم دەرکەوت کە نەخۆشی چاو لە ناویاندا نەخۆشییەکی گشتییە.

ئەو شەوە سەربازەکان پشوویان داو تەنها پاسەوانەکان بەخەبەرمانەوە، چونکە مەترسی دەکرا ئەو بەشە خەبیرییانەی هەڵهاتبوون بەشەو هێرشمان بکەنە سەر. بەڵام لەو شەوەدا هیچ شتێ رووی نەدا و من تا بەیانی خەریکی برین پێچی بووم و بەیانی زوو (هورم هەب) لە خەو هەڵسا و لەبەرئەوەی زانی تا بەیانی بەخەبەر بوومە منی بانگ کردە لای خۆی و وتی: من دوێنێ بینیم تۆ بەبێ چەک بە چ بێ باکییەکەوە خۆت خستە ناوجەرگەی شەڕەکەوە، بەڵام دەبێ پێت بڵێم ئەرکی پزیشک لە دوای شەڕەوە دەست پێ دەکات و پێویست ناکات پزیشک خۆی گیرۆدەی ئەو تێک بەربوونە بکات و لەمەو بەدوا هەرکاتێ بۆ جەنگ چووین تۆ پشوو بدە تا ئەو کاتەی شەڕ کۆتایی پێ دێت و دوایی خەریکی چارەسەری بریندارەکان بە.

من چونکە ماندوو بووم، (هورم هەب) ملوانکەیەکی زێڕی داپێم و وتی: ئەمە پاداشتی ئازایەتییەکەی دوێنێ و بێدارییەکەی شەوی رابردووتەو ئێستا برۆ بنوو.

من هەرچەندە هیلاک بووم، بەڵام هەستم نەدەکرد بتوانم بنووم، چونکە کاتێ کە رووناکیی رۆژ دەرکەوت مرۆڤ خەو لە چاوی دەزڕێ. وتم: (هورم هەب) من دوێنێ تۆم بینی و سەیرم کرد بەردەوام لە پێشەوەی سەربازەکاندا شەڕ دەکەیت و لەگەڵ ئەوەشدا کە هەموو تیرەکان بەرەوڕووی تۆ بوو، چونکە دەیانزانی تۆ فەرماندەی سوپای میسری، بەڵام هیچ تیرێکت بەرنەکەوت.

(هورم هەب) وتی: لەبەرئەوەی هەڵۆکەم بەردەوام بەبان سەرمەوە لە فڕیندایەو من لە مەترسی دەپارێزێت و هەرگیز تیر بەرمن ناکەوێت و هیچ سەربازێکی دوژمن ناتوانێ تیر یان شمشێر یان گورزێ لەمن بوەشێنێ، چونکە من لەوەی کە لە دیدی خەڵکیدا بە پیاوێکی ئازا دەبینرێم هەست بە لە خۆبایی بوون ناکەم، چونکە دەزانم من ئەو ئازایە نیم کە خەڵکی لێی تێ گەیشتووەو لە باوەڕیاندایە. هەر کەسێکی تریش لە جیاتی من بێت دەتوانێ وەک من ئازایەتی



بنوێنێ. من لەبەرئەوە لە پێشەوەی سەربازەکان دەجەنگم بۆ ئەوەی سەربازە میسرییەکان لەگەڵ شەڕکردندا رابهێنم، چونکە ئێستا نزیکەی چل ساڵە کە میسرییەکان جەنگیان نەکردووەو ئاشتیی درێژخایەن هەڵسوکەوتی شەڕکەرانی لە بیریان بردۆتەوە و من هەرئەوەندە سەربازەکانم راهاتن و خووی جەنگیان گرت کە لە دوژمن نەترسێن، ئیتر وەک سەردارەکانی تری میسر لە کەژاوەدا دادەنیشم و لە دواوەی شەڕگەدا جێگیردەبم و لەوێوە جەنگ بەڕێوە دەبەم.

وتم: (هورم هەب) ئاخر چۆن هەڵۆیەک کە لە بان سەرتەوە لە ئاسماندا دەفڕێ تۆ لە زیانی تیر و شمشێر و گورزەکان دەپارێزێ؟

(هورم هەب) وتی: من باوەڕ ناکەم پارێزەرم ئەم هەڵۆیە بێت، بەڵکو ئەم هەڵۆیە تەنها هێمایەکە کە دەیهێنێتەوە یادم، تا ئەو رۆژەی سەرەم نەهاتووە ناکوژرێم و لەبەر ئەوەش بێ مانایە من بترسێم. من دەزانم مرۆڤ زیاتر لە یەک جار ناکوژرێ و کەس نییە کە دووجار بمرێ و لەسەر ئەم بنچینەیە نابێت بۆ ڕووداوێک کە تەنها یەک جار روودەدات مرۆڤ هەموو تەمەنی لە مەترسیدا بەسەرببات، لەبەر ئەوەی کە لە خۆمدا رێگا بە هەراس نادەم و چونکە ترسم نییە مەرگ بە سۆراغمەوە نایەت تائەو رۆژەی سەرە دەگاتە من و، لەو رۆژەدا چ ئازا بیت و چ ترسنۆک مەرگ یەخەت پێ دەگرێت.

من تێگەیشتم (هورم هەب) راست دەکات و ئەو هۆیە وای کردووە مەرگ دەستی لێی گیر نەبێت، ئەوەیە کە بوێرە و سەربازە بەختەوەرەکان هەمیشە ئەوانەن کە شەهامەتیان هەیە و خۆشبەختییەکەیان ئەو بەغیرەتییەیانە، ئەو سەربازەی ئازایەتی و شەهامەتی نەبێت بەختی نییە و لەشەڕی یەکەمدا دەکوژرێت و ئارەزووی تالانی و ملوانکە و زێڕ و ژنی جوان دەباتە ژێر گڵەوە.

دوایی لە (هورم هەب) جیابوومەوە و رۆیشتم کەمێ نووستم و پێش نیوەڕۆ لە خەو هەڵسام و بینیم سەربازەکان خەریکی نیشان نانەوە و رابواردنن و نیشانەکەیان سەربازە بریندارەکانی خەبیرییەکان بوو، چونکە دەیانزانی ئەو

سەربازانە چاک نابنەوە و بەکەڵکی بەندەیی نایەن و ناتوانن دوایی بیانفرۆشن.

ئەو رۆژە و شەوی دواییش سەربازەکانی ئێمە نەیانهێشت خێزانی خەبیرییەکان ئاسوودە بن و هەندێ لەو ژنانە بۆئەوەی گرفتاری سەربازەکان نەبن بە کەزیە (پرچە) درێژەکەیان خۆیان خنکاندبوو. شەوی سێیەم بۆنی لاشەی سەربازە میسری و خەبیرییەکان کە لە بیاباندا کەوتبوون هەوای بۆگەن کردبوو و بە زەحمەت هەناسە دەدرا و تا بەیانی نەمانتوانی لەبەر دەنگە دەنگی چەقەڵ و کەمتیارەکان بنووین، کە خەریکی لاشەخۆری بوون.

بە (هورم هەب)م وت: ئەگەر لەم بیابانەدا بمێنینەوە هەموومان بەهۆی بۆنی لاشەی کوژراوەکان نەخۆش دەکەوین. بۆیە ئەویش رازی بوو کە سوپاکەی بکەوێتەرێ و برینداره سەختەکان بە گالیسکە ببەنە (ئورشەلیم) و وتی: لەبەرئەوەی خەبیرییەکان لە کاتی هەڵهاتن خوایەکەی خۆیان بردووە و پێ سپێردراوەکانی پشکنینی ئێمە دەڵێن ئەوان لەم دەوروبەرەدان، من دەبێ بڕۆم و خوایەکەیان لێ بسەنم.

رۆژی دوایی دوای ئەوەی بریندارەکانمان رەوانەی ئورشەلیم کرد، (هورم هەب) بە چەندین گالیسکەی تیژڕەو کەوتەڕێ و منیشی لە گالیسکەکەی خۆی سوارکرد و وتی: دەمەوێت تۆ بکەمە شەریکی خۆم لەم شەڕەدا، کە ببینی چۆن لموزی پاشماوەی خەبیرییەکان لە خاکدا دەگەوزێنم.

کاتێ کە ئێمە پاشماوەی هۆزی خەبیرییەکانمان لەناکاودا دەورەدا، ئەوان خەریکی گۆرانی وتن بوون و مانگاو مەڕەکانیان (کە ئێمە دەمانزانی ئەو مێگەل و رانانەیان لە جووتیارەکانی سووریا بە تاڵان هێنابوو) پێش خۆیان دابوو و دەڕۆیشتن و ئێمە وەک تۆفان دامان بەسەریاندا و بەرلەوەی بتوانن بەرگری لە خۆیان بکەن گالیسکەکانی ئێمە گەنج و پیری خستە ژێر خۆیەوە و ئێسکەکانیانی تێک شکاند و سەربازەکان هەر کەسێکیان دەست دەکەوت دیانکوشت، بە شێوەیەک کە خەڵکی لە ترسی گیانی خۆیان وازیان لە مەڕ و



ماڵاتەکەیان هێنا و رایان کرد.

(هورم هەب) فەرمانی دا مانگا و مەڕەکانی بیابان کۆبکەنەوە، کە پەرت و بڵاو بوون و دوایی خوای خەبیرییەکانی لەزەوی هەڵگرتەوە و گەڕاینەوە و رێگای ئورشەلیم -مان بە هەموو هێزەکەوە گرتەبەر. (هورم هەب) لە یەکەمین شوێنی حەسانەوە خوای خەبیرییەکانی لەبەر چاوی سەربازەکان کەرت کەرت کرد و فڕێیدا. سەربازەکان هەستیان بە شادی کرد، چونکە دەیانزانی کە خەبیرییەکان ئیتر خوایان نییە و لەبەرئەوە لە هەموو کاتێ زیاتر هەژاربوونە و تا ئەو شوێنەی بە بیرم بێت خوایەکەیان پەیکەرێکی لە دار دروست کراوبوو کە (یەهود) یان (یەهوە)یان پێ دەگوت.

کاتێ من چوومە ئورشەلیمەوە، سەرم سووڕما کە بۆچی هەندێکی زۆر لەو بریندارانەی کە من تەداویم کردبوون مردبوون، ئەگەرچی دەمزانی برینەکەیان مەترسی لێ نەدەکراو چارەسەردەکران. نهێنیی ئەم بابەتەم دوایی بۆ ئاشکرابوو و ئەویش بەم شێوەیەبوو کە بە پێی فەرمانی (هورم هەب) هەموو دەستکەوتەکانی شەڕیان بردبۆوە ئورشەلیم و لەگەڵ کەنیز و بەندەکاندا فرۆشرابوون و هەرچی زێڕ و زیو و مسێ کە لە فرۆشتنی ئەو دەستکەوتانەدا پەیدا بووبوو بەسەر سەربازەکاندا دابەش کراوە. لێپرسراوی ئازووقەی لەشکرەکە کە لەگەڵ مندا دۆست بوو وتی: لە هەموو شەڕێکدا هەروا دەکرێ و سەربازەکان هاوڕێ بریندارەکانی خۆیان بە بێ داودەرمان و نان و ئاو جێ دەهێڵن کە بمرن، چونکە دەزانن هەرچەندە ژمارەیان کەمتر بێت زیاتر سوود لە دەستکەوتی شەڕەکە وەردەگرن و کانزایەکی زیاتریان بەردەکەوێت.

کۆمەڵێکی زۆر لە مامەڵەچییەکانی سووریا لە ئورشەلیم کۆببوونەوە و دەستکەوتەکانی شەڕیان دەکڕییەوە و هەر کامێکیان هەندێ ژنی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو و، سەربازەکانی ئێمە زێڕ و مسیان لە بری دەدا و هەندێ لەوانیان دەکرد بە هاوسەر و هەندێکی تریان بەکەنیز دەکڕی و ئەم زێڕ و مسە دەبۆوە

دەستکەوتی مامەڵەچییەکان.

لە سبەینێ تا ئێوارەو، لە شەو تا بەیانی لە ئورشەلیم دەنگی تەنبوور و زوڕنا و سنج و تەپڵ و عوود دەهات و شەراب و بیرە لە گۆزەکانەوە دەڕژانە ناو جامەکانەوەو سەربازە میسرییەکان کاتەکانی خۆیان بە خۆشگوزەرانی و خواردنەوە دەبردەسەر.

هەندێ کات لە نێوان سەربازەکاندا شەڕی ترسناک رووی دەدا و کێردەکان بە سینە و سکیاندا دەچوو و گۆزەکان بەر تەوقی سەری هەندێکدا دەکەوت. لەو کاتەدا (هورم هەب) کە فەرماندەیان بوو چەند کەسێکی سەرەو ژێر هەڵواسی و لەبەرئەوەی ناکۆکییەکەیان هەموو رۆژێ دووبارە دەبوونەوە، رۆژنەبوو چەند کەسێ بە دارەوە هەڵنەواسرێن. سەربازەکان لەگەڵ ئەوەشدا کە دەیانبینی هاوڕێ شەڕانییەکانیان هەڵدەواسرێن تەمێ نەدەبوون، چونکە هەتا ئەو کاتەی لە جیهاندا شەراب و زێڕ و پارە و ژن هەبێ و، هەندێ لە سەرخۆشەکان لەسەر ئەو زێڕ و پارە و ژنە دژایەتیی یەکتر بکەن و بەشەڕبێن، کوشتار بەردەوام دەبێت و بکوژەکان لە سێدارە دەدرێن. ئەو شتانەی سەربازەکان لە تالانیدا دەستیان کەوتبوو و کەمیش نەبوو، هەموویان لە جێی کڕینی شەراب یان کەنیز خەرج کرد و بەرپرسە میسرییەکانیش وەک سەربازەکان بەشەکەی خۆیان لە شەراب و ژندا سەرف کرد.

ئەو کەسانەی لە خێزان و ئازیزەکانی خۆیان دوورکەوتبوونەوە و لەو ماوەیەدا سەرگەرمی شەڕبوون لەم رۆژانەدا کە کاتی پشوودان بوو، بۆ بەسەربردنی کاتەکانیان هەوڵیان دەدا سوود لە هەموو دەرفەتێک و هەموو هۆیەک وەربگرن بۆئەوەی کەمێ دڵی خۆیان شاد بکەن. لە نێوان لێپرسراوەکانی سوپادا تەنها (هورم هەب)ی فەرماندە سەرنجی نەدەدایە ژنەکان و من لەم خۆڕاگرتنەی ئەو سەرسام بووم، چونکە (هورم هەب) کوڕێکی جوان و گەنج بوو و دەیتوانی حەزی لە هەر ژنێک بێت بیکاتە هاوسەری خۆی، بەڵام ئەو پیاوە لەو خەیاڵەدا نەبوو.



(هورم هەب) لەو دەستکەوت و کۆیلانە هیچی هەڵنەگرت، بەڵام لە جیاتی ئەوە سوودی لە مامەڵەچییەکان وەرگرت. بەم شێوەیەی کە کاتێ مامەڵەکەیان کۆتایی پێ هات و دەیانویست ئەو ماڵ و کۆیلانەی کڕیبوویان هەڵی بگرن و برۆن، (هورم هەب) وتی: هەر بازرگانێ دەبێ لەسەدا دەی بەهای گشتی ئەو شتانەی کڕیویەتی لەبری مافی پاراستنی ئاسایشیان بیداتە من. هەروەها وتی: لە هەموو ئەو کاتانەی کە ئێوە سەرگەرمی مامەڵەبوون هیچ کەسێ لە سەرباز و دانیشتووانی ئەم شارە نەیانوێراوە دەستدرێژی بکەنە سەر داراییەکانتان. چونکە من شەوو رۆژ ئاگاداربووم کە کەس سامان و کۆیلە و کانزای ئێوە نەدزێ و ئەگەر من نەبوومایە ئێوە نەک هەر نەتاندەتوانی دارایی و کۆیلە و کانزاکانتان لێرە ببەن، بەڵکو ئەم سەربازە سەرخۆش و خوێنمژانە خودی ئێوەشی دەکوشت.

ئەم وتەیەی (هورم هەب) راست بوو، ئەو بەجۆرێک هێمنیی پاراستبوو کە یەک حەڵقە مسیش لە مامەڵەچییەکان نەدزرابوو. مامەڵەچییەکان کە بینییان ئەگەر بە رەزامەندییەوە (لەسەدا دەی) داراییەکەیان نەدەن لەوەیە هەموو شتێکیان لە کیس بچێ. باجەکەیان دا بە (هورم هەب) و ماڵ و گیانیان بەسەلامەتی لە ئورشەلیم بەدەر برد و منیش کە بەبۆنەی کۆتایی هاتنی شەڕەکە کارم نەمابوو چوومە لای (هورم هەب) کە خواحافیزی لێ بکەم و بگەڕێمەوە بۆ ئەزمیر.

لە کاتی خواحافیزیدا (هورم هەب) بە منی وت: دوێنێ پەیکێ بە کاغەزێک (پاپیروس) لە لایەن فیرعەونەوە هاتووە و، فیرعەون لەم نامەیەدا سەرزەنشتی من دەکات کە بۆچی خوێن رێژیم کردووە و خەبیرییەکانم کوشتووە. من دەمەوێت بە فیرعەون بڵێم ئەوەی کە سروود بۆ خوایەکەی خۆی دەڵێت و وادەزانێ کە دەتوانێ میسرو سووریا بە ئاشتیخوازی و خۆشەویستی و سۆزی چونیەکی بەرێوەببات، هێشتا دیمەنی هەڵمەت بردنی هۆزەکانی خەبیری نەبینیوە کە پەلاماری شار و گوندەکان دەدەن و ئەگەر دەیدی چۆن ئەم هۆزانە هێرش دەکەنە

سەر ئەو شارانە و پیاو و ژن و منداڵ دەکوژن و ژنەکانیان بەوپەڕی سووکییەوە بەدیل دەگرن و دوایی دەیانکەنە کەنیز کە بیفرۆشن، ئەوسا دەیزانی کە ناتوانێ زەوی بە ئاشتیخوازی و خۆشەویستی و سۆزەوە بەڕێوەببات. چونکە رووی نەداوە یەکێ هێز و پێویستی کوشتن و تاڵانی هەبووبێ و کەڵکی لێ وەرنەگرتبێ. تەنها لە یەک باردا پیاوێکی بەهێز، کە دەتوانێ خەڵکی بکوژێت و سامان و دارایی و ژنەکانیان داگیربکات، دەسەڵاتەکەی بەکارناهێنێت، ئەویش لەو کاتەدایە کە پێویستی بە دارایی و ژنی جوان نەبێت. من ئێستا سەربازەکانی خۆم دەگەڕێنمەوە بۆ میسر و دڵنیام فیرعەون دەڵێت سەربازەکان روخسەت بدە، بەڵام من ئیزنیان نادەم، چونکە لە سەرتاسەری میسردا تەنها یەک سوپای جەنگ دیدە و تاقی کراوە هەیە، ئەویش لەشکرەکەی منە.

وتم: (هورم هەب) ئایا وابیردەکەیتەوە کە میسر پێویستی بە سوپایە؟ چونکە میسر ئەوەندە بەهێز و دەوڵەمەندە کە دوژمنی نییە کە ناچاربێت سوپایەکی ئەزموون دیدە و کارامەی بۆ رابگرێت.

(هورم هەب) وتی: وڵاتێکی وەکو میسر کە دەیان پاشای سووریا لە ژێر پاراستنی ئەودان، پێویستی بە هێزێک هەیە کە لە نێوان دەسەڵاتدارەکانیدا ئاشتی بچەسپێنێ و من لەم ماوەیەدا بیستوومە پاشای وڵاتی (ئامورۆ) لە سووریا خەیاڵی یاخی بوونی هەیە.

وتم: نا.. من ئەم پاشایە دەناسم، لەبەرئەوەی لە رابردوودا ددانەکانیم چاک کردۆتەوەو ئەو کەنیزە جوانەکەی منی بینی و دڵی کەوتەسەری و منیش پێشکەشم کرد و خۆم بێ ژن مامەوە.

(هورم هەب) وتی: سینۆهە ئایا تۆ ئامادەی هاوکاریم بکەیت، واتە سەفەرێکی گەورەم بۆ بکەی و لە جیاتی ئەوە هەرچەندە زێڕت دەوێ دەتدەمێ.

وتم: بۆچی دەتەوێ سەفەرت بۆ بکەم؟

(هورم هەب) وتی: تۆ پیاوێکی پزیشکی و ئازادی، دەتوانی بۆ هەموو



جێگایەک بچی و لەبەرئەوەی پزیشکی هەموو باوەڕت پێ دەکەن و من دەزانم کە لە وڵاتی هاتی و بابل رێزێکی زۆر لە پزیشکە میسرییەکان دەگرن. من لەبەرئەوەی فەرماندەی سوپای میسرم دەبێ بزانم چەکی جەنگی گەلانی تر بەتایبەتی هاتییەکان و بابلییەکان چۆنە. لەمەڕ چەکە جەنگییەکانی هاتی و بابل هەواڵی ترسناکم پێگەیشتووە و لەوانە بیستوومەکە (هاتی)یەکان نەیزە و شمشێرەکانیان لە کانزایەکی رەش دروست دەکەن کە ناوی (ئاسنە) و کەس نازانێت کە ئەوان ئەم کانزایەیان لە کوێ دەست کەوتووە، بەڵام لە شمشێر و نەیزەکانیان ترسێنەرتر گالیسکە جەنگییەکانیانە و بیستوومە کە ئەوان گالیسکە جەنگییەکانیشیان لەم کانزا رەشە دروست دەکەن و ئەوەندە ئەم گالیسکانە بەهێزن کە کاتێ بەر گالیسکە مسییەکانی ئێمە دەکەون وەک دار تێکیان دەشکێنن و بۆ وەرگرتنی زانیاری لەمەڕ ئەم کانزایە و چەکی وڵاتانی تر و گالیسکەکانیان کەسی ترنییە لە تۆ شیاوتربێت. لەبەرئەوەی تۆ پزیشکی و بۆ هەموو جێگەیەک دەچیت و لەو رووەوە کە زمانی نێودەوڵەتی بابلی دەزانی، دەتوانی لەگەڵ هەموو کەسێکدا قسەبکەی و کەس هەست ناکات کە تۆ جاسووسی سەربازیت، چونکە کەس لەو باوەڕەدا نییە کە پزیشکێ لە کاروباری سەربازیدا زانیاریی هەبێت. جگە لەمانەش تۆ پیاوێکی هوشیار و ژیری و دەزانی چ جۆرە زانیارییەک بۆمن سوودمەندە و خەڵکانی تر بێ هەست و نەفامن و کاتێ کە فیرعەون بۆ کۆکردنەوەی زانیاری دەیاننێرێتە شوێنێ تەنها لەمەڕ ریشی پاشای بابل و ژنەکانی ئەو زانیاری بۆ فیرعەون دەنێرن، بەڵام تۆ دەتوانی لە وڵاتانی تر زانیاری کۆبکەیتەوە کە چەند سەربازیان هەیە و چەکی سەربازەکانیان چییە و ئاسن چ شتێکە و چۆن دەست دەکەوێت و ئایا دروست دەکرێت یان وەک مس لە ژێر زەوی دەست دەکەوێت و، تۆ دەتوانی تێبگەی کە توانای جەنگیی ئەو گەلانە چەندەو دوای دەستکەوتنی ئەو زانیارییانە لە میسر بێیتەوە میسر بۆ لای من و ئەوەی دەزانی پێمی بڵێی.

وتم: (هورم هەب) من ئیتر ناگەڕێمەوە بۆ میسر..

(هورم هەب) وتی: تۆ لە هەڵەدایت، ئەو کەسەی کە ئاوی نیل بخواتەوە ناتوانێ دڵ لە میسر هەڵبکەنێ و ئەم وتەیەی تۆ لە گوێی مندا وەک گیزەگیزی مێش بێ بایەخە، چونکە بەدڵنیاییەوە دەزانم کە ڕۆژێ دەگەڕێیتەوە میسر و من وابیردەکەمەوەکە ئەگەر تۆ بە پێشنیارەکەی من رازی بیت و لە بارەی پاشاکان و لەشکر و چەک و مەشقەکانی سەربازی وڵاتانی تر زانیاریم بۆ کۆبکەیتەوە من لەو کارەت کەڵکێکی زۆر وەردەگرم. چونکە من ئومێدەوارم کە لە داهاتوودا بتوانم لەم زانیارییانە بۆ فراوان کردنی وڵاتی میسر و ملکەچ کردنی پاشاکانی تر سوود وەربگرم. ئەمڕۆ میسر بە ئەو پلە و پایەیەی شیاوێتی نەگەیشتووە، لەبەرئەوەی گەلی میسر هەڵبژاردەترینی گەلانی جیهانە و خوایەکان لەبەرئەوە گەلی میسریان لە گەلانی دیکەی جیهان لە پێشتر داناوە کە ببنە فەرمانڕەوای ئەوانی تر. بەڵام میسرییەکان لەبەر تەمبەڵی نایانەوێت لەم تایبەتمەندییە سوود وەربگرن و فیرعەونی ئێمە لە جیاتی ئەوەی بۆ وڵاتانی تر لەشکرکێشی بکات بەهۆی دوودڵی و تەڵقینی خوایەکی نادیار باس لە ئاشتی و خۆشەویستی هاوڕەگەزایەتی دەکات.

کاتێ کە (هورم هەب) ئەم قسانەی دەکرد من بە وردی لێیم دەڕوانی و هەستم کرد لەبەرچاوم گەورە بووە، چونکە هەتا یەکێک خاوەن ئامادەییەکی وا گەورە نەبێت نابێتە خاوەن ئەم بیر و بۆچوونەو هەموو شتێکی ئێمە لە دایکبووی بیروڕامانە و ئەوکەسەی ئەندێشەیەکی گەورەی هەیە و ئامادەبێت هزرەکەی خۆی دابەزێنێتە سەر قۆناغی جێبەجێ کردن، پیاوێکی گەورەیە.

ئەوەبوو کە پێم گوت: (هورم هەب) تا ئەمڕۆ من تۆم تەنها بە پیاوێکی جەنگی لێهاتوو دەزانی و لەو باوەڕەدانەبووم توانای بەڕێوەبردنی وڵاتیشت هەبێت، بەڵام ئێستا توانایەکی وا لە تۆدا دەبینم کە لەوەیە لە فیرعەوندا نەبێت.

(هورم هەب) وتی: ئایا ئامادەی من بەگەورەی خۆت بزانی و پێشهاتەکانی ژیانی خۆت بە پێشهاتەکانی منەوە ببەستیتەوە؟



وتم: بەڵێ ئامادەم...

(هورم هەب) وتی: (سینۆهە) تۆ لە ئێستا بەدواوە لە وڵاتەکانی تر دەبیتە چاو و گوێی من و بەهۆی تۆوە من لە بارودۆخی هەرێمە بیانییەکان ئاگاداردەبم و ئەگەر من سەرکەوتوو بووم و گەیشتمە پلەی بەرزتر تۆ لەو بەختەوەری و سەرکەوتنەی من شەریک دەبیت و ئەگەریش دەستکەوتی گەورەم نەبوو و بە پێچەوانەوە دابەزیم، تۆ هیچ زیانێک ناکەیت. چونکە وەک پێشوو پزیشکیت و دەتوانی بەو پیشەیە زێڕ و پارە پەیدا بکەی و گەورەیی من و بەندەیی تۆ لەوەیە بۆ تۆ قازانجی هەبێت، بەڵام زەرەری نییە.

دوای ئەوە (هورم هەب) زێڕێکی زۆری داپێم کە زۆر لەوە زیاتر بوو کە من چاوەڕوانی بووم و کۆمەڵێ سەربازی راسپارد کە بمبەنەوە بۆ ئەزمیر بۆئەوەی کەس لە رێگادا زێڕەکانم بە تاڵان نەبات.

کاتێ گەیشتمە ئەزمیر زێڕەکانم دا بە چەند کۆمپانیایەک و لە جیاتی ئەوە لەوحەی خاکی رۆسم (گڵی سوور) وەرگرت کە لە ئاگردا گەرم کرابوو و لەسەر ئەو لەوحانە چەندێتی ئەو زێڕەی لەسەر نووسرابوو کە دابووم بە هەریەکە لەو کۆمپانیایانە و جگە لە خۆم کەسێکی تر نەیدەتوانی ئەو زێڕە لە وڵاتی بابل یان وڵاتی (هاتی)یەکان وەربگرێت و لەبەرئەوە ئەگەر دزەکان لە رێگادا ئەو لەوحانەیان لێ بسەندمایە هیچ نرخێکی بۆئەوان نەبوو و منیش زەرەرم نەدەکرد چونکە دەمتوانی بگەڕێمەوە و لەوحەی تر لەو کۆمپانیایانە وەربگرم.

من لەو باوەڕەدام کە یەکێک لە سوودە گەورەکانی ئەم سەردەمەی ئێمە لە چاو سەردەمەکانی وەحشێتی ئەوەیەکە ئێمە دەتوانین زێڕێکی زۆر لەگەڵ خۆماندا هەڵبگرین لە شێوەی لەوحەیەکی گڵی سوورو، ناچار نەبین زێڕەکانمان بە کۆڵەوە بگرین کە مەنجەڵی تەماحی دزەکان بهێنێتە جۆش و ئەوەی هەمانەو بەگشتی بەری رەنجی هەموو تەمەنمانە لێمانی بستێنن.

***

١- لێرەدا مەبەست خوای تاک و تەنها و نەبینراوە و مێژوو دەری دەخات کە ئەم فیرعەونە بۆ

یەکەمین جار لە میسردا پەرستنی خوای تاک و تەنهای بە خەڵکی ڕاگەیاندووە – وەرگێڕ.
٢- حوشتر مورغ: نعامە

**بەشی سیانزەیەم**

# سەفەرە درێژخایەنەکەم

ئێستا بەر لەوەی باسی ئەو شتانە بکەم کەلە وڵاتانی دەرەوەدا بینیم، حەزدەکەم ئەوە بزانن کە ماوەی ئەم سەفەرە درێژخایەنەی من بەیەکێک لە خۆشترین روژگارەکانی تەمەنم لەقەڵەم دەدرێت و دەزانم کە چی تر ئەو ڕۆژگارانە نابینمەوە. چونکە لەو کاتەدا جحێڵ و بەهێزبووم و خۆر لەبەر چاوم ڕۆشناییەکی زیاتری هەبوو و زیاتر هەستم بە فێنکایی نەسیم دەکرد و ژنەکان جوانتر دەهاتنە بەرچاوم. خۆر و نەسیم و ژنەکان ناگۆڕدرێن، بەڵام مرۆڤ لەسەردەمی بەساڵاچوویدا ئەوان بەشێوەیەکی تر دەبینێ.

ئەو کاتەی من دەستم بەسەفەر کرد، دنیا چل ساڵ بوو لە ئاشتیدا دەژیا و لە هەموو شوێنێ کاروانەکان بە ئازادی هاتوچۆیان دەکرد و کەشتییەکان لە رووبار و دەریاکان بەبێ مەترسیی چەتە دەریاییەکان، هاتوچۆیان دەکرد. لەو وڵاتانەدا جووتیارەکان بەهۆی بەردەوام بوونی ئارامی، بەروبوومێکی زۆریان لە کێڵگەکاندا دەست دەکەوت و تەسلیمی خاوەن زەوییەکانیان دەکرد و لە هەموو شوێنێ (نیل)ی ئاسمان، لە جیاتی (نیل)ی سەر زەویی میسر، باخ و کێڵگەکانی تێرئاو دەکرد.

مانگاو مەڕەکان لەناو لەوەڕگاکاندا دەڵەوەڕان و شوانەکان پاڵیان بە داری بەرزەوە دەدا بۆئەوەی شمشاڵ بۆ مەڕەکانیان بژەنن و ئەوانیش بەوردی گوێیان بۆ دەگرت. لە دارە میوەدارەکان بەروبوومێکی زۆر دەست دەکەوت و ئەو دارانە لە ژێر باری میوەی زۆردا چەمیبوونەوە. لەسەر هەموو پەرستگەکاندا دووکەڵی درێژ



بەرزدەبووەوە، چونکە لە تەواوی پەرستگاکاندا مانگا و مەڕی قوربانییان لێ دەنا.

هەموو شتێ بەردەوامێتی ئاسایی خۆی هەبوو، واتە دەوڵەمەندەکان ساڵ بە ساڵ زەنگینتر و هەژارەکان ساڵ بە ساڵ هەژارتر دەبوون، چونکە خوایەکان وایان دانابوو کە هەموو ساڵێ سامانی دەوڵەمەندەکان زیاد بکات و هەژاران دوای هاتنی هەر ساڵێکی نوێ خۆیان لە ساڵی رابردوو کەم دەرامەتتر ببیننەوە.

من لەو باوەڕەدام کە لەو کاتەدا خوایەکانیش وەک زەنگینەکان و کاهینەکان لەش ساغ و قەڵەو بوون و ڕۆژگاریان بەخۆشی دەبردە سەر، چونکە کاتێک ئاشتی باڵی بەسەر زەویدا بکێشێت، کاری خوایەکان کەمتر دەبێت و دەتوانن کاتێکی زیاتر خۆیان بە پشوودان و خۆشییەوە خەریک بکەن.

ئەمڕۆ من خەم بۆ ئەو ڕۆژگارە ناخۆم، چونکە خەم خواردن و خۆزگە خواستن کاری پیاوێکی ژیر و دنیادیتە نییە و بە حەسرت کێشان مرۆڤ ناتوانێ دۆخی رابردوو بگەڕێنێتەوە، بەتایبەت ئەگەر ئەو شتانە تواناى بۆ رابردوو گەڕانەوەی نەبێت، چونکە کەس ناتوانێت تەمەنی گەنجێتی بگەڕێنێتەوە.

پێش ئەوەی سەفەرەکەم دەست پێ بکەم وەک باسم کرد، گەڕامەوە ئەزمیر و (کاپتا) کە منی بینی بەڕاکردن بەرەولام هات و فرمێسک لە تاکە چاوەکەیەوە هاتە خوارێ و وتی: ئەمڕۆ پیرۆزترین ڕۆژەکانی تەمەنی منە کە دەبینم تۆ گەڕاویتەوە بۆ ماڵ. من وام دەزانی تۆ لە شەڕدا کوژراوی و من جارێکی تر تۆ نابینمەوە و بە پەرۆش بووم کە لاشەی تۆ چی لێ دێت و کێ مۆمیایی دەکات، بەڵام بە خۆم دەگوت لەبەرئەوەی تۆ مردوویت هەموو دەوڵەمەندییەکەی تۆ لە کۆمپانیاکانی کەشتیوانی بە من دەبڕێت. ئەمڕۆ کە گەڕاویتەتەوە لە هاتنەوەت خۆشحاڵم، چونکە بەبێ تۆ ئەگەرچی دەوڵەمەند دەبووم بەڵام وەک مەڕێک دەبووم کە خاوەنەکەی خۆی ون کردبێ و ئێستا وەک مەڕێکی خاوەندارم لێ هاتووە. لەو کاتەی تۆ لێرە نەبووی، من زیاتر لەو کاتانەی کە خۆت لێرەبووی

دزیم لێ نەدەکردی و زۆر هەوڵمدا ماڵەکەت بێ عەیب بهێنێتەوە و داراییەکەت پەرت و بڵاو نەبێت، بۆیە ئێستا کە گەڕاویتەوە دەبینی وەک پێش ڕۆیشتنت خانووەکەت ڕێک و پێکە.

دوایی ئاوی هێناو قاچی شوشتم و ئاوی بە دەموچاومدا کردو لەگەڵ ئەوەشدا هەر قسەی دەکرد. من پێم گوت: ئەوەندە قسەمەکە و لە جیاتی ئەمانە بڕۆ کەل و پەلی سەفەرم بۆ ئامادە بکە چونکە بەتەمای سەفەرێکی درێژخایەنم.

(کاپتا) کە بیستی بەتەمای سەفەرم کەوتەوە گریان و سەرزەنشتی خوایەکانی کرد کە بۆچی هێناویانەتە سەر ئەم دنیایە و دەیگوت: نازانم بۆ من وا دروست بوومە کە هەرگیز بۆ ماوەیەکی درێژ بەختەوەری بە خۆمەوە نەبینم. ئاخر من زۆر هەوڵم داوە بۆئەوەی خۆم بەم شێوەیە قەڵەو بکەم و ئێستا لەبەرئەوەی تۆ دەتەوێ ئەم ژیانە خۆشە بەجێ بهێڵی و بڕۆی من ناچارم لە گەڵتدا بێم و لە ڕێگا لەڕ و لاواز دەبمەوە.

وتم: تۆ مەجبوور نیت لەگەڵ مندا بێیت و دەتوانی لێرە بمێنیتەوە.

(کاپتا) وتی: ئەگەر سەفەرەکەت یەک دوو مانگی پێ بچوایە لێرە دەمامەوە، بەڵام لەبەرئەوەی سەفەرەکەت درێژە دەکێشێت، ناچارم لەگەڵتدا بەڕێ بکەوم چونکە ئەگەر من نەیەم و ڕێنومایی نەکەم تۆ وەک گۆلکێک وای کە دز دەست و قاچی بەستبێتەوە و خستبێتییە سەرشانی کە بیبات و گۆلکەکەش توانای بەرگری نەبێت، یان وەک یەکێک وای کە چاویان بەستبێتەوە و توانای ڕێگای نەبێت و هەر هەنگاوێ بنێت بکەوێت و ئەگەر من لەگەڵ تۆدا نەبم هەموو کەسێ ئەوەندەی بتوانێ زێڕ و پارە و شتی ترت لێ دەدزی، بەڵام ئەگەر بەس من لەگەڵتدا بم بەتەنها من دزیت لێ دەکەم و دزینەکەی من، کە یەک کەسم لە هی دزەکانی تر باشترە لەبەرئەوەی خەڵکی کاتێ کە دزی لە تۆ دەکەن ڕەچاوی هیچ شتێک ناکەن. بەڵام من بە ڕێژەی چەندێتی دەوڵەمەندییەکەت دزیت لێ دەکەم و هەمیشە بەشە زۆرەکەی



داراییەکەت بۆ خۆت بەجێ دەهێڵم. ئایا باشتر نییە لێرە لە ئەزمیر لە ماڵی خۆماندا بمێنینەوەو خواردنی خۆش بخۆین و کەڵک لە زێڕ و پارەکەی خۆمان وەربگرین و خۆمان تووشی زەحمەت و ماندوێتیی سەفەر نەکەین.

کاپتا بەهۆی بەسەرچوونی کاتەوە بەشێوەیەک بێ شەرم ببوو کە وای دەزانی لەگەڵ مندا هاوپشکە و باسی (خانووەکەمان) و (خواردنەکەمان) و (زێڕ و پارەکانمان)ی دەکرد و من بۆئەوەی بە بیری بهێنمەوە کە ئەو بەندەی منە، نەک شەریکەبەشی داراییەکەم و، هەروەها لەبەرئەوەش کە گریانەکەی هۆیەکی ڕاستەقینەی هەبێت، گۆچانەکەم بەرز کردەوە و چەند دارێکی بەهێزم بەپشت و ناوشانیدا کوتاو وتم: (کاپتا)، تۆ لەسەر ئەم چاوچنۆکییەی بۆ دزی کردن هەتە ڕۆژێ دێت لە سێدارەت دەدەن و دەبینم چۆن سەرەو ژێر هەڵتدەواسن.

(کاپتا) هەر چۆنێ بێت رازی بوو کە مل بەم سەفەرە بدات و کەل و پەلی سەفەرمان پێچایەوە و کەوتینە ڕێ.

ئەگەر (کاپتا)م لەگەڵ نەبوایە من لە ڕێگای دەریاوە خۆم دەگەیاندە لوبنان، بەڵام (کاپتا) وتی: ئەگەر بمکوژی لەوە باشترە کە سواری کەشتیم بکەی. خۆم سواری کەژاوەیەک بووم و گوێ درێژێکم بۆ (کاپتا) کڕی، بەڵام لەبەر ئەوەی کاپتا بەشی دواوەی لەشی برینێکی پێوە بوو حەزی بە سواربوون نەبوو و هەندێ لە ڕێگاکەی بە پێ بڕی و دەیوت پیادەڕەوی لە سواربوونی گوێدرێژ باشترە.

کاتێ گەیشتینە لوبنان، لەوێ داری بەرزی (سەدر)م بینی و ئەو دارانە ئەوەندە بەرزبوون کە ئەگەر وەسفی بکەم کەس لە میسردا باوەڕم پێ ناکات و هەر لەبەرئەوەش واز لە باس کردنی دەهێنم. لەو دارستانانە دارە (سەدر)ەکان بۆنێکی خۆشیان لێ دەهات و جۆگەلەی ئاوی زوڵاڵ بە دارستانەکەدا دەڕۆیشت و من بە خۆمم دەگوت لە ناوچەیەک کە ئەوەندە بۆن خۆش و ڕازاوە بێت کەس بەدبەخت نییە. تا گەیشتینە جێگایەک کە بەندەکان خەریکی بڕینەوەی قەدی دارە (سەدر)ەکان بوون و دەیانخستە سەرشانیان و لە ڕێگا شاخاوییەکانەوە

دەیانهێنایە خوارەوە تا دەگەیشتنە کەناری دەریا، بۆ ئەوەی لەوێوە بە کەشتی باری بکەن.

کاتێک کە ئەندامە بریندارەکانی لەشی بەندەکانم بینی و روانیم مێش تێیداوە، تێگەیشتم کە لەو ولاتە جوان و سەوزەشدا خەڵکانی چارەڕەش زۆر هەن. دوایی لە لوبنان دەرچووین و رێگای ولاتی (میتانی)مان گرتەبەر. لە میتانی، کاپتا زۆر هەستی بەشادی کرد، چونکە لەو رۆژەوە کە هەنگاومان نایە ئەو ولاتە، خەڵکەکەی بە گەرمی پێشوازییان لێ کردین و لەبەرئەوەی کە دەیانزانی (کاپتا)بەندەی منە خواردنی خۆشیان دەداپێی و، کاپتا دەیگوت: واباشە هەرگیز لەم ولاتە نەڕۆین و هەر لێرە بمێنینەوە. بەڵام من کە بۆ کۆکردنەوەی زانیاریی سەربازی هاتبووم نەمدەتوانی لەوێ بمێنمەوە و دەبووایە دوای وەرگرتنی زانیاری، بۆ هەمان مەبەست بەرەو ولاتی بابل بچوومایە.

لە (میتانی) ئەو شتەی لە هەمووی زیاتر سەرنجی ڕاکێشاین، جوانیی ژنەکانیان بوو و هەموویان بالابەرز و بەهێز و قەشەنگ بوون و هەر ئەوەندە زانییان کە من پزیشکێکی میسریم، هاتنە لام و گلەییان لە سارد و سڕیی مێردەکانیان دەکرد و دەیانگوت: پیاوەکانمان ناتوانن هەموو شەوێ لەگەڵماندا کۆببنەوە و ئەم بابەتە دەبێتە هۆی دڵڕەنجانی ئێمە.

من بینیم پێستی لەشی ئەو ژنانە ئەوەندە سپییە کە هاتوچۆی خوێنی ناو دەمارەکانیان بە رەنگێکی شین لە ژێر پێستیانەوە دیاربوو. پزیشکەکانی میسر لە کۆنەوە بۆ چارەسەرکردنی دیاردەی کەم توانایی جووت بوون بەناوبانگ بوون و لە هیچ ولاتێک بە ئەندازەی میسر لە چاک کردنەوەی ئەم دیاردەیە شارەزا نەبوون و من هەموو جارێ کە دەرمانێکم بۆ یەکێک لەو ژنانە دەبرییەوە، کە دەرخواردی مێردەکەی بدات. دەمزانی کە ئاکامێکی باشی هەبووە و ژنەکە دوای چەند رۆژێ دەهاتە لام و سوپاسی دەکردم و دەیگوت: ئێستا وەزعی مێردەکەم باشە و هەموو شەوێ دێتەلام . بەڵام ناتوانم بڵێم کە لەدوای ئەوەی دەرمانەکەم



دەدا بەو ژنانە، ئەوان دەرخواردی مێردەکانی خۆیانیان دەدا، یان دەیاندایە خۆشەویستە نهێنییەکەی خۆیان. چونکە لە(میتانی) ژنەکان وا راهاتبوون کە جگە لەمێردەکانی خۆیان، لەگەڵ پیاوێکی تریشدا پەیوەندییان هەبێت.

من سەرنجم دا ئەگەر چی ژنەکانیان کەڵەگەتن، بەڵام بە دەگمەن منداڵیان هەیە و تێگەیشتم کە خوایەکان لە گەلی (میتانی) تووڕەن، چونکە کاتێک منداڵ لە دایک نەبوو بەشێکی زۆری خەڵکی بریتی دەبێت لە پیرەمێرد و پیرەژنەکان و ئەو گەلە لە ناو دەچێت. ئەگەر چی چاککردنەوەی گرفتی سارد و سڕی پیاوەکان بەڕادەیەکی زۆر بووە هۆی دەرکردنی ناوبانگم، بەڵام چارەسەرکردنی یەکێک لە دەوڵەمەندە بەساڵاچووەکانی (میتانی)، سەرکەوتنەکەمی بەتەواوی گەیاندە لوتکە.

ئەو پیاوە پیرەمێردێکی زەنگین بوو کە بە دەست سەرئێشەوە دەینالاند و دەیوت بەردەوام لە گوێچکەمدا گوێم لە دەنگێکە کە وەک گرمەی هەورە بروسکە وایە و دەیگوت: چوومەتە لای هەموو پزیشکەکانی (میتانی)، بەڵام نەیانتوانییوە چاکم بکەنەوە.

رۆژێکیان پێم وت کە بێتە ماڵەوە بۆئەوەی لەوێ بڕوانمە سەری و دوای هاتنی، دام نیشاند و بە پەنجە دەمدا بەسەر بەشە جیاجیاکانی سەری و دەیگوت هیچ جێگایەکی نایەشێت. دوایی چەکوشم بەدەستەوە گرت و بەهێواشی دەمدا بەسەر بەشەکانی سەری. لە ناکاودا هاوارێکی کرد و بوورایەوە و تێگەیشتم کە عەیبەکەی سەری لەو خاڵە دایە، کە چەکوشەکەی لێ کەوتووە و ئەو جێگایەم نیشانە کرد و دوایی بە پزیشکەکانی (میتانی)م گوت: بەتەمام سەری ئەو پیاوە نەشتەرگەری بکەم.

ئەوان گوتیان: ئەگەر سەری کون بکەی دەمرێت.

وتم: منیش بەڵێن نادەم کە چاکی بکەمەوە من دەڵێم ئەگەر سەری نەشتەرگەری نەکەین و غودەکە لەسەریدا بمێنێتەوە، بێگومان دەمرێت.

پزیشکەکانی ئەوێ بوونی غودەیان لە ناو سەری پیاوەکە نەسەلماند. دوایی لەگەڵ خودی نەخۆشەکە دانیشتم و قسەم کرد و ئەو وتی: بەم ئازارەی سەرمەوە من هەموو رۆژێ دەجار دەمرم و ئەگەر سەرم کون بکەی و بە یەکجاری بمرم رزگارم دەبێت.

رۆژێکمان بۆ نەشتەرگەرییەکە دیاری کرد و بڕیارمان وابوو هەندێ لە پزیشکەکان بێن و نەشتەرگەرییەکە ببینن، بەمەرجێ دەست لە کارەکە وەر نەدەن. خۆم و نەخۆشەکەم خاوێن کردەوەو هەندێ زیوم پەیدا کرد، کە لە دوای هەڵگرتنی ئێسکی سەر لە جێی ئێسکەکە دای بنێم. دوایی تریاکم کردە دەماری نەخۆشەکەوە کە هەست بە ئازار نەکات و ئەو خاڵەی دەمزانی غودەکەی تێدایە ئێسکەکەیم دوای لابردنی پێستی سەری هەڵگرت و، مێشکی دەرکەوت.

نەخۆشەکە هیچ هەستی بەئازار نەدەکرد و تەنانەت چاوەکانیشی کراوەبوون. کە مێشکی دەرکەوت بانگی پزیشکەکانم کرد کە بێنە پێشەوە و هەموو بینیان غودەیەک لەسەر مێشکی پیاوەکەدایە کەبە ئەندازەی هێلکەی پەڕەسێلکەیەک دەبوو.

وتم: ئەم غودەیە کە بۆتە هۆی ژانە سەرەکەی، ئێستا لە سەر مێشکی لای دەبەم و دەری دەکەم.

لەو کاتەی خەریکی لێ کردنەوەی غودەکە بووم (کاپتا) کە هەندێ لە کارەکانی نەشتەرگەری و قاڵب گرتنم فێر کردبوو، لەسەر ئێسکە بڕاوەکە قالبی دروست کرد و زیوی کردە قالبەکەوە و کەرتێ زیو بە قەدەر ئێسکە شکاوەکە لە قالبەکەی هاتە دەرەوە.

من ئەو زیوەم دوای سارد بوونەوە خستە سەر کونی کاسەی سەری نەخۆشەکە و پێستی ئەم لاو ئەو لای سەریم هێنایەوە یەک و دووریمەوە و مەڵحەمم بەسەردا کرد و پێچامەوە و لە نەخۆشەکەم پرسی: وەزعت چۆنە؟

پیاوەکە هەڵسایەوە و وتی: هیچ هەست بە ئازار ناکەم و چەند ساڵە ئەمە



یەکەمین جارە کە خۆم بە ئاسوودەیی و بێ ئازار دەبینم.

پێم وت: تا کاتێ کە برینی سەرت چاک نەبۆتەوە نابێت شوێنی نەشتەرییەکە بجوولێنیت و باشتر وایە رابکشێی و چەند رۆژێ پشوو بدەیت. ئەو پیاوە برینەکەی چاک بووەوە و بە تەواوی هەڵسایەوە و بڕیاری دا لە جیاتی کاتەکانی رابردوو کە توانای رابواردن و خۆشگوزەرانی نەبووەو ژانەسەر نەیهێشتبوو بەم کارانەوە خەریک بێت، دەست بکاتەوە بەم سەرگەرمییانەو خەریکی خۆشگوزەرانی بێت و شەوێکیان کە بەبۆنەی گەرمیی هەوا لەسەر سەربان دەیخواردەوە، لەبەر سەرخۆشی بەر دەبێتەوە و دەمرێت.

بەڵام هەموو خەڵکی بەتایبەت پزیشکەکانی ئەوێ دانیان بەو راستییەدا نا کە هۆی مردنەکەی مەستی بووە و پەیوەندیی بە منەوە نەبووە، چونکە چاکم کردبۆوە و لە ژانە سەر و مەرگ رزگارم کردبوو و ئەم چارەسەرە بەشێوەیەک لە (میتانی) ناوبانگی دەرکرد کە دەنگ دانەوەکە گەیشتە (بابل)یش. ئەو هەرێمەی لە ژێردەسەڵاتی (بابل)ە چەند ناوێکی هەیە و هەندێ جار (کەلدە)ی پێ دەڵێن و جاری واش هەیە پێی دەڵێن (خوسی)، بەڵام من، بابلی پێ دەڵێم چونکە کاتێک کە ناوی بابل وترا هەموو کەسێ دەزانێت مەبەست کوێیە.

بابل وڵاتێکی بەپیتەو زەوییەکانی تەختەو هەرچەندە لێی بڕوانی هەر زەویی هەموار دەبینرێ و شاخی تێدانییە. لە میسر ژنەکان بۆ گەنم هاڕین، ئەژنۆ لەسەر زەوی دادەنێن و بەردی ئاشەکە (دەستاڕ) دەسووڕێنن، بەڵام لە بابل، ژنەکان لە کاتی گەنم هاڕین بە پێوە دەوەستن و دوو بەردی ئاش لە دوو لای دژ بەیەکەوە دەخولێننەوە و ئەم کارەی ئەوان لەوەی ژنە میسرییەکان سەختترە.

لە بابل ئەوەندە دار کەمە، کە ئەگەر یەکێک دارێک ببڕێتەوە گرفتاری تووڕەیی خوایەکان دەبێت. هەموو دانیشتووانی بابل قەڵەو بوون و خواردنەکانیان چەور بوو و ئاردی گەنمیان تێ دەکرد. لە بابل باڵندەیەکی سەیرم بینی کە نەیدەتوانی بفڕێ و ئەم باڵندەیە لە زۆربەی ماڵەکاندا هەبوو و

(ماکیان)یان پێ دەگوت[1].

ماکیان ئەگەرچی قەبارەی گەورە نەبوو، بەڵام هێلکەکانی بەئەندازەی هێلکەی تیمساح دەبوو و دانیشتووانی بابل هێلکەی ئەم باڵندەیەیان دەخواردو سەیر ئەوەبوو، ماکیان، هەموو ڕۆژێ هێلکەیەکی دەکرد، بەڵام تیمساح یان باڵندەکان لە کاتێکی دیاری کراودا هێلکەیان دەکرد.

دانیشتووانی بابل بە هێلکەی ئەم مریشکە خواردنی جۆراوجۆریان دروست دەکرد، بەڵام من لەو خواردنانەم نەدەخوارد و ئەو چێشتانەم بەس بوو کە خۆم دەمناسین. بابلییەکان دەیانگوت: وڵاتەکەیان کۆنترین و گەورەترین شاری جیهانە، بەڵام من باوەڕم بە ئەم قسەیەیان نەدەکرد، چونکە (تەبەس) لە بابل گەورەتر و کۆنتر بوو، بەڵام دەتوانم بڵێم کە بابل لە تەبەس شکۆمەندتر بوو و ئەو دیوار و باڵاخانانەی کە لە بابل هەبوو لە تەبەس بەدی نەدەکرا.

لە بابل دیوارەکان ئەوەندە بەرزبوون کە لە کێو دەچوون و خانووەکان چوار یان پێنج قات بوون و لە هیچ جێگایەک تەنانەت لە تەبەسیش خانە بازرگانییەکان بە ئەندازەی خانەکانی بازرگانی بابل گەورە نەبوون.

خوای دانیشتووانی بابل ناوی (مەردوک) بوو، بەڵام (عەشتار)یشیان دەپەرست و دەروازەیەکیان بۆ ساز کردبوو کە دەروازەی (عەشتار)یان پێ دەگوت و ئەم دەروازەیە لە دەروازەی پەرستگەی (ئاموون) ی تەبەس بەرزتربوو.

لەئەم دەروازەیەوە شەقامێک هەبوو کە بە بورجی (مەردوک) کۆتایی پێ دەهات و ئەم بورجەیان بە شێوەیەک دروست کردووە کە شەقامێک بەدەوری دا دەسوڕێتەوە هەتا دەگاتە لوتکەی بورجەکە و ئەوەندە ئەم شەقامە پانە کە چەند گالیسکە دەتوانن لە تەنیشت یەکەوە پێیدا بڕۆن. لەبان ئەم بورجە بەرزەدا ئەستێرەناسەکانی لێ بوو و ئەوان جووڵەی ئەستێرەکانیان دەپێوا و ڕۆژەکانی بەخت و ڕۆژە خراپەکانیان دەست نیشان دەکرد و خەڵکی بە پێی ڕۆژ ژمێری ئەوان کاریان دەکرد.



دەڵێن ئەستێرەناسەکان دەتوانن لە سەر ئەستێرەکان ڕووداوەکانی ئایندەی خەڵکی پێشبینی بکەن، بەڵام بە مەرجێ ئەو کەسەی دەیەوێت ئاگاداری ڕووداوەکانی داهاتووی بێت، دەبێ بزانێ کە لە چ ڕۆژ و سەعاتێکدا لە دایک بووە و من لەبەر ئەوەی ڕۆژ و کاتی لە دایک بوونم نەدەزانی نەمدەتوانی بچمەلای ئەوان.لە دوای چوونم بۆ بابل بەهۆی لەوحە گڵە سوورەکانەوە کە لەگەڵ خۆمدا هێنابووم هەرچەندە زێرم پێویست بوو لە خانە بازرگانییەکانی بابلم وەرگرت. پاشان لە میوانخانەیەکی گەورە و چەند نهۆمی نزیک دەروازەی (عەشتار) نیشتەجێ بووم. ئەم میوانخانەیە جێگای مانەوەی ئەو دەوڵەمەندانەبوو کە لە بابل خانوویان نەبوو، بۆ نموونە سەرۆکی خێڵەکان کاتێ لە وڵاتانی ترەوە دەهاتنە بابل و لەو میوانخانەیە نیشتەجێ دەبوون بە کەژاوەی گەورەی میوانخانەکە، کە چل کەس هەڵیان دەگرت دەچوونە لای پاشای بابل.

هەموو ژوورەکانی ئەم میوانخانەیە دیواری نەخشێنراوی هەبوو کە وەک شووشە وایە و کاتێ کە دەست بەسەر خشتەکانیدا دەهێنی وەک ئەوە وایە کە دەست بکێشی بە بان ئاوداو هەست بە زبری و ناڕێکی ناکەیت. بنمیچی ئەم میوانخانەیە کە لە ئاستی زەوییەوە زۆر بەرز بوو گوڵی لێ چێندرابوو و ئەگەر یەکێ خۆی نەیبینێ باوەڕ ناکات و وا دەزانێ ئەفسانەی بۆ دەگێڕمەوە.

ئەم میوانخانە چەند قاتە کە ناوی (کۆشکی عەشتار) بوو بە میوانەکان و خزمەتکارەکانییەوە ئەوەندە قەرەباڵغە کە بە قەدەر گەڕەکێکی شاری تەبەس خەڵکی تێدا بوو. کاتێ کە لە تەبەس بووین پێیان دەگوتین بابل کەوتۆتە قەراغ دنیاوە و لەو دیویەوە هیچ جیهانێک نییە. دوای ئەوەی چوومە بابلەوە و لەگەڵ خەڵکی کەوتمە گفتوگۆ، بیستم دەیانگوت: بابل چەقی دنیایە و لە لای ڕۆژهەڵاتی بابل ئەوەندە زەوی و وڵاتانی لێیە کە ئەگەر شەش مانگ بەردەوام شەو و ڕۆژ بە ڕێدا بڕۆی ناگەیتە کۆتایی ئەو زەوییانە.

من باوەڕم بەم قسەیە کرد، چونکە لە بابلدا هەندێ نەتەوەم بینی کە هیچ

یەکێکیان لە میسردا نەدەبینران و تەنانەت هەندێ کەسم بینی کە ڕەنگیان زەرد بوو بەبێ ئەوەی دەم و چاویان ڕەنگ کردبێ و هەموو بازرگان بوون و بارەکەیان جۆرێک پارچەی ناسک بوو کە لە بابلدا دەیانفرۆشت و، من لە بابلییەکانم بیست کە دەیانگوت: ئەو پارچە تەنکانە، نە لە خوریی مەڕ دروست بووەو نەلە پەمۆ، بەڵکو لە تاڵی کرمێکی تایبەت ئەو پارچانە دروست کرابوون و، من لەم وتەیە زۆر سەرم سوڕما، چونکە تا ئەو ڕۆژە نەمبیستبوو کە لە تاڵی کرم پارچە بڕێسرێ.

بابلییەکان گەلێکی بازرگانن و هەموویان سەرگەرمی بازرگانی بوون و تەنانەت خوایەکانی ئەوانیش بە مامەڵەوە خەریک بوون. ئەوان لە جەنگ بێزاربوون، چونکە شەڕ دەبووە هۆی بەستنی ڕێگا بازرگانییەکان و بار و کەل و پەلی کاروانەکانی دەگەڕاندەوە. ئەوان دەیانوت: پێویستە ڕێگاکان بۆ بازرگانی لەگەڵ هەموو جیهاندا کراوە بێت و خەڵکی ئازادانە بۆ هەموو شوێنێک بێن و بچن.

ئەوان بۆ بەرگری کردن لە بابل، سەربازیان بەکرێ گرتبوو و لەسەر بورج و شوورەکانی بابل پاسەوانییان پێ دەکردن. دیمەنی ڕێکردنی سەربازەکان کە خوودەی زێڕ و تەلی کانزاییان بەسەرەوە بوو سەرنجڕاکێش بوو. من لە پێشا وام زانی کڵاو و خوودەکانیان یەکپارچە زێڕ یان تەلە، بەڵام دوایی بۆم دەرکەوت خوودەکان لە (حەوجۆش) دروست کرابوون و دوایی رووکەشی زێڕ، یان تەلیان بەسەرەوە دەکردو سەربازەکان دەسکی شمشێرەکانیان لە زێڕ، یان زیو دروست دەکرد بۆئەوەی وای نیشان بدەن کە زەنگینن.

گالیسکە جەنگییەکانیشیان جوان بوون کە من هاوتای ئەوانەم لە وڵاتانی تر و لە میسریشدا نەدیبوو و بابلییەکان پێیان دەوتم: ئەی میسری... ئایا لە هیچ جێگایەک گالیسکەی وا قەشەنگت دیوە؟

منیش لە وەڵامدا دەمگوت: نا..



پاشای بابل گەنجێک بوو کە هێشتا موو لە دەم و چاوی نەهاتبوو، بۆیە کاتێک کە دەستی بە پاشایەتی کرد ریشێکی دەستکردی بە چەناگەیەوە نووساند، کە وا نیشان بدات پیاوێکی پێگەیشتووە و کاتێ چوومە بابلەوە بیستم کە حەزی بە شتی یاری و داستانی پێکەنیناوییە.

لە وڵاتی میسردا قوتابخانەی پزیشکی لە خانەی ژیاندا بوو و ئەو دامەزراوە خاوەن ناوەندێتی زانستی بوو، بەڵام لە بابل ناوەندی زانستی شار، بورجێکی بەرز (مەردوک) بوو و هەموو پزیشکە گەورەکان و ئەستێرە ناسە پایەبەرزەکان لەوێدا بوون و من هەر زوو لەگەڵ هەندێ لە پزیشکەکان و ئەستێرەناسەکان قسەو باسم کردو بۆم دەرکەوت لە بابلدا ئەوەندەی بایەخ بە ئەستێرەناسی دەدەن ئەوەندە پزیشکی سەرنجی ڕانەکێشاون.

هەروەها لە بابل زانستی پزیشکی تەنها دەخوێندرا و بەعەمەلی کاری لەسەر نەدەکراو من دوای ئەوەی چوومە بورجی (مەردوک)ەوە، بینیم پزیشکەکان لەسەر چارەسەری نەخۆشییەکان خەریکی گفتوگۆ بوون بە بێ ئەوەی لەسەر لاشەکان و نەخۆشەکان کار بکەن و لە خانەی ژیان لێکۆڵینەوە و توێکاری گرنگییەکی تایبەتی هەیە و پزیشک تا ئەو کاتەی بەدەستی خۆی تەرمەکەشی نەکاتەوە فێری زانیاریی زانستی نابێت.

من ویستم لەم بەشەدا چەند تێبینییەک بدەمە پزیشکەکانی بورجی (مەردوک)، بەڵام لەبەرئەوەی تازە هاتبوومە بابلەوە وام بیردەکردەوە کە دەبێتە هۆی دڵڕەنجاندنیان و وا هەست دەکەن کە من دەمەوێت خۆم هەڵبکێشم یان بۆ ئەوە هاتوومە سووکایەتییان پێ بکەم.

***

١- مەبەست لە ماکیان، مریشکە کە وادیارە ئەو باڵندەیە ئەو کات لە میسردا نەبووە- وەرگێڕ

# چاوپێکەوتن لەگەڵ پاشای بابل

کاتێ کە لە وڵاتی (میتانی) بووم ناوبانگی من گەیشتبووە بابل و لەوێدا بە پاشاشیان راگەیاندبوو و دوای جێگیربوونم لە میوانخانەکەی بابل و گفتوگۆ کردن لەگەڵ پزیشکەکانی بورجی (مەردوک) رۆژێک لە لایەن پاشای بابلەوە پیاوێک بە شوێن مندا هات و وتی: پاشا بانگهێشتی جەنابتی کردووە.

(کاپتا) کە بیستی لەلایەن پاشاوە بانگ کراوم، ترسا و وتی: مەڕۆ چونکە رۆیشتن بۆلای پاشا مەترسیی هەیە.

وتم: بۆچی؟

(کاپتا) وتی: ئەم پاشایە خۆ فیرعەونی ئێمە نییە و ئێمە نایناسین و نازانین خوای ئەو چۆن بیردەکاتەوە و چیی پێ تەڵقین کردووەو، لەوەیە دوای بینینی تۆ ئەمر بکات بتکوژن.

وتم: (کاپتا) من پزیشکم و کارێکی وام نەکردووە کە شایانی کوشتن بم و، پاشای بابل بمکوژێ.

(کاپتا) وتی: ئەگەر دەتەوێ بچیتە لای، منیش ببە بۆئەوەی ئەگەر تۆی کوشت منیش لەگەڵ تۆدا بکوژرێم، چونکە دوای مردنی تۆ، ژیان بۆ پیاوێکی وەک من، کە بەندەیەکی پیرم بێ بایەخە درێژەی نابێت و مردنم باشترە. هەروەها ئەگەر دەتەوێ بڕۆی بۆلای پاشا فەرمان بدە کەژاوەیەکت بۆ بهێنن کە بە رێزەوە بەرەو (دەربار)ی[1] پاشا بڕۆی، چونکە پزیشکێکی میسری کە خوێندنی لە خانەی ژیان تەواو کردبێ پیاوێکی گەورەیە و شایانی ئەوەیە کە بەرێزەوە پێشوازیی لێ بکرێ و سێیەمیش ئەوەیە کە ئەمڕۆ مەچۆرە لای پاشا.



وتم: بۆ ئەمڕۆ نەچمە لای؟

وتی: لەبەرئەوەی ئەمڕۆ هەموو شوێنە بازرگانییەکان و کرێکارانی بابل دەستیان لەکار هەڵگرتووە، چونکە ئەستێرەناسەکان دەڵێن ئەمڕۆ کارکردن و لە ماڵ دەرچوون شوومە، چونکە حەوتەمین رۆژی هەفتەیە.

من بەسەر سوڕمانەوە وتم: هەفتە چییە!؟

بەندەکەم وتی: ئەو کاتەی تۆ رۆیشتی بۆ بورجی (مەردوک)، کە لەگەڵ پزیشکەکان گفتوگۆ بکەی، لە کاتی قسەکردنم لەگەڵ خزمەتکاری میوانخانەکەدا، تێگەیشتم کە لێرە مانگیان کردووە بە چوار بەشەوە و بەهەر بەشێک دەڵێن هەفتە و ئەو هەفتەیە حەوت رۆژە و شەش رۆژیان بەکارەوە خەریک دەبن و رۆژی حەوتەم دەست لەکار هەڵدەگرن. چونکە ئەستێرەناسەکان کە لەگەڵ خوایەکان و ئەستێرەکان پەیوەندییان هەیە وتەی خوایەکان دەگێڕنەوە، کە کارکردن لە رۆژی حەوتەمدا شووم و نەهاتییە و نابێ لەم رۆژەدا لەماڵ بچیتە دەرەوە و بۆ بازاڕ بڕۆی و خزم و دۆست لە ماڵەکانیاندا بەسەر بکەیتەوە.

من لە دوای کەمێک بیرکردنەوە وتم: راست دەکەیت، چونکە مادام لێرە کارکردن و لەماڵ دەرچوونی رۆژی حەوتەم مەترسیی هەیە، ئێمەش لەبەرئەوەی بیانین، دەبێ پەیڕەوی لەو رێ و رەسمەی ئێرە بکەین. چونکە بێ گومان خوایەکانی بابل رەچاوی هۆکار و بەرژەوەندییەکان دەکەن، کە دەڵێن کارکردن لە رۆژی حەوتەم زیان بەخشە و ئێمە ئەگەر ئەمڕۆ بچینە لای پاشا گرفتاری نەهامەتی دەبینەوە.

لەبەرئەوە بە نێردراوەکەی پاشام گوت: پێم سەیرە کە تۆ چۆن لەم رۆژی حەوتەمەدا بانگهێشتی ئێمە دەکەی بۆ کۆشک و تەلاری پاشا؟ لەگەڵ ئەوەشدا کە دەزانی ئەمڕۆ رۆژی کارکردن نییە. بڕۆ و لەلایەن منەوە بە پاشا بڵێ کە سبەینێ دێمە لای، بەمەرجێ کەژاوەیەکم بۆ بنێرێت کە سواری ببم، چونکە من پیاوێکی کەم نیم و شایانی ئەوەم کە بە رێزەوە پێشوازیم لێ بکرێت.

پیاوەکە ڕۆیشت و ڕۆژی دوایی بینیم بە کەژاوەیەکی بچووک لەو کەژاوانەی مامەڵەچییەکان بۆ خستنە رووی کەل و پەلەکانیان دەیبەن بۆ کۆشک هاتەوە و ویستی من سواری ئەوە بکات. (کاپتا) کاتێ کە ئەوەی بینی تووڕە بوو و وتی: من لە خوای (مەردوک) داواکارم بە قامچییەکەی خۆی کە لە دووپشکی گەورە دروست کراوە، ئێوە دارکاری بکات... ئێوە چۆن هەستتان بەوە نەکردووە کە گەورەکەی من پیاوێک نییە کە سواری ئەم کەژاوە بچووکە ببێت... زوو لێرە دووری بخەنەوە، بۆ ئەوەی چرو چاوتان نەبینم.

ئەو بەندانەی کەژاوەکەیان هێنابوو لەم قسەیە سەریان سوڕما و، ئەو خەڵکانەی کە لەبەردەم میوانخانەکەدا کۆببوونەوە، بە پێکەنینەوە بە (کاپتا)یان وت: ئێمە دەمانەوێت ئەم گەورەیەی تۆ ببینین و بزانین بۆ ئەم کەژاوەیە بۆ ئەو بچووکە؟

(کاپتا) لە خاوەن میوانخانەکە کەژاوەیەکی گەورەی بۆ ڕۆیشتن بۆ کۆشک بە کرێ گرت، کە چل بەندە هەڵیان دەگرت و من لە میوانخانەکە هاتمە خوارەوە. کاتێ خەڵکی منیان بە جل و بەرگی میسری و ملوانکەی زێڕەوە بینی، بێدەنگ بوون و دەستیان لە گاڵتە پێ کردن هەڵگرت، چونکە زانییان پیاوێکی بیانی بەرەو کۆشکی پاشا دەڕوات کە لەولاتەکەی خۆیدا بێ بایەخ نییە.

بەکێک لە بەندەکانی میوانخانەکە لە دواوەی کەژاوەکە دەهات و شتومەکی پزیشکی منی هەڵگرتبوو کە لە سندووقێکی بچووکدا بوو و، (کاپتا)ش لە پێشەوەی کەژاوەکەدا بە سواری گوێدرێژ دەڕۆیشت. ئێمە بەم شکۆمەندییەوە گەیشتینە کۆشکی پاشایەتی و هەندێ لە دانیشتووانی شاریش نزیک و دوور دوای ئێمە کەوتبوون. لەوێدا لە کەژاوەکە هاتمە خوارەوە و بینیم هەندێ پاسەوان لەبەردەم کۆشکدا وەستاون و قەڵغانە سپی و زەردەکانیان بەیەکەوە نووساندبوو، بە جۆرێک کە لە قەڵغانەکان دیوارێک دروست ببوو و کاتێ منیان بینی قەڵغانەکانیان لێک جیاکردەوە و ڕێگایان دا من بە ناوەڕاستیاندا تێ پەڕیم و



بۆ ناو کۆشک بچم.

لەوێ پیاوێکی پیر لێم نزیک بووەوە، کە دەمو چاوە تاشراوەکەی نیشانی دەدا لە زاناکانە و گوارەی زەردی لە گوێ کردبوو و لۆچ کەوتبووە دەمو چاوی و وتی: من لەم هەرا و هوریایەی لەم شارەدا بەرپات کردووە ئاگادارم و خاوەنی چوار ولات (پاشای بابل - وەرگێڕ) دەپرسێت ئەم پیاوە کێیە کە هەر کاتێ خۆی مەیلی لێ بێت دێتەلام و کاتێک کە بانگهێشتی دەکەم نایەتە لام؟

من وەڵامم دایەوە: ئەی پیاوی بەساڵاچوو تۆ کێیت کە لەگەڵ مندا بەم شێوەیە دەدوێی؟

وتی: من پزیشکی تایبەتی خاوەن چوار ولاتم و لە بابلدا ڕێز و ناو بانگێکی زۆرم هەیە، بەڵام تۆ کێیت کە بە تەماحی دەستکەوتنی زێڕ بەم قەرەباڵغییەوە هاتوویتە ئێرە و کاتێ خاوەن چوار هەرێم بانگهێشتت دەکات نایەیت؟ من هێشتا بە تەواوی تۆ ناناسم، بەڵام ئەوە بزانە کە ئەگەر پاشای بابل زێڕ و پارەت بداتێ دەبێ نیوەی بدەیتە من. ئەگەر نا ناهێڵم تۆ لێرەدا پزیشکی بکەیت.

وتم: پیرەمێرد من هەرگیز لە بارەی زێڕ و زیو لەگەڵ ئەو کەسانەی دەرۆزە دەکەن و حەزیان بە پارەیە نادوێم و ئەم کارەم بە بەندەکەم سپاردووە. بەڵام لەبەرئەوەی دەڵێی پزیشکم و بەساڵاچوویت، دۆستایەتییەکەتم پێ باشترە لە دوژمنایەتیت و حەزدەکەم لە گەڵتدا ببمە هاوڕێ و بۆئەوەی بزانی من بۆ بەدەست هێنانی زێڕ نەهاتووم و تەنها مەبەستم کۆکردنەوەی زانستە، هەردوو بازووبەندە زێڕەکەی خۆمت دەدەمێ.

دوایی بازووبەندەکانم لە دەستم دەرهێناو دام پێی و ئەو ئەوەندە خۆشحاڵ و حەپەسا بوو کە ئیتر قسەی نەکرد و ڕازی بوو کە بەندەکەشم (کاپتا) لەگەڵمدا بێتە لای پاشا.

پاشای بابل ناوی (بورا بوریاش) بوو و کاتێ چوومە لای وام دەزانی

منداڵە، چونکە پێیان وتبووم کاتێ کە کرا بەپاشا مووی لێ نەهاتبوو و ریشی دەستکردی بە چەناگەیەوە نابوو، بەڵام روانیم گەنجەو دەرکەوت ئەوانەی لەبارەی ئەو زانیارییان بەمن دابوو لە رابردوودا ئەویان بینیوە و بەجۆرێک کە لە ناو خەڵکی ئاساییدا روو دەدات، بەسەرچوونی تەمەن لەبیردەکرێت و ئەوان بیرلەوە ناکەنەوە کە هەموو منداڵێک گەورە دەبێت و دەگاتە قۆناغی گەنجی.

لە تەنیشت (بورا بورباش) شێرێکی بچووکی لێبوو و کە ئێمەی بینی خرۆشا. پیرەمێردەکەی کە دەیوت پزیشکی فیرعەونم کاتێک کە چووینە ژوورەوە سوجدەی برد و کاپتای بەندەی منیش چاوی لەو کرد، بەڵام لەو کاتەدا جارێکی تریش شێرەکە نەڕاندی و کاپتا بەشێوەیەک ترسا، کە لە جێگای خۆی هەڵبەزییەوەو هاواری کرد.

پاشا لە بەرزبوونەوە و هاوارەکەی (کاپتا) کەوتە پێکەنین و کاپتا وتی: ئەم ئاژەڵە تووڕەیە لێرە ببەنە دەرەوە، چونکە من بە درێژایی تەمەنم گیانەوەری وا ترسناکم نەبینیوە و دەنگی ئەم ئاژەڵە لە گالیسکە جەنگییەکانی (تەبەس) دەچێت کە لە دوای خۆرئاوابوون دەگەڕێنەوە بۆ سەربازخانەکەیان.

(کاپتا) ئەم قسانەی بە زمانی بابلییەوە دەوت و پاشا ئەوەندە پێکەنی کە فرمێسک بە چاویدا هاتە خوارەوە. دوایی بیری هاتەوە کە منی بۆ چارەسەری نەخۆشییەکەی بانگ کردووە و دەستی خستە سەر دەمو چاوی و ناڵاندی، سەیرم کرد ئاوساوییەکی گەورە بە دەم و چاوییەوەیە و لەبەر گەورەبوونی ئەو هەڵئاوسانە چاوێکی بە باشی نەدەبینرا.

پیرەمێردەکەی بازووبەندەکەم دابوو پێی، وتی: ئەمە ئەو پزیشکە خۆپەسەندە میسرییەیە کە دوێنێ ناردت بە شوێنیدا و نەهات و وتبووی سبەینێ دێم و، وا باشترە بە سەربازەکانت بڵێیی هەر ئێستا بە نەیزەکانی خۆیان سکی کون بکەن.

پاشا وتی: من ئێستا نایکوژم، چونکە بۆ ئەوە بانگم کردووە کە ئازارەکەم ببینێ و چەند شەوە کە نەنووستووم و لەم ماوەیەدا جگەلە شلەمەنی هیچ شتێکم



نەخواردووە.

پیاوە پیرەکە وەک یەکێک کە کەوتبێتە گریان وتی: ئەی خاوەنی چوار وڵات، چەند رۆژ لە پەرستگەی (مەردوک) قوربانییمان بۆ کردی و کراسی سوورمان لەبەر کرد و تەپڵمان لێدا و سەمامان کرد کە ئەو ئازارەی خراوەتە ناو دەمت بێتە دەرەوە. بەڵام تۆ نەتهێشت دەست لە دەمت بدەین و ئەگەر روخسەتت بداینایە دەمانتوانی چارەسەرت بکەین و من لەو باوەڕەدانیم کە ئەم پیاوە بیانییە بتوانێ چاکت بکاتەوە.

پاشا رووی کردە من و وتی: تۆ کێیت و ئایا دەتوانی پێم بڵێیی ئەم ئازارەی من لە چییەوە دروست بووە؟

وتم: من (سینوهە) پزیشکی میسری و کوڕی کەرم و، ئەگەر چی هێشتا دەمتم نەبینیوە، بەڵام دەتوانم بڵێم کە هۆی ئازارەکەت ئەوەیە کە یەکێک لە ددانەکانی هاڕینت جەراحەتی کردووە و ئەم جەراحەتە لە بنی ددانەکەتدایەو بۆتە هۆی ئاوسانی و هۆی ئاوساوییەکەی روومەتت ئیلتیهاب کردنی ددانەکەتە. لەبەرئەوەی کەلە کاتی خۆیدا ددانەکانت خاوێن نەکردۆتەوە و کاتێک کە رەگی ددانەکەت تێکچوو دەرت نەهێنا. چونکە ئەگەر رەگی ددان رەش بووەوە و بۆگەنی کرد دەبێ دەربکرێت.

پاشا وتی: من دەمزانی کاتێ کە رەگی ددان تێکچوو دەبێت دەری بهێنی، بەڵام ئازاری دەرکردنی ددان ئەوەندە زۆرە کە ناتوانم خۆمی بۆ بگرم.

وتم: لە میسردا ددان دەرکردن زۆر ئازاری نییەو ئەگەر بتەوێ دەتوانم ددانەکەت بەبێ ئازار دەربهێنم، بەڵام ئەمڕۆ ناتوانم دەست لەم کارە وەربدەم، چونکە ددانەکەت ئاوساوە و دەبێت لە پێشا ئاوساوییەکە چاک بکەینەوە و کێم و جەراحەتەکە لەبن ددانەکەتدا دەربهێنین و دوای چەند رۆژێ ئینجا ددانەکە دەربهێنین.

وتی: ئایا دەتوانی ئەو جەراحەتە لەبن ددانەکەمدا دەربهێنی؟

وتم: بەڵێ.. من بۆ دەرکردنی ناچارم ئاوساوییەکە هەڵبدڕم و هەرچەندە لەسەر شێوەی کاری (تەبەس) نەشتەریی دەکەم کە زۆر ئازاری نەبێت، بەڵام دەبێ پێت بڵێم کە کردنەوەی ئاوساوی بۆ هێنانە دەرەوەی جەراحەت کەمێ ژان دەکات. چونکە خوایەکان کە دەردیان دروست کردووە، دەسەڵاتدارانیان لێ ریزپەڕ نەکردووە و ئەوانیش وەک خەڵکی ئاسایی دووچاری ئازار دەبن.

من بە کاپتام وت: خێرا ئاگرێ بکاتەوە، بۆئەوەی کێردەکەم لەئاگردا خاوێن بکەمەوەو کاتێ کە خەریکی ئاگرکردنەوە بوو هەندێ شەرابم لەگەڵ تریاکدا تێکەڵ کرد و دەرخواردی پاشای بابلم دا. کاتێ کە شەرابەکەی نۆشییەوەو کەمێکی پێ چوو، وتی: وا هەست دەکەم ئیتر پێویستیم بە تۆ نییە، چونکە ئازارم نەما.

وتم: ئەم هێوربوونەوەیە کاتییەو پاش کەمێکی تر ژانەکە زیاد دەکات.

وتی: دەکرێ دیسانەوە ئەم دەرمانەم دەرخوارد بدەی بۆئەوەی ئازارەکەی نەمێنێت؟

وتم: ئەم دەرمانەی دەرخواردتم دا، تەنها یەک جار زیانی نییە و ئەگەر جاری دووەم و سێیەم بەکاری بێنی دەبێتە عادەت و ئەو کاتە بۆ زیندوو مانەوەت پێویستت بەم دەرمانە دەبێت، بەبێ ئەوەی ئازارەکەت کەم بکاتەوە. دە بهێڵە ئێستا، کە ئازارەکەت کەم بووەتەوە ئاوساوییەکەی بن ددانت هەڵبدڕم و چڵک و جەراحەتەکەی دەربکەم.

پاشا بە نەشتەرگەرییەکی بچووکی ددانی رازی بوو و دوای ئەوەی کێردەکەم لە ئاگردا خاوێن کردو دوایی ساردم کردەوە، لێی نزیک بوومەوە و سەریم خستە ژێر باخەڵمەوە و دەمیم کردەوە. هەرچەندە خواردنی تریاکەکە ئازاری کەم کردبووەوە، بەڵام دوای ئەوەی ئاوساوییەکەی ددانیم هەڵدڕی لەبەر ئازار هاواری کرد و شێرەکەی هەڵساو کلکی راتەکاندا، بەڵام پەلاماری نەداین.

دوای ئەوە پاشا چیی تر نەینالاند، چونکە ئازارەکەی نەما و دەرهێنانی



جەراحەتەکەی ناودەمی لەوکاتەدا بووە هۆی بەبەرستێک بۆ قسەکردنی.

پاش تەواوبوون پاشا وتی: ئەی پزیشکی میسری، تۆ پیاوێکی گرانبەهای، چونکە ئێستا هەست بە ئازار ناکەم.

پزیشکە پیرەکە کە لەوێ وەستابوو وتی: ئەگەر تۆ روخسەتت بدایە ئاوساوییەکەی دەمتم هەڵبدڕیبایە وەک ئەم پیاوە میسرییە دەمتوانی جەراحەتی ددانت دەربهێنم بۆئەوەی ئازارەکەی نەمێنێت.

وتم: ئەم پیاوە راست دەکات و ئەگەر جەنابت دەرفەتت بدایەتێ ئاوساوییەکەی نەشتەرگەری بکردایە هەمان دەرئەنجامی دەبوو، بەڵام ئەم پیاوە بەساڵاچووە نەیدەوێرا پێ لەسەر داواکارییەکەی دابگرێ و ددانتی چارەسەر بکردایە، چونکە دەترسا جەنابت تووڕە ببی. ئەگەر چی پزیشک دەبێت بوێر بێت و لە تووڕەیی نەخۆش، ئەگەر چی پاشاش بێت نەترسێ و من لە تەبەس هەرگیز لە نەخۆشەکان نەدەترسام.

پاشای بابل کە بە تەواوەتی لە ئازارەکەی ئاسوودە ببوو وتی: (سینۆهە) ئەگەر چی تۆ پیاوێکی بێ باکی و بە لەخۆڕادیتنەوە قسە دەکەی، بەڵام من چاوپۆشی لەم رەفتارەت دەکەم چونکە پیاوێکی شایستەی. لێرە کەس نابێت پاشایەک لە کاتی ناڵەناڵیدا ببینێ و بەندەکەی تۆ منی لە کاتی ناڵاندندا بینی، بەڵام من چاوپۆشی لەمەش دەکەم. چونکە بەندەکەت منی هێنایە پێکەنین و بووە هۆی رابواردنم. دوایی رووی لە کاپتا کردو وتی: جارێکی تریش هەڵبەزەوە و بمهێنەوە پێکەنین.

(کاپتا) وتی: من ئەم کارە ناکەم، لەبەرئەوەی بە پێچەوانەی ئابڕوومەندی و کەسایەتیی پیاوێکی بەساڵاچووی وەک منە.

پاشا وتی: من ئێستا کارێک دەکەم کە تۆ ئابڕوومەندی و کەسایەتیی خۆت لەبیر بچێت.

دوایی ئیشارەتێکی بۆ شێرەکەی کرد و شێرەکە هەڵساو پاشا (کاپتا)ی بە

شێرەکە نیشان داو ئاژەڵەکە سەرە زلەکەی بەلای (کاپتا)وە سووڕاندو بە هەنگاوی هێواش بەرەو (کاپتا) هات. هەرچەندە زیاتر لێی نزیک دەبووەوە کاپتا زیاتر بەرەو دواوە دەچوو. تا ئەو کاتەی پشتی بە کۆڵەگەکەوە نووساند و لەم کاتەدا شێرەکە دەمی کردەوەو نەڕاندی. کاپتا لە ترسا کۆڵەگەکەی گرت و وەک مەیموونێ کە لە میسر بەدارەکاندا هەڵدەگەڕێت بە گورجی و خێراییەوە هەڵکشا.

پاشا بەشێوەیەک پێدەکەنی کە بەرەو پێش و پاش و ئەم لاو ئەولا دەچەمییەوە و کاتێ پێکەنینەکەی وەستایەوە وتی: برسیمە و نانم بۆ بهێنن. پزیشکە پیرەکە لەم قسەیە خۆشحاڵ بوو چونکە مەیلی سوڵتان بۆ نان خواردن نیشانی دەدا کە باری تەندروستیی چاک بووەتەوە و دڵی چووەتە سەر خواردن و چەند ساتێ دوای ئەوە خواردنیان بۆ هێنا.

پاشا لەبەرئەوەی خەریکی نان خواردن بوو ئیتر سەرنجی نەدایە کاپتا و شێرەکە لە خوار کۆڵەگەکەوە لاچوو و هاتە لای پاشا و کاپتا توانی لەکۆڵەگەکە بێتە خوارەوە و هەنگاو بنێتە سەر زەوی.

بە پاشام وت: ئێستا ئازاری ددانت نەما، بەڵام لەبەرئەوەی ددانەکەت تێکچووە دیسانەوە تووشی ددان ئێشە دەبیتەوە و هیچ چارەیەکت نییە جگە لەوەی ددانت دەربکرێ و من واهەست دەکەم تۆ حەزت بە شیرینییە. خواردنی شیرینیی زۆر ددانەکانتی خراپ کردووە، چونکە لێرە شیرینی بەدۆشاوی خورما دروست دەکەن و ئەم دۆشاوە بۆ ددان زیانی هەیە. بەڵام لەمیسردا شیرینی بەجۆرە شەکرێک دروست دەکەن کە مێش دروستی دەکات و ئەو شەکرە زیانی بۆ ددان نییە.

پاشا وتی: مەگەر مێش دەتوانێ شەکر دروست بکات؟

وتم بەڵێ جۆرێک مێش لە میسردا هەیە، وەک ئەو زەردەواڵانەی کە لێرە بەسەر خورماوە دەنیشن و دەیخۆن. ، بەڵام کەمێ لەوان بچووکترن و ئەم مێشە



شەکرێکی بەتام و شیرین دروست دەکات کە زیان بە ددانەکان ناگەیەنێت و بۆ بەهێزکردنی لەش سوودمەندە. پاشا وتی: تۆ سوود لە خۆشباوەڕییەکەی ئێمە وەردەگری و درۆمان لەگەڵ دەکەیت. چونکە زەردەواڵە ناتوانێت شەکر دروست بکات. وتم ئاخر پیاوی راستگۆ تووشی ئەم جۆرە گرفتانە دەبێت و ئەگەر بەڕاستی بدوێت، باوەڕی پێ ناکەن. چونکە چۆن ئێستا تۆ باوەڕ بەوە ناکەیت کە لە میسر مێش شەکر دروست دەکات و ئەگەر منیش بە میسرییەکان بڵێم کە لە بابل باڵندەیەک هەیە کە نافڕێت و بەردەوام لەگەڵ مرۆڤدا دەژێت و هەموو رۆژێ هێلکەیەک بەقەدەر هێلکەی تیمساح دەکات، کەس باوەڕم پێ ناکات و من ئەگەر بتوانم لەم مریشکانە دەبەمەوە بۆ میسر بۆ ئەوەی خەڵکی بیبینن و دڵنیابن کە درۆ ناکەم. پاشا وتی: ئێستا وەرە لەگەڵ مندا نان بخۆ...

وتم بەمەرجێ لەگەڵتدا نان دەخۆم کە فەرمان بدەیت خواردن ببەن بۆ بەندەکانی میوانخانەکە، کە منیان بەکەژاوە هێناوەتە ئێرە چونکە ئێستا برسییانە.

پاشا فەرمانی دا نان بدەنە بەندەکان و شەرابی خورمایان بۆ ببەن، چونکە لە بابل شەرابیان لە خورما دروست دەکرد.

***

١- دەربار: کۆشک و تەلار - دەربارییەکان: واتە خزمان و نزیکانی فیرعەون - ئەوانەی کە لە کۆشکی پاشادا نیشتەجێن. وەرگێڕی کوردی

**بەشی پانزدەهەم**

# پێشبینیی ڕووداوەکانی ئاینده

ئەو کاتەی ویستم لە کۆشکی پاشایەتی بێمە دەرەوە پاشا وتی: (سینۆهە).. ئێمە جەژنێکمان لە پێشەوەیە کە جەژنی پاشای درۆیینە و لەو ڕۆژەدا تۆ دەبێ بێیت و ئەم جەژنە ببینی، چونکە دڵنیام کە لە وڵاتی میسردا ئەم جەژنە نییە.

وتم: زۆر باشە، دێم...

پاشا بە پێکەنینەوە وتی: لەو ڕۆژەدا بەندەکەت بازاڕی گەرم دەبێت.

وتم: بۆچی؟

وتی: لەبەرئەوەی خەڵکێکی زۆر دەهێنێتە پێکەنین.

لەکاتی گەڕانەوەم، بەندەکانی کەژاوەکە کە لە خواردن و خواردنەوە تێر بوون، گۆرانییان دەوت و بەشان و باڵی منیان هەڵدەدا و خەڵکیش کە لە دوای ئەوانەوە دەڕۆیشتن حەزیان دەکرد وەک ئەوان گۆرانی بڵێن و مەدحی من بکەن.

ئەم بابەتە بووە هۆی ناو دەرکردنێکی زۆرم لە بابل و خەڵکی دەیانگوت: (سینۆهە) پزیشکی میسری پیاوێکە، کە بەندە کەژاوە هەڵگرەکەی خۆی تێر خواردن دەکات.

بەرلەوەی جەژنی ڕۆژی پاشای درۆیین (کە باوەڕ ناکەم لە بابل یان لە هیچ وڵاتێکی تر هەبێت) دەست پێ بکات (کە دوایی باسی ئەم جەژنە دەکەم) لەبەرئەوەی بڕیاربوو ددانی پاشای بابل دەربکەم، (بورابوریاش) بانگی کردم و من پێش هەڵکێشانی ددانی هەندێ تریاکم کردە دەماریەوە و لەوانەیە بڵێم بەبێ ئازار ددانیم دەرکرد. پزیشکەکانی بابل لەوێ وەستابوون و وایان دەزانی پاشا لەبەر ئازاری ددانی دەمکوژێت، بەڵام دوایی بەسەر سامییەوە لە منیان پرسی:



چی ڕووی دا کە پاشا هەستی بە ئازاری زۆر نەکرد؟

وتم: ئەو دەرمانەی من کردمە دەمارەکەیەوە، سیفەتی لەناوبردنی ئازاری هەیە و لە دەرمانە هەرە باشەکانی میسرە و ئەم دەرمانە لە توێکڵی ڕووەکێک دروست دەکرێت و تەنها کاهینەکانی میسر ئەم ڕووەکە دەچێنن و کاری دروستکردنی ئەم دەرمانە لە توێکڵی ئەو گیایە لەسەر ئەوانە و هەرگیز نهێنیی دروست کردنی ئەم دەرمانە بەخەڵکی ئاسایی ناڵێن. لەبەرئەوەی ئەم دەرمانە هەموو جۆرە دەردێک لەناو دەبات و ئەگەر بکەوێتە دەستی خەڵکی ئیتر لە دەرد ناترسێن و ڕێسای کۆمەڵ دەشێوێنێ، چونکە کەس لە سزا بەدەنییەکان ترسی نابێت.

پاشا وتی: حەز دەکەم هەندێ لەم دەرمانەم هەبێ.

وتم: من هەندێکت دەدەمێ بە مەرجێ جگە لەو شێوازەی پێتی دەڵێم بۆهیچ شتێکی تر بەکاری نەهێنی، چونکە ئەم دەرمانە ئەگەر بە پێچەوانەی ڕێنومایی تایبەتیی خۆی بەکاربێت وەک زەهر دەبێتە هۆی لەناو چوون.

پاشا وتی: ئێستا کە ددانی منت بەبێ ئازار دەرکرد چ پاداشتێکت لە من دەوێت؟

وتم: من پێویستیم بە زێڕ و پارە نییە، چونکە دەتوانم لە زانستەکەی خۆم زێڕ و پارە پەیدا بکەم، بەڵام حەز دەکەم دەسەڵاتی تۆ ببینم و بزانم سوپاکەت چەندە. بۆئەوەی کاتێ کە گەڕامەوە بۆ میسر مەدحی هێز و دەسەڵاتەکەت بکەم و هەمووان بە بیستنی ئەو وەسفانە سەریان بسوڕمێ. بۆیە داوا دەکەم فەرمان بدەیت هێزەکانت بە چەشنی ڕۆیشتنی سەربازی خۆپیشاندان بکەن هەتا بتوانم سەربازەکان و گالیسکە جەنگییەکانت ببینم.

پاشا داواکارییەکەمی جێبەجێ کرد و من لەم بابەتە خۆشحاڵ بووم، چونکە دەمتوانی توانای سەربازی پاشای بابل بخەملێنم.

بەر لە ڕۆژی خۆپێشاندانە سەربازییەکە، بە (کاپتا)م وت: سەربازەکان و

گالیسکەکانی پاشا بژمێرێت و بزانێت کە چەند سەرباز و گالیسکە لە سوپاکەیدا هەیە.

(کاپتا) وتی: من ئەم هەموو ژمارەیە لە کوێ بهێنم کە بە هۆیانەوە سەربازەکانی بابل بژمێرم، چونکە دەڵێن ژمارەی سەربازەکانی بابل لە ژمارەی لمی بیابان زۆرترە.

وتم: گەوجە.. پێویست ناکات سەربازەکان یەک بە یەک بژمێری، چونکە هەر دەستەیەک لە سەربازەکان لە دوای هێمایەکەوە بەرێدا دەڕۆن و ئەگەر تۆ هێماکان بژمێری ژمارەی سەربازەکانت دەست دەکەوێت.

لە رۆژی خۆپیشاندانەکەدا پاشا ریشە دەستکردەکەی بە چەناگەیەوە ناو من بینیم تەنیا ئەو سەربازانەی کە لە بابلدا بوون چەکیان پێ بوو و ئەوانەی لە هەرێمەکانی ترەوە ئاگادار کرابوون زۆربەیان نەیزەکانیان پێ نەبوو و چاوەکانیان عەیب دار بوو.

من شەست جار تێپەڕ بوونی شەست دەستە سەربازی نیشانەدارم ژمارد و تێگەیشتم کە هەر دەستەیەک لەو سەربازانە شەست جار شەست سەرباز بوون. چونکە لە بابل ژمارەی شەست لە لایان پیرۆز بوو و گالیسکە جەنگییەکانیشیان شەست جار شەست گالیسکە بوو. گالیسکەکانیان بە کانزایەکی زۆر سەیر و نوێ دروست کردبوو کە ئاسنیان پێ دەوت و لە ژێر هەر گالیسکەیەکدا دوو پەیکانی ئاسنینی گەورە هاتبووە دەرێ کە لە جەنگدا زۆر مەترسیداربوو. بەڵام من بینیم پەیکانەکان ژەنگیان کردبوو و تایەی هەندێ لەگالیسکەکانی لەکاتی رۆیشتندا لێ دەبوونەوە.

سەربازەکان بەڕیزی شەست کەسییەوە دەڕۆیشتن کە خۆپیشاندانەکە زووتر تەواو بێت و گالیسکەکان بەڕیزی پانزە گالیسکەییەوە دەڕۆیشتن. لە نێوان سەربازەکانی پاشا سەربازەکانی پاسەوانی تایبەتی پاشا سەرنجڕاکێش بوون، بەڵام هەندێکیان ئەوەندە قەڵەو بوون کە نەیاندەتوانی بە ئاسانی رێ



بکەن و بەڕێ رۆیشتنەکەیان دەبووە هۆی رابواردنی بینەران.

کاتێ شەو داهات، پاشا بانگی کردم و وتی: (سینۆهە) ئایا ئەمڕۆ سوپای سەربازی منت بینی؟

وتم: بینینی سەربازەکانت ئەمڕۆ چاوی منی رەش کردەوە، چونکە سەربازەکانی تۆ لە لمەکانی کەناری دەریا و ئەستێرەکانی ئاسمان زیاترن و من دوای بینینی سوپاکەت تێگەیشتم کە تۆ بەهێزترین پاشای سەرزەویت.

پاشا وتی: (سینۆهە) جێ بە جێ کردنی داواکارییەکەت لەسەر من گران کەوت، چونکە لەبەر سازکردنی ئەو خۆپیشاندانە دەبێ ماوەی چەند رۆژێ هەتا ئەو کاتەی سەربازەکان دەگەڕێنەوە هەرێمەکانی خۆیان، خواردنیان بدەمێ و مەسرەفی خواردنیان بە ئەندازەی سەرانەی ساڵێکی یەکێک لە هەرێمەکانم دەبێت. لەم چەند رۆژەی سەربازەکان لێرەدان ریسواییەکی گەورە دروست دەبێت، چونکە دەستدرێژی دەکەنە سەر ژنان و ناتوانین پێشیان لێ بگرین و دوای رۆیشتنیشیان تا ماوەی یەک مانگ رێگا و بانەکان نائارام دەبێت. لەبەرئەوەی ئەم سەربازانە تا دەگەڕێنەوە وڵاتی خۆیان لە رێگا هەر کەسێک ببینن رووتی دەکەنەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خۆشحاڵم کە توانیم چەکدارەکان و دەسەڵاتەکەی خۆمت نیشان بدەم. ئێستا پێم بڵێ ئایا فیرعەون کچی هەیە؟

وتم: کچی فیرعەونی میسرت بۆ چییە؟

وتی: حەزدەکەم کچی ئەو ببێتە ژنی من، ئەگەرچی ئێستا چوارسەد ژنم هەیە، بەڵام هیچ کامیان کچی پاشای میسر نییەو من زۆر حەزدەکەم هاوسەرێکم هەبێت کە کچی فیرعەونی میسر بێت.

وتم: (بورابوریاش) ئاگاداربە کە لەو رۆژەی جیهان دروست بووە تاوەکو ئێستا بەردەوام کچی فیرعەون دەبێتە هاوسەری براکەی خۆی و ئەگەر براشی نەبێت شوو ناکات بەڵکو دەچێتە پەرستگەیەک و دەبێتە کاهینە. ئەم قسەیەی تۆ دەیکەی لە لای خوایەکانی میسر کوفرە، بەڵام لەم قسەیەی تۆ ناڕەنجێم،

چونکە تۆ خوایەکانی میسر ناناسی.

پاشا وتی: سینۆهە ئاگاداربە کە من بڕیارم داوە کچی فیرعەون بکەمە هاوسەری خۆم و ئەگەر فیرعەون کچەکەی خۆیم نەداتێ من سوپاکەی خۆم دەهێنمە خاکی ئەو و میسر وێران دەکەم و بە زۆر دەست بەسەر کچەکەیدا دەگرم.

وتم: (بورابوریاش) فیرعەونی میسر هێشتا زۆر گەنجە و تازە ژنی هێناوە و کچی نەبووەو گریمان خوایەکانی میسر ڕێگایان دا کە کچی فیرعەون شوو بە بیانییەک بکات، بەڵام ئەو کە کچی نەبێت ناتوانێ کچت بداتێ. کەواتە دان بە خۆتا بگرە تا دەبێتە خاوەن کچ، ئەوسا بیر لە کچەکەی بکەوە.

پاشا وتی: سینۆهە من ئەمڕۆ کاتێکی زۆر لە مەیدان دانیشتم و سەیری تێپەڕینی سەربازەکانم کرد و ئێستا ماندوو بوومە و حەز دەکەم بەرەو حەرەمەکەی خۆم بڕۆم و کەمێ پشوو بدەم و، تۆش کە پزیشکی و دەتوانی بۆ هەموو شوێنێ بڕۆی، لەگەڵ مندا وەرە کە ژنەکانم ببینی و لە نزیکەوە گفتوگۆیان لەگەڵدا بکەیت و بۆت دەرکەوێت کە زۆر لە پاشاکان باشترین کچەکانی خۆیان ناردۆتە بابل بۆئەوەی بە ناوی هاوسەری منەوە بێنە ناو حەرەمەکەمەوە و من ئەگەر وتم حەز دەکەم کچی فیرعەونی میسر ببێتە هاوسەرم تەنها مەبەستم ئەوە بوو کە دەمەویست لەگەڵ فیرعەونی میسردا دەرگایەکی تازەی دۆستایەتی بکەمەوە.

وتم: (بورابوریاش) منیش بە تۆم وت فیرعەونی میسر کچی نییە کە بیکاتە هاوسەری تۆ.

(بورابوریاش) وتی: ئێستا تۆ دەتوانی لە نێوان ئەو ژنانەی کە لە
حەرەمسەراکەی مندا خزمەت دەکەن یەکێکیان بەشێوەیەکی کاتی هەڵبژێری و لەگەڵیدا رابوێری، بەڵام ئاگادار بەسکی پڕ نەکەیت چونکە ئەگەر دووگیان بێت گرفت دروست دەکات و خەڵکی وادەزانن بەهۆی منەوە سکی پڕ(دووگیان) بووە. وتم(بورابوریاش) ئەم قسەیە مەکە، چونکە جوان نییە



پیاو، ژنی خۆی بەشێوەیەکی کاتی بداتە یەکێکی تر کە لەگەڵیدا کۆببێتەوە.

(بورابوریاش) وتی بۆ چی جوان نییە، ژنەکانی من ئەگەر بزانن کەمن ئامادەم ئەوان بەشێوەیەکی کاتی بدەمە خەڵکی تر کە لەگەڵیاندا رابوێرن، زۆر خۆشحاڵ دەبن، چونکە من بەتەنهایی ناتوانم لەگەڵ چوارسەد ژندا کۆببمەوە.

دوایی لەمنی پرسی تۆ چەند ژنت هەیە. وتم من ژنم نییە. ئەو بەسەر سوڕمانەوە وتی بۆ مەگەر تۆ خواجە(نێرەمووک)ی؟ وتم نا. پاشا وتی ئەگەر خواجە نیت ئەی چۆن دەتوانی بەبێ ژن ژیان ببەیتە سەر و خەریکی پزیشکی بێت. چونکە تا پیاو لەگەڵ ژندا کۆنەبێتەوە، فکرو هۆشی لەسەر خۆی نابێت و ناتوانێت خۆی بەکارێکەوە خەریک بکات. ئەگەر دەتەوێت چێژ لە ژیان وەربگریت وەکو من، لەگەلانی جۆراوجۆر ژن بهێنە، چونکە هەر یەکێک لەم ژنانە بەپێی داب و نەریتی وڵاتەکەی خۆی عەشقبازی دەکات و تۆ هەر جارە و چێژێکی تایبەتی وەردەگری.

ئەگەر چی نەمدەویست بچمە ناو حەرەمسەراکەی پاشاوە، بەڵام ئەو منی لەگەڵ خۆیدا برد و بینیم ژنەکانی ئەو، لەگەلانی جۆراوجۆر بوون و هەموویان گەنج و جوان بوون و هەر یەکەیان جلکی خۆماڵیی خۆیانیان لەبەر کردبوو. هەندێک لەو ژنانە لەبەر ئەوەی تازە لەوڵاتانی ترەوە بەهۆی فرۆشیارەکانی کۆیلەوە هاتبوونە ئەوێ، نەیاندەتوانی بەزمانی بابلی بدوێن، بەڵام هەموویان پێدەکەنین و هەر ژنێک هەوڵی دەدا سەرنجی پاشا بۆ لای خۆی رابکێشێت.

کاتێک کەبیستیان پاشا دەڵێت حەزدەکەم یەکێک لەو ژنانە بەشێوەیەکی کاتی بدەم بەتۆ کە لە گەڵیدا ببەیتەسەر، هەوڵیان دا سەرنجی من رابکێشن. پاشا بە منی وت هەر کامێکیانت حەز لێیە هەڵبژێرە، بەڵام سەرەڕای ئەوەی حەزم لە هەموویان بوو نەمدەتوانی یەکێکیان لێ هەڵبژێرم و جگە لەوەش لەتووڕەیی و راگۆڕینی پاشاش دەترسام چونکە کاتێک کە مرۆڤ لەگەڵ پاشایەکی هەوەسبازدا هەڵسوکەوت دەکات دەبێ وریا بێت چونکە لە ناکاودا

هەڵوێستی پاشا دەگۆڕێت.

بۆیە وتم: من لەبەرئەوەی لە سەفەردام و بۆ فێربوونی زانست هاتووم ژن ناهێنم، چونکە خوایەکانی ئێمە دەڵێن کاتێک خەریکی کۆکردنەوەو فێربوونی زانستن خۆتان لە ژن هێنان بپارێزن. ئەی خوایەکانی میسر من داوای لێ بوردنتان لی دەکەم کە ئەم درۆیەم بەدەم ئێوەوە کرد، بەڵام بۆئەوەی پاشای بابل بڕوام پێ بکات، هیچ ڕێگایەکی ترم نەبوو.

ژنەکانی حەرەم کاتێک وەڵامی منیان بیست لە سەرەتادا سەریان سوڕما و دوایی کەوتنە گاڵتەکردن و سووکایەتی پێ کردن و وتیان: دیارە تۆش وەکو نێرە مووەکانی حەرەم وایت و ناتوانی لەگەڵ ژنەکاندا رابوێری.

پاشاش کە وایدەزانی بە پێشکەش کردنی یەکێک لە ژنەکانی خۆی من زۆر خۆشحاڵ دەکات، دڵگران بوو و وتی: ئەگەر تۆ منت لەو ددان ئێشەیە رزگار نەکردبایە ئێستا فەرمانم دەدا بتکوژن.

دوایی روخسەتم لێ وەرگرت و بۆ ئەوەی بڕۆم. ئەو دیسان لەبارەی جەژنی پاشای درۆیین دواو وتی: بەهار نزیک بووەتەوە و کاتی جەژنی پاشای درۆیین ئەوەندەی نەماوە و خۆت بۆ تام و چێژ وەرگرتن لەم جەژنە ئامادە بکە.

لە پێش ئەوەی لە بارەی جەژنی پاشای درۆیین بدوێم دەبێ بابەتێک بخەمە بەرچاو، کە پەیوەندی بە منەوەیە: رۆژێکیان بۆ تەماشای شووشەی گەورەکەرەوە چوومە بورجی (مەردوک)، ئەم شووشەیە کە باوەڕ ناکەم لە هیچ جێگایەکی جیهاندا هەبێت لە بابلدا دروست دەکرێت و شووشەیەکی ئەستوور و زۆر روونە و وەک کەرتە سەهۆڵێکی درەوشاوە و زوڵاڵە. بەڵام کاتێک کە مرۆڤ لە پشت ئەم شووشەیەوە دەڕوانێت ئەوەندە شتەکان گەورە دەبنەوە کە دەبێتە هۆی ترسانی بینەرەکە و ئەو رۆژەی من بۆ بینینی شووشەکە رۆیشتم مێروولەیەکیان هێناو من شووشەکەم بەدەستەوە گرت و لە پشتیەوە سەیری مێروولەکەم کرد و خەرێک بوو لە ترسا رابکەم. چونکە مێروولەکە ئەوەندەگەورە ببووەوە کە لە قەبارەدا لە



ئەسپێکی ئاوی دەچوو.

دوای بینینی شووشە گەورەکەرەوەکە بەرەو نهۆمی سەرەوەی بورجەکە، کە جێگای ئەستێرەناسەکان بوو رۆیشتم و داوام لێ کردن سەیری بەختم بکەن. لەبەر ئەوەی من نەمدەزانی لە چ رۆژێک و لە کوێ لە دایک بوومە، ئەوان نەیانتوانی داهاتووی من پێشبینی بکەن، بەڵام پێیان وتم تۆ میسری نیت.

وتم: گومانی تێدانییە کە من لە ناو سەبەتەیەکدا بوومە کەبەسەر رووباری نیلەوە بووە و، ئەو ژنەی منی بەخێو کرد سەبەتەکەی لە ئاوەکە گرتبووەوە.

ئەستێرەناسەکان وتیان: ئەگەرچی تۆیان لەسەر رووباری نیلدا دۆزیوەتەوە، بەڵام تۆ نە میسریت و نەخەڵکی وڵاتێکی تریشی. هەروەها بچیتە هەر جێگایەکی تری ئەم جیهانە بە بیانییەک لە قەڵەم دەدرێیت.

وتم: ئەم قسەیە رێی تێ ناچێت، چونکە هەر چۆنێک بێت لەم جیهانەدا جێگایەک هەیە کە من تیایدا لە دایک بووبێتم و ئەو جێگایە نیشتمانی من بێت و تیایدا بیانی نەبم.

وتیان: لەم جیهانەدا جێگایەک کە تۆی تێدا لە دایک بووبیت نییە..

وتم: ئەی من لە کوێ لەدایک بوومە؟

یەکێکیان وتی: لەوەیە تۆ کوڕی خوایەکان بیت و لە ئاسمانەوە هاتبیتە سەر زەوی.

وتم: لە وڵاتی ئێمەدا تەنها یەک نەفەر کوڕی خوایەکانە و ئەویش فیرعەونە.

وتیان: بەهەر حاڵ بەختی تۆ وا نیشان دەدات کە تۆ لەم دنیایەدا بچیتە هەر جێگایەک تیایدا بیانیت و جێگایەک نییە کە وڵاتی تۆ بێت و بەم جۆرە هیچ گومانێکی تر نییە، جگە لەوەی کە تۆ لە ئاسمانەوە هاتوویت و کوڕی خوایەکانی.

دوایی بە سەرسوڕمانەوە سەیرم کرد ئەستێرەناسەکان سەریان بۆ دانەواندم و پرسیم: بۆ وا دەکەن؟

ئەوان وتیان: ئێمە دڵنیانین کە تۆ کوڕی خوایەکان بیت، بەڵام دەزانین کە لەم دنیایەدا لە دایک نەبوویتە و لەبەر ئەوە مەرجی دووربینی ئەوەیە کە رێز لە تۆ بگرین بۆ ئەوەی ئەگەر بەراستی کوڕی خوایەکان بیت، لە لایەن ئێمەوە کەم تەرخەمی و بێ رێزیت لەگەڵدا نەکرابێت، هەتاکو لە لای خوایەکان تاوانبار نەبین.

من کە دەمزانی کوڕی خوایەکان نیم، لەم قسەیەیان زۆر سەرسام بووم و ئەویشم بە بێ عەقڵی و پڕ و پووچ پەرستی ئەستێرەناسەکان لەقەڵەم دا.



## بەشی شانزدەهەم

# جەژنی ڕۆژی درۆکردن

کاتێک کە وەرزی بەهار دادێت دانیشتووانی بابل ماوەی دوانزە ڕۆژ دەیکەنە جەژن. لە مەراسیمی ڕۆژی سیانزەیەمی ئەم جەژنە بە درۆیەکی گەورە، واتە پاشای درۆیین کۆتایی دێت. لەم دوانزە ڕۆژەدا خەڵکی بابل جوانترین جل و بەرگی خۆیان لەبەر دەکەن و کچە گەنجەکان دەڕۆنە پەرستگەی (عەشتار) و لەوێدا بە پێی ڕێ و ڕەسمی خۆیان پێشوازی لەو ڕێبوار و میوانانە دەکەن کەلە شوێنەکانی دەوروبەرەوە دێن و ژمارەشیان کەم نەبوو و لە بری ئەوە لە هەر یەکێک لەو میوانانە دیارییەکیان وەردەگرت و دوایی ئەم دیارییانەیان کۆدەکردەوە، بۆئەوەی کاتێک کە شوو دەکەن خاوەنی (جەهیزیە)ی بووکێنیی خۆیان بن.

هیچ کەسێ ئەم ڕێ و ڕەسمەی لەلا سەیر نەبوو و پیاوەکان کاتێک کە ژنێکیان دەهێنا، چاوەڕوانی ئەوە نەبوون کە ئەو ژنەی کە هێناویانە کچ بێت. لەم دوانزە ڕۆژەدا هەموو خەریکی رابواردن و خۆشگوزەرانی دەبوون و خۆیان بۆ جەژنی ڕۆژی سیانزەیەمی بەهار ئامادە دەکرد. بەیانی ڕۆژی سیانزەیەم لە میوانخانەکەدا دانیشتبووم و لە ناکاودا گوێم لە دەنگی هەندێ سەرباز بوو کە ڕژانە ناو میوانخانەکەوە و هاواریان دەکرد: پاشاکەمان لە کوێیە؟ پاشاکەمان بدەنێ... ئەگەر نا هەمووتان دەکوژین.

ئەم کۆمەڵە سەربازە بە توڕەییەوە هاواریان دەکرد و لە نهۆمەکانی میوانخانەکە بەسەر دەکەوتن. تا گەیشتنە ئەو نهۆمەی کە منی تێدا نیشتەجێ بووم و هاواریان کرد: پاشامان بدەنێ... پاشاکەمان مەشارنەوە.

سەربازەکان لە بەردەم هۆدەکەماندا دەنگە دەنگیان کرد و (کاپتا)



بەندەکەی من لە ترسا خۆی لە ژێر قەرەوێڵەکەیدا شاردبووەوە و بە منی وت: وا بزانم لە بابل شۆڕش بەرپابووە و پاشا هەڵهاتووە و لایەنگرانی بە گومانی ئەوەی لێرە بێت هاتوونەتە ئێرە.

دەرگام کردەوە و بەسەربازەکانم وت: ئایا من دەناسن یان نا؟ من (سینۆهە)، کوڕی کەر پزیشکی میسریم و ددانی پاشای ئێوەم چاک کردەوە و لەبەر خۆشحاڵی من فەرمانی دا لەم شارەدا سوپاکەی خۆپیشاندانی سەربازی بکەن و ئەگەر بتانەوێت من ئازار بدەن دەچمە لای پاشاکەتان و شکاتتان لێ دەکەم.

سەربازەکان وتیان: ئەگەر تۆ (سینۆهە)یت ئێمە بە شوێن تۆدا دەگەڕێین و مەبەستمان دۆزینەوەی تۆیە.

وتم: چ ئیشێکتان بە منە؟

وتیان: بەندەکەی تۆمان دەوێت.

دووبارە پرسیمەوە: بەندەکەی منتان بۆ چییە؟

سەربازەکان وتیان: ئەمڕۆ جەژنی پاشای درۆیینە و پاشا ئەمری پێ کردووین بەندەکەت ببەینە لای ئەو.

وتم: پاشا چ ئیشێکی بە بەندەکەی منە؟

وتیان: ئێمە لەم بابەتە ئاگادار نین و ئەگەر بەندەکەمان نیشان نەدەی رووتت دەکەینەوە و بە بێ جل و بەرگ دەتبەینە کۆشکی پاشاو بۆئەوەی نیشانی بدەن کە هەرەشەکەیان بە راستە بە یەک جووڵاندنەوە کراسەکەمیان لەبەردا دادڕی و رووتیان کردمەوە و دوایی بە واق وڕمانەوە سەیریان کردم. چونکە تا ئەو کاتە پیاوێکی خەتەنە کراویان نەبینیبوو.

یەکێک لە سەربازەکان وتی: پەنا بە (مەردوک) ئەم پیاوە بۆ وایە؟

یەکێکی تر وتی: ئایا هەموو پیاوەکانی میسر ئەوهان؟

وتم: بەڵێ لە میسر پیاوەکان لەکاتی منداڵیدا خەتەنە دەکرێن.

یەکێک لەوان وتی: ئەم بابەتە بۆ ئێمە گرنگ نییە.

یەکێکی تر هاواری کرد: ئێمە ئەو کەسەمان لێت دەوێت کە دەبێ بماندەیتێ ئەگەر نا...

وتم: بە کورتی پێم بڵێن چی دەکەن؟

وتیان: یان بەندەکەتمان بدەیە، یان بە رووتی بە ناو شەقامەکانی بابلدا دەتسوورێنینەوەو دەتبەینە کۆشکی پاشایەتی.

وتم: من لە لای پاشا شکاتتان لێ دەکەم و پێی دەڵێم بە سەختی دارکاریتان بکات.

سەربازەکان وتیان: پاشا خۆی بە ئێمەی وتووە ئەگەر بەندەکەی نەداپێتان بە رووتی بەرەو کۆشکت ببەین.

(کاپتا) کە لە ژێر قەرەوێڵەکەوە لە ترساندا دەلەرزی لەوێ هاتە دەرەوە و وتی: گەورەکەی من بە رووتی بەرەو کۆشک مەبەن، چونکە ڕێزی ئەم پزیشکە ناودارە نامێنێت و من ئامادەم لەگەڵ ئێوەدا بۆ هەر جێگایەک کە بتانەوێ بێم.

سەربازەکان کاتێک کە کاپتایان بینی لە خۆشیا هاواریان کرد و وتیان: بژی (مەردوک)... پاشاکەمان دۆزییەوە... ئێمە پاشاکەمان دییەوەو ئێستا بەرەو کۆشکی دەبەین.

(کاپتا) بەسەر سوڕمانەوە دەیڕوانییە سەربازەکان و ئەوان کاتێک سەر سوڕمانەکەی ئەویان بینی بە شادییەوە هاواریان دەکرد: تۆ پاشای چوار وڵاتی؟ تۆ شەهریار (خاوەن شکۆ-پاشا)ی هەمووانی و ئێمە هەر بە دەم و چاوت دەتناسینەوە. هەندێ لە سەربازەکان لەبەردەم (کاپتا)دا سەریان دادەنەواند و هەندێکی تریان لە دواوە تێیان هەڵدەدا بۆئەوەی وای لێ بکەن زووتر بکەوێتە ڕێ.

(کاپتا) وتی: گەورەم من لەو باوەڕەدام لە وڵاتێکدا دەژیم کە هەموو



خەڵکەکەی شێتن و من ئێستا نازانم لەسەر پێی خۆم دەڕۆم یان لەسەر سەر و لەوەیە لە خەودابم و ئەوەی دەیبینم دیمەنێکی خەو بێت. ئەگەر لەم وڵاتەدا سەرەو ژێر هەڵیان واسیم تۆ مەهێڵە ئاژەڵەکان لاشەکەم بخۆن و تەرمەکەم مۆمیایی بکە و لە میسردا بمنێژە.

یەکێ لە سەربازەکان بە پێکەنینەوە وتی: لێرەدا گیانەوەر لاشە ناخوات، چونکە ئێمە تەرمەکان فڕێ دەدەینە رووبارەوە و ئاو بەرەو دەریای دەبات.

(کاپتا) وتی: گەورەم مەهێڵە لاشەکەم فڕێ دەنە ناو ئاوی رووبارەوە، چونکە ئەگەر وام لێ بکەن ناتوانم لە دنیای تردا زیندوو بمێنمەوە.

سەربازەکان کە پێدەکەنین وتیان: ئێمە ئەمڕۆ توانیومانە پاشایەکی باش بدۆزینەوە، چونکە لە کاتی قسەکردندا زمانی ناگرێت.

(کاپتا) کە نەیدەویست لە میوانخانەکە بچێتە دەرەوە، ئەوان بە شەق و قۆناغی نەیزەکانیان بەڕێیان خست. دوای ئەوەی (کاپتا)یان بە زۆر برد، من بەپەلە جلکم لەبەر کرد و لە دوای ئەوەوە گەیشتمە کۆشکی پاشا و لەبەرئەوەی دەیانزانی لە لای پاشا ڕێزم هەیە کەس پێشی لێ نەگرتم.

کاتێ کە چوومە کۆشکەوە کۆمەڵێکی زۆرم بینی لە کۆشکی پاشایەتی کۆ ببوونەوە و هەموو هاواریان دەکرد و سەربازەکان بە خۆشییەوە نەیزەکانیان بەرزدەکردەوە. من دڵنیابووم کە لە بابلدا شۆڕش بەرپابووە و ئەگەر لە هەرێمەکانی ترەوە سەرباز نەهێنن لەوانەیە (بورابوریاش)ی پاشای بابل لەسەر تەخت لابدەن، چونکە لە هات و هاوارەکانی ئەو کۆمەڵە وا دەردەکەوت کە لە دژی (بورابوریاش) دروشمەکانیان دەردەبڕن. بەبێ ئەوەی کەس پێشم لێ بگرێ چوومە ئەو تەلارەی کە دەمزانی پاشا لەوێیەو بینیم کاهینی گەورەی پەرستگەی (مەردوک) و هەندێ لە کاهینەکانی تر لەوێدان.

کاتێ (کاپتا) هاتە تەلارەکەوە لە ناکاودا کاهینی گەورەی پەرستگە لەکاتێکدا کە بە پەنجە ئیشارەتی بۆ پاشای بابل دەکرد، وتی: ئەم کوڕەی کە

هێشتا مووی لێ نەهاتووە لێرە بیبەنە دەرەوە... ئێمە ئامادە نین ئەو بە پاشای خۆمان بزانین.

ئەوانەی تریش بۆ پاڵپشتی قسەکەی وتیان: ئەم کوڕە بکەنە دەرەوە، ئێمە ئامادەنین لەمە زیاتر منداڵێک فەرمانڕەواییمان بکات... بیبەنە دەرەوە...

کاهینی گەورە ئیشارەتی بۆ (کاپتا) کرد و وتی: ئێستا ئێمە توانیومانە پاشایەکی پێگەیشتوو و ژیر بدۆزینەوە و بە پاشای خۆمان هەڵی دەبژێرین. بۆ ئەوەی بە ژیری و دووربینییەوە فەرمانڕەواییمان بەسەردا بکات.

هەر کە ئەم قسەیە لە دەمی کاهینی گەورەوە هاتە دەرێ، ئەوانەی لەوێ بوون، هێرشیان بردە سەر پاشای لاو و بە پێکەنین و گاڵتەو گەفەوە نیشانەکانی پاشایەتییان لەسەر و سینەی کردەوە و کراسەکەیان لەبەری داکەندو بازوو و قاچەکانیان دەست لێ دەدا و دەیانگوت: سەیر کەن ئەم کوڕە گەنجە چەند لاواز و لەڕەو هێشتا بۆنی شیر لە دەمی دێت. قاچەکانیشی ئەوەندە ناسکن کە ئەگەر چەند هەنگاوێک بنێت لە ناوەڕاستەوە دەبێتە دوو کەرت، لەبەر ئەوە ئەم کوڕە ناتوانێت ببێتە پاشا و ئێمە ئەم پیاوە (ئیشارەیان بۆ بەندەکەم دەکرد) لە جیاتی ئەو دەخەینە سەر تەخت.

(بورابوریاش) کاتێ کە نیشانەکانی پاشایەتییان لێ دەکردەوە هیچ بەرگری نەکرد و بینیم لەگەڵ شێرەکەی خۆی، کە کلکی خستبووە نێوان قاچەکانی، چووە سووچێکی ژوورەکەوە.

لەو کاتەدا کە کراسی پاشایەتییان لە بەر بەندەکەم دەکرد و نیشانەکانی پاشایەتییان بە سەر و سینگیدا دەکرد، نەمدەزانی لەسەر قاچەکانم دەڕۆم یان لەسەر سەر. (کاپتا)یان لەسەر ئەو تەختەی کە پێشتر پاشای بابلی لێ بوو، دانیشاند و لەبەر دەمیدا سوجدەیان برد و زەوییان ماچ کرد. تەنانەت خودی (بورابوریاش) کە رووت بوو، لەبەر دەم (کاپتا)دا سوجدەی برد و وتی: ئەو دەبێ ببێتە پاشای ئێمە، چونکە لەو عاقڵتر و دادپەروەرتر لەم وڵاتەدا نییە.



(کاپتا) ئەوەندە حەپەسابوو کە نەیدەتوانی قسە بکات و سەیرم کرد قژی سەری لە ژێر تاجی پاشایەتی، کە لەسەر سەری دایان نابوو رەق ببوو..

کاتێک کە ئەو کەسانەی لە هۆدەکەدا بوون مل کەچی خۆیان دەردەبڕی، (کاپتا) هاواری کردو وتی: وسکت بن...

هەموو بێدەنگ بوون و ئەو وتی: من وا تێدەگەم کە جادووگەرێک جادووی لێ کردووم و هەندێ شت دەبینم کە لە راستیدا وانییە، چونکە بە بڕوای من هەرگیز ناگونجێت پیاوێکی وەک من کە لەم وڵاتەدا بیانیم ببم بە پاشا.

ئامادە بووان نارەزاییان دەربڕی و بە گاڵتەو پێکەنینەوە وتیان: وانییە، تۆ پاشای ئێمەیت و کەس جادووی لە تۆ نەکردووە و ئێمە بەوپەڕی خۆشحاڵی و رەزامەندییەوە تۆمان کردۆتە پاشای خۆمان.

(کاپتا) وتی: من ئەگەرچی حەز ناکەم ببمە پاشاتان، بەڵام ناتوانم بە پێچەوانەی ویستی ئێوە رەفتار بکەم، چونکە ئێوە ژمارەتان زۆرە، بەڵام پرسیارێکتان لێ دەکەم و داواکارم وەڵامێکی راستم بدەنەوە..، ئایا من پاشای ئێوەم یان نا ؟

هەموو بە یەک دەنگ هاواریان کرد: بەڵێ... تۆ پاشای ئێمەیت و.. دیسانەوە لەبەردەمی سوجدەیان برد. یەکێک لە ئامادەبووان کەوڵی شێرێکی لەبەر کرد و لەبەردەم تەختی (کاپتا) دانیشت و نەڕاندی.

(کاپتا) جارێکی تر هاواری کرد وسکت بن و، هەموو بێدەنگ بوون. بەندەکەم وتی: ئەگەر من پاشای ئێوەم دەبێ گوێڕایەڵی فەرمانەکانم بن.

هەموو هاواریان کرد هەرچی تۆ بڵێی دەیکەین.

(کاپتا) وتی: لەبەر ئەوەی بوومەتە پاشای ئێوە، ئەمڕۆ دەکەینە جەژن و بڵێن با بەندەکان بێن.

هەندێ لە بەندەکان کە لەوێ بوون لە (کاپتا) نزیک بوونەوە و پێیانی

وت: زوو شەراب و خواردن بهێنن کە بیخۆم و بە شەرابەکە خۆم شادمان بکەم و خەڵکیش وەک من سکیان تێر و سەریان گەرم بکەن.

بەندەکان وتیان: خواردن و شەراب لە هۆدەکەی تردا ئامادە کراوە و هەڵیان گرت و بەهەراو هۆریا و شادی و پێکەنینەوە بردیانە تەلارێکی ترەوەو، منیش لەگەڵیان رۆیشتم و بینیم لەو تەلارەدا هەموو جۆرە خواردن و خواردنەوەیەکیان داناوە و هەر کەسێ بە کەیفی خۆی لەو خواردن و شەرابانەی هەڵدەبژارد و خەریکی خواردن و خواردنەوەی دەبوو.

(بورابوریاش) پاشای پێشووی بابل وەک بەندەکان پشتێنێکی لە پشتیەوە ئاڵاندبوو و لە ناوەڕاستی خەڵکەکەدا بە ئەم لاو ئەولادا رای دەکرد و شەرابی بە خەڵکیدا دەکردو شلەمەنییە خەستەکانی خواردنەکەی بەکراسی ئامادەبوواندا دەکرد و وای لێ دەکردن جنێو بدەن.

لە حەوشەی کۆشکدا حەوزەکانیان پڕ کردبوو لە ئاوی جۆ(بیرە)و شەراب و هەموو کەسێ دەیتوانی بە پەیمانەکانی کەنار حەوزەکە بیرە، یان شەراب بنۆشێتەوە و بە خورما و ماست و جۆرە چەورییەک کە لە شیر دروستیان دەکرد و زۆر بەتام بوو (مەبەستی نووسەر کەرەیە- وەرگێڕ) سکی خۆیان تێر بکەن. کاتێک کە خەڵکی تێربوون و سەرەکان لە بیرە و شەراب گەرم داهاتن، هەراو هوریایەکی ئەوەندە شادی بەخش لە حەوشەکەدا دروست بوو کە من تاکو ئەو رۆژە هاوتای ئەو ئاهەنگەم نەدیتبوو.

جیاوازی لە نێوان چین و توێژ و پلەدارەکاندا نەمابوو و هەموو کەسێ لەگەڵ ئەوانەی تردا گاڵتەو گەفی دەکرد و ئەوانەی هەتا دوێنێ بەرامبەر (بورابوریاش) سوجدەیان دەبرد، لەو کاتەدا ئێسکی گۆشتەکانیان تێ دەگرت و ئەویش ئێسکەکانی بەرەو ئەو کەسانەی بۆیان دەهاویشت هەڵدەدایەوە.

لە ناوەڕاستی ئەو قەرەباڵغییەدا خۆم گەیاندە (کاپتا) و وتم: کاپتا ئێستا هەموویان سەرخۆشن و کەس ئاگای لە تۆ نەماوە هەڵسە با بەبێ ئەوەی کەس



بزانێ لێرە بڕۆین، چونکە وا هەست دەکەم کە ئاکامی ئەم کارە باش نییە.

(کاپتا) کە خەریکی خواردنی پارچە گۆشتێکی سوورەوە کراوی گوێدرێژ بوو وتی: ئەوەی تۆ دەیڵێی لە گوێچکەی مندا وەک گیزە گیزی مێش وایە و بە قسەت ناکەم و دەست لەم بەختەوەرییە هەڵناگرم و لێرە ناڕۆم. مەگەر نابینی ئەم خەڵکە بە چ سۆز و خۆشەویستییەکەوە منیان بە پاشای خۆیان هەڵبژاردووە؟ ئایا من دەتوانم لە بەرامبەر ئەم هەست و خۆشەویستییەی ئەوان بەرامبەر بە من دەری دەبڕن، بێ سفەتیبیان لەگەڵدا بکەم و بە جێیان بهێڵم و بڕۆم؟ هەروەها تۆ لەمەو بەدوا نابێت بە ناوی (کاپتا) بانگم بکەیت، چونکە من پاشای چوار وڵاتم و تۆ هەر جارێک کە دەتەوێ قسە لەگەڵ مندا بکەیت دەبێ بڵێی (ئەی پاشای چوار وڵات) و وەک خەڵکی تر لەبەر دەممدا سوجدە ببەیت.

وتم: (کاپتا)... ئەم پاشایەتییەی تۆ جگە لە گاڵتە و گەف و درۆیەکی گەورە هیچی تر نییە. چونکە هەرگیز ناگونجێت ئەم میللەتە تۆ بکەنە پاشای خۆیان کە بەندەیەکی بیانیت و دەترسم دەرئەنجامی ئەم گاڵتەیە بۆ ئێمە ترسناک بێت و تا کات ماوە هەڵسە با خۆمان لە جێگایەکدا بشارینەوە، یان لێرە بڕۆین و ئەگەر هەڵسی و لەگەڵمدا بێیت لە بێ رێزی کردنەکەت خۆش دەبم و بە گۆچانەکەم دارکاریت ناکەم.

(کاپتا) چەورییەکەی دەمی خاوێن کردەوە و بەکەرتە ئێسکێکی گوێدرێژ کە بەدەستیەوە بوو هەڕەشەی لێ کردم و بانگی کرد: ئەم میسرییە پۆخڵە لێرە دوور بخەنەوە ئەگەرنا ناچار دەبم بەدار، ئێسکەکانی تێک بشکێنم.

هەر ئەوەندە (کاپتا) ئەم قسەیەی کرد پیاوەکەی چوو بووە پێستی شێرەوە، پەلاماری دام و منی بە زەویدا داو بە چرنووکی دەستی لەشمی رووشاند و خەریک بوو هەموو جەستەم بریندار بکات، بەڵام خۆشبەختانە نەفیرەکان کەوتنە لێدان و رایانگەیاند پاشای نوێ بڕوات بۆ دادپەروەری کردن

و شێرەکە وازی لێ هێنام.

دادگای بابل نزیک کۆشکی پاشایەتی بوو و، کاتێک کاپتایان بردە ئەوێ کە دادوەری بکات، ویستی خۆی لێ بدزێتەوە و وتی:من باوەڕم بە دادپەروەری کردنی دادوەرانی بابل هەیە و وا باشترە کە ئەوان وەک رابردوو خۆیان خەریکی دادوەری بن.

بەڵام خەڵکی بەم قسەیە رازی نەبوون و وتیان: ئێمە داواکاری جێ بە جێ کردنی دادگەریی پاشای نوێی خۆمانین بۆئەوەی بزانین ئایا عەقڵی هەیە و دەتوانێ بە پێی بنچینەکانی ویژدان بڕیار بدات، یان نا.

(کاپتا ) ناچار بوو مل بدات و خەڵکی ئەویان لەسەر کورسیی گەورەی دادوەری بابل دانیشاند و قامچی و کەلەبچەیان لەبەردەمی دانا، کە نیشانەی جێ بە جێ کردنی دادپەروەرییە. یەکەم کەسێک کە سکاڵای هێنا، پیاوێک بوو کە کراسێکی دڕاوی لەبەردا بوو و سەیرم کرد قژی سپی بوو. دوایی بۆم دەرکەوت سپیایەتی قژی هی ئەوە بووە کە خۆڵەمێشی بەسەر خۆیدا کردبوو و کراسەکەی بە قەستی دڕاندبوو بۆئەوەی بتوانێت بەسەر و وەزعێکی شڵەژاوەوە لەبەردەم پاشا ئامادە بێت. چونکە لە بابلدا ئەو کەسانەی خۆیان بە ستەم لێکراو دەزانن هەوڵدەدەن بە رواڵەت خۆیان داماو نیشان بدەن بۆ ئەوەی سەرنجی پاشا رابکێشن و بەزەیی پیایان بێتەوە.

پیاوەکە لەبەردەم بەندەکەی مندا کەوتە سەر خاک و زەویی ماچ کرد و وتی: ئەی خواوەندی چوار وڵات، ئەمڕۆ کەس وەک تۆ دادپەروەر و عاقڵ نییە، بۆیە من هاتوومەتە لای جەنابت کە داوای جێ بە جێ کردنی دادت لێ بکەم.

من ژنێکم هەیە کە چوار ساڵە هاوسەرمەو لەم ماوەیەدا دووگیان نەبووەو بەم زووانە سکی پڕبووەو لەگەڵ ئەوەشدا کە هەندێ کەس پێیان دەوتم پیاوێکی تر هاتوچۆی ژنەکەت دەکات، من باوەڕم بەقسەکەیان نەدەکرد. هەتا



دوێنێ ژنەکەم لەگەڵ سەربازێکدا لەماڵەوە گرت. بەڵام من نەمتوانی سەربازەکە بگرم چونکە ئەو لەمن بەهێزتر بوو و هەر ئەوەندە چوومە ژوورەوە، ئەو هەڵهات و ئێستا جەرگە رەشەکەی من پڕە لەخەم و دوودڵی و نازانم ئەو منداڵەی لە سکی ژنەکەدایە هی منە یان هی سەربازەکەیەو داوا لەتۆدەکەم کە ئەم موشکیلەیەم بۆ چارەسەر بکەیت و لە دوودڵی رزگارم بکەیت بۆ ئەوەی بزانم چ ئەرکێکم بەرامبەر بەو منداڵە هەیە.

(کاپتا ) بە نیگەرانییەکەوە سەیری دەوروبەری خۆی کرد، چونکە نەیدەزانی چ وەڵامێ بداتەوە کە لە دادپەروەرییەوە نزیک بێت و لە ناکاودا بانگی بەندەکانی کرد و وتی: دار بگرنە دەست و ئەم کابرایە دارکاری بکەن.

بەندەکان بەدار کەوتنە سەر پیاوەکە و دوای ئەوەی لێیان دا، پیاوەکە رووی کردە جەماوەرەکەو وتی: ئایا بڕیاری پاشا لەم بارەیەوە راستە و من کە بۆ سکاڵا هاتوومەتە دادگا، دەبێ دارکاری بکرێم؟

خەڵکی دوای بیستنی ئەم قسەیە داوای روون کردنەوەیان لە کاپتا کرد و پرسییان: خواوەندی چوار وڵات بۆچی فەرمانت دا ئەم پیاوە بکوتن؟

(کاپتا ) وتی: پیاوێک کە ئەوەندە گەوج بێت شایانی دارکارییە، ئایا عەقڵ دەیگرێ پیاوێک زەوییەکی لە باری هەبێت، بەڵام کشتوکاڵی تێدا نەکات و نەیچێنێ و بەرەڵای بکات و دوایی کاتێ خەڵکی لە رووی چاکەکاری و بەزەییەوە کێڵگەکەی دەکێڵن و تۆوی لێ دەچێنن، ئەو شکات بکات کە بۆچی خەڵکانی تر لە کێڵگەکەیدا کشتوکاڵ دەکەن و کێڵگەکە تاوانبار بکات،

کە بۆ چی داوای لەخەڵک کردووە تۆوی تیا بچێنن؟ بەدڵنیاییەوە کە نا. کەواتە ژنەکە مافی خۆیەتی پەیوەندی لەگەڵ پیاوێکی تردا هەبووە چونکە ئەم پیاوە نەیتوانیوە داواکاریی ژنەکە جێبەجێ بکات و زەوییەکەی بە(بەیار) جێ هێشتووە.

خەڵکی دوای بیستنی ئەم قسەیە بە دەنگی بەرز کەوتنە دەستخۆشی لێ کردن و ستایشی عەقڵ و عەدالەتەکەیان کرد. دوایی پیرەمێردێک لە کاپتا نزیک بووەوە و وتی: ئەی خواوەندی چوار وڵات، من لەبەردەم تۆ و ئەم ئەستوونە، کە یاساکانی بابلی لەسەر نووسراوە داواکارم دادپەروەری جێ بە جێ بکرێت و سکاڵاکەم ئەوەیە کە من لە کەناری کۆڵانێکدا خانوویەکەم دروست کرد، بەڵام ئەو ئەندازیارەی خانووەکەمی بە قۆنتەرات دروست کرد، فێڵی لێ کردم و کەل و پەلی خراپی لە بیناسازییەکەدا بەکارهێنا و گوێی نەدایە پتەویی خانووەکەو لە ناکاودا بیناکە رماو رێبوارێکی کوشت و ئێستا کەس و کاری ئەو رێبوارە داوای خوێنەکەیم لێ دەکەنەوە و من تاوانم نییە. کەواتە چارم چییە و چی بە کەس و کاری قوربانییەکە بڵێم؟

(کاپتا) بیرێکی کردەوە و دوایی وتی: ئەم بابەتەی تۆ دەیڵێی پرسیارێکی ئاڵۆزە و دوایی لە دادوەرەکانی بابلی پرسی یاسا لەم بارەیەوە چی دەڵێت؟

دادوەرەکان ئەو ئەستوونەی کە قانوونی وڵاتی لەسەر نووسرابوو نیشانی کاپتایان داو وتیان: ئەگەر خانووەکە بەهۆی کەمتەرخەمی یان فێڵی قۆنتەراتچییەوە بڕووخێ و خاوەن خانووەکە بکوژرێ دەبێ ئەندازیارە قۆنتەراتچییەکە بکوژرێتەوە.. ئەگەر خانووەکە دوای رووخانی کوڕی خاوەن خانووەکەی کوشت، کوڕی ئەندازیارەکە بە تاوانی کوشتنی کوڕی خاوەن خانووەکە دەکوژرێت. یاسا لەبارەی کوشتنی خەڵکی ترەوە شتێکی تر باس ناکات، بەڵام ئێمە وای لێک دەدەینەوەکە هەر جۆرە زیانێک بەهۆی رووخانی خانوو بەسەر خەڵکی تردا رووبدات دەبێ قۆنتەراتچییەکە بیبژێرێت و ئەگەر قۆنتەراتچییەکە نەیەوێت ئەو زیانە ببژێرێت، دەبێت بەئەندازەی هەمان زەرەر زیانی لێ بدرێت.

(کاپتا) وتی: من نەمدەزانی لەم وڵاتەدا ئەندزیارە قۆنتەراتچییەکان



ئەوەندە فێڵبازن و دزی لە کەل و پەلی بیناسازییەکە دەکەن یان لە دروستکردنی خانووەکە بە شێوەیەک کەمتەرخەمی دەکەن کە خانووەکە خۆی ناگرێت و دڕووخێ. من لەمەوبەدوا بە ورياييەوە ئاگادار دەبم کە گرفتاری ئەم جۆرە قۆنتەراتچییە فێڵبازانە نەبم. بەڵام سەبارەت بە شکاتەکەی ئەم پیاوە و داواکردنی خوێن لەلایەن کەس و کاری قوربانییەکە، رای من ئەوەیە کە: کەس و کاری رێبوارە کوژراوەکە دەبێت بڕۆنە بەردەم ماڵی ئەندازیارە قۆنتەراتچییەکە و یەکەم کەسێ کە بەوێدا تێدەپەڕێت بیگرن و بیکوژن، بۆئەوەی بە پێی یاسا کار کرابێت. بەڵام ئەگەر کەس و کاری ئەو رێبوارە وەک کەس و کاری رێبواری یەکەم داوای بژاردنی خوێنیان کرد، ئەوانەی رێبواری دووەمیان لەبەردەم خانووی ئەندازیارەکە کوشتووە دەبێ حەقی خوێنەکەی ببژێرن. بیرۆکەی من لەمەڕ تاوانبارە راستەقینەکە ئەوەیە کە لەم رووداوەدا هیچ کەسێ بە ئەندازەی ئەو رێبوارەی بە تەک خانووە سستبنیادەکەدا تێدەپەڕێت تاوانبار نییە، چونکە هیچ پیاوێکی ژیر بە بەردەم خانوویەکدا تێناپەڕێت کە مەترسیی رووخانی لێ بکرێت. لە دوای ئەو تاوانباری دووەم ئەم پیاوەیە کە هاتۆتە ئێرەو دەڵێت خانووەکەم وێران بووە، ئەم پیاوە لەو رووەوە تاوانبارە کە لەگەڵ ئەوەشدا کە خەڵکی بابلە و هەموو ژیانی لێرەدا بەسەربردووە و ئێستا لە تەمەنی پیریدایە، نازانێت کە نابێت لە بابلدا دروستکردنی خانوو بە ئەندازیارێکی قۆنتەراتچی بسپێرێ، چونکە دەبوایە لە مانگی یەکەمدا چاوەڕوانی رووخانی خانووەکەی بوایە. یان هەر نەبێت دوای ئەوەی دروستکردنی خانووەکەی بە قۆنتەراتچییەک سپارد، خۆی چاودێریی کارەکەی بکردایە، بۆئەوەی نەتوانێ هەوڵی هەڵخەڵەتاندنی بدات.

لەبەرئەوەی هەوڵیشی نەداوە ئەندازیارەکە بخاتە ژێر چاودێریی خۆیەوەو بە دیاریەوە بێت ئەو حەقی خۆی بووە هەڵی بخەڵەتێنێ و خانووەکەی وا دروست بکات کە بڕووخێ. چونکە هەتا ئەوان ئەم نەفامانە هەڵنەخەڵەتێنن و زیانیان

لێ نەدەن عاقڵ نابن.

خەڵکی جارێکی تر دادپەروەری (کاپتا)یان ستایش کرد و ئەو پیاوەی سکاڵای هێنابوو بە داماوییەوە دوورکەوتەوە. دوایی مامەڵەچییەکی قەڵەو کە کراسی گرانبەهای لەبەردابوو لە کاپتا نزیک بووەوە و وتی: سێ ڕۆژ لەمەوبەر لە شارەکەی خۆمەوە بۆ کارێک هاتمە بابل و ڕۆژێکیان وەکو خەڵکی تر بۆ پەرستگەی (عەشتار) چووم و پێشوازییان لێ کردم. من لەوێ دڵم چووە سەر یەکێک لەو کچانەی بۆ دەستکەوتنی جەهازی بووکێنی لە ڕۆژەکانی سەرەتای بەهاردا هاتبووە پەرستگەی (عەشتار) و لەگەڵیدا ڕێککەوتم کە هەندێ پارەم لێ وەربگرێت و ببێتە هاوسەرم. لەپاش ئەوەی پارەکەم داپێی بۆ دەست بەئاو گەیاندنێک چەند ساتێ بەجێم هێشت و لەپاش گەڕانەوە بەسەرسوڕمانەوە روانیم کە ئەو لەگەڵ پیاوێکی تردا ڕادەبوێرێت، لەکاتێکدا کە زیوی لەمن سەندبوو و بڕیاربوو چاوەڕێی من بکات. کاتێک کەپێم وت زیوەکەم بدەرەوە وتی تۆ بڕیار بوو لەگەڵ مندا ڕابوێری و ئێستا کە ئەو پیاوە ڕۆیشتووە تۆ دەتوانی لەگەڵ مندا کۆببیتەوە. وتم من کاتێک دەمەویست لەگەڵتدا ڕابوێرم کە تۆ کچ بوویت و ئێستا کچێنییەکەت نەماوە. بەڵام ئەو قسەکەی منی نەسەلماند و وتی زیوەکەت نادەمەوە چونکە ئەوەی تۆ دەتەویست لێمی بکڕیتەوە ماوەو دەتوانی بیکڕیتەوە. پێم وت من گۆزەیەکی ساغم لەتۆ کڕی و نرخەکەشیم داپێت و بۆ کارێکی پێویست کەمێ لێت دوورکەوتمەوە و هەرچۆنێ بێت ئەو گۆزەیە ماڵی من بوو و تۆ کە بەمنت فرۆشتبوو مافی ئەوەت نەبوو بیفرۆشیتە خەڵکی تر کە ئەویش گۆزەکە بە عەرزا بدات و بیشکێنێ و ئێستا کە من هاتوومەتەوە، کەرتە گۆزە شکاوەکانم دەدەیتێ ودەڵێی ئەمەیە ئەو شتەی لەمنت کڕیبوو.

کاتێ (کاپتا) ئەم قسانەی بیست قامچییەکەی گرتە دەست و بەتووڕەییەوە تەکانی داو وتی: من لە هیچ شوێنێکدا خەڵکم نەبینیوە کە



وەک دانیشتووانی ئەم شارە نەزان بن و بۆ شتی منداڵانە شکات بکەن. ئەی کابرای بازرگان، ئەگەر تۆ بۆ کڕینی میوەیەکی تازە بچیتە بازاڕ ئایا دوای کڕینی، یەکسەر دەیخۆی، یان وازی لێ دێنی چەند ڕۆژێکی پێ بچێت و دوای بەسەرچوونی ئەو ماوەیە دەچیتەوە بۆ لای فرۆشیارەکە و پێی دەڵێی بۆچی میوەکەی لێتم کڕیوە چرچ و بۆگەن بووە؟ کچێکی گەنجیش وەک میوەیەکی تازە وایە و کڕیارەکە لەپاش کڕینی میوەکە دەبێ یەکسەر بیخوات و ئەگەر کچەگەنجەکە بەجێ بهێڵی و دوای گەڕانەوە بڕوانی کە میوەکە ڕزیوە یان وەکو خۆت دەڵێی گۆزەکە شکاوە، نابێت گلەیی بکەی و تۆ لەجیاتی ئەوەی شکاتی لێ بکەی دەبێ مەمنوونیشی بیت کە یارمەتیی داوی، چونکە بەر لەگەڕانەوەی تۆ، بەربەستێکی لەناو بردووە و ئەگەر بمایە دەبووە هۆی زەحمەت دانی تۆ و ئەو ئەم ئەرکەی بەیەکێکی تر سپارد کەتۆ بەبێ گرفت لەگەڵیدا ڕابوێری و لەبەر ئەوەی کە تۆ پیاوێکی نەزانیت و قەدرو قیمەتی میوەی تازە نازانی من سزات دەدەم کە لەمەوبەدوا هەمیشە لەگەڵ گۆزەی شکاودا ڕابوێری.

دیسانەوە خەڵکی بەدەنگی بەرزەوە کاپتایان ستایش کرد و ژیری و تێگەیشتوویییان بە بەرزی نرخاند و بەندەکەم بە دادوەرەکانی وت: ئەمڕۆ بایی پێویست دادوەریم کرد و ئێستا ماندوو بوومە و دەبێ پشوو بدەم. ئەگەر داواکارێکی تر سکاڵای هێنا، دەبێ دادوەرەکان پێوەی خەریک بن و شکاتەکەی ئەم پیاوە بازرگانە هێنایەوە بیرم کە من ئێستا پاشایەکم کە لە حەرەمسەراکەی خۆمدا چوارسەد ژنم هەیە و دەبێ بە سۆراغیانەوە بچم و دڵنەواییان بکەم و ئەم کارانە نەتەنها منی ماندوو و بێ هێز نەکردووە، بگرە لەو کاتەوە کە بوومە بە پاشای چوار هەرێم، هێزێکی زیاد لە ڕادە لە خۆمدا هەست پێ دەکەم کە تەنانەت لە سەردەمی گەنجێتیشمدا خاوەنی ئەو هێز و توانایە نەبوومە.

خەڵکی بە هاواری خۆشییەوە (کاپتا) یان بەرەو حەرەمسەرابرد، بەڵام لە ناو ئەو کۆمەڵە خەڵکەدا تەنها یەکێک شاد نەبوو و پێ نەدەکەنی، ئەویش (بورابوریاش) بوو کە خۆی گەیاندە من و وتی: (سینۆهە) تۆ پزیشکی و دەتوانی بچیتە حەرەمەوە و برۆ و مەهێڵە بەندەکەت دەست لە ژنەکانم بدات، چونکە ئەگەر ئەم کارە بکات ئێوارەی ئەمڕۆ پێستی لەشی لێ دەکەمەوە و کەوڵەکەی بە دیوارەوە هەڵدەواسم تا وشک دەبێتەوە، بەڵام ئەگەر دەست درێژی نەکاتە سەر ژنەکانم مردنی ئاسان دەبێت و فەرمان دەدەم بە شێوەیەک بیکوژن کە تووشی ئەشکەنجە نەبێت.

وتم: (بورابوریاش) هەر چییەک تۆ بڵێی دەیکەم، بەڵام من بە بینینی تۆ لەم کراسی بەندەییەدا خەمبارم و جەرگە رەشەکەم پڕ بووە لە خەم چونکە ناتوانم ئارام بگرم و ببینم خەڵکی تانەت لێ دەدەن و سووکایەتیت پێ دەکەن.

(بورابوریاش) وتی: ئەمڕۆ رۆژی درۆی گەورە، واتە پاشای درۆیینە و لەم رۆژەدا یەکێک بەناو و نیشانی پاشای بابل هەڵدەبژێردرێ و پاشایەتی کردنەکەی لە رۆژێک زیاتر ناخایەنێت و هەموو دانیشتووانی بابل ئەم بابەتە دەزانن، بەڵام لەم کاتەی من و تۆ قسە دەکەین بەندەکەت بەرەو حەرەمسەرا دەڕوات و من دەترسێم دەست بۆ ژنەکانم ببات و تۆ برۆ و مەهێڵە ئەم شتە روو بدات.

من و (بورابوریاش) بەرەو حەرەم کەوتینە رێ و لە رێگا لە بارەی نەریتی رۆژی درۆی گەورە پرسیارم لێی کرد و وتی: هەموو ساڵێ لەم رۆژەدا گەلی بابل یەکێک لە نێوان قۆشمەترین و سێبەندیترینی ئەو خەڵکە هەڵدەبژێرن و فەرمانڕوایی ئەو کەسە لە بەیانییەوە دەست پێ دەکات و پاشای بابل وەک بەندەیەک لە خزمەتیدا دەبێت. لەم رۆژەدا ئەم پاشا کاتییە هەرچییەکی بوێ دەیکات و من لەبەرئەوەی بینیم بەندەکەی تۆ زۆر پێکەنیناوییە خۆم وتم کە



ئەو بۆ پاشایەتی یەک رۆژە هەڵبژێرن.

پرسیم: دوای ئەوەی ئەم یەک رۆژەی پاشایەتییەکەی بەسەر چوو چیی لێ دەکەن؟

(بورابوریاش) وتی: کاتێ ئەمڕۆی بردەسەر وەک چۆن بەرەبەیان لە ناکاودا کردیانە پاشای بابل، لەکاتی ئێوارەدا لە چەند ساتێکدا دەیکوژن و بڕیاری کوشتنەکەی لە لایەن پاشاوە، واتە من، دەردەچێت. ئەگەر ئەو کەسە لە ماوەی پاشایەتییەکەیدا دەست لە کوشتن و بڕین و دەست بەسەراگرتنی ژنی خەڵکی وەرنەدات زەهر دەکەنە ناوشەرابەوە و دەرخواردی دەدەن و بە بێ ئازار گیان لەدەست دەدات. بەڵام ئەگەر لەم رۆژەدا دەسەڵاتەکەی لە خراپەکاری و بەدڕەفتاریدا بەکاربهێنێ، ئەوا من ئازار و ئەشکەنجەی ترسناکی پێ دەچێژم کە بە هۆیەوە گیانی دەرچێ. لە رابردوودا جارێکیان لەم رۆژەدا پاشای راستەقینەی بابل کە وەکو خەڵکی تر خەریکی خۆشگوزەرانی بوو، بەهۆی خواردنی گۆشتاوێکی داخەوە کە هەندێ کەس دەڵێن زەهری تێ کرابوو ماڵئاوایی کرد و پیاوە قۆشمەو پێکەنیناوییەکەی تەنها بۆیەک رۆژ ببووە پاشا، دوای مردنی پاشای راستەقینە ماوەی سی و شەش ساڵ لە بابلدا پاشایەتیی کردو هەر لەبەر ئەوەش ئەمڕۆ من لەکاتی خواردن و خواردنەوەدا زۆر وریابووم کە گرفتاری چارەنووسی ئەو پاشایە نەبم.

کاتێ کە من و (بورابوریاش) گەیشتینە دەرگای حەرەمسەراکە، چاوم بە (کاپتا) کەوت، کە خوێن لە لووتییەوە دەهاتە خوارەوە و تاکە چاوەکەی ئاوسابوو و لە حەرەمسەراکە دەهاتە دەرەوە. وتم: (کاپتا) چی بووە مەگەر بریندار بوویتە؟

(کاپتا) وتی: سەیرکە لە حەرەمسەرا چییان لێ کردم، کاتێک کە چوومە حەرەمەکەوە سەیرم کرد دەیانەوێت ژنە پیرەکان و کەنیزە رەشە قەڵەو و بەساڵاچووەکانم بدەنێ و من وتم لەمانە بێزارم و بەرەو ژنێکی گەنج و جوان

رۆیشتم، بەڵام ئەو ژنە وەکو شێرە دایکانە پەلاماری منی دا و کەوشەکانی خۆی وەها کێشا بەدەمو چاومدا کە چاومی ئاوساندو خوێنی لەلووتم هێنا.

(بورابوریاش) کاتێ قسەکەی کاپتای بیست ئەوەندەپێکەنی کە لەبەر ئەوەی نەکەوێت بازووی منی گرت و (کاپتا) وتی: سینۆهە من ناوێرم بچمە حەرەمەوە چونکە ئەم ژنە تێکچووە و ئەگەر هەنگاو بنێمە ژوورەوە دەمکوژێت و لەبەر ئەوە تۆ بچۆ و کاسەی سەری کون بکە تا ئەو گیانە شەڕانییەی چووەتە مێشکیەوە لە ناو سەری دەربچێ، بەڵکو بەم شێوەیە ئارام بگرێت. ئەگەر ئەم ژنە شێت نەبوایە پەلاماری منی نەدەدا و نەیدەکێشا بەدەم و لووتمدا و خوێنەکەمی وەک مانگای سەربڕاو نەدەڕژاند، چونکە من پاشای ئەوم و ژیانی ئەو بە ئیشارەتێکی منەوە بەندە.

(بورابوریاش) پێی وتم: (سینۆهە) برۆ و بزانە کە وەزعی حەرەم چۆنە و ئەم ژنەی پەلاماری ئەم نەفامەی داوە کێیە؟ ئەمڕۆ لەبەر رۆژی پاشای درۆیین من ناتوانم بچمە حەرەمەوە، بەڵام تۆ لەبەر ئەوەی پزیشکی دەتوانی بۆ هەر جێگایەک، لەوانە حەرەمسەراکەی من برۆی و من وا هەست دەکەم کە ئەو ژنەی شالاوی بردۆتە سەر بەندەکەت یەکێک لەو کەنیزانەیە کە دەمەویست بیکەمە هاوسەری خۆم، بەڵام هێشتا وەک کێوییەکانە و چاوەڕێم ماڵی ببێت.

من نەمدەویست بچمە ناو حەرەمسەراوە، بەڵام (بورابوریاش) ئەوەندە زۆری لێ کردم کە داواکارییەکەیم قبووڵ کرد و چوومە ژوورەوە، (خواجەکان)[١] کە دەیانزانی من پزیشکم پێشیان لێ نەگرتم و چوومە حەرەمەکەوەو سەیرم کرد بارودۆخی ناو حەرەم ئاڵۆز بوو و هەندێ لە ژنە پیرەکان لە سووچێک کۆببوونەوە بۆئەوەی ئەو رۆژە بکەنە جەژن و کە چاویان بە من کەوت هەواڵی (کاپتا)یان لێ پرسیم و وتیان: گەورەکەی ئێمە بۆ کوێ چوو و بۆچی نەهات کە لە میوانداریییەکەماندا بەشدار بێت.

ژنێکی رەش پێست کە وەک کاپتا قەڵەو بوو و سکی ئەوەندە گەورە بوو



کە وەکو تەپڵ دەهاتە بەرچاو، بەرەو من هات و وتی: بزنە قەڵەوەکەم بۆ بنێرەوە بۆئەوەی چاوەکانی بە سەما کردن رۆشن بکەمەوە... گەورەکەم بۆ بگەڕێنەوە کە گۆرانیی بۆ بڵێم.

خواجەکان دەورەیان لێ دام و وتیان خەمی ئەم پیرەژنانەت نەبێ، چونکە هیچ کامێکیان شێت نەبوونە و ئەم هەڵسوکەوتەی دەیکەن هی ئەوەیەکە ئەمڕۆ خۆیان بۆ جەژن ئامادە کردووە، بەڵام لە نێوان ژنەکانی حەرەم کچێکی گەنجی تێدایە کە لە سەرەتای هاتنی بۆ ئێرە لەگەڵ هەمووماندا تووڕەیەو ئەمڕۆ شێت بووە و نە تەنها پاشا درۆیینەکەی بریندار کرد و راوی نا، بەڵکو کێردێکیشی بە دەستەوە گرتووە و کە دەمانەوێت لێی نزیک ببینەوە پەلامارمان دەدات و تۆ دەبێ برۆی و شێت بوونەکەی چاک بکەیتەوە.

دوایی رێنوماییان کردم و منیان بردە حەوشەی گەورەی حەرەم، کە خشتەکانی ساف و بریقەدار بوون و لە ناوەڕاستی حەوشەکەدا حەوزێکی لێ بوو کە پەیکەری بەردینی ئاژەڵانی دەریایی تێدابوو و ئاو لە دەمی ئەو پەیکەرانە دەڕژایە ناو حەوزەکەوە. لەکەناری حەوزەکە ژنێکی گەنج بە کراسێکی دڕاوەوە راوەستابوو و پاڵی دابوو بە پەیکەری یەکێ لە ئاژەڵە دەریاییەکان و لە پرچ و کراسەکەی بەری ئاو دەتکایە خوار و دیاربوو لە حەوزەکە هاتبووە دەرێ و کێردێکی بەدەستەوە بوو کە لە ژێر تیشکی خۆردا دەدرەوشایەوە. کاتێ لێی نزیک بوومەوە ئەو کچە جەحێڵە کە لە کاتی بەشەڕ هاتنی لەگەڵ نێرەمووکەکاندا کراسەکەی دڕابوو، شتێکی وت، بەڵام لەبەر دەنگە دەنگی نێرەمووکەکان و دەنگی رژانی ئاوی نافورەکە نەمتوانی لێی تێبگەم.

دوایی بەوانم وت: لەوێ دوور بکەونەوە بۆ ئەوەی ئەو ناوە چۆڵ بێت و ئاوەکە بگرنەوە بۆئەوەی بتوانم گوێم لە دەنگی ئەو ژنە بێت.

ئەوان (نێرەمووکەکان) لەوێ رۆیشتن و ئاوی نافورەکەیان گرتەوە و ئەو

کاتە توانیم دەنگی ببیستم و تێگەیشتم کە خەریکی گۆرانی وتنە و گۆناکانی لە تاو هەڵچوون و تووڕەییەکەی سوور هەڵگەڕابوون.

وتم: بێدەنگ بە و ئەم کێردە فڕێدەو وەرە لام بۆئەوەی چارەسەرت بکەم، چونکە بێ گومان تۆ شێت بوویتە.

ژنەکە لە جیاتی ئەوەی بە قسەم بکات وتی: ئەی مەیموون، ئەگەر بێیتە پێشەوە ئەم کێردە دەکەم بە سکتا، چونکە من زۆر تووڕەم.

وتم: ئەی ژن، ئەو کێردە فڕێدە، چونکە من دوژمنایەتیم لەگەڵتدا نییە و نامەوێت زیانت پێ بگەیەنم.

ژنەکە وتی: چەند پیاوێکی تریش ئەم قسەیەیان کرد و وتیان نیازی خراپمان لەگەڵتدا نییە، بەڵام من تێگەیشتم کە دەیانەوێت فریوم بدەن و دەستدرێژی بکەنە سەرم. لەبەر ئەوە ئەم کێردەم بەدەستەوە گرتووە بۆ ئەوەی هەر پیاوێ لێم نزیک بووەوە بیکوژم، بەتایبەت ئەو پیرەمێردە یەک چاوە هەر دەکوژم کە دەڵێی کوندەی ئاوساوە.

وتم: ئایا تۆ پاشای بابلت بریندار کرد؟

ژنەکە وتی: بەڵێ من بووم و خۆشحاڵیشم کە توانیم خوێن لە لووتییەوە بهێنمە خوارێ، چونکە تەنانەت پاشای بابلیش بۆی نییە کەڵک لەمن وەربگرێ، چونکە من وەقفی خوایەکەی خۆم کراوم و دەبێ لە بەردەم خوایەکەماندا سەما بکەم.

وتم: هەر چەندی حەز دەکەی لەبەردەم خوایەکەتدا سەما بکە، ئەم بابەتە پەیوەندی بە منەوە نییە و من پزیشکم و ئیشم ئەویە کە نەهێڵم تۆ، کە ئێستا شێت بوویتە، خۆت بریندار بکەیت و ئەگەر تۆ بریندار بیت، پاشای بابل زیان دەکات چونکە نێرەمووکەکانی بە منیان وت پاشا تۆی بە بەهایەکی زۆر لە بازاڕی کۆیلە فرۆشەکان کڕیوەتەوە.

ژنەکە وتی: من کۆیلە نیم کە کەسێک مافی ئەوەی هەبێت لە بازاڕی



کۆیلە فرۆشەکاندا بمفرۆشێ، من کچێکم کە منیان بە زۆر رفاندووەو ئەگەر تۆ کەمێ شعوورت هەبوایە لەم بابەتە تێدەگەیشتی.

پاشان ژنەکە سەیرێکی دواوەی خۆی کردو وتی: نێرەمووکەکان چوونەتە سەر دارەکە کە گوێ لە قسەکانمان بگرن، تۆ ناتوانی بە زمانێکی تر قسە بکەی کە تێنەگەن ئێمە چی دەڵێین.

من بە زمانی میسری دەستم بە قسە کردن کرد و وتم: خەڵکی میسرم و ناوم (سینۆهە) کوڕی کەرە و لەبەرئەوەی پزیشکم تۆ نابێ لە من بترسی.

ژنەکە هەر ئەوەندە کە بیستی بە زمانی میسری قسە دەکەم لێم نزیک بووەوە و وتی: من نەمزانی تۆ میسریت، ئەگەرنا زووتر دەهاتمە لات چونکە دەزانم کە پیاوەکانی میسر بەزۆر دەستدرێژی ناکەنە سەر ژنەکان و ئەگەرچی بڕوات پێدەکەم، بەڵام ناتوانم ئەم کێردەت بدەمێ چونکە پێویستیم پێیەتی و دەمەوێت ئەمشەو کاتێ پاشای بابل ، یان یەکێکی تر هاتە لام و ویستی سوودم لێ وەربگرێت رەگی گەردنم بەم کێردە ببڕم، بۆئەوەی لە بەردەم خوایەکەمدا ئابڕووم نەچێت و ئەگەر تۆ حەز دەکەی بمێنم و لە خوایەکان دەترسێی، من لەم وڵاتە دەربکە. بەڵام ئەوە بزانە کە ئەگەر منت لێرە قوتار کرد ناتوانم بە پاداشتی ئەم کارەت ببمە هاوسەرت، لەبەرئەوەی من وەقفی خوا کراوم و هەرگیز ناتوانم لەگەڵ پیاوێکدا پەیمانی ژن و مێردایەتی ببەستم، مەگەر ئەو کاتەی خوایەکەم بڵێت ئەوت بوێ و ببە بە شەریکی ژیانی.

وتم: من هیچ بەتەمای ئەوە نیم تۆ بکەمە هاوسەری خۆم و تۆ دەبێ لەم رووەوە لە من دڵنیابیت. بەڵام رۆیشتنی تۆ لە حەرەمی پاشا کارێکە کە لە عەقڵ بەدوورە، چونکە لێرە هەموو پێداویستییەکانی ژیانت لەبەردەستدایەو خواردن و جل و بەرگ و هەر چییەکت کە بوێ دەتدەنێ.

ژنەکە وتی: من لە وڵاتی خۆشم خواردن و جل و بەرگم هەبوو و خواردن و جلکی ئێرە نایەتە پێش چاوم. بەڵام ئەو قسەیەت کە دەڵێی نیازی کەڵک لێ

وەرگرتنت لەمن نییە، ئەمە بابەتێکە کە هەر کاتێ منت لە بابل دەرباز کرد دەتوانین لە بارەیەوە بدوێین چونکە ئەگەرچی من وەقفی خوا کراوم، بەڵام ئەگەر خوایەکەم بڵێ پیاوێک هەڵبژێرە دەتوانم بڕیار بدەم کە ببمە هاوسەری تۆ.

وتم:ژنەکە من بەتەما نیم تۆ لە بابل قوتار بکەم و لێرە رزگارت بکەم، چونکە پاشای بابل دۆستی منەو ئەگەر لە حەرەمەکەی بتفرێنم کارەکەم پێچەوانەی نەریتی دۆستایەتی دەبێت. هەروەها تۆ دەبێ بزانی ئەو پیاوە یەک چاوەی کە لە کوندەیەکی ئاوساو دەچوو پاشای راستەقینەی بابل نییە، بەڵکو پاشای درۆیینی ئەم وڵاتەیە و تەنها یەک رۆژ (ئەمرۆ) پاشایەتی دەکات و لە سبەینێوە پاشای هەمیشەیی بابل کە تۆی کڕیوەتەوە پاشایەتی دەکات و ئەو جەوانێکی قۆزە و هیوادارە لە هاودەمێتی کردن لەگەڵ تۆدا هەست بە بەختەوەری بکات و لەو باوەڕەشدام کە تۆش لە بەسەربردنی ژیان لە حەرەمەکەی ئەودا رازی دەبیت. لەبەر ئەوە ئامۆژگاریت دەکەم کە واز لەم بیرکردنەوە منالانەیە بهێنە و کێردەکەتم بدەیە.

ژنەکە وتی: ئەگەر کێردەکەت بدەمێ پشتگیریم لێ دەکەیت؟

وتم: بەڵێ.. من بەرگریت لێ دەکەم و ناهێڵم زیانت پێ بگەیەنن.

ئێنجا وتی: من ناوم (مینا)یە و لەبەر ئەوەی بەڵێنت داپێم کە پشتگیریم لێ بکەیت و نەهێڵی کەس دەستدرێژی بکاتە سەرم، ئەم کێردەت دەدەمێ و لەبەر ئەوەی میسریت دەزانم کە درۆم لەگەڵدا ناکەیت و فریوم نادەی.

دوایی بە بزەیەکەوە کێردەکەی داپێم و من لێیم وەرگرت و بەرێ کەوتم، بەڵام کاتێ کە دەڕۆیشتم تێ گەیشتم کە (مینا) بەو کێردەی دابووی بەمن، منی خستبووە مەترسییەکی گەورەوە و لەوە بەدوا دەبوایە پشتگیریم لێ بکردایە. نازانم چۆن دەکرێت پاڵپشتی لە ژنێکی گەنج و جوان بکەم کە لە حەرەمسەرایەکی گەورە وەک ئەم حەرەمەی (بورابوریاش) دایە. ویستم



بگەڕێمەوە و کێردەکەی بدەمەوە بۆ ئەوەی لەگەڵیدا هیچ بەڵێنێکم نەبێ، بەڵام نێرەمووکەکان دەورەیان لێ دام و لەوەی کە توانیبووم کێردەکەی لەدەست بسەنم کەوتنە مەدح کردن و وتیان: ئەم ژنە ئەگەر ئەو کێردەی لەلا بمایە، یان خەڵکی پێ دەکوشت یان خۆی و، ئێستا لەوە دڵنیاین کە ناتوانێ نە زەرەر لە خەڵکی بدات و نە لە خۆشی.

کاتێ لە حەرەمەکە چوومە دەرێ (بورابوریاش) بەرەو من هات و بە پێکەنینەوە لێمی پرسی: چی بوو؟ ئایا گومانەکەم راست بوو؟ ئایا ئەوەی بەندەکەتی بریندار کردبوو هەمان ئەو کەنیزە نەبوو کە من وتم تازە بۆیان کڕیوم؟

وتم: بەڵێ، ئەم کەنیزە بەهۆی رەفتاری خراپی خواجەکان بەرادەیەک تووڕە ببوو کە بڕیاری داوە خۆی بە دەست هیچ پیاوێکەوە نەدات و وا باشترە تا ماوەیەک وازی لێ بهێنی بۆئەوەی وردە وردە تووڕەییەکەی بنیشێتەوە و ماڵی بێت و پاشان رازی بێت کە تۆ لەگەڵیدا ببەیتە سەر.

(بورابوریاش) وتی: تۆ پەرۆشی گوێڕایەڵ کردنی ئەو ژنەت نەبێ، چونکە من ژنە گەنجەکان باش دەناسم و دەزانم چۆن گوێڕایەڵیان بکەم و ئەمە یەکەم جار نییە کە ژنێکی گەنج و تووڕە دەهێننە حەرەمەکەی من و لە سەرەتای هاتنی بۆ حەرەم رەفتاری شێتانە و وەحشییانە دەنوێنێ. کاتێ کە کچە گەنجەکان بۆ یەکەمین جار دێنە ناو حەرەمەوە دەترسێن و وا دەزانن کە مەترسییەکی گەورە هەڕەشەیان لێ دەکات، بەڵام ماوەیەک کە لەوێ مانەوە و تێگەیشتن کە لە حەرەمی پاشایەکدان، ئارام دەبنەوە و دوایی بەردەوام گلەیی دەکەن کە بۆچی سەرنجیان نادەمێ و ئەگەر دیارییەک بدەمە ژنەکانی تری حەرەم، حەسوودی دەبەنەوە و ئەگەریش ئەم رێگایە کاریان لێ نەکات، هۆیەکی کاریگەری ترم بۆ ملکەچ کردنیان هەیە و ئەویش دارە. من فەرمان دەدەم ئەو کچە جوانەی گوێڕایەڵ نییە لەسەردەم رایکشێن و نێرەمووکەکان بە

شوارکی باریک ئەوەندە بدەن بە لەشیاندا کە خوێن لە پشتیان بێتە خوارەوە و لەکاتی شەودا توانای نووستنیان نەبێت و ئەم ژنە دوای ئەوەی جارێک یان دووجار دارکاری کرا بەشێوەیەک ملکەچ دەبێت کە هەرگیز سەرپێچی ناکات.

(بورابوریاش) دوای ئەم قسەیەی بە پێکەنینێکی ترەوە لێم دوورکەوتەوە و من بەرەو تەلاری میوانداریییەکە رۆیشتم. (کاپتا) لەگەڵ ئەوەشدا کە بەدەستی (مینا) زامدار ببوو، بەڵام دوای گەڕانەوەی بۆ تەلاری میوانداریییەکە بەهۆی خواردنەوە ئازارەکەی لەبیر چووبووەوە. کۆمەڵێکی زۆر دەوریان دابوو و هانیان دەدا گاڵتە و گەف بکات و نوکتەیان بۆ بڵێ و بەندەکەم، کە من وابیردەکەمەوە بۆ ئەم کارەی توانایەکی دەروونیی لە رادە بەدەری هەبوو، هەندێ قسەو هەڵسوکەوتی دەکرد کە خەڵکی دەهێنایە پێکەنین.

لەو تەلارەدا خەڵکی وەها سەرگەرمی رابواردن بوون، کەکەس سەرنجی نەدەدایە من. ویستم خۆم لە (کاپتا) نزیک بکەمەوە و پێی بڵێم کە هەڵسێ و خۆی دەرباز بکات، بەڵام هەستم کرد کە دانیشتووانی ئەوێ بەشێوەیەک دەوریان گرتبوو کە نەدەکرا بە نهێنی لەگەڵیدا بدوێم و جگە لەوەش (کاپتا) ئەوەندە دڵنیابوو کە بووەتە (پاشا) هیچ دوورنەبوو ئەمر بکات ئەوانەی دەوری بمدەنە بەر شەق و زللە. من نەمدەویست بەندەکەم لە بابل-دا بکوژرێ و رزگار کردنی ئەوم لە مردن، بە ئەرکی سەرشانی خۆم دەزانی. ئەگەرچی ئەو بە هۆی سەرخۆشییەوە خۆی لێ ون ببوو، بەڵام هەر بەندەیەکی تر لە جیاتی ئەو بوایە و لە ناکاودا ببوایە بە پاشا هەمان هەڵسوکەوتی دەبوو.

جگە لە (کاپتا) من بەڵێنم بە (مینا)ش دابوو کە دەبوایە ئەو وەعدەشم ببردایەتە سەر. پاشای بابل وتبووی ئەگەر ئەو کچە جوانییەکەی من ببینێ تووڕەییەکەی نامێنێت و خۆی دەهاوێتە بەر پێم. بەڵام من ئەو شتەم بە راست نەدەزانی، چونکە ئەگەر مینا بیویستایە خۆی بەدەست (بورابوریاش)ـەوە



بدات تا ئەو کاتە دڵی نەرم دەبوو و خۆی تەسلیمی دەکرد.

من گومانم لەوەدا نەبوو کە (بورابوریاش) فەرمان دەداتە نێرەمووکەکانی کە مینا دارکاری بکەن و حەزم نەدەکرد مینا بەدەستی ئەو نێرەمووکانە داری لێ بدرێ و لەشی بریندار ببێ، چونکە جگەلەوەی مینا بە دڵنیابوون لە بەڵێنەکەی من، کە میسریم، کێردەکەی دابوو پێم، ئێمەی میسری ناتوانین بەوە رازی بین کە ژنێکی جوان دارکاری بکرێ.

من دوو ئەرکم لەسەر شان بوو، یەکێکیان گرنگتر لەوەی تر، کە رزگار کردنی بەندەکەی خۆم (کاپتا) بوو و ئەوەی تریان ئەرکێکی دۆستانە بۆ قوتار کردنی (مینا). بۆ جێ بە جێ کردنی ئەرکی یەکەم دوو دڵیم نەبوو، ئەگەرچی ببوایەتە هۆی تووڕەیی (بورابوریاش) چونکە بەندەکەی من تاوانێکی نەکردبوو کە دانیشتووانی بابل بیکوژن. بەڵام بۆ ئەرکی دووەم کەمێ دوودڵ بووم، چونکە (بورابوریاش) بەهۆی لێ رادیتنی منەوە، منی ناردبووە ناو حەرەمسەراکەی خۆی و ئەگەر (مینا)م لە حەرەمەکەی ئەو بڕفاندایە و دەربازم بکردایە، خیانەتم لە دۆستایەتی و متمانە پێ کردنەکەی دەکرد. هەروەها (مینا)ش پشتی پێ بەستبووم و چاوەڕوانی ئەوەبوو لە بابل رزگاری بکەم یان ئەوەی کە نەهێڵم دارکاریی بکەن. من ئەگەر بمتوانیبایە لە بابلدا بمێنمەوە داوام لە پاشا دەکرد کە مینا دارکاری نەکەن و ئەویش داواکەمی رەد نەدەکردەوە. بەڵام من لەبەر ئەوەی ناچار بووم، بەندەکەی خۆم (کاپتا) لەمەرگ رزگار بکەم، نەمدەتوانی لەوێدا بمێنمەوە و دەبوایە لەگەڵ (کاپتا) دەربازبووینایە و لەبەر ئەوەی لەگەڵ (کاپتا)دا هەڵدەهاتین، (مینا) بە تەنها دەمایەوە و ئازاریان دەدا و بۆئەوەی نەکەوێتە ژێر ستەمی ئەوان، ناچار دەبوایە ئەویشم رزگار بکردایە، ئەگەرچی پاشای بابل رفاندنی (مینا)ی بە کارێکی پێچەوانەی هاوڕێیەتی و بە خیانەت کردنی بزانیایە.

لە جیهاندا مرۆڤ، هەموو کاتێ لەکارەکانی خۆیدا ئازاد نییە، لەبەر

ئەوەی ئەستێرەکان چارەنووسی مرۆڤ دیاری دەکەن و هەندێ جار مرۆڤ ناچار دەبێت کارێک بکات کە خۆی حەزی بەکردنی نییە. لەبەر ئەوە وازم لە دوودڵی هێنا و بڕیارم دا کە هەم (کاپتا) لە مردن رزگار بکەم و هەم (مینا)ش لەو ستەمانە رزگار بکەم کە چاوەڕوانێتی.

***

١- خواجە: نێرەمووک - خەساو- لە فارسیدا (خواجە) دوو مانای هەیە کە یەکێکیان بە مانای گەورە و خاوەن دەسەڵاتە و ئەوەی تریان بە مانای نێرەمووک دێت کە لێرەدا مەبەست ئەوەی دووەمە. بۆ نموونە پەندێکی فارسی هەیە کە دەڵێت: (من دەڵێم (خواجە)یە، تۆ دەڵێی چەند منداڵی هەیە)- وەرگێڕی کوردی.



## بەشی حەڤدەیەم

## بۆ رزگار كردنی دوو كەس

پاش نیوەڕۆ چوومە كەناری رووبارەوە و لە كەشتییەكی بچووك نزیک بوومەوە كە چەند سەوڵ لێدەرێكی هەبوو و پێم وتن: من دەزانم كە ئەمڕۆ رۆژی جەژنی پاشای درۆییە و ئێوە ئاوی جۆتان خواردۆتەوە و حەز دەكەن ئەمڕۆ هەتا شەو لە خۆشگوزەرانیدا بن، بەڵام رۆژەكانی جەژن زوو تەواو دەبن و دوای ئەوانە رۆژگاری برسێتی و ماندوو بوون روو لە مرۆڤ دەكەن و مرۆڤی ژیر ئەو كەسەیە كە فریوی رابواردن و رۆژە جەژنەكان نەخوات و رۆژەكانی داهاتووی لە یاد بێت. ئێوە ئەمڕۆ دەتوانن كار بكەن و كرێیەكی باش لە من وەربگرن و بەو پارەیە لە سبەینێوە تا دوو هەفتە بخۆن و بخۆنەوە و لە خۆشیدا بن.

سەوڵ لێدەرەكان وتیان: ئێمە دەبێ چی بكەین؟

وتم: ئەمڕۆ هەر چەندە رۆژی جەژنە، بەڵام مامم ماڵئاوایی لێ كردوومە، چونكە خوایەكان كاتێک كە بیانەوێت یەكێ بمرێت بایەخ بەوە نادەن كە لە رۆژی جەژندا بمرێ، یان لە رۆژی پرسەدا. من ناچارم بە پێی وەسیەتی مامم ئەمشەو تەرمەكەی لێرە بگوازمەوە و بیبەمە ئەو جێگایەی باو باپیرانی ئەو تیایدا بەخاک سپێردراون، كە نزیک سنووری (میتانی)یەو جگە لە تەرمەكەش، كەنیزێكی خۆشم لەگەڵدایە، چونكە پیاوێكی وەک من ناتوانێ بە تەنیایی كارەكانی خۆی جێ بە جێ بكات و دەبێ ژنێک هەبێ خواردنی بۆ ئامادە بكات و.. ئێمە ئەمشەو لێرە بەرێ دەكەوین و من دوو ئەوەندەی كرێی ئاسایی پاداشتتان دەدەمێ.

سەوڵ لێدەرەكان وتیان: ئێمە ئامادەین بتگەیەنینە شوێنی مەبەست، بەڵام لەكاتی شەودا لەسەر رووبار سەوڵ لێنادەین، چونكە گیانە ئازار گەیەنەر و



ترسناكەكان لە ئەم بەرو ئەو بەری رووبار، یان لە سەر ئاوەكەن و هاوار دەكەن و ئێمە لە دەنگی هاوار كردنیان دەترسێین و لەوانەیە كەشتییەكەمان دەمەونخوون بكەنەوە.

وتم: من ئێستا دەچم و لە پەرستگە مەڕێک دەكەمە قوربانی بۆ ئەوەی گیانە ئازاردەرەكان زیانمان پێ نەگەیەنن و كاتێک كە گەیشتینە شوێنی مەبەست دەنگی ئەو حەلقە زیوانەی دەتاندەمێ، ئەوەندە لە گوێتاندا خۆش دەبێت كە گوێتان لە دەنگی گیانە ئازاردەرەكان نابێت.

ئەوان پرسییان: تۆ كەی دێیت؟

وتم: ناتوانم بڵێم لە چ كاتێكدا دێم، بەڵام هەرچۆنێ بێت لە سەرەتای شەودا خۆم دەگەیەنمە لاتان، بەڵام هەر چۆنێک بێت ئێوە بە كەشتییەكەی خۆتان لەم جێگایەدا چاوەڕوانی من بكەن و لێرە مەجووڵێنەوەو، ئەگەر بەرێكەوت زانیتان من دواكەوتوومە، ئەوا هەر لێرەدا لە ناو كەشتییەكە بنوون و كەشتییەكە مەبەنە جێگایەكی تر. چونكە لەوانەیە من لە سێ یەكی دووەمی شەو یان نزیكی بەیانی لەگەڵ تەرمەكەی مامم و كەنیزەكەمدا بگەمە لاتان و ئەگەر كەشتییەكە ببەنە شوێنێكی تر من ناتاندۆزمەوە.

دوایی هەریەكەو حەلقەیەكی زیوم دا بە سەوڵ لێدەرەكان و وتم: ئەم زیوە پێشەكییە، بۆئەوەی بزانن من ئەمشەو هەرچۆنێ بێت دێم و كەشتییەكەتان بەكرێ مەدەنە كەسێكی تر و كاتێ گەیشتینە جێگا، یەكی چوار حەڵقەی تر دەدەمە هەر یەک لە ئێوە و بۆ ئەوەی لە رێگادا بە تەماحی زێڕ و پارە نەمكوژن. وتم: خۆشتان دەزانن ک رێبواران لە بابلدا هەرگیز زێڕ و پارەی زۆر لەگەڵ خۆیاندا هەڵناگرن، بەڵكو حەواڵە وەردەگرن و كاتێ گەیشتنە جێگا حەواڵەكە دەكەنە كانزا (زێڕ، زیو، مس، تەل) و منیش دوای گەیشتنە جێ حەواڵەكەم دەكەم بە كانزا و باقیی كرێكەتان دەدەمەوە.

سەوڵ لێدەرەكان دوای وەرگرتنی زیوەكە گەیشتنە ئەو باوەڕەی كە ئەگەر من

بگەیەننە جێگای دیاری کراو قازانجێکی زۆریان دەست دەکەوێت و هەریەکەیان دەبێتە خاوەن پێنج حەلقەی زیو و دڵنیابوون کە شەو تا سبەینێ چاوەڕوانی من بن.

دوایی لەوێ گەڕامەوە و کوندەیەکی بچووکم کڕی و پاشان چوومە پەرستگە و مەڕێکم سەربڕی و خوێنەکەیم خستە ناو کوندەکەوە و کێردەکەی میناشم هەڵگرت و بەرەو حەرەم سەرای (بورابورریاش) کەوتمەڕێ. کاتێ ویستم بچمە ناو حەرەمەوە کوندە بچووکەکەم خستە ناو سندووقی پزیشکییەکەم بۆ ئەوەی کەس نەیبینێ.

نێرەمووکەکان هەر ئەوەندە چاویان بە من کەوت، هاتنە لام و من پێیانم وت: هەندێ دەرمانم بۆ چاک کردنەوەی ژنە شێتەکە هێناوەو ئێوە دەبێ بەرەو خانووەکەی ئەو ڕێنومایییم بکەن.

نێرەمووکەکان منیان گەیاندە جێگاکەی (مینا) و پێم وتن: ئێرە چۆڵ بکەن بۆ ئەوەی بە دەرمان گیانە ئازارگەیەنەرەکان لە لەشی ئەم ژنە دەربکەم، کە بوونەتە هۆی شێت بوونی.

ئەوان ڕۆیشتن و من بە (مینا)م وت: دەمەوێت ئەمشەو لێرە بترفێنم و لەگەڵ خۆمدا بتبەم و لەم وڵاتە دەرباز بین. بەڵام بە مەرجێک کە بە پێی ڕێنوماییەکانی من کاربکەی.

(مینا) وتی: پێویستە چی بکەم؟

کوندە بچووکەکە و کێردەکەم نیشانی داو وتم: ئەمانە لای تۆ دادەنێم و دەڕۆم و پێیان دەڵێم دوای ڕۆیشتنی من هیچ کەسێک نەچێتە ئەم هۆدەیەوە و لەگەڵ تاریک بوونی هەوا دەبێ ئەم کوندەیە بکەیتەوە و هەندێ خوێنی لێ دەربکەی و بە دەم و چاو و دەست و سینگی خۆتدا بکەی و کێردەکەش لە تەنیشت خۆتەوە دابنێ، من لە سەرەتای شەودا دێم و کاتێک هاتمە هۆدەکەتەوە، بەوان دەڵێم کە بەم کێردە خۆی کوشتووە و تۆش خۆت بە مردوو نیشان بدە بۆ ئەوەی هەموویان



دڵنیابن کە گیانت دەرچووە.

دوایی نێرەمووکەکان ڕازی دەکەم کە تۆ لێرە ببەمە دەرەوە و لە شتێکا دەتپێچمەوەو لێرە دەچینە دەرەوە. دواییش لە جێگایەک دەست و دەم و چاو و سینەت دەشۆم و لەگەڵ خۆمدا دەتبەم.

(مینا) ڕازی بوو کە بە پێی فەرمانی من ڕەفتار بکات و لە ژوورەکەی هاتمە دەرەوە و بە نێرەمووکەکانم وت: هیچ کەسێک لە نێرەمووکەکان و ژنەکانی حەرەم نابێت بچنە ناو هۆدەکەی (مینا)وە، چونکە ئەگەر یەکێک دەرگای هۆدەکەی بکاتەوە و بچێتە ژوورەوە، گیانە ئازار گەیەنەرەکان کە بەهۆی دەرمانەکەوە لە (مینا) دێنە دەرەوە، دەچنە ناو لەشیەوەو شێتی دەکەن. من خۆم شەو دێمەوە و دەچمە ژوورەکەیەوە.

خواجەکان، کە ترس دایگرتبوون وتیان: دڵنیابە کە ناهێڵێن کەس بچێتە ژوورەکەیەوە و ئێمەش ناچین.

دوایی چوومە کۆشکی پاشایەتی و سەیرم کرد بەندەکەم هێشتا لە هۆڵی میوانداریییەکەیە. هەندێ لەو کەسانەی خەریکی بادەنۆشی بوون بەهۆی سەرخۆشییەوە لە تەلارەکەدا خەویان لێ کەوتبوو و خەڵکیش کەم و زۆر مەست بوون، بەڵام (بورابورریاش) لە هەست و هۆشی ئاسایی خۆیدا بوو. هەتاو بەرادەیەک نزم ببووەوە کە تیشکە ئەرخەوانییەکەی لە ناو ژوورەکەی دەدا.

لە (بورابورریاش)م پرسی: جەژنی پاشای درۆیین کەی کۆتایی پێ دێت؟

وتی: کاتێ کە خۆر لە پشت رووبارەوە ون بوو، ئەم جەژنە کۆتایی پێ دێت و بەندەکەی تۆ بە ژەهرێک کە دەیکەنە شەرابەکەیەوەو دەرخواردی دەدەن دەکوژرێ و دوای ئەوە لاشەکەی دەخەنە دەفرێکی کووپەیی گڵی سوور[1] و لە ناو سارد خانەکەی مندا لە تەنیشت لاشەی ئەو کەسانەی لەم ڕۆژەدا بوونەتە پاشای درۆیین، دادەنرێت.

وتم: (بورابورریاش) بەندەکەی من وەک خۆم خەڵکی میسرە و خەتەنە کراوە

و خوایەکانی ئێمە دەڵێن کاتێ کە مرۆڤ مرد دەبێ تەرمەکەی مۆمیایی بکرێت بۆئەوەی لە دنیای تردا زیندوو بمێنێت.

(بورابورياش) وتی: کاتێ کە تەرمەکە مۆمیایی کرا چی لەو لاشەیە دەکەن؟

وتم: دوای مۆمیایی کردن لاشەکە لە ژێر خاکدا دەشارینەوە.

(بورابورياش) وتی: من دەهێڵم لاشەی بەندەکەت بە پێی نەریتی خۆتان مۆمیایی بکەیت، بەڵام دوایی دەبێ تەرمەکە بدەنە ئێمە بۆ ئەوەی بتوانین بیکەینە کوپە هەرگینە (سوفاڵ)ەکەوە و لە ناو ساردخانە دایبنێین.

وتم: مۆمیایی کردنی جەنازەی پیاوە بەرزەکان شەست تا حەفتا ڕۆژ دەخایەنێت، بەڵام جەنازەی بەندەکان دەتوانرێت بە سی ڕۆژ مۆمیایی بکرێت.

(بورابورياش) وتی:باشە کەواتە تەرمەکەی ئەو لەسی ڕۆژدا مۆمیایی بکە.

– وتم ناکرێت ئەم کارە لێرەدا دەستی پێبکەم، چونکە ئەگەر من تەرمی بەندەکەم لەم کۆشکەدا مۆمیایی بکەم، هەموو ئەو کەسانەی کە لێرەدان، بەتۆشەوە، بەهۆی بۆنی ترسناکی لاشەکەوە دەمرن و دەبێ بڵێم کە ئەم تەرمە دەبێ بەزوویی مۆمیایی بکرێت. ئەگەر نا هەوای گەرمی بابل ئەمشەو تەرمەکە تێک دەدات و دوایی ناتوانین مۆمیایی بکەین. بۆیە تۆ دەبێ ڕێگا بدەیت، کە ئەمشەو لەپاش مردنی بەندەکەم، لاشەکەی لەکۆشک ببەمەدەرەوە بۆ ئەوەی لە قەراغی ڕووبار لە جێگایەکی دوور مۆمیایی بکەم و لە ئەمشەوەوە کەلێرە دەچمە دەرێ، تاسی(٣٠) ڕۆژی تر من نابینیەوەو ناشبێ بمبینی چونکە ئەگەر لەم سی ڕۆژەدا من لێت نزیک ببمەوە بۆنی لاشەکە دەبێتە هۆی لەناو چوونت.

(بورابورياش) وتی منیش لەسی ڕۆژی داهاتوودا کارم بەتۆنییە کەبێیت بۆ لام.

پاشان سەیرێکی خۆری کردو وتی لەبەر ئەوەی خۆر کەوتە پشت ڕووبارەوە، ئیتر جەژن کۆتایی پێ هاتووەو چەند ساتێکی تر، ژەهر دەدەنە بەندەکەت و بڕۆ و ئاگادار بە کە بە چاودێریی خۆتەوە کە پزیشکی، ژەهر بدرێتە ئەم پیاوە.



لەکاتێکدا کە ئێمە خەریکی گفتوگۆ کردن بووین، لەوەزعی خزمەتکارەکانی کۆشکەوە بۆم دەرکەوت کەجەژنی پاشای درۆیین کۆتایی پێهاتووە. چونکە لەناکاو هەمووان لە دەوری (کاپتا) دوورکەوتنەوە، بەڵام کاپتا کە بەهۆی نۆشینی شەرابەوە مەست بوو نەیدەتوانی هەست بەگۆڕانی هەڵسوکەوتی کرێکارەکان بکات. خۆم گەیاندە پزیشکەکەی (بورابورياش) و پێم وت کە پاشا فەرمانی داوە پێم کە خۆم ژەهرەکە دەرخواردی ئەم کابرایە بدەم کە ئەمڕۆ بووەتە پاشای درۆیین. پزیشکەکە باوەڕی بە قسەکەی من کرد، چونکە جگە لەوەی کە هەستی کرد درۆناکەم، لەو ڕۆژەدا ئەوەندە شەرابی خواردبۆوە کە نەیدەتوانی لەسەر پێ بوەستێ و هەر ئەوندە کە زانی کاری ژەهرە پێ خوراندنەکە، بە(کاپتا) لە ئەستۆی مندایە، خۆشحاڵ بوو و وتی ئایا دەزانی کە دەبێ بەچ ژەهرێک بیکوژی؟ وتم بەڵێ من لە ناسینەوەی ژەهرەکان لە هەموو پزیشکەکانی بابل شارەزاترم. پزیشکی پاشا لەبەر سەرخۆشی بەلادا دەهات و وتی: بەڵام لەپاش ئەوەی بەندەکەت مرد، من دەبێ چاوی لێ بکەم و فەحسی بکەم، بۆئەوەی دڵنیابم مردووە.

وتم هەر کە مرد ،یەکسەر دێم پێتی رادەگەیەنم کە بێی سەیری بکەی. وتی کەواتە من دەچم دەنووم و پاش ئەوەی بەندەکەت گیانی دەرچوو ئاگادارم بکەرەوەو ئەگەر نووستبووم، بەخەبەرم بکەرەوە. وتم وادەکەم بۆ ئەوەی بزانی کە مردووە.

کاتێک کە لە پزیشکەکە جیابوومەوە، هەندێ تریاکم کردە ناوشەڕابەوە و ئەو تریاکەم بەقەدەر ئەوەندە تێکەڵ کرد، کە لە دوای خواردنی بە جۆرێک لە هۆش بچێت کە خەڵکی وابزانن مردووە.

دوای بەشەڕابی لەگەڵ تریاک تێکەڵ کراوەوە چوومە لای (کاپتا) و پێم وت تۆ ئەمڕۆ پاشای چوارهەرێمی و هەمووان تۆ بەم پلەیەوە دەناسن و منیش دانی پێدا دەنێم کە تۆ پاشای بابلی، بەڵام وەکو دەزانی من نەهاتبووم کە هەمیشە لە

بابلدا بمێنمەوەو ئێستا دەمەوێت بگەڕێمەوە، بەڵام بەر لە ڕۆیشتن ئارەزوویەکم هەیە کە دەبێ بەدیی بهێنم. (کاپتا) پرسی ئارەزووەکەت چییە؟

وتم ئارەزووم ئەوەیە کە بەدەستی خۆم پیاڵەیەک شەرابت پێ بنۆشم بۆ ئەوەی لەدوای گەڕانەوە بۆ میسر بتوانم بەهەمووان بڵێم کە من (سینۆهە)ی کوڕی کەر کەسێکم کە بە دەستی خۆم شەرابم بە پاشای بابل نۆشیوەو خەڵکی بەچاوی ڕێزەوە لێم بڕوانن و گەورەیی من بسەلمێنن.

(کاپتا) وتی من ئەمڕۆ بایی پێویست شەرابم نۆشیوەو هیچکە حەزم بە خواردنەوە نییە. بەڵام لەبەر ئەوەی تۆ دەڵێیی بە ئاواتەوەی بەدەستی خۆت شەرابم بدەیتێ و منیش تاوەکو ئەمڕۆ کەسێک نەبووە کە شەراب ڕەت بکەمەوە، ئەوا دەیخۆمەوە ئەگەرچی دەشزانم کە لەوانەیە بەشێوەیەک مەست ببم کە نەتوانم لە جێگەی خۆم ڕاست ببمەوە.

پاشان پیاڵەکەی لەمن وەرگرت و بەیەک جار هەڵیقوڕاند و پیاڵە بەتاڵەکەی فڕێ دا. لەم کاتەدا چراکان هەڵکران و بێدەنگی کۆشکی پاشایەتیی گرتەوە. چونکە هەموو زانیتیان کە کاتی خۆشی و ڕابواردن تێ پەڕیوە و ئەگەر یەکێک بە تەمای گاڵتەوگەف و ڕابواردن بێت، دەکوژرێت.

دوای چەند ساتێ کاپتا کڵاو (تاج)ی پاشایەتییەکەی لەسەری خۆی داگرت و وتی ئەم کڵاوە بۆسەرم بچووکە و پاڵەپەستۆ دەخاتەسەر سەرم و ئێسکی سەرم ژان دەکات و لەقاچەکانیشمدا هەست بەسڕبوون دەکەم و پێڵووەکانم قورس بوونەو وابزانم بنووم باشە. (کاپتا) هەر لەو شوێنەی دانیشتبوو، ڕاکشاو ساتێ دوای ئەوە خەوی لێ کەوت و من زانیم کە هۆی نووستنەکەی ئەو تریاکەکە بوو و چەند خولەکێک دوای ئەوە بەرە بەرە قورس دەبێت و وای لێ دێت کە هەرکەسێ بیبینێ وا دەزانێت کە گیان لە لەشیدا نەماوە. خزمەتکارەکانی کۆشک، ئەو تاجەی کاپتا لەسەری خۆی کردبۆوە، هەڵیانگرت و خستیانە سەر (بورابورياش) و بەرگی پاشایەتییان لەبەرکرد و پاشای ڕاستەقینەی بابل لەسەر



تەخت دانیشت و وتی: ئەمڕۆ لەگەڵ ئەوەشدا کە ڕۆژی جەژن و خۆشی بوو، بەڵام من زۆر ماندوو بوومە، چونکە لە ڕۆژەکانی جەژن مرۆڤ زیاتر لە کاتەکانی تر هەست بەشەکەتی دەکات و لەبەرئەوە من دەبێ بنووم و خێرا ئەو کەسانەی کەمەستن و لێرە نووستوونە، بە کوتەک لە کۆشک ببەنەدەرەوەو ئەم نەفامەش (ئیشارەتی بەکاپتا کرد) کاتێک کەبەتەواوەتی گیانی سپارد، بیخەنە ناو کووپەیەکی سواڵەتی (سوفاڵ). خزمەتکارەکانی کۆشکی پاشا، بەجۆرێک بەدار کەوتنە گیان سەرخۆشەکان و ئەوانەی لەوێ نووستبوون، کە لە چەند ساتێکدا هەموویان هاتنەوەهۆش و هەڵسان و ڕایانکرد. من لە کاپتا نزیک بوومەوەو ڕوانیم هەموو نیشانەکانی ڕواڵەتی مەرگی تیادا بەدیار کەوتووەو بە بەندەکانم وت بڕۆن بەپزیشکی پاشا بڵێن بێت بۆ ئێرە و ئەم پیاوە فەحس بکات بۆ ئەوەی کە بزانێ مردووەو ئەوان ڕۆیشتن و پزیشکەکەیان هێنا و ئەویش کە لە کاتی مەستی خەوی لێ کەوتبوو و نیوسەعاتیش نەدەبوو نووستبوو و هێشتا هەر مەستیش بوو، بە چاوەنیوەکراوەکانییەوە هات. من هەستم کرد کە بەو وەزعە، ئەو تاقەت و توانای ئەوەی نییە کە بە وردی چاوی لێ بکات و ئەگەریش فەحسی بکردایە دیسانەوە هەر وایدەزانی مردووە.

بەڵام پزیشکی پاشای بابل کەدەیەویست هەرچی زووترە بگەڕێتەوەو بنوێت، سەرپێیی سەیرێکی بەندەکەی کردو وتی بێ گومان مردووەو بیکەنە ناو دەفرێکی سواڵەت (هەرگینە) بیەوە و دەرگای دەفرەکە (کووپەکە) بەهەویری خاکی ڕۆس (گڵی سوور) دابخەن. بەندەکانی (بورابورياش) کاپتایان خستەناو کووپەکەیەوە و کاتێک کە خەریکی گرتنەوەی هەویری گڵەسوورەکە بوون، من بەڵێنەکەی پاشام هێنایەوە بیری و وتم دەبێ لاشەکەی کاپتام بدەنەوە کە بیبەم و مۆمیایی بکەم. (بوراوبورياش) بە بەندەکانی وت، (سینۆهە) پزیشکی میسری لەلایەن منەوە ڕێگا پێدراوە کە لاشەی ئەم پیاوە لەکۆشک بباتە دەرەوەو خەریکی مۆمیایی کردنی بێت و کەس نابێت ڕێگای لێ بگرێ و ئاگاداربن کە

ئەو لەدوای دەرچوونی لە کۆشک تاماوەی سی شەو و سی ڕۆژی تر هەنگاو نەنێتە کۆشکەوەو ئەگەر ویستی بێتە ژوورەوە بەدار دەری بکەن.

چونکە لەبەر ئەوەی خەریکی مۆمیایی کردنی لاشەی ئەم پیاوە دەبێت بۆنە ترسناکەکەی لەگەڵ خۆیدا دەهێنێتە ئێرەو هەموومان لەناو دەبات.

من کە پێشتر کەژاوەیەکم ئامادە کردبوو کووپە گەورەکەی کە (کاپتا)ی تیابوو هەڵمگرت و خستمە ناو کەژاوەکەوە و لە ڕێگا بەر لەوەی بگەینە کەژاوەکە، چەند کونێکم کردە سەرپۆشی کووپەکە کە لە هەویر دروست کرابوو، بۆ ئەوەی بەندەکەم نەخنکێ.

کاتێ کە دڵنیابووم (کاپتا) لە کۆشکی پاشا دەرچووە و لە دەفرەکەدا لەسەر کەژاوەکە داندرا بەرەو حەرەم سەرای پاشا کەوتمەڕێ و بە نێرەمووکەکانم وت: دەڕۆم بۆ ئەوەی کاریگەرێتیی دەرمانەکە لە (مینا)دا ببینم.

کاتێ کە چوومە ژووری (مینا)وە، تێگەیشتم کە بە پێی پیلانەکەی من کاری کردووە و دەم و چاو و دەستی خوێناوی کردووە و کێردێکی خوێناویشی لە تەنیشت خۆیەوە دانابوو. بە ترسێکی دروست کراوەوە لە ژوورەکە هاتمە دەرەوە و بانگی نێرەمووکەکانم کرد و پێم وتن: مەگەر ئێوە شێت بوونە کێردێکی ترتان خستووەتە بەردەستی ئەم ژنە، کە خۆی پێ بکوژێت.

کاتێ نێرەمووکەکان چاویان بە خوێنەکە کەوت، لەرزین و کەسیان نەیان وێرا بچنە پێشەوە و بزانن ئایا (مینا) بەراستی مردووە یان هێشتا گیانی تیایە. چونکە نێرەمووکەکان زۆر لە خوێن دەترسێن و بە هیچ نرخێک ئامادەنین لە تەرمێکی خوێناوی نزیک ببنەوە. هەموویان بە ترس و لەرزەوە سەیری منیان دەکرد و بە چاوە ترس لێنیشتووەکانیان لە منیان دەپرسی ئەرکی ئێمە چییە و دەبێ چی بکەین؟

وتم: لەم ڕووداوەدا ئێوە بە ئەندازەی من یان لە منیش زیاتر بەرپرسن، چونکە من پیاوێکی پزیشکم و هاتبووم ئەم ژنە شێتە چاک بکەمەوە و



جارێکیان بە ئاگاداری خۆتان کێردەکەم لێ سەند، بەڵام نازانم ئەو چۆن توانیویەتی کێردێکی تر پەیدا بکات و خۆی پێ بکوژێت.

ئێستا تاکە ڕێگە چارە ئەوەیە کە من ئەم ژنە لە لبادێک بپێچمەوەو لێرە بیبەمە دەرەوە و ئێوە هەر ئەمشەو یان سبەینێ کەنیزێک بکڕن و لە جیاتی ئەو دای بنێن و ئەگەر (بورابوریاش) پرسیی بۆچی شێوەی کەنیزەکەی گۆڕاوە، بڵێن لەبەر ئەوەی ئەو شێت ببوو و گیانە ئازارگەیەنەرەکان کە لە لەشیدا تواونەتەوە شێوەیان گۆڕیوە.

نێرەمووکەکان سەیرێکی یەکتریان کرد و پرسییان: ئێمە کانزا لە کوێ بهێنین کە کەنیزی پێ بکڕین؟

وتم: من بەهای کەنیزێکتان دەدەمێ و کاتێک کە کەنیزە نوێیەکەتان کڕی و هێناتانە حەرەم، بیرازێننەوە و شێوەی پێشوازی کردن لە (بورابوریاش)ی فێر بکەن و من دڵنیام کە کاتێک پاشای بابل ببینێ کەنیزەکەی دەستەمۆ بووە، ئەوەندە خۆشحاڵ دەبێت کە بیر لە دەمو چاو گۆڕانەکەی ناکاتەوە.

دوایی دوو کەرتە زێڕم پێدان کە زیاتر بوو لە بەهای کەنیزێکی جوان و ئەوان لبادێکیان هێناو من (مینا)م تێدا پێچایەوەو بەبێ ئەوەی خۆم بۆ هەندێ ڕوونکردنەوە دوابخەم (مینا)م خستە سەرشانم و لە حەرەم چوومە دەرەوە. چونکە دەمزانی ئەو کاتەی کە دەبێت کارێک بە خێرایی ئەنجام بدرێ هەر چەندە کەمتر لە بارەیەوە بدوێی باشترە. لەبەرئەوەی بەهۆی گفتوگۆی درێژ هەندێ گرفت لە کارەکەدا پەیدا دەبێت کە دەبێتە هۆی ترس و دوو دڵیی خەڵکانی لاوازو خواجەکان هەموویان کەسانێکی ترسنۆک و لاواز بوون.

(مینا)شم بردە ناو کەژاوەکەوە و خۆم سواربووم و بەڕێ کەوتین تا گەیشتینە نزیک ڕووبار. بەر لەوەی بگەینە ڕووبارەکە بە باربەرەکانم وت: کەژاوەکە دابنێن و سەرەتا کووپەکەی (کاپتا)ی تێدابوو بە ئەوانم گواستەوە بۆ ناو کەشتییەکە. دوایی بە باربەرەکانم وت: لە کەژاوەکە دوور بکەونەوە بۆ ئەوەی ڕوحی

بەندەکەی خۆم لەوێ بهێنمە دەرەوە و، وتم: کاتێ ئێوە دەگەڕێنەوە من نابینن چونکە لەوێ ڕۆیشتوومە، بەڵام کەژاوەکەی ئێوە لە شوێنی خۆی دەمێنێتەوە و دەتوانن هەڵیبگرن و بیبەنەوە.

دوای ڕۆیشتنی باربەرەکان (مینا)م لە کەژاوەکە هێنایە دەرەوە و بردمە کەناری ڕووبار و رامکشاند کە دەست و دەمو چاوی خۆی بشوات. دوایی بە یەکەوە سواری کەشتییەکە بووین و لە تاریکیی شەودا کەشتییەکەمان کەوتەڕێ و لە کەنارە کە دوورکەوتەوە.

سەوڵ لێدەرەکان لە بینینی (مینا) نە حەپەسان، چونکە بە ئەوانم وتبوو کە لەگەڵ کەنیزەکەی خۆم سەفەر دەکەم و ئەوان هەر وایان دەزانی کەنیزی منە. بەم شێوەیە، من بە یەک شەو، بابلم خستە پشت سەری خۆمەوە و لەو سەرزەمینە کە لەوانە بوو بەهۆی پزیشکییەوە سامانێکی زۆرم دەست بکەوێت دوور کەوتمەوە.

***

١- کووپەی گڵی سوور: کووپەی هەڕگینەیی- کووپەی سواڵەت یان گۆزەی گەورەی سوفاڵ- وەرگێڕی کوردی.



## بەشی هەژدەیەم

# مینا و، بەهۆش هاتنەوەی کاپتا

کاتێ کە هێندە لە شار دوور کەوتینەوە، کە ئیتر رۆشنایی شاری بابلمان لێوە دیار نەما، (مینا) بە زمانی میسری کە سەوڵ لێدەرەکان لێی تێ نەدەگەیشتن دەستی بە قسە کردن کرد و وتی: من ئەمشەو بە هۆی جێ بەجێ کردنی فەرمانی تۆ بۆن گرتوو بوومە.

وتم: بۆچی بۆن گرتوو بوویتە؟

(مینا) وتی: لەبەر ئەوەی تۆ بە منت وت دەست و دەم و چاو و قاچم خوێناوی بکەم و من هەرچەندە خۆم بشۆم بۆنی خوێن لە لەشم دوور ناکەوێتەوە.

وتم: مەبەستت لەم قسەیە چییە؟

(مینا) وتی: مەبەستم ئەوەیە کە تۆ منت فریو داو وات لێ کردم کە بەهۆی خوێناوی بوون، پیس و بۆگەن ببم.

وتم: ئەی ژنی نەفرەتی، من ئەوەندە ماندووم کە تاقەتی قسەکردنم لەگەڵ تۆدا نییەو بهێڵە بنووم، چونکە ئەو زەحمەتەی ئەمشەو بۆ رزگار کردنی تۆ تووشی بووم، یەکێک بوو لە گەورەترین ناخۆشییەکانی تەمەنم و لە دوای دەرچوونم لە خانەی مەرگی میسر، هەرگیز گرفتاری ماندوێتی وەها نەبوومەتەوە، چونکە ئەو گرفتانەی ئێمە رووبەڕووی دەبینەوە ئەگەر تەنها پەیوەندیی بە جەستەوە بێت، زۆر سەخت نییە، بەڵام کاتێ کە مرۆڤ جگە لە ئازارە جەستەییەکان تووشی ماندوێتی روحیش بێت، زۆر شەکەت دەبێت. من ئەمرۆ هەم گرفتاری ماندوێتیی جەستەیی بوومە و هەم ئەرکی روحیش. جگە لەمانەش ئەمرۆ بۆ رزگار کردنی تۆ زەرەرێکی ماددیی گەورەم لە خۆم دا، چونکە ئەگەر تۆ نەبوویتایە و داوات لە من نەکردایە رزگارت بکەم لە حەرەم قوتارت ببێ من چەند رۆژێکی تر بە ناوی پزیشکی گەورە و پلە یەکی بابل لە لای



راستی پاشای ئەم وڵاتە دەوەستام و ئەوەندە زێڕ و پارەم دەست دەکەوت کە کەشتییەکی وەک ئەمە کە ئێمە ئێستا تیایدا دانیشتووین نەیدەتوانی هەڵیبگرێ. بەڵام تۆ منت ناچار کرد کە واز لەو قازانجە بهێنم و تۆ لە بابل دەربکەم. لە داهاتوودا هەموو ساڵێ لەم رۆژەدا کیسەیەک خۆڵەمێش بەسەر خۆمدا دەکەم بۆ ئەوەی لە یادم بێت کە ئەم رۆژە یەکێک بووە لە رۆژە نەگبەتییەکانی من.

(مینا) وتی: ئەگەر تۆ بەم رادەیە من بە هۆکاری تووش بوونی چارەڕەشی خۆت دەزانی وا باشە من خۆم فڕێدەمە رووبارەوە بۆ ئەوەی تۆ لە دەست من رزگارت بێت.

دوای ئەم قسەیە (مینا) جووڵایەوە کە خۆی بخاتە ئاوەکەوە، بەڵام من ئەوم گرت و وتم: (مینا) لەگەڵ ئەوەشدا کە من ئەمرۆ ماندویەتییەکی زۆرم چێشتووە و زیانێکی گەورەم کردووە، بەڵام وەسیلەیەکی دڵدانەوەم بۆ خۆم هەیە کە ئەویش رزگار کردنی تۆیە. ئەگەر تۆ خۆت بخەیتە ئاوەکەوە و لە ناوبچی بەدبەختییەکەی من گەورەتر دەبێت، چونکە تێدەگەم کە دوای ئەو هەموو ئەرک و ئازارە نەمتوانیوە پێش لە مردنت بگرم. تۆ، بە هەموو خوایەکانی بابل و میسر و سووریا سوێند دەدەم کە وازم لێ بهێنە و بنووەو ئەگەریش حەز ناکەی بخەوی لە گۆشەیەکدا دابنیشە و بێدەنگ بە بۆ ئەوەی بتوانم بنووم.

ژنەکە بێدەنگ بوو و لە سووچێکی کەشتییەکە دانیشت و منیش لبادەکەی کە (مینا)م تێدا پێچابووەوە دام بە خۆمداو خۆم پێ داپۆشی کە بنووم. چونکە لەگەڵ ئەوەشدا کە شەوی چواردەیەمی وەرزی بەهار بوو و بولبولەکان لەم بەرو ئەو بەری رووباردا دەیانخوێندو حاجی لەقلەقەکان لە کەنار قامیشەڵانەکانی کەناری رووبار دەنگیان دەهات، بەڵام هەوای ئەو شەوەی سەر ئاوەکە فێنک بوو.

دوای چەند ساتێک داوام لە (مینا)ش کرد کە ئەویش پشوو بدات، بەڵام

ئەو بەبێ ئەوەی گوێ بداتە قسەکەی من دەستی بە چڕینی ئاوازێکی خەماوی کرد. من بە هۆی دەنگی (مینا)وە خەوم لێ کەوت و بەرە بەیان لە خەو هەڵسام و هەستم کرد کەشتییەکە ناڕوات و سەیرم کرد سەوڵ لێدەرەکان دەستیان لە سەوڵەکانیان هەڵگرتووە.

پێم وتن: بۆچی سەوڵ لێنادەن؟

وتیان: ئێمە لە شەوەوە تا بەیانی سەوڵمان لێداوە و ئێستا دەستەکانمان وەک داری سەوڵەکە وشک بووە و پشتمان دەیەشێت و ناتوانین چی تر بەردەوام بین و دەبێ خواردن بخۆین و لەبەر ئەوەی گوندێک لە کەناری رووباردا دەبینرێت، برۆ و لەو گوندە گۆشت و ماستمان بۆ بهێنە تا بیخۆین و خۆمان تێر بکەین.

وتم: ئێستا کاتی نان خواردن نییە، ئەگەر لە کاتی نیوەڕۆدا گەیشتینە هەر ئاوەدانییەک، ئەوا خواردنتان بۆ دەکڕم و تێرتان دەکەم. ئینجا پێم وتن کە دەبێ بە خێرایی خۆم بگەیەنمە شوێنی باو و باپیرانمان و ئەگەر ئێوە لێرە خواردن بخۆن بەرەو پێش چوونمان دوادەکەوێت و ئەوەش بزانن کە ئەگەر بتانەوێت لە فەرمانەکانم سەرپێچی بکەن، من جادووگەرێکی بە توانام و بە هەموو گیانە ئازارگەیەنەرەکان رادەگەیەنم کە پەلامارتان بدەن و گۆشتی لەشتان پارچە پارچە بکەن و بیخۆن.

ئەگەرچی بابلییەکان لە جادوو دەترسان، بەڵام ئەوان لە هەڕەشەکەی من نەترسان، چونکە دەیاندی رۆژە و هەتاو ئەدرەوشێتەوە و لە رووناکیی رۆژ گیانە ئازار گەیەنەرەکان ترسناک نابن.

دوایی گوێم لێ بوو کە یەکێ لەوان دەیگوت: ئەو یەک نەفەرە و ئێمە دە نەفەرین و دەتوانین هەر چییەکمان بوێ لەگەڵیدا بیکەین. یەکێک لە سەوڵ لێدەرەکان کاتێ کە قسەکەی ئەوی بیست سەوڵەکەی هەڵبڕی کە بیکێشێت بەسەری مندا، بەڵام لەم کاتەدا هاواری (کاپتا) لەناو کووپەکەوە بەرزبووەوەو،



سەوڵ لێدەرەکان کە لەو باوەڕەدابوون تەرمی مامی من لە ناو ئەو کووپەیەدایە کاتێک کە زانییان مردووەکە زیندوو بووەتەوە بە شێوەیەک ترس دایگرتن کە یەک لە دوای یەک خۆیان خستە ناو ئاوەکەوە و کەشتییەکە بەبێ سەوڵ لێدەر مایەوە، بەڵام من توانیم کەشتییەکە بگەیەنمە کەنارەوە و لەوێدا لەنگەری کەشتییەکەم خستە خوارەوە تاکو جووڵانی ئاو کەشتییەکە نەبات.

(مینا) لە خەو هەڵسابوو و پرچی سەری رێک دەخست و من بەبینینی ئەو دڵخۆش بووم، چونکە بینیم مینا لەوە جوانترە کە لە حەرەمی (بورابورياش) بینیبووم.

(کاپتا) لە ناو کووپەکە پەلە قاژەی دەکرد و من لێی نزیک بوومەوەو سەری کووپەکەم شکاند، چونکە هەویرەکە وشک بوو بوو.

(کاپتا) سەری لە کووپەکەوە هێنایە دەرەوە و بەسەرسوڕمانەوە سەیری دەوروبەری کرد و پرسیی: ئێرە کوێیە و من لە کوێم و کڵاوی پاشایەتیم چیی لێ هاتووە؟ بۆچی کراسی پاشایەتیم لەبەردا نییە؟ چونکە هەست دەکەم رووتم و سەرمامە و قاچەکانم بە شێوەیەک سڕ بوونە کە ئەڵێی مارێکی ژەهراوی پێوەی داوم... سینۆهە... سینۆهە. ئاگاداربە ئازارم نەدەیت و هەڵم نەخەڵەتێنی، چونکە من پاشای بابلم و پاشا کەسێک نییە کە بتوانن گاڵتەی پێ بکەن و فریوی بدەن.

من بۆ ئەوەی تۆڵەی بێ ڕێزییەکانی دوێنێی لێ بکەمەوە وتم: تۆ بیرت چوو دوێنێ کاتێ کە لە بابل دەرچووین ئەوەندەت خواردبووەوە کە مەستی کردبووی و ویستت سەوڵ لێدەرەکانی ناو کەشتییەکە بریندار بکەی و باست لەوە دەکرد کە پاشای بابلی و دادپەروەری پیادە دەکەی و سەوڵ لێدەرەکان کاتێ لێت پەست بوون ناچار بوون تۆ لەم کووپەیەدا زیندانی بکەن بۆ ئەوەی پەلاماریان نەدەی.

(کاپتا) چاوەکانی نووقاند و کەوتە بیرکردنەوەو دوای ئەوەی چاوەکانی هەڵهێنا، وتی: من لەمەو دوا شەراب ناخۆمەوە چونکە بادەنۆشی، منی تووشی

خەوێکی سەرسوڕهێنەر کرد و بینیم بوومەتە پاشای بابل و لە ناو خەڵکیدا دادپەروەری بەرقەرار دەکەم و دوایی بینیم چوومە حەرەمی (بورابورباش)ی پاشای بابل و ویستم لە گەڵ ژنێکی نەفامدا چەند وشەیەک بدوێم، بەڵام ئەو ژنە شاڵاوی بۆ هێنام و برینداری کردم و هەندێ شتی تریشم بەسەردا هات کە ئێستا نایەتەوە یادم. چونکە سەرم ژان دەکات و حەز دەکەم کە تۆ لەو دەرمانەی دەیدەیتە سەرخۆشەکان کە بەئاگایان بهێنێیتەوە بیدەیتە منیش کە بیخۆم، بۆ ئەوەی مەستی بەرم بدات و سەرئێشەکەم نەمێنێت.

لەو کاتەدا کە بەندەکەم ئەم قسەیەی دەکرد لە پڕێکا لەسەر رووی کەشتییەکە چاوی بە (مینا ) کەوت و ئەو کە سەری لە کووپەکە هێنابووە دەرێ بردییە ژوورەوە و بە ناڵەوە وتی: گەورەم من هێشتا هەر خەریکی خەو بینینم، لەبەرئەوەی ئەو ژنەی لە حەرەمەکەی (بورابورباش) بوو ئێستا وا لە بەر چاومە... ئەی خوایەکانی میسر بە هانامەوە وەرن چونکە خەریکە شێت دەبم.

(کاپتا ) لە ناو کووپەکەدا کەوتە گریان و جار بە جار دەیگوت: من شێت دەبم و لەمەو بەدوا ئەقڵم نابێت و وەک شێتەکان لە شار دەمکەنە دەرەوە.

(مینا ) لە کووپەکە نزیک بووەوە و قژی سەری (کاپتا )ی گرت و سەری هێنایە دەرەوەو وتی: باش سەیرم کە، ئایا دەمناسیتە یان نا ؟

(کاپتا ) بە گریانەوە وتی: تۆ ئەوەی کە لە خەوەکەمدا پەلامارت دام و لووت و لێومت بریندار کرد... ئەی خوایەکانی میسر بەزەییتان پێمدا بێتەوە... و لەم ژنە رزگارم بکەن. خوایەکانی میسر دەزانم کە ئێوە لە من تووڕە بوونەو لەبەر ئەوە ئەم ژنەتان هێناوەتە خەونی منەوە. چونکە لە دوای ئەوەی هاتمە بابلەوە پەرستنی ئێوەم لە بیر کرد و خوایەکانی بابلم دەپەرست. بەڵام لەمەو دوا تەنها ئێوە دەپەرستم.

(مینا ) پێڵاوەکانی لە پێی کردەوە و دووجار، بەڵام بە هێواشی، بە پێڵاو کێشای بە دەم و چاوی (کاپتا )داو وتی: لەبەرئەوەی تۆ لە کاتی خەودا جنێوت



بە من دا ئەمە سزای خەونە ناپەسەندەکەتە بۆ ئەوەی بزانی کە ئێستا نەنووستووی و بە خەبەری.

بەڵام (کاپتا ) زیاتر گریا و وتی: ئێستاش هەر لە خەودام، چونکە وا هەست دەکەم وەک جاری یەکەم کە لێی دام ئێستاش بەو پێڵاوە هێرش دەکاتە سەرم.

من بە (کاپتا )م وت: ئێستا بە راستی بە خەبەری و نابێ بگرییێت و لە کووپەکە وەرە دەرەوە بۆ ئەوەی مەستییەکەت چارەسەر بکەم.

بەڵام (کاپتا ) نەیدەتوانی لە کووپەکە بێتە دەرەوە چونکە گۆزەیەکی بچووک بوو و من، یارمەتیم دا تا هاتە دەرەوەو بۆئەوەی کاریگەرێتیی شەرابەکە لە ناو دەماریدا دەربچێت، (مسهل)م دەرخوارد دا، چونکە دەرمانی کاریگەر بۆ لەناو بردنی مەستی، دوای لە خەو هەڵسانی شەرابخۆر(مسهل)ە، لە بەر ئەوەی بەندەکەی من جگە لە سەرخۆشیی شەراب، گرفتاری نەشئەی تریاکەکەش ببوو و بۆئەوەی لە ئاسەواری تریاکەکە رزگاری بکەم پەتێکم بە پشتییەوە بەست و خستمە ناو ئاوی رووبارەوە.

(کاپتا ) لە پاش نەمانی کاریگەرێتیی دەرمانەکە، لەمەستی شەرابەکە هەر زوو رزگاری بوو و وتی چیتر هەست بە سەر ئێشە ناکەم. بەڵام وەک بلێیی بە تەواوەتی لە خەو هەڵنەساوم چونکە حەز دەکەم بنووم.

تێگەیشتم کە مەیلی ئەو بۆ نووستن بە هۆی کار تێکردنی تریاکەکەوەیە کەوا زوو لەناو ناچێت و ماوەیەک دەخایەنێت. پێم وت:تۆ رۆژێکی تر هەست بەهیچ یەکێک لەم ئازارانەی ئەمڕۆ ناکەی و بەتەواوی چاک دەبییەوە، هەروەها لەبەر ئەوەی بە هۆی هەڕەشەی ئەم ژنەو ناڕاحەتییەکانی پێ خواردنی دەرمانەکانی من بایی پێویست تەمێ بوویتە، من چاوپۆشی لە بێ رێزی کردنەکەت دەکەم.

(کاپتا ) وتی: بۆ من بەرامبەر بە تۆ بێ ئەدەبیم کردووە ؟

وتم: بەڵێ، تۆ دوێنێ بەهۆی خواردنەوەی شەراب و گاڵتەپێکردنی ئەو خەڵکەی کە تۆیان کردبووە وەسیلەی گاڵتەپێکردنی خۆیان، بە شێوەیەک ملهوڕ

ببووی کە دووجار بەرامبەر بە من بێ ئەدەبیت نواند، بەڵام بۆ ئەوەی بزانی کە جیاوازیی نێوان خواوەندێک و بەندەیەک چەندە، لێت خۆش دەبم، بەڵام ئەوە بزانە کە ئەگەر من دوێنێ لە کاتی خۆرئاوابووندا تۆم لە مەرگ رزگار نەکردایە ئێستا تۆ لەم کووپە بچووکەدا لە تەنیشت کووپەکانی تر، لە ساردخانەکەی کۆشکی پاشادا بووی، بەڵام بەبێ گیان. چونکە (بورابورياش) تۆی دەکوشت.

ئینجا رووداوەکانی دوێنێم بە تێر و تەسەلی بۆ گێڕایەوە، بەڵام (کاپتا) باوەڕی نەدەکرد و وای دەزانی درۆ دەکەم. بەڵام ئامادەبوونی (مینا) ناچاری دەکرد هەر چییەکی پێ دەڵێم باوەڕ بکات. دوای ئەوەی تێم گەیاند کە دوێنێ چ مەترسییەک هەڕەشەی لێ دەکرد و وتم: ئەگەرچی ئێمە لە بابل هەڵهاتووین بەڵام هێشتا ئەوەندە لەو شارە دوور نەکەوتووینەتەوە کە لە مەترسییەکان رزگارمان بووبێت و ئەگەر پاشای بابل دەستگیرمان بکات سەر بەرەو ژێر لە دیواری بابلدا هەڵمان دەواسێت.

سەوڵ لێدەرەکانی ئەم کەشتییەش هەڵهاتن و ئێمە ناتوانین بەهۆی ئەوانەوە کەشتییەکە لێ بخورین و خۆمان بگەیەنینە وڵاتی (میتانی) و تۆ کە بەندەی منی ئێستا دەبێ رێگا چارەیەکمان بۆ بدۆزیتەوە کە هەرچی زووتر لەنزیک بابل دوور بکەوینەوە و لەبەر ئەوەی لە دوێنێ ئێوارەوە تا ئەمڕۆ هیچمان نەخواردووە پێویستیمان بە خواردنە و برۆ لەم گوندە کە لە دوورەوە دەبینرێ خواردنمان بۆ بکڕەو لە گەڵ خۆتدا بیهێنەرەوە و لە کاتی رۆیشتن و گەڕانەوە ئەقڵت بەکار بهێنە کە چۆن ئێمە دەتوانین رابکەین و گیانی خۆمان لەتووڕەیی (بورابورياش) رزگار بکەین.

(کاپتا) بە دوو حەڵقە مسەوە رۆیشت و لە کاتێکدا کە بارێکی بە کۆڵەوە بوو گەڕایەوەو بینیم دوو گۆزە خواردنەوە و هەندێ خواردن لە ناو کۆڵەکەی پشتیدایە.

وتم: (کاپتا) ئایا بیرت لەوە کردەوە کە چی بکەین؟



وتی: بەڵێ گەورەی من، لێرەوە کە رۆیشتم بیرم کردەوە و لە هاتنەوەشمدا هەر لێکم دەدایەوەو تێگەیشتم کە من دوێنێ خەوم نەبینیبوو و ئەوەی بینیبووم لە بێداریدا رووی دابوو و لەبەر ئەوە شەراب تاوانی نییە، چونکە هۆی بینینی ئەو شتانە مەستی نەبوو و من لە هەڵەدا بووم کە ئەمڕۆ تۆبەم کرد کە چیی تر شەراب نەنۆشمەوە.

(کاپتا) ئەمەی وت و بەبێ ئەوەی چاوەڕوانی ئیزن دانی من بێت، یەکێک لە گۆزەکانی هەڵگرت و دەستی بە خواردنەوەی کرد و جار بە جار بۆ تازە کردنەوەی هەناسە، دەمی لە گۆزەکە هەڵدەگرت و ستایشی خوایەکانی میسر و تەنانەت بابلیشی دەکرد. دوای ئەوەندەی نۆشییەوە کە چی تری پێ نەخورایەوە گۆزە نیوە بەتاڵەکەی لە ژێر مێزی کەشتییەکە دانا، کە شوێنێکی فێنک بوو و هەر لەوێ راکشاو نووست.

من ئەوەندە لەم کردەوەیەی تووڕە بووم کە ویستم بە یەکێک لە سەوڵەکان لێی بدەم و بە سزای بگەیەنم، بەڵام (مینا) نەیهێشت و وتی: بەندەکەت کارێکی ژیرانەی کرد و ئێمەش دەبێ ئەو بکەینە نموونە و شەراب بنۆشین، بۆ ئەوەی چالاک بین. چونکە ئەمڕۆ رۆژێکی خۆشە و (بورابورياش) ئەگەر هەموو رۆژێ دەسەڵاتی هەبێ هەر نەبێ ئەمڕۆ توانای دەستگیرکردنی ئێمەی نابێت و ئێمە دەبێت لەم رۆژە بەهارەدا کە گەنمەکان لە کەناری رووباردا شین بوونە و حاجی لەق لەقەکان دەنگیان دێت و مراوییەکان بەگەردنی بەرزەوە لە ئاسماندا دەفڕن کەبڕۆن و هێلانە دروست بکەن و هێلکە بکەن، کەڵک وەربگرین. چونکە لەوانەیە رۆژێکی تری وەهامان بە نسیب نەبێت کە تا ئەم رادەیە خۆش و دڵڕفێن بێت و دوایی خەفەتی بۆ بخۆین.

ئەم قسەیەی ئەو کاری لە من کرد و وتم: (مینا) کاتێ کە لە بابلدا بۆ بینینی ئەستێرەناسەکان چوومە بورجەکەیانەوە لەوانم بیست کە چارەنووسی مرۆڤ لە لایەن ئەستێرەکانەوە دیاری دەکرێت و ئێمە ناتوانین چارەنووسی خۆمان

بگۆڕین، بۆیە پێشنیارەکەی تۆم بەدڵەو ئەمڕۆ لەم جێگایەدا بەخۆشی رادەبوێرین و لەبەرئەوەی هەوا گەرم بووە، واباشە بچینە ناو ئاوەکەوە و لەشمان فێنک بکەینەوە.

جلەکانمان داکەندو لە رووبارەکەدا مەلەوانیمان کرد و دوای فێنک بوونەوە گەڕاینەوە کەشتییەکەو نانمان خوارد و شەرابمان نۆشییەوەو، مینا بۆ ئەوەی نیشان بدات کە چۆن بۆ خوایەکەی خۆی سەما دەکات لەسەر کەشتییەکە سەمای کرد و من پێم وت: (مینا) لەوە زیاتر سەما مەکە.

پرسیی: بۆچی لەوە زیاتر سەما نەکەم؟

وتم: لەبەر ئەوەی کاتێ کە بە نیگات کە وەک تریفەی مانگی سەر ئاوی رووبارە، سەیری خۆرهەڵات دەکەی و بە دەست ئاماژەی بۆ دەکەی دەکەومەوە یادی میسر و هەست بە پەژارە دەکەم(1) من نامەوێت بە ژنێک بڵێم کە دڵم پێتەوەیە، چونکە جارێکیان قسەیەکی وام بە ژنێک وت و ئەو ژنە ئەوەندە چارەڕەشی کردم کە هیچ پزیشکێکی میسری تا ئەمڕۆ هێندە بەدبەخت نەبووە.

(مینا) وتی: دیارە لە وڵاتەکەی تۆدا ژنەکان پیاو فریو دەدەن و بەدبەختیان دەکەن. بەڵام من بەتەما نیم تۆ بەدبەخت بکەم و فریوت بدەم و خوای منیش دەڵێت تۆ نابێ خۆت بە دەست پیاوەوە بدەیت مەگەر کاتێ کە پیاوێکت پەسند کرد و من هێشتا پیاوێکم نەدۆزیوەتەوە بۆ ئەوەی بتوانم هەموو تەمەنی ژیانم لە گەڵ ئەودا ببەمە سەر، بەڵام پێم بڵێ بزانم ئەو ژنەی بووە هۆی بەدبەختیت خەڵکی کام وڵات بوو و چۆن تۆی چارەڕەش کرد؟

وتم: ئەو ژنە منی خستە داوی خۆیەوە و هەر چییەکی هەمبوو لێی سەندم، تەنانەت وای لێ کردم گۆڕی دایک و باوکیشم بفرۆشم و نەمتوانی دایک و باوکم لە گۆڕەکەی خۆیاندا بشارمەوە.

(مینا) وتی: ئایا مەبەستت لەم قسەیە ئەوەیە کە تۆ دەتەویست ئەو ژنە بکەیتە هاوسەری ژیانی خۆت؟



وتم: بەڵێ.

وتی: ئایا ئەو بۆ ئەوەی ببێتە هاوسەرت هەرچییەکت هەبوو لێی سەندی و تۆی ناچار کرد گۆڕی دایک و باوکت بفرۆشی؟

وتم: بەڵێ...

(مینا) وتی: ئەم رەفتارە تایبەت بووە بە ئەو، یان لە وڵاتەکەی ئێوەدا هەموو ژنەکان ئەوهان و بۆ ئەوەی ببنە هاوسەری ژیانی پیاوێک، هەرچییەکی هەیە لێی دەستێنن؟

وتم: ژنەکانی تریش بۆ ئەوەی پیاوێک کەڵکیان لێ وەربگرێ شتێکیان لێ دەستێنن و لە میسردا هیچ ژنێ بەبێ وەرگرتنی شتێک نابێتە هاوسەری پیاوێک.

(مینا) وتی: ئەمە نەریتێکی وەحشیانەیەو ئەگەر من باش تێگەیشتبم، لە میسر هەر پیاوێک کە بیەوێت ژن بهێنێت دەبێ زێڕ و پارە بدات و وەک کەنیز ژنەکە بکڕێتەوە، ئەگەر نا ناتوانێت سوودی لێ وەربگرێ.

وتم: وایە، بەڵام چەندێتیی زێڕ و پارەکە جیاوازە و ئەو کەسانەی دەوڵەمەندترن بۆ کڕینی ژن پارەی زیاتر دەدەن.

مینا وتی: کەواتە جێی سەرسوڕمان نییە کە بۆچی هەموو ژنە خۆفرۆشەکان لە میسرەوە دێن، چونکە لە جێگایەک کە ژن و مێردایەتی بە پارە بەسترابێتەوە و تا پیاو پارە نەدات نەتوانێ ژن بهێنێ و تا ژن کانزا وەرنەگرێ مێردێ هەڵنەبژێرێ، ئیتر ژن و مێرد حەز لە یەکتری ناکەن و تەنها حەز لە پارە دەکەن و هەرکەسێ کانزای زیاتر بدات ژنەکە جەرگی خۆی بە ئەو دەسپێرێ. بەڵام من خەڵکی وڵاتێکم کە لەوێ ژن و پیاو بۆ پارە تێکەڵیی یەکتر ناکەن و ئەو شتانەی کە خوایەکان بە خۆڕایی داویانە بە ئەوان، بۆ فرۆشتن داینانێن و لە وڵاتی ئێمەدا هەرگیز نەبیستراوە ژنێ بۆ ئەوەی پیاوێک کەڵکی لێ وەربگرێ هەرچی هەیەتی لێی بسەنێ و تەنانەت گۆڕی دایک و باوکیشی لێ وەرگرێت.

لەوێ هەر ئەوەندە ژن و پیاو یەکتریان بە دڵ بێت، ئیتر دەبنە ژن و مێرد و نە ژنەکە داوای شت لە پیاوەکە دەکات و نە پیاوەکە لە ژنەکە.

من ئەگەر خۆم تایبەت نەکردبایە بەخوایەکەم، هەر پیاوێکم بە دڵ بووایە بە مێردی خۆمم هەڵدەبژارد و ئەمڕۆش کە خۆم تایبەت کردووە بەخواوە دیسانەوە دەتوانم پیاوێک هەڵبژێرم کە بەدڵم بێت، بەمەرجێ کچێنییەکەی خۆم پێشکەش بە خواکەم بکەم، پاشان شوو بکەم.

وتم: (مینا ) دنیا بەرفراوانە و لەم دنیایەدا خوایەکان زۆرن و ئەوەندە ژمارەیان زۆرە کە هێشتا کەس پەیدا نەبووە کە بتوانێ ناویان لەبەر بکات و لە هەر سەردەمێکدا خەڵکی لە ترسا خوای نوێ بۆ خۆیان پەیدا دەکەن و دەیپەرستن و لەبەر ئەوە تۆ دەتوانی واز لە خوایەکەی خۆت بهێنی و لە گەڵ مندا بێیت بۆ وڵاتێ کە لەوێدا خوایەکەت دەسەڵاتی نەبێت و لەوێ خوای تری لێیە کە ناچارت ناکەن کچێنییەکەی خۆتیان پێشکەش بکەی و لەوێدا تۆ دەبیتە خوشکی من، واتە دەبیتە هاوسەرم.

(مینا ) وتی: من بۆ هەر وڵاتێ بڕوم دەسەڵاتی خوایەکەم دەمگرێتەوە و هەرگیز جێگایەک نییە کە بتوانم بۆی بڕوم و دەسەڵاتی خوایەکەم لەوێدا نەبێت.

دوایی مینا لێم نزیک بووەوە و دەستی گرتم و وتی: من تۆم بە دڵە و ئامادەم ببمە خێزانی تۆ، بەڵام ناتوانم بەر لە وەرگرتنی ڕەزامەندیی خوایەکەم ببمە هاودەمت، چونکە من موڵکی خوایەکەی خۆمم.

وتم: (مینا ) ئەم قسەیەی تۆ دەیکەی وەک قسەی هەموو ژنە گەنج و جوانەکانی ترە، کە هەر کامێکیان بۆ ئەوەی ئازاری ئەو پیاوە بدەن کە خۆشیان دەوێت، بەهانەیەک دەدۆزنەوە. یەکێکیان دەڵێت خۆشم دەوێیت بەڵام زێڕ و پارەت نییە.. یەکێکی تر دەڵێ خۆشم دەوێیت بەڵام لەبەرئەوەی خواکەی من ناپەرستی ناتوانم ببمە هاوسەرت و.. تۆش دەڵێی ئامادەم ببمە هاوسەرت بەڵام لە پێشا دەبێ ڕەزامەندیی خواکەم وەربگرم.



(مینا ) وتی: من ژنێکی نەزان نیم و جگە لە زمانی وڵاتەکەی خۆم زمانی میسری و زمانی بابلیش دەزانم و ئەتوانم ناوی خۆم بەسێ شێوە بنووسم. من دەزانم کە خەڵکی لە وڵاتە جیا جیاکان خوای جۆراوجۆر دەپەرستن و ئاگادارم کە لە هەموو وڵاتاندا ئەوانەی دەوڵەمەندن باوەڕیان بە خواکانی خۆیان نییە، بەڵام لەبەر دوو مەبەست وای دەردەخەن کە باوەڕیان پێیانە، یەکێکیان ئەوەیە کە داب و نەریتیان وایە و، دووەمیان ئەوەیە کە لەبەر ئەوە وای دەردەخەن کە باوەڕیان بە خوایە تاکو بتوانن چینی هەژار و بەندەکان بەکار بگرن کە ئەوانیش باوەڕیان بە هەمان خوای ئەوانە و بە ڕەنجی ئەوان خۆیان زیاتر دەوڵەمەند بکەن چونکە ئەگەر چینی هەژار و بەندەکان بزانن کە دەوڵەمەندەکان باوەڕیان بە خواکان نییە لێیان هەڵدەگەڕێنەوە. هەروەها باوەڕی چینی هەژار و بەندەکان بە خواکان لە میسر وبابل و شوێنەکانی تر باشترین هۆکارە بۆ گوێڕایەڵ ڕاگرتنی ئەو خەڵکە و ئەوەندەی کە ئەم بیر و باوەڕە هەژارو کۆیلەکان ملکەچی دەوڵەمەندەکان دەکات، ترس و قامچی و مەرگ، ئەوەندە ناچاریان ناکەن ملکەچ بن.

من هەموو ئەمانە ئەزانم، بەڵام لەبەر ئەوەی لە منداڵییەوە منیان بە باوەڕی خواکەمەوە پەروەردە کردووە و بەردەوام خەریکی سەما کردن بۆ خواکەم بوومە هیچ هێزێک ناتوانێ ئەو باوەڕەم لێ بسەنێتەوە و ئەگەر تۆش وەک من لە منداڵییەوە لەبەر دەم گایەکاندا سەمات بکردایە و لە کاتی سەمادا بە نێوان شاخە نووک تیژەکانیدا بازت بدایەو بە پاژنەی پێت لەکاتی بۆڕاندنیاندا بدایە بە لمۆزیاندا، دەتزانی کە من چی دەڵێم و ئەو کەسەی بەم شێوەیە باوەڕی بە خوای خۆی هەبێت ئیتر لە باوەڕەکەی پاشگەز نابێتەوە. بەڵام دڵنیام تۆ هەرگیز سەمای کچ و کوورە گەنجەکانت لەبەردەم گایە توورەکاندا نەبینیوە.

وتم: من بیستوومە کە لە هەندێ لە وڵاتان لەگەڵ گادا یاری دەکەن و لە بەردەمیدا سەما دەکەن و تووڕەیان دەکەن و وام دەزانی ئەم کارە بۆ ئەوەیە تەماشاچیەکان خۆشحاڵ بکەن. بەڵام لە وتەکەی تۆدا دەردەکەوێت کە ئەم کارە

هۆیەکی ئاییینی هەیە و بۆ ئەوە لەبەردەم گایەکەدا سەما دەکەن کە ئەرکێکی ئاییینی خۆیان جێ بە جێ بکەن و ئێمەش لە وڵاتی میسردا گا دەپەرستین، بەڵام ئەو گایەی ئێمە دەیپەرستین لەگەڵ گایەکەی ئێوەدا جیاوازە، چونکە ئێمە تەنیا یەک جۆرە گا دەپەرستین و ئەم گایە کە خاوەنی هەندێ نیشانەی تایبەتەو لە هەر نەسلێکی مرۆڤدا، واتە هەر بیست ساڵ جارێک دەردەکەوێ. کاتێک گایەک پەیدا بوو کە ئەو نیشانە دیاری کراوانەی تێدا بوو، دەزانین کە خاوەن نیشانەکانی خوایەتییە و دەیپەرستین تاکو دەمرێت. بەڵام ئێمە هەرگیز لەبەردەم گایەکاندا سەماناکەین و کچێنیی کچەکانی میسر پێشکەشی گایە نێرەکان ناکەین لەکاتێکدا کە تۆ دەتەوێ پێشکەشی گایەکی بکەی و ئەگەر بڕیار وایە کە ئاژەڵێک سوود لە کچێنییەکەی تۆ وەربگرێ بۆ چی پێشکەشی سەگ و ئەسپی ناکەیت؟

(مینا) لەم قسەیە ئەوەندە تووڕە بوو کە دوو شەقە زللەی بەهێزی کێشا بە بنا گوێمدا و ڕەنگی لە تووڕەییدا ڕەش هەڵگەڕاو وتی: ئەی پزیشکی میسریی نەزان، لەبارەی شتێ کە زانیاریت لە بارەیەوە نییە قسە مەکە، چونکە زانیاریی تۆ لە مەڕ خوایەکەی من لە زانیاریی مێشێک لە بارەی زێڕ و زیوەوە زیاتر نییە.

لەو کاتەدا کە دەم و چاوم لە شەقە زللەکانی مینا دەکزایەوە، تێگەیشتم کە زۆر لێ کردن سوودی نییە و (مینا) ڕازی نابێت ببێتە هاوسەری من، مەگەر ئەوەی کە سەرەتا بە سازدانی مەراسیمێک بوونی خۆی پێشکەش بە خواکەی بکات، بۆیە بەرەو دواوەی کەشتییەکە ڕۆیشتم و بۆ خۆخافڵاندن دەستم کرد بە ڕێکخستنی دەرمانکانم.

(مینا)ش لە بەشی پێشەوەی کەشتییەکە دەستی بە سەما کردن کرد و من تێگەیشتم کە ئەم سەمایە تەنها بۆ پەرستنی خواکەی نییە، بەڵکو مەشق دەکات بۆ ئەوەی ماسولکەکانی لەشی بەردەوام لە فەرمانیدا بن.

(مینا) بە شێوەیەک سەمای دەکرد کە مەحاڵ بوو سەماکەرێکی ئاسایی



بتوانێ بەو جۆرە سەما بکات. چونکە هەندێ جار لەپی هەر دوو دەستی بەسەر کەشتییەکەوە دەنووساند و قاچەکانی وەها بەرز دەکردەوە کە دەتگوت کەرتە دارە و هەندنێ جاریش خۆی بەرەو پشت دەچەماندەوە کە سەری دەگەیشتە زەوی بەبێ ئەوەی قاچەکانی لەزەوی جیا ببنەوە.

کاتێ کە من ئەو سەمایە سەرسوڕهێنەرەیم بینی کە بۆ خواکەی دەکرد زانیم زۆر لێکردن لەگەڵ مینادا سوودی نییەو کەسێک کە ئەم زەحمەتە سەختانە بۆ خواکەی خۆی بکێشێ، ئامادە نابێت ببێتە خوشکی من، مەگەر لە پێشا کچێنییەکەی خۆی پێشکەش بە خواکەی بکات. کەسێ کە تا ئەم ڕادەیە باوەڕی هەبێت داوالێکردنی شتێک کە دژی ئاییینەکەیەتی لە پیاوەتییەوە بە دوورە. لەبەرئەوە بڕیارم دا لەوەو دوا چیی تر داوای لێ نەکەم ببێتە خوشکم.

(مینا) دوای سەماکردن لەشی خۆی شێلاو کراسی لەبەر کردو دوایی لە پێشەوەی کەشتییەکە دانیشت و دەستی بە گریان کرد. من وازم لە کەرەستەی پزیشکیی خۆم هێناو بەرەو ئەو چووم و زۆر بەنەرمی پێم وت: (مینا) ئایا تۆ نەخۆشی؟

(مینا) وەڵامی نەدامەوەو دەستمی لابرد و زیاتر گریا.

وتم: (مینا) ئەگەرچی من زۆر دڵم بەتۆوەیە، بەڵام دڵنیابە بۆ ئەوەی خەمبارت نەکەم هەرگیز داوات لێ ناکەم ببیتە خوشکی من و لە من مەترسە.

(مینا) سەری هەڵبڕی و فرمێسکی چاوی سڕییەوە و وتی: تۆ چەند نەفامی کەوا تێدەگەی من لە تۆ دەترسم. من هیچ ترسێکم لە تۆ نییەو بۆ تۆ ناگرم، بەڵکو بۆ چارەنووسی خۆم دەگریم کە منی لە خواکەم جیا کردەوەو ئەگەر لە خواکەم دانەبرامایە ئەوەندە لاواز نەدەبووم کە نیگای پیاوێکی وەک تۆ بمهێنێتە لەرزە.

من دەستیم گرت و ئەم جارەیان ئەو دەستمی لانەبرد و ڕووی کردە من و وتی: سینۆهە لەبەر ئەوەی تۆ منت لە پاشای بابل ڕزگار کرد، من دەبوایە بە

پاداشتی ئەم یارمەتییەت بیومایەتە هاوسەری ژیانت، بەڵام ئەگەر تۆ بتزانیبایە خواکەی من کێیە، سەرت لەوە نەدەسوڕما کە ناتوانم پاداشتەکەت بدەمەوە. ئێمە نابێت لە بارەی خواکەمانەوە لەگەڵ بیانییەکاندا زۆر بدوێین و هەرچییەک دەزانین پێیان بڵێین، بەڵام من دەتوانم پێت بڵێم کە خوای ئێمە خوای دەریایە و لە ئەشکەوتێکە کە لە ناو شاخێکدایەو هەرکەسێ دەچێتە ناو ئەو ئەشکەوتەوە ئەگەرچی دەتوانێ لەوێ بێتە دەرەوە، بەڵام لەوێ ئەوەندە هەست بە بەختەوەری دەکات کە هەرگیز نایەتە دەرەوەو هەر لەبەر ئەوەش تا ئەمڕۆ کەس لەو ئەشکەوتە نەهاتۆتە دەرەوە. هەندێ دەڵێن خواکەی ئێمە ئەگەرچی خوای دەریایە، بەڵام لە شێوەی مانگادایەو هەندێ دەڵێن کە لە شێوەی مرۆڤە، بەڵام سەری لە مانگا دەچێت.

هەموو ساڵێ لە ناو کچە گەنجەکاندا کە پێشتر فێرە سەمابوونە، دوانزە کەس بە تیروپشک هەڵدەبژێردرێن و هەر یەکە لەم دوانزە کەسە لە مانگێکدا یەک جار بە تەنیایی لە کاتی مانگەشەودا دەچێتە ئەشکەوتی خوا. منیش لەو دوانزە کەسە بووم کە دەبوایە لە شەوێکی مانگەشەودا بچوومایەتە ناو ئەشکەوتەکەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی منیان رفاندو وەک کەنیز بە پاشای بابلیان فرۆشتم، نەمتوانی بەم بەختەوەرییە گەورەیە بگەم. من لە هەموو ئەو کاتانەی دیلێتیدا بیرم لەو ئەشکەوتە دەکردەوەو ئێستاش هەر لە یادی ئەوێ و لە یادی خواکەمدام و هیچ ئارەزوویەکم نییە جگە لەوەی بڕۆم و کچێنیی خۆمی لەو ئەشکەوتەدا پێشکەش بکەم و ئەگەر لە ئەشکەوتەکە هاتمەدەرێ، دەبمە ژنی تۆ، بەڵام وەکو پێم وتی ئەو کەسانەی کە دەچنە ئەشکەوتی خوایەکەمان بەڕادەیەک هەست بە بەختیاری دەکەن کە هەرگیز لەوێ هەنگاو نانێنە دەرێ.

وتم: (مینا) ئێستا زانیم کە تۆ خەڵکی دورگەی (کریت)ی[٢]. چونکە ئەو کاتەی لە سووریا بووم ئەو دەریاوانانەی لە دورگەی (کریت)ـەوە دەهاتن دەیانگوت: خوای دانیشتووانی دورگەی (کریت) لە ئەشکەوتێکدا دەژیت و لە



شێوەی گادایەو من ئامادەم تۆ ببەمە دورگەی (کریت) بۆئەوەی چۆنی خۆت حەز دەکەی لەگەڵ خواکەتدا رەفتار بکەیت.

(مینا) وتی: (سینۆهە) لە ناو هەموو ئەو پیاوانەی من بینیومە تۆ تاکە کەسێکی کە پەسندم کردوویت، چونکە جگە لەوەی گیانی منت رزگار کردووە، لە تۆدا هەندێ شت هەیە کە من بۆلای خۆی رادەکێشێ، بەڵام نازانم چییە. من حەز دەکەم لە ئێستاوە تا ئەو کاتەی دەگەینە (کریت) من و تۆ بەخۆشی بژین و دیسانەوە دەڵێم دوای ئەوەی خۆم پێشکەشی خوایەکەم کرد ئەگەر لە ئەشکەوتەکە هاتمە دەرەوە شوو بە تۆ دەکەم.

لەو کاتەی مینا بە پەنجەکانی خۆی دەموچاوی منی نەوازش کردو دەموچاوی خۆی لێم نزیک کردەوەو لێوەکانی لە دەموچاوی من دەخشاند و منیش دەموچاویم ماچ کردو ئەوەندە چێژم وەرگرت کە ئەگەر ببوایەتە خوشکیشم تا ئەو رادەیە هەستم بەخۆشی نەدەکرد.

کاتێ شەو داهات بەندەکەم لە خەو هەڵساو باوێشکێکی داو دەستی بە چاویدا هێناو وتی: ئەی (ئاموون) خوای گەورەی میسر، من سوپاست دەکەم کە ژانە سەرەکەمت چاک کردەوە و ئیتر سەرم وەک کەرتە مسێک کە دەیخەنە نێوان سندانی ئاسنگەر و چەکوشە گەورەکەی، ئازار ناکێشێ، بەڵام سکم ئەوەندە برسییە کە دەڵێی چەند شێرێکی گەنجی برسیی تێدایە و داوای خواردن دەکەن.

دوایی بەبێ ئەوەی چاوەڕوانی ئیزنی ئێمە بێت هەڵساو هەندێ لەو خواردنەی خوارد کە خۆی کڕیبووی و لە کاتی خواردنی گۆشتی باڵندەکان، ئێسکەکانی فڕێ دەدایە ناو رووبارەوە.

***

١- لە زمانی فارسیدا، ئەویش لەکاتی رۆژ، نیگای ژن ناشوبهێنن بە تریفەی مانگی سەر رووبار، بەڵام لەم کتێبەدا هەموو تەشبیهاتەکان و هەروەها شێوەی دەربڕینی قسەکان میسرییە، چونکە

نووسەر ناوی رووداو و بابەتەکانی لە مێژووە وەرگرتووە. لەبەرئەوە خوێنەران نابێت گلەیی لە وەرگێڕ بکەن کە بۆچی نیگای مینای بە شوبهاندن بە تریفەی مانگی سەر رووبار، وەسف کردووە– وەرگێڕ.

٢– دورگەی کریت دورگەیەکی گەورەیە لە دەریای ناوەڕاست کە لە رابردوودا خاوەن شارستانیەتێکی درەوشاوە بووە– وەرگێڕ.

# بووینە سێ گاڵتەچیی گەڕۆک

کاتێ برسیەتییەکەی نیشتەوە وتم: (کاپتا) تۆ قەرار بوو رێگا چارەیەکمان بۆ بدۆزییەوە و پێمان بڵێی کە پێویستە چی بکەین، بۆئەوەی خۆمان رزگار بکەین، چونکە دوور نییە سەربازەکانی پاشا بەدوای ئێمەوەبن و بیانەوێت دەستگیرمان بکەن.

(کاپتا) وتی: ئەگەر من باش تێگەیشتبم تۆ وتت پاشای بابل تا سی رۆژی تر بە شوێن تۆدا ناگەڕێت و بڕیاری داوە کە تا سی رۆژی تر هەنگاو نەنێیتە کۆشکەوەو لەم رووەوە ئەو بیر لە تۆ ناکاتەوە و وادەزانێت کە لە شوێنێکی دوور خەریکی مۆمیایی کردنی لاشەی منی. بەڵام لەوانەیە سەوڵ لێدەرەکانی کەشتییەکەمان، یان نێرەمووکەکانی حەرەم ئەم بابەتەیان بە پاشا راگەیاندبێ کە ئەگەر وابێت جێی مەترسییەو دەبێ رابکەین. چونکە ئەگەر (بورابوریاش) من دەستگیر بکات دەرخواردی شێرەکەی خۆیم دەدات و تۆ و ئەم ژنە سەربەرەوژێر لە شوورەی بابلەوە هەڵدەواسێ هەتا گیانتان دەر دەچێ. ئەگەر تۆ بەهۆی تریاکەوە منت بێ هۆش نەکردایە و هەست و هۆشم لە جێی خۆیدا بوایە ئێوەم رێنومایی دەکرد، بەڵام ئەم تریاکەی تۆ ئەوەندە منی شێواندووە، کە ئەگەرچی سەر ئێشەکەم نەماوە، بەڵام هێشتا هەر گێژم و لەگەڵ ئەوەشدا کە تۆ تریاکت دەرخوارددابووم و منت خستبووە ناو کووپەوە (کە ئەم بابەتە بە پێچەوانەی ئابڕوومەندی نییە) من لێت خۆش دەبم.

وتم: (کاپتا) واز لەم قسانە بهێنەو چارەیەکمان بۆ بدۆزەرەوە کە بتوانین خۆمان رزگار بکەین.



(کاپتا) وتی: من دەزانم کە تۆ بەبێ من وەک بەرخێکی کە دایکی خۆی ون کردبێ و بەردەوام بەع بەع بکات و ئەگەر من نەبوومایە تا ئێستا لەبەر ئەوەی نەتدەتوانی خۆت لە کارەساتەکان رزگار بکەی گیانت دەسپارد.

وتم: پێمان بڵێ چی بکەین و چۆن رابکەین؟

وتی: ئەم کەشتییە کە پێشتر دە سەوڵ لێدەری هەبووە، گەورەیەو ئێمەش ناتوانین بەدوو کەس (چونکە ئەم ژنە ناتوانێت سەوڵ لێ بدات) ئەم کەشتییە بەرەو پێش ببەین و بە پێچەوانەی رژانی ئاوەکە سەفەر بکەین. لەبەرئەوە دەبێت واز لە سواربوونی کەشتی بهێنین و لە جیاتی ئەوە هەوڵ بدەین دوو گوێ درێژ بدزین و لە رێگای وشکانییەوە درێژە بە سەفەرەکەمان بدەین. لەم سەفەرەدا ئێمە خۆمان وەگ گاڵتەچییە گەڕۆکەکان لێ دەکەین و کراسی کۆنە لەبەردەکەین و بەرۆژ رێگا دەبڕین و شەوان لەئاوەدانییەکان بەهۆی فاڵ گرتنەوەو گاڵتەو گەف و سەما کردن گوندنشینەکان سەرگەرم دەکەین و ئەگەر کرا هەندێ مسیشیان لێ وەردەگرین. تۆ دەبێ پزیشکییەکەی خۆت بشارییەوەو لە جیاتی ئەوە وەک ئەستێرەناسەکانی بابل سەیری بەختی خەڵکی بکەیت و منیش بەهۆی حەکایەتی پێکەنیناوییەوە دەیانهێنمە پێکەنین. (مینا)ش بەسەما کردن مەشغووڵ دەبێت. هەروەها دەبێ خێرا لێرە بڕۆین، لەبەر ئەوەی سەوڵ لێدەرەکان دە نەفەرن و بەزوویی بەسەر ترسی خۆیاندا زاڵ دەبن و هەوڵ دەدەن کەشتییەکەیان دەست بکەوێتەوە. منیش هەستم کرد کە (کاپتا) راست دەکات و ئەوان لەوانەیە بێنەوە و هێرش بکەنە سەرمان تاکو کەشتییەکەیان لە ئێمە بسەننەوە.

ئێمە جل و بەرگی خۆمان بە قوڕ و لیتەی رووبارەکە پیس کرد و زێڕ و پارەکەمان لە ناوخۆماندا بەش کرد و لە ناو (هەمیان)ی[1] ژێر کراسەکانماندا شاردمانەوە.

(کاپتا) وتی: شتومەکی پزیشکییەکەت بخەرە ناو ئاوی رووبارەوە، بەڵام

من دەستم لە کەرەستەکان بەر نەدەبوو و خستمە ناو لبادەکەی کە (مینا )ی تێدا پێچرابووەوەو نامە کۆڵی (کاپتا ) و لەگەڵ تاریک بوونی هەوا بە ناو کێڵگەکاندا بەرێ کەوتین و خۆمان گەیاندە ئەو رێگایەی کە کاروانەکان پێیدا دەڕۆیشتن.

ئەو شەوە تا بەیانی بەرێوە بووین و بەرەبەیان گەیشتینە گوندێک کە دانیشتووانی ئەوێ تا ئەو کاتە بەدەگمەن رەنگی کانزایان بینیبوو و لە خانووی قوڕدا دەژیان و زەوییان بەدار و بەردی تیژ دەکێڵا.

من بە (کاپتا )م وت: دزینی دوو گوێدرێژ باش نییە، چونکە دانیشتووانی ئەو جێگایەمان لێ دەبنە دوژمن و وا باشترە کە دوو گوێدرێژیان لێ بکڕین و مسیان پێ بدەین.

ئێمە بە هەندێ مس بووینە خاوەن دوو گوێدرێژ و، (کاپتا ) لە هەڵگرتنی بارەکە رزگاری بوو و لەوە بەدوا لە رێگا دوور و درێژەکانی بابلدا درێژەمان بە رێرەوی داو هەموو رۆژێ دوای گەرم بوونی هەوا لە گوندێکدا دەوەستاین و لە مەیدانی گوندەکە، یان لە کەناری رووبار هونەرەکانی خۆمان پیشانی گوندنشینەکان دەدا.

من بەو شێوەیەی کە لە بورجی بابلدا بینیبووم فاڵم بۆ لادێییەکان دەگرتەوە و موژدەم پێدەدان کە بەروبوومێکی فراوانیان دەست دەکەوێت و ئاوی رووبار بۆ ئاودێریی کێڵگەکان زیاد دەبێت و ژنەکانیان کوڕیان دەبێت و ئەگەر گەنجەکان داوای فاڵ گرتنەوەیان لێ بکردمایە دەموت کچێکی جوانت بەنسیب دەبێت. من نەمدەویست راستییەکانیان پێ بڵێم، چونکە ئەگەر بمگوتایە کە فەرمانبەرەکانی وەرگرتنی سەرانە، دانەوێڵەو ئاژەڵەکانیان بە زۆر لێ دەستێنن و بەدار پشتیان شین دەکەنەوەو، ئاوی رووبار بەرز دەبێتەوەو نیوەی کێڵگەکانیان ئاو دەیبات و نیوەکەی تریشی کوللە دەیخوات، ئەوان کە خەڵکێکی سادە بوون تووشی نائومێدی دەبوون.



هەرچەندە زیاتر بە رێدا دەڕۆیشتین و خۆر لێی دەداین، زیاتر لە سێ گاڵتەچی گەڕۆک دەچووین و کە دەگەیشتینە هەر گوندێک لەو کاتەدا کە من فاڵم بۆ خەڵکی دەگرتەوە، (کاپتا ) بە حەکایەتی سەیرو سەمەرە و نوکتەی خۆش ئەوانی دەحەپەساند، یان وای لی دەکردن پێ بکەنن.

کاتێ (کاپتا ) لە حەکایەتەکانیدا دەیگوت: کەلە جیهاندا گەلانێک هەن کە کاتێ بە رێدا دەڕۆن سەریان لە لەشیان جیا دەکەنەوەو دەیخەنە بن هەنگڵیانەوە، بۆ ئەوەی قورسایی نەخاتە سەر لەشیان، یاخود کە دەیگوت: دەبنە گورگ یان مەڕ، ئەو خەڵکە سادە دڵانە باوەڕیان بەقسەکەی دەکردو کەسیان نەیدەپرسی ئاخر کاتێ کە سەر لە لەش جیابووەوە چۆن خاوەنەکەی زیندوو دەمێنێت.

ئێمە لەم سەفەرەماندا لە بری بەهای خواردن هیچ کانزایەکمان نەدا، چونکە کە دەگەیشتینە هەر شوێنێک هەرئەوەندە فاڵ گرتنەوەی من و قسەکانی (کاپتا ) و سەمای (مینا ) دەستی پێ دەکرد، ئەو خەڵکە ئەوەندە خواردنیان بۆ دەهێناین کە زیاد لە پێویست بوو.

لەو سەفەرەدا ئەگەر چی نەمدەویست پزیشکی بکەم، بەڵام کاتێک کە دەچووینە گوندێکەوەو من لەشە تووکاوییەکانی پیاوان و ژنانم دەدی پێیانم دەوت کە چۆن بەهۆی زەرنیخ و قسڵ تووکە زیادەکانی لەشیان لێ بکەنەوە، بۆ ئەوەی لە خوراندن و ناشیرینی پارێزراو بن. کاتێک کە هەستم دەکرد چاوی گوندنشینەکان عەیبدارە و ئەگەر چاکی نەکەنەوە کوێر دەبن بە خۆڕایی چاکم دەکردنەوە. ژنەکان کاتێک کە قسڵ و زەرنیخەکەیان بەکار دەهێناو دەیاندی کە لە ناکاودا وەک کچی دە ساڵان لەشیان بێ موو و سپی بووەتەوە بەرادەیەک خۆشحاڵ دەبوون کە خۆشترین خواردنیان پێشکەشی ئێمە دەکرد. من جگە لەوەی بەهۆی چارەسەرکردنی لادێییەکان ئەوانم لەخۆم رازی دەکرد، بەم چارەسەرانە مەشقم دەکرد کە زانیارییە پزیشکییەکانی خۆم لەبیر نەکەم و

لێهاتوویی دەستم بۆ نەشتەرگەری کردن لە ناو نەچێ.

بەهۆی سەفەرکردن لە سەرزەمینی گەرمی بابل قاچەکانم تلۆقی کردو دەستم ئاوڵەی دەرکرد و رەنگی پێستی لەشم و دەم و چاوم رەش هەڵگەڕا، بەڵام هەمیشە دڵخۆش بووم و لە ناخی دڵمەوە خۆم بە شادمان دەبینی چونکە (مینا) هاوشانم بوو و هەرکاتێ لێم دەڕوانی ئەو بزەیەکی دەهاتێ.

شەوان کە دەنووستم مینا لە تەنیشت منەوە پشووی دەداو بەیانی کە هەڵدەستامەوە بەر لەوەی کەشتیی ئاڵتوونیی خۆر لە ئاسماندا ببینم سەیری دەم و چاو و ئەندامەکانی (مینا)م دەکرد کە لە چاومدا لەخۆر جوانتر بوو.

جگە لە (مینا)ش لەو سەفەرەدا بەتەواوەتی خۆم لە تەنگ و چەڵەمەکانی ژیان ئاسوودە دەبینی و هیچ خەمێکم بۆ سەردەمی ئێستاو داهاتوو نەبوو و هیچ کارێکی خێرام نەبوو کە بۆ ئەنجام دانی خۆم بەدڵتەنگ ببینم.

ئێمە زیاتر کاتی تاریکی، واتە لە نیوەی شەودا بەڕێ دەکەوتین بۆ ئەوەی لە گەرمای خۆر پارێزراو بین و کاتێ کە خۆر هەندێ بەرز دەبووەوە بێ ئەوەی خۆمان ماندوو بکەین لە یەکەمین ئاوەدانیدا دەوەستاین و پشوومان دەدا و نزیکەی نیوەڕۆ لەخەو هەڵدەستاین و لادێییەکانمان لە دەوری خۆمان کۆدەکردەوە تا خۆرئاوا بوون کاتەکانمان بەسەرگەرم کردنیان دەبردەسەر و ئەم کارە بەلای خۆشمانەوە خۆش بوو، چونکە ئێمە لەوان زیاتر تام و چێژمان لە کارەکانمان وەردەگرت.

کاتێ دەبووە شەو گوندنشینەکان دەنووستن ئێمەش دەنووستین و ڕۆژی دواتر بەڕێ دەکەوتین و ئەم شێوەیە تا ئەو ڕۆژەی کە گەیشتینە سەر سنووری وڵاتی (میتانی) بەردەوام بوو.

پاش ئەوەی گەیشتینە سنووری (میتانی)، دوو شوان کە بینییان ئێمە خەڵکانێکی هەژارین بەزەییان پێمان هاتەوەو بێ ئەوەی پاسەوانەکانی سنوور سەرنجمان بدەنێ ئەوان ڕێنوماییان کردین و ئێمەیان بردە ناو وڵاتەکەوە و



چووینە شاری (میتانی)و لەوێدا جل و بەرگێکی شیاوی خۆمانمان کڕی و لەشمان شوشت و جلەکانمان لەبەرکرد و لە یەکێک لە میوانخانەکاندا نیشتەجێ بووین. لەبەر ئەوەی زێڕ و پارەکانمان کەم ببووەوە دوای ئەوەی چووینە ناو (میتانی) بڕیارم دا ماوەیەک پزیشکی بکەم کە بەهۆیەوە هەندێ پارەم دەست بکەوێت.

بەزوویی ژمارەی ئەو کەسانەی دەهاتنە لام ئەوەندە زیادی کرد کە ناچار بووم بە هەندێ لە نەخۆشەکانم بڵێم لە ڕۆژەکانی تردا بۆ چارەسەری نەخۆشییەکەیان بێنەوە لام. (مینا) زۆر سەرنجی دانیشتووانی (میتانی) ڕادەکێشاو هەر پیاوێکی دەوڵەمەند کە چاوی پێ دەکەوت، دەیویست لێمی بکڕێتەوە، بەڵام من ئامادە نەبووم مینا بفرۆشم، چونکە بوونی ئەو بۆ من وەک پێویستی تیشکی خۆر و خواردنی لێ هاتبوو.

(کاپتا) کەلە سەفەرەکەدا لاواز ببوو دیسانەوە قەڵەو بووەوە و هەندێ لە ژنە گەنج و جوانەکان دەورەیان لێدەدا و بە حەکایەتە پێکەنیناوییەکانی کاپتا کاتەکانیان دەبردەسەر. یەکێک لە حەکایەتە سەرنج ڕاکێشەکانی کاپتا چیرۆکی یەک ڕۆژ پاشایەتی کردنەکەی بابل بوو کە لە ڕۆژی سیانزەیەمی بەهاردا بوو.

(کاپتا) بۆ گێڕانەوەی ئەم چیرۆکە لێ وەشاوەییەکی تایبەتی هەبوو و ژنەکان لەتاو پێکەنین لەسەر زەوی دەتلانەوە و دەیانگوت: زمانی ئەم پیاوە وەک ڕووبار دوور و درێژ و خێرایە.

لە (میتانی) دا کاتێکی خۆشم بردەسەر، تا ئەو کاتەی کە هەستم کرد (مینا) شەوان دەگریەت. من دەمزانی کە هۆی گریانەکەی ئەوەیە کە لە خوایەکەی دوورە، بۆیە پێم وت: (مینا) من دەزانم کە هۆی گریانەکەت چییە، چونکە پێشتر پێم وتبووی کە دەتگەیێنمەوە (کریت) و هێشتا تۆم نەگەیاندۆتە ئەوێ. بەداخەوە من ناتوانم لەم کاتەدا بەرەو (کریت) سەفەربکەم، چونکە ناچارم بۆ جێ بە جێ کردنی کارێک بچم بۆ وڵاتی (هاتی)، بەڵام لەبەر ئەوەی

کەشتییەکانی (کریت) زۆر دێن بۆ (هاتی) دەتوانم تۆ بە یەکێک لەو کەشتییانە بگەیەنمەوە (کریت).

ئەوەی من بە (مینا)م دەگوت زۆریش لە راستییەوە دوور نەبوو چونکە پێشتر باسم کرد فەرماندەی سوپای میسر، پێی سپاردبووم کە بۆ ئەو وڵاتانە بڕوم و لە بارەی رەوشی سەربازی ئەوان زانیاری پەیدا بکەم و لە گەڕانەوەمدا بۆ میسر بۆی بگێڕمەوە. یەکێک لەو وڵاتانە (هاتی) بوو کە دەبوایە بچوومایەو بمزانیایە کە پاشای ئەو وڵاتە چەند سەربازی هەیەو کەل و پەلی جەنگیان چۆنە؟ بەڵام جگە لەوەش من نەمدەویست کە (مینا) راستەوخۆ بۆ (کریت) ببەم و پێشکەشی خوایەکەی بکەم، بەڵکو دەمویست بەناوی سەفەرکردن بۆ (هاتی) هەندێکی تر لە لای خۆمی بیهێڵمەوە.

وتم: مینا ساڵێ یەک جار لەم وڵاتەوە دەستەیەک بۆ وڵاتی (هاتی) دەڕۆن بۆ ئەوەی باجی وڵاتی (میتانی) بدەنە پاشای (هاتی). ئەو کاتەی ئەم کۆمەڵە بەڕێ دەکەون رێگاکان دەپارێزرێن و دزەکان ناتوانن پەلاماری رێبواران بدەن. ئێستا کاتی بەڕێ کەوتنی ئەو دەستەیەیە و من دەبێ سوود لەم دەرفەتە وەربگرم و بەرەو (هاتی) بڕۆم، ئەگەر نا ناچاردەبم سەفەرەکەم تا ساڵی داهاتوو کە کاتی بەڕێ کەوتنی دەستەی باجە دوابخەم. من زۆرت لێ ناکەم لەگەڵ مندا بەرەو وڵاتی هاتی بێیت، چونکە نامەوێت لەمە زیاتر لە خوایەکەت دوورت بخەمەوەو ئەگەریش دەتەوێ من لێرەوە تۆ دەبەم بۆ سووریا کە بە کەشتی بچیت بۆ کریت و خۆشم ئەگەر توانیم لە کاتی خۆیدا بگەڕێمەوە و بەفریای دەستەی باج کەوتم ئەوا یەکسەر لەگەڵیاندا دەچم بۆ هاتی و ئەگەر بەفریای ئەوان نەکەوتم سەفەرەکەم دوا دەکەوێت بۆ ساڵی ئایندە.

(مینا) وتی: (سینۆهە) من حەز ناکەم بە بۆنەی بردنی من بۆ سووریا لە سەفەرەکەی (هاتی) دوا بکەوی، چونکە بێ گومان سەفەرەکەی تۆ بۆ (هاتی) لە چوونی من بۆ (کریت) گرنگترە. من بیستوومە لە وشکانییەکانی وڵاتی



(هاتی) کچە گەنجەکان لە بەردەم مانگاندا سەما دەکەن و من دەتوانم لەوێ مەشقی سەماکردنی بەردەم گایەکان بکەم. چونکە ماوەیەکە ئەم سەمایەم نەکردووە و دەترسم لێهاتوویی لەشم بۆ سەماکردن لەکیس بچێ.

وتم: من لە بارەی سەماکردنی بەردەم گایەکان لە وڵاتی (هاتی) بێ ئاگام، بەڵام دەزانم کە دەکرێ لەوێوە بە کەشتی بچیت بۆ (کریت).

مینا وتی: تۆ بۆ هەر شوێنێ بڕۆی من لەگەڵتدا دێم، ئەگەر چی بۆ وڵاتی (هاتی)ش بێت.

بەڵام بەندەکەم (کاپتا) کاتێ کە بیستی ئێمە بۆ (هاتی) دەچین خەمبار بوو و بە تووڕەییەوە وتی: ئێمە هێشتا لە مەترسییەک رزگارمان نەبووە تۆ دەتەوێ گرفتاری مەترسییەکی ترمان بکەی، مەگەر تۆ نازانی ئەو خەڵکەی لە (هاتی) دەژین وەک دڕندەکانن و بیانییەکان دەکوژن بۆ ئەوەی گۆشتەکەیان بخۆن و ئەگەریش نەیانکوژن چاوەکانیان کوێر دەکەن کە لە ئاشەکانی خۆیاندا بیانبەستنەوەو بەردی ئاشەکەیانی پێ بسوورێنن کە دانەوێڵەکانیان بهاڕێت.

دوایی (کاپتا) بە مینای وت: گەورەکەی من شێتە و تۆش کە رۆیشتنی ئەو بۆ (هاتی) بە باش دەزانی وەک ئەو شێتی. من ئەگەر پزیشک بوومایە ئێسکی سەری سینۆهەم کون دەکرد کە هەڵمە ئازارگەیەنەرەکانی ناو سەری دەربکەم بۆ ئەوەی چیی تر بیر لە شتی مەترسیدار نەکاتەوە. من پزیشک نیم، بەڵام دەتوانم وەک چۆن منی خستبووە ناو گۆزەیەکەوە منیش ئاوها بیکەمە کووپەیەکەوەو چەند زاڵوویەکی بەسەردا بکەم بۆ ئەوەی عەقڵی بگەڕێتەوە.

دوایی (کاپتا) دەستی بە ناڵە ناڵ کرد و وتی: نەفرەت لەو رۆژەی منی تێدا لە دایک بووم، کە ئەوها گرفتاری ئەم خاوەنە شێتە بوومە... تازە کەمێ قەڵەو بوومەتەوە و سکم بەرزبۆتەوە دەبێت دیسان گرفتاری بەدبەختیی ئەم سەفەرە ببمەوە، ئەویش لە وڵاتی مرۆڤ خۆرەکاندا.

من کە بینیم (کاپتا) ئارام ناگرێت گۆپاڵەکەم هەڵگرت و چەند گۆپاڵێکم

بەشان و پشتیدا کێشا، هەتا هێمن بووەوە و وتم: (کاپتا) هەر بەندەیەکی تر لە جیاتی تۆ بووایە و ئەوها بێ ڕێزیی لەگەڵمدا بکردایە دەمفرۆشتەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی تۆ بەساڵاچوویت و ماوەیەکە لە لای منی من ئامادەم تۆ بنێرمەوە ئەزمیر بۆ ئەوەی ئاگات لە خانووەکەم بێت هەتا لەم سەفەرە دەگەڕێمەوە.

(کاپتا) وتی: ئەگەرچی من نەمدەویست بۆ (هاتی) سەفەر بکەم، بەڵام ناتوانم بتهێڵم تۆ بە تەنیایی بۆ ئەم وڵاتە بچی، چونکە بەتەنیا ڕۆیشتنی تۆ بۆ ئەو وڵاتە وەک ئەوە وایە کە منداڵێکی ساوا بخەنە بەردەست کۆمەڵێ گورگەوە، بەڵام پێم بڵێ کە ئایا بۆ ڕۆیشتن بەرەو (هاتی) دەبێ بەکەشتی بڕۆین؟

وتم: نا.. ئەو کەسانەش کە لێرەوە بۆ (هاتی) دەڕۆن لە ڕێگای وشکانییەوە سەفەر دەکەن.

(کاپتا) وتی: بژی (ئاموون) خوای گەورەی میسر، چونکە من سوێندم خواردبوو کە هەرگیز هەنگاو نەنێمە ناو کەشتییەوە و لە دەریاوە سەفەر نەکەم، بەڵام لەبەر ئەوەی لەم سەفەرەدا پێویست ناکات سواری کەشتی بین لەگەڵتدا دێم.

دوایی (کاپتا) خەریکی ئامادەکردنی کەل و پەل و خواردنی سەفەر بوو، چونکە لەم کارەدا لەمن دووربینترو بە تواناتر بوو.

***

١-مەبەست لە (هەمیان)، پشتێنێکی گیرفانەدار بوو کە زێڕ و پارەیان لە ناو ئەو گیرفانەدا دەشاردەوە - وەرگێڕ.

## لە وڵاتی «هاتی»

خەڵکی ئەوەندە لە ناوی هاتی دەترسێن کە ئەگەر من بڵێم(هاتی) وڵاتێکی هێمن و ئارامە، کەس باوەڕ ناکات کە راست دەکەم. ئەگەر چی دانیشتووانی (هاتی) خەڵکانێکی تووڕەو گرژن و لە جەنگەکاندا بێ بەزەیین، بەڵام لەناو وڵاتەکەیاندا کە زیاتر هەرێمێکی شاخاوییە هێمنی و ئاسایش بەرقەرارە.

لە(هاتی) ئەگەر پارەی کەسێک لە رێگاوبانەکاندا بدزرێ، پاشای ئەو وڵاتە دوو ئەوەندەی ماڵە دزراوەکەی دەداتێ و هەرکاتێ یەکێک بەر شاڵاوی چەتەکان بکەوێت و لەرێگادا بکوژرێ بە قەدەر ئەوەندەی کە کوژراوەکە لە کاتی ژیانیدا سامانی بەدەست هێناوە پارە دەداتە کەسوکاری کوژراوەکە، بە جۆرێک کە لە رووی بژێوییەوە نیگەرانی و گرفتیان نەبێت. بۆیە سەفەرەکەی ئێمە لە جادەکانی وڵاتی (هاتی) بەبێ هیچ رووداوێکی ئەوتۆ تێپەڕ بوو و گالیسکە جەنگییەکانی پاشا لە پێش و دوای ئێمەوە دەڕۆیشتن و هەموو رۆژێک خواردەمەنییان بۆ ئێمە ئامادە دەکرد تا گەیشتینە شاری (ختوشە) کە پایتەختی وڵاتی (هاتی)یە.

کاتێ باس لە شارە گەورەکانی دنیا دەکرێت خەڵکی ناوی شارەکانی **تەبەس** و بابل و نەینەوا دەهێنن. من نەینەوام نەبینیوە و نازانم چۆنە بەڵام دەتوانم بڵێم شاری (ختوشە) پایتەختی (هاتی) لە هەندێ رووەوە تەنانەت لە **تەبەسیش** باشترە. لەم شارەدا پاشایەک فەرمانڕەوایی دەکات کە هەم سەرۆکی وڵاتەکەیە و هەمیش سەرۆکی ئایینییە. هەروەها دادوەری گەورەی ئەوێشە و من باوەڕ ناکەم لە هیچ جێگایەکی دنیادا پاشایەک هەبێت کە بەقەدەر ئەو بە دەسەڵات بێت.



مرۆڤ کاتێک دێتە وڵاتی (هاتی)یەوە و چاوی بە شاخە وشکەکانی دەکەوێت سەری دەسوڕمێ کە چۆن دەگونجێ ئەم وڵاتە کە هەتاوی سووتێنەر لە چیا وشکەکانی دەدات داهاتی هەبێت. تەنانەت مرۆڤ لەخۆی دەپرسێ بە چ شێوەیەک خەڵکی لەم شاخانەدا دەژێن و چۆن لە بێ ئاویدا نامرن، بەڵام لەم وڵاتە سەیرەدا، لەو وەرزەی کە رووباری نیل ئاوەکەی هەڵدەستێ (وەرزی پاییز – وەرگێڕ) هەوا سارد دەبێت و لە ئاسمان پەڕی سپی دێتە خوار و ئەم پەڕانە هەموو کێوەکان دادەپۆشێ و دوایی لە وەرزی گەرما، دەتوایەوەو دەبوو بە ئاو. من دەزانم کە ئێوە باوەڕ بەم قسەیە ناکەن بەڵام من بەچاوی خۆم کێوە بەرزەکانی (هاتی)م بینی کە بەو پەڕە سپییانە داپۆشرابوون. ئەم پەڕانە بە درێژایی ساڵ ئاوی ئەو وڵاتەیان دابین دەکرد بە شێوەیەک کە خەڵکی نەک هەر ئاژەڵەکانیان تێر ئاو دەکرد و تێنوێتیی خۆشیان پێ دەشکاند بگرە بەو ئاوە زەوی و زارەکانیشیان تێراو دەکرد.

بەقەدەر ئەوەندەی کە دانیشتووانی هاتی لەناوخۆدا ئارامن بە هەمان ئەندازە لەگەڵ دراوسێکانیاندا ناکۆکن و بەهانەیان پێ دەگرن و بەردەوام نیشانەکانی سەر سنووریان دەبردە دواوە کە بتوانن خاکی دراوسێکانیان داگیر بکەن.

لە سنووری سووریا شوورەیەکی گەورەیان دروست کردبوو کەدیوارەکانی بەبەردی گەورە هەڵچنرا بوو و ئەم دیوارە دەیڕوانییە هەرێمێکی بەرفراوان و هەموو ئەو کاروانانەی کە لە سووریاوە بۆ (هاتی) دەڕۆیشتن و بەوێدا تێ دەپەڕین، دەبووایە (باج)یان بدایەتە فەرمانبەرەکانی(هاتی) کە بنکەیان لە چەقی ئەو شوورەیەدا بوو.

هیچ کام لە کاروانەکان دوای چوونە ژوورەوە بۆ وڵاتی هاتی ، بۆیان نەبوو لە شارێ لابدەن و ئەگەر لایان بدایە ماڵ و گیانیان لەکیس دەچوو و داراییەکەیان تاڵان دەکرا و ئەگەر بەرگریشیان بکردایە دەکوژران و ئەگەریش خۆیان تەسلیم بکردایە، بەدیل دەیانگرتن و دەیانکردنە کۆیلە. دەوڵەمەندیی دانیشتووانی

(هاتی) سێ سەرچاوەی هەیە یەکەمیان ئەو باجە بوو کە لە کاروانەکان و ڕێبوارانیان دەسەند ، دووەم لە ڕێگای پەلاماردانی ولاّتانی دەوروبەر، سێیەم بەهۆی دەرکردنی زێڕو مس و کانزایەکی تایبەتی تر کە ڕەنگی خۆڵەمێشی و مەیلەو شین بوو و پێیان دەوت ئاسن، من نازانم دانیشتووانی (هاتی) چۆن ئەم کانزایەیان دەردەهێناو چەکیان لێ دروست دەکرد، چونکە ئاسن وەک مس نەدەتوایەوە و من خۆم یەکێ لە کانەکانی ئەوانم بینی کە ئاسنیان لێ دەردەکرد، بەلاّم نەمتوانی تێبگەم چۆن لە بەردی کان بۆ دروست کردنی ئاسن کەڵک وەردەگرن.

شاری(ختوشە) لەناوەندی هەرێمێکی شاخاوی دروست کرابووو بنارەکانی شاخ بە داری میوە داپۆشرا بوو و لە داوێنی شاخەکانیش جۆگەلەی ئاو دەڕژان.

لەشاری (ختوشە) بینایەی ترسناکی لێ دروست کرابوو چونکە ئەو بالاّخانانەیان بە بەردی گەورە دروست کرد بوون و هەندێ لەو بینایانە ئەوەندە بەرز بوون کە مرۆڤ لێیان دەترسا و هیچ بیانییەک نەیدەتوانی بچێتە ناو شاری (ختوشە)وە مەگەر لەگەڵ ئەو دەستانە بووایە کە ساڵی جارێک (باج) یان بۆ پاشا دەهێناو هەر لەبەر ئەوەش شاری (ختوشە) وەک بابل و **تەبەس** ناوبانگی نەبوو.

لەم شارەدا دانیشتووان لەگەڵ بیانییەکاندا قسەیان نەدەکرد و ئەگەر بیانییەک پرسیاریشی لێیان بکردایە و ئەوان زمانە بیانییەکەشیان بزانیبایە دەیانوت تێناگەین یان نازانین، لەگەڵ ئەوەشدا خەڵکانێکی هێمن بوون و لەگەڵ بێگانەکاندا دژایەتییان نەدەکرد.

جل و بەرگی گەورەکانی ئەم شارە دیدەنییە و کراسی درێژ لەبەر دەکەن و فەقیانەی کراسەکانیان ئەوەندە گەورەیە کە سەرێکی فەقیانەکەیان دەگەیشتە زەوی و لەسەر سینەی کراسەکەیان بازنەی باڵداریان لێ نەخشاندبوو و کلاّوی درێژ و نووک تیژیان هەبوو دەموچاویان وەک میسرییەکان دەتاشی و هەندێ لە



گەورەکان تەنانەت سەریشیان وەک دەمو چاویان لەمووی پاک دەکردەوە بەلاّم لە ناوەڕاستی سەریان کاکۆڵێکی بەرزیان دەهێشتەوە. گەورەکان و دەوڵەمەندەکانی هاتی وەک هەموو گەورە پیاوانی دنیا قەڵەون و دەموچاوێکی گۆشتن و روونیان هەیە و دیار بوو خواردنیان زۆر دەخوارد.

(ختوشە) پایتەختی پاشای (هاتی)، بەپێچەوانەی **تەبەس** و بابل شارێکی بازرگانی نییەو تیایدا کڕین و فرۆشتن ناکرێ بەلاّم شارێکی پیشەسازی بوو و لە بەیانییەوە تا ئێوارە لەم شارەدا دەنگی کانزاکاری دەهاتە گوێ و هەمیشە لەوێ هەر چەک دروست دەکرا.

دانیشتووانی (هاتی) بەپێچەوانەی گەلە شارستانییەکان، سەربازی بەکرێگرتەی بیانییان نەبوو و هەموو سەربازەکانیان خەڵکی ناوچەکە بوون و من واهەست دەکەم لەبەر دوو هۆکار ئەوان سەربازی بیانییان بە کرێ نەدەگرت یەکێکیان لەبەر ئەوەی بیانییەکانیان وەک خۆیان بە ئازا نەدەزانی و دووەمیان ئەوەبوو کە وایان بیردەکردەوە بەکرێگرتە هەرچەندە ئازا بێت دیسانەوە هەر بە کرێگرتەیەو بەقەدەر سەربازێکی خۆیی دڵسۆز و تێکۆشەر نییە.

لە(هاتی) سەرۆکی ناوچە هەبوو و هەرکامێک لەو سەرۆکانە لە ناوچەکەی خۆیدا سەربەخۆیی ناوخۆیی هەبوو بەلاّم گوێڕایەڵی پاشای هاتی بوون.

شێوەی دادپەروەری لە (هاتی) ئەوەندە سەرسوڕهێنەرە کە گەلانی شارستانی ناتوانن باوەڕ بکەن . لەم ولاّتەدا ئەگەر یەکێ لە پاشاکانی ناوچەکان دژی دەسەلاّتی پاشای(هاتی) بوەستێتەوە و بیەوێت لەسەر تەخت لای بدات، نایکوژن بەڵکو بۆ یەکێ لە سنوورەکانی دەنێرن بۆ ئەوەی لە شەڕدا لەگەڵ ولاّتانی تر فێری ئەزموون ببێت و ببێتە خاوەن کەسایەتییەکی جەنگی و لە(هاتی) ئەگەر یەکێ یەکێکی تر بکوژێت لەسێدارەی نادەن بەڵکو بکوژ دەبێ خوێن بەهای کوژراوەکە بداتە کەسوکارەکەی.

لەم ولاّتە ئەگەر ژنێکی مێرددار حەز لە پیاوێکی تر بکات نە ژنەکە

سزادەدەن ونە پیاوەکە، بەڵکو ژنەکە مافی ئەوەی هەیە کە لە ماڵی مێردەکەی بڕوات و لە ماڵێکی تردا نیشتەجێ بێت، بەڵام دەبێت زەرەری پیاوەکە بە زێڕ یان مەڕوماڵات بپژێرێ. ئەگەر ژن و پیاو دوای ژن ومێردایەتییان منداڵیان نەبێت، ئەو ژن و مێردایەتییە بەتاڵ دەکرێتەوە و ژن یا پیاوەکە ناچار دەبن بۆ ئەوەی ببنە خاوەن منداڵ هاوسەرێکی تر هەڵبژێرن چونکە پاشای (هاتی) داوای منداڵی زۆر لە ژێردەستەکانی خۆی دەکات.

یەکێ لە نەریتە سەیرەکانی ئەم گەلە ئەوەیە کە ئەگەر یەکێک مرۆڤێک لە بیابانێکی چۆڵ یان شوێنێک کە خەڵکی لێنییە بکوژێ، ئەو خوێن بەهایەی کە دەیدات لەوە کەمترە کە لەشوێنێکی قەرەباڵغ وەک شارەکان یان شوێنێک کە دانیشتووانی زیاترە کوشتبێتی چونکە باوەڕیان وابوو کە ئەو کەسەی بۆ شوێنێکی چۆڵ دەڕوات خۆی هانی خەڵکی دەدات کە بیکوژن.

یەکێ لە یاسا پێکەنیناوییەکانی ئەم وڵاتە ئەوەیە کە خوشک و برا نابنە هاوسەری یەکتری و هاوسەرێتی خوشک و برا بە یەکێک لە گەورەترین تاوانەکان دادەنرێت و لە سێ حاڵەتدا لە(هاتی) سزای لەسێدارەدان رێگا پێدراوە کە یەکێکیان هاوسەرێتیی خوشک و برایە.

کاتێ کە چوومە وڵاتی (هاتی) یەوە بەخۆمم وت لەبەر ئەوەی دانیشتووانی ئەو وڵاتە خەڵکانێکی زەحمەتکێشن و راهاتوون کە لە هەوای ساردا بژین و منداڵی کەم ئەندام و لاواز لە کاتی لەدایک بوونیان دەکوژن(تاکو لە داهاتوو دا خەڵکانێکی لاواز نەبن)، ئیتر پێویستییان بە پزیشک نییەو من بیستبووم کە لەو وڵاتەدا کاتێک کە یەکێکیان نەخۆش دەکەوت مردنی پێ باشتر بوو وەک لەوەی چارەسەر بکرێ چونکە نەیدەتوانی دان بەوەدا بنێت کە نەخۆشە. من دەمزانی کە دانیشتووانی (هاتی) لەمەرگ ناترسێن بەڵام ترسیان لەکەم توانایی هەبوو، بەڵام سەرنجم نەدابوو کە لەم وڵاتەشدا هەندێک لە گەورەکان هەن و پیاوە بەرزەکان و دەوڵەمەندەکان لە هەموو جێگایەکی دنیادا تەمەڵ و لەش



پەروەرن و لە مردن دەترسێن و خۆیان چارەسەر دەکەن تا نەمرن. بۆیە هەندێ لەو پیاوانە لە کاتی شەودا بە کراسی ئاساییەوە دەهاتنە لام و من چارەسەرم دەکردن و زۆربەیان لەو نەخۆشییانە رەنجیان دەبرد، کە هۆیەکەی خواردنەوەی زۆر بوو و گەورەکانی (ختوشە) شەرابیان زۆر دەنۆشییەوەو دەستیان بەهۆی زیادەنۆشی لەرزۆک ببوو و زۆربەیان داوایان لێ دەکردم لەرزۆکیی دەستیان چاک بکەمەوەو من ئەوانم بەهۆی دەرمانی هێور کەرەوە و خۆشۆرینیان چاک دەکردەوە.

یەکێ لەو شتانەی کەبووە هۆی ئەوەی گەورەکانی شار لەگەڵمدا ببنە دۆست ئەوە بوو کە(مینا ) لە بەردەم ئەواندا سەمای دەکردو هەر جارێک کە ئەوان دەهاتنە ماڵی من بە مینام دەوت لەبەردەمیاندا سەما بکات و ئەوان دیاریی گرانبەهایان دەدا پێی و منیش زێڕو پارەم لە نەخۆشەکان وەردەگرت و لە ماوەیەکی کەمدا دەوڵەمەند بووم، ئەگەرچی ئەو کاتەی هاتمە(هاتی)یەوە وام بیردەکردەوە کە بە گیرفانێکی بەتاڵەوە لەوێ دەگەڕێمەوە.

یەکێ لەوکەسانەی کە لەگەڵمدا ببووە دۆست نامەنووسی پاشای(هاتی) بووکە چەند زمانی دەزانی و نامەی پاشا بیانییەکانی بۆ دەخوێندەوە و وەڵامی نامەکانی ئەوانی دەنووسییەوە. رۆژێکیان ئەو پیاوە لەماڵی من شەرابی دەنۆشییەوە و سەیری سەمای(مینا )ی دەکرد کە زۆر حەزی لێ بوو و من لێم پرسی بۆچی پاشاکەی ئێوە شاری(ختوشە )ی بە رووی بیانییەکاندا داخستووە و ناهێڵێت کەس بێتە ناو ئەم شارەوە و بۆچی لەم وڵاتەدا کاروانەکان بۆیان نییە لە رێگاکان لابدەن، ئایا باشتر نییە گەلانی تر بۆ ئەم شارە بێن و دەسەڵات و گەورەیی پاشای (هاتی) ببینن و بڕۆن و بۆ خەڵکی تری بگێڕنەوە؟ نامەنووسەکە وتی: ئەو رۆژەی پاشاکەی ئێمە، (شوبیلو لیوما ) هاتە سەر تەخت وتی، ( ٣٠ ساڵ مۆڵەتم بدەنێ، من هاتی دەکەمە بەهێزترین وڵاتی دنیا )و لە بەر ئەوەی بە زوویی ئەم ماوەیە تەواو دەبێت لەو باوەڕەدام لە داهاتوودا وڵاتانی تر ناوی ئێمە دەبیستن.

وتم ئەو کاتەی من لە بابل بووم شەست جار شەست دەستەی شەست سەربازیم بینی کە بە بەردەم پاشای بابل-دا ڕۆیشتن و کاتێ هەنگاویان دەنا وەک ئەوە بوو گوێت لە شەپۆلەکانی دەریا بووبێت. بەڵام لێرە دە جار دە سەربازیشم نەبینیوە کە بەرێدا بڕوات و بەم حاڵە، ئەی بۆچی ئەم هەموو چەکو گالیسکەیە دروست دەکەن، چونکە ناتوانن کەڵکی لێ وەربگرن.

نامەنووسی پاشا پێکەنی و وتی ئێمە لەبەر ئەوە چەک دروست دەکەین کە بە خەڵکی بفرۆشین و نان پەیا بکەین.

من بە پێکەنینەوە وتم هەرگیز گورگ ددان و چنگەکانی خۆی نافرۆشێتە کەروێشک. نووسەرەکەی پاشا بەم قسەیە زۆر پێکەنی و وتی ئەم قسەیە بۆ پاشا دەگێڕمەوەو دڵنیام بەم قسەیە خۆشحاڵ دەبێت. لە وڵاتی ئێمەدا بە پێچەوانەی وڵاتەکانی تر دەوڵەمەندەکان بەسەر هەژارەکاندا حوکم ناکەن بەڵکو دەستەڵاتداران بەسەر بێ دەسەڵاتەکاندا حوکم دەکەن چونکە گورگ بۆ ئەوە دروست بووە فەرمانڕەوا بێت لەسەر کەروێشک و من دڵنیام بەر لەوەی تۆ (سینۆهە) مووەکانت سپی بێت دەبینی کە چۆن وڵاتێکی بەهێز کە بۆ فەرمانرەوایی دروست بووە بەسەر هەموو وڵاتە لاوازەکاندا حوکم دەکات.

من خۆم لەسادەیی و نەفامی دا و وتم وەک چۆن کە ئێوە خوایەکتان هەیە کە بەتەمایە فەرمانڕەوایی بەسەر گەلە بێ دەسەڵاتەکاندا بکات، لە وڵاتی میسریش فیرعەون خوایەکی تازەی پەیا کردووە. نامەنووس وتی من لەبەر ئەوەی نامەی پاشا بیانییەکان دەخوێنمەوە نامەی پاشای میسریشم خوێندووەتەوەو دەزانم کەخوای تازەی ئەو زۆر حەزی بە ئاشتییەو دەڵێت هیچ ناکۆکییەک لەنێوان گەلاندا نییە کە نەتوانرێ بە ئاشتی چارەسەر بکرێ و تەنانەت فیرعەونی ئێوە پارچەیەک زێڕی بۆ ئێمە ناردووە کە لە شێوەی (موجەب-کۆ)-(واتە شێوەی خاچ-وەرگێڕ)دایەو دەڵێت ئەمە هێمای ژیان و ئاشتییە. نامەنووس کاتێ ئەم قسەیەی کرد دوو پەنجەی خۆی خستە سەر یەکتری کە پێم نیشان بدات ئەو زێڕە



چ شێوەیەکی هەیە[١].

دوایی وتی ئەگەر فیرعەونی ئێوە زێڕمان بۆ بنێرێت کە ئێمە بتوانین بەو زێڕە کرێی پیشەسازەکانی خۆمان بدەین کە چەکمان بۆ دروست دەکەن، ئەوا تا چەند ساڵێکی تر ئاشتی دەبینێت. بەڵام ماوەی ئەو ئاشتییە کورتە چونکە هەر ڕۆژێ پاشاکەی ئێمە بۆی دەرکەوێ کە بایی پێویست چەکی دروست کردووە و ئازووقەشی پەیداکردووە، لەو ڕۆژەدا فیرعەونی میسریش دەبێ وەک دەستەڵاتدارانی تر ملکەچی پاشای ئێمە بێت، ئەگەر نا ئەو و هەموو ژێر دەسەکانی کۆمەڵکوژ دەکەین. بەڵام ئەمانە بابەتێکن کە عەقڵی پزیشک ناتوانێ بۆی بچێت چونکە پزیشک توانای تێگەیشتنی ڕووداوەکانی ئایندەی نییە.

وتم لەبەر ئەوەی پزیشکیش وەک خەڵکی ئەقڵی هەیە، ئەگەریش نەتوانێ لە هەموو ڕووداوەکانی داهاتوو تێ بگات، هەر نەبێ دەتوانێ لە هەندێکیان بگات و من پێشبینی دەکەم ساڵەکانی داهاتوو ببێتە سەردەمی سک تێریی باڵندە لاشەخۆرەکان و کەمتیارەکان. چونکە کۆمەڵێکی زۆر دەکوژرێن و کەس لاشەکانیان کۆناکاتەوە تا مۆمیایی بکەن و بیخەنە گۆزەوە، یان لەژێر خاکدا بیشارنەوە.

ئەو پێکەنی و من وتم بەر لەوەی بۆ وڵاتی (هاتی) بێم بیستبووم ئێوە ئەو کەسانەی کە لە جەنگدا بەدیل دەیانگرن، کوێریان دەکەن و لەئاشەکانتان دەیان بەستنەوە بۆ ئەوەی بەردی ئاشیان پێ بسووڕێننەوە و من باوەڕم بەم قسەیە نەدەکرد، بەڵام لەم وڵاتە بە چاوی خۆم ئەوانم بینی و ئەم کردەوەیە لە گەلێکی شارستانی چاوەڕوان ناکرێت و هەروەها بیستم کە ئێوە لە سەر سنوورەکانتان لە کاتی داگیر کردنی زەویی وڵاتانی تر تاوانکاریی دڵتەزێن و بێ بەزەییانە ئەنجام دەدەن و دەستی خەڵکی دەبڕنەوەو پێستی سەریان دەدەنەوە بەسەر دەم وچاویان و هەندێ لەو کەسانەش لەشیش دەدەن. ئەم کردەوە دڕندانەیە شایانی دڕندەکانە،

نەک مرۆڤی شارستانی. پیاوەکە وتی ئێمە لەبەر ئەوەی کە گەلێکی شارستانین چاوی ئەسیرەکانمان کوێر دەکەین و دوایی لە ئاشەکانی خۆمان دەیانبەستینەوە، چونکە ئەگەر چاویان ببینێ، زەوی و ئاسمان و باڵندەکان دەبینن و خەمبار دەبن کە بۆچی ئازاد نین و دوایی هەوڵی راکردن دەدەن و بەردەوام بۆ ئێمە دەبنە ئەرک و تووشی زەحمەتمان دەکەن. بەڵام لەبەر ئەوەی کوێرن و بیر لە راکردن ناکەنەوە ئێمە ناچار نابین بەردەوام کۆمەڵی سەربازی خۆمان بکەینە پاسەوانی ئەوان، بەڵام بابەتی بڕینەوەی دەستی دانیشتووانی سنووری وڵاتانی تر و لێکردنەوەی پێستی سەریان و لەشیش دانیان بەرژەوەندییەکی تایبەتی تیایە، کە دەگەڕێتەوە بۆ شارستانیبوونی ئێمە، چونکە ئێمە نامانەوێت لەو وڵاتانەدا خەڵک بکوژین و ببینە هۆی ئەوەی کە ئەوانەی دەتوانن کارمان بۆ بکەن و باجمان بدەنێ لەناو بچن و هەروەها نامانەوێ بەهۆی شەڕەوە شارەکانیان وێران ببێت و زەوی و زار و باخەکانیان لەناو بچێت کە لەدوای داگیر کردنی ئەو وڵاتانە هیچمان پێ نەبڕێت. ئێمە دەزانین کە بۆ ملکەچ کردنی وڵاتانی دەوروبەر باشترین رێگا ترساندنیانە چونکە ئەو گەلەی ترس دایدەگرێت وەک سوپایەک وایە کە بەر لە دەست پێکردنی شەڕ بشکێت و ئەم گەلە ئیتر ناتوانێت بەرەنگاری دوژمن ببێتەوە و خۆی لەدەسەڵاتەکەی رزگاربکات.

لەبەرئەوە ئێمە لەسەر سنوورەکانی خۆمان و لە خاکی وڵاتانی تردا ئەم کردارانە دەکەین کەخەڵکی بترسێن و پێشاوپێشی دوژمنەکانی خۆمان دامرکێنینەوە. وتم مەگەر هەموو گەلانی جیهان دوژمنی ئێوەن، ئایا لەناو ئەو وڵاتانەدا دۆستتان نییە. نامەنووسی پاشای هاتی وتی دۆستەکانی ئێمە بریتین لەو وڵاتانەی ملکەچمان دەبن و باجمان دەدەنێ، ئەوسا ئێمە وازیان لێ دەهێنین کە داب و نەریتی خۆیان بپارێزن و خوایەکانی خۆیان بپەرستن. هەروەها لە دۆستەکانی ئێمە ئەو وڵاتانەن کە هێشتا نەبوونەتە دراوسێمان چونکە هەر ئەوەندە بوونە دراوسێمان ئەوەندە بەهانەیان پێ دەگرین تا لەگەڵیاندا دەکەوینە



شەڕو خاکەکەیان داگیر دەکەین، یان وایان لێ دەکەین باجمان بدەنێ. لەو رۆژەی کە(هاتی) دروست بووە ئەم نەریتە لە نێوان ئێمە و خەڵکدا باو بووە و لەمەو بە دواش هەر وا دەبێت.

وتم ئایا خوایەکانی ئێوە دەست لەم کارانەی ئێوە وەرنادەن چونکە لە وڵاتانی تر خوایەکان دروست لە نادروست و حەقیش لە ناحەق جیادەکەنەوە. نامەنووسەکە وتی ئێمە لەبارەی راست و ناڕاست و حەق و ناحەق باوەڕێکی سادەو روونمان هەیە.

چاک و خراپ بریتییە لەو شتەی لەگەڵ ویستمان یەک دەگرێتەوە و نادروست و ناحەقیش ئەوەیە کە حەزمان لێی نییە، سینۆهە بڕوابکە لە نێوان ئایینی ئێمە و ئایینی ئێوەو وڵاتانی تر جیاوازی نییە، چونکە لەلای ئێوە و وڵاتانی تر حەق و راستی ئەو شتەیە کە دەوڵەمەندەکان بیانەوێت و ناڕاست و ناحەقیش ئەوەیە کە بە دڵی هەژارەکان بێت. (سینۆهە) لەبەر ئەوەی تۆ پزیشکی ئەقڵت لەوە بچووکترە کە هەست بەم بابەتە بکەی و تێبگەی کە لە سەرەتای ژیانەوە تا ئەمڕۆ هەرچییەک دەوڵەمەندەکان وتبێتیان حەق بووەو هەرچی هەژاران بەسەر زمانیاندا هاتبێ حوکمی بەتاڵیان بەسەرا داوە. تا کۆتایی دنیاش هەروا دەبێت و هەمیشە دەوڵەمەندەکان لەسەر حەقن و هەژاران ناحەقن.

تەنیا شێوەی دەرەوەی دەوڵەمەندەکان دەگۆڕێ و لە هەر سەردەمێکدا شتێک دەبێتە نیشانەی دەوڵەمەندی. رۆژێک مەڕو مانگا نیشانەی زەنگینییەو رۆژێ تر زێڕو پارە و رۆژێکی دیکە پلەو پایەی تایبەت، رۆژی دواتر هەبوونی ناونیشان، وەک ناوی پزیشک یان جادووگەر یان نامەنووسی پاشاو تا جیهان بمێنێ قسەی هەژاران بێ بایەخەو هەرچی بڵێن بەتاڵە. ئەگەر دەوڵەمەندەکان چاوی هەژارەکان کوێر نەکەن و لە ئاشەکاندا بیانبەستنەوە، بە رێگایەکی تر دەیانچەوسێننەوە، چونکە دنیا بەم شێوەیە دروست بووە و دەشبێ وا بێت و هەژار لەبەر ئەوە دروست بووە کە بتوانێ هۆی حەسانەوەی دەوڵەمەندەکان دابین

بکات و خۆی بەردەوام برسی بێت و لە زەحمەتکێشاندا بێت. باشییەکی تری شارستانییەتەکەی ئێمە بەسەر شارستانیی ئەوانی تردا ئەوەیە کە ئێمە دەوڵەمەندین و گەلانی تر ملکەچ و گوێڕایەڵ و نەدار دەکەین، بۆ ئەوەی بەردەوام کارمان بۆ بکەن و دەسترەنجی خۆیان وەک باج بدەن بە ئێمە تاکو بە ئاسوودەیی و بەختیارییەوە ژیان ببەینە سەر. بەڵام سەبارەت بە خوایەکەمان، دەبێ بڵێم کە چینی تایبەتی وڵاتی ئێمە دووشتە یەکێکیان ئاسمانە و ئەوی تریان زەوییەو هەموو ساڵێ لە وەرزی بەهاردا لە خۆشیی ئەم دووانە دەیکەینە جەژن و ڕێگا بە خەڵکیش دەدەین کە ئەوانیش بتوانن بیکەنە جەژن، چونکە گەل ساڵی جارێک دەبێ ئازاد بکرێت بۆ ئەوەی ڕۆژێک لە خۆشیدا بن و باشترین وەرز بۆ ئازاد کردنی خەڵکی وەرزی بەهارە چونکە لەم وەرزەدایە کە زەوی لە ئاسمان ئاوس و دووگیان دەبێت و ژیانی دووبارەی خۆی دەست پێ دەکاتەوە. مرۆڤیش وەک زەوییە و ئێمە گرنگییەکی زۆر دەدەینە دوو گیان بوونی ئافرەتان، چونکە میللەتێک کە بیەوێت بەسەر جیهاندا فەرمانڕەوایی بکات، دەبێ خاوەنی منداڵی زۆر بێت. بۆ ئەوەی لەسەر زەویدا پەرە بەدەسەڵاتەکەی بدەن.

خەڵکی سادەی ئێمە وەک چینە ساکارەکانی وڵاتانی تر، خوایەکی زۆریان هەیە، بەڵام ئێمە بایەخ نادەینە باوەڕی ئەوان و نەڕێگەیان لێ دەگرین کە دەست لە باوەڕەکەیان هەڵبگرن و نە هانیشیان دەدەین، چونکە باوەڕی ئەوان لە رووی رامیارییەوە هیچ سوودو زیانێکی بۆ ئێمە نییە. ئێمە هانی لایەنگری و پەرستشی ئەو خوایانە دەدەین کە پشتگیری لە زۆرداری و تۆقاندن دەکەن، چونکە بە زۆرداری دەبێ بەسەر خەڵکیدا فەرمانڕەوایی بکەین و بە هەڕەشەکردن بیانترسێنین بۆ ئەوەی ملکەچمان بن. ئەگەر ڕۆژێک ئێمە بۆ خوایەکانی زۆرداری و تۆقاندن پەرستگا دروست بکەین. ئەو پەرستگایانە لە جومجومەی سەری مرۆڤ دروست دەکەین بەڵام ئەگەر تۆ دوای دەرچوونت لەم وڵاتە، ئەم قسانە بۆ خەڵکی بگێڕیتەوە کەس باوەڕت پێ ناکات چونکە هەموو ئەو میللەتانەی کە



لێمانەوە دوورن وا دەزانن کە ئێمە گەلێکی شوانکارە و ئاژەڵدار و هەژارین، کە لە شاخەکاندا بە هەژاری دەژێین و توانای ئاغایی و فەرمانڕەواییمان بەسەر خەڵکیدا نییە.

نامەنووسی پاشا لە دوای ئەم قسانە ڕۆیشت و دوای ڕۆیشتنی ئەو بە (مینا)م وت من لە مانەوەمان لە ئەم وڵاتە تێر بوومە چونکە ئەوەی پێویستم بوو زانیم و لەمەودوا ئەگەر لێرە و بەتایبەتی لەم شارەدا بمێنینەوە دوور نییە بکوژرێین و ئەگەر بەشێوەیەکی ئاسایی بیانکوشتینایە زۆر نەدەترسام، بەڵام لەم وڵاتە کاتێک کە دەیانەوێ بیانییەکان بکوژن پێستەکەیان لێ دەکەنەوە، یان لە (شیش)یان دەدەن. لەبەرئەوە دەبێ هەرچی زووترە لەم شارە بڕۆین و گیانمان رزگاربکەین.

لە ڕۆژەکانی تر من لەو نەخۆشانەی دەهاتنە لام بیستم، کە هەر کەسێ لە وڵاتی (هاتی)دا باوەڕێک جگە لە باوەڕی ڕەسمیی حکومەت بڵاوبکاتەوە بە تاوانی جادووگەری لە شیشی دەدەن، بەداخەوە من چەندین جار هەندێ شتم وتبوو کە وەک بیروباوەڕی ڕەسمی حکومەتی (هاتی) نەبوو و لەوانەبوو هەر کاتێک منیان بگرتایە لە شیشیان بدامایە، بۆیە بەنەخۆشەکانی خۆمم وت، بەتەمام بگەڕێمەوە و لەبەرئەوەی ئەوان لە دام و دەزگای حکومەتدا دەسەڵاتیان هەبوو ئیزنی ڕۆیشتنیان بۆ وەرگرتم و بڕیاردرا کە من بە ڕێگایەکی تایبەتدا بڕۆم و لەوێوە خۆم بگەیەنمە کەناری دەریا.

***

١- ئەو شتانەی کەخوێنەران سەبارەت بەباری ژیانی گەلان و داب و نەریت و ناوی پاشاکان دەیخوێننەوە، هەروەها ئەم (خاچ)ەش کە لێرەدا باس دەکرێت لەبەڵگەنامە مێژوییەکانەوە وەرگیراوە و سەنەدی هەیە و بایەخی ئەم کتێبەی نووسەری فینلەندی دەگەڕێتەوە بۆ بەڵگەدارێتیی دیرۆکی کەسەکانی و دەبینین خاچ هێمایەک بووە کە لە چوار هەزارساڵ بەر لەئێستا، واتە دووهەزار ساڵ پێش لەدایک بوونی حەزرەتی مەسیح، بەنیشانەوە ڕەمزی ئاشتی لەقەڵەم دەدرا. وەرگێڕ.

# (بەرەو سەر زەمینی «کریت»)

لەگەڵ (مینا)و (کاپتا) بەرێ کەوتین و شاری ترسناکی (ختۆشە) پایتەختی (هاتی)مان بەجێ هێشت کە لە دیوارەکانی ئەو شارە خوێن دەتکایەوەو چارەنووسی ئایندەی جیهانی تیادا گەڵاڵە دەکرا، لە گەڕانەوەدا بەتەک ئاشەکاندا تێپەڕین کە دیلە کوێرەکان دەیانسووڕاندنەوەو بەتەک هەندێ کەسی تردا ڕەت بووین کە بەشیشیانەوە کردبوون و بۆمان دەرکەوت کە جادووگەر بوونە.

دوایی گەیشتینە کەنارەو هەنگاومان نایە بەندەرێک کە لە وڵاتی (هاتی)دا تاکە بەندەرێک بوو کە بیانییەکان دەیانتوانی ئازادانە لە ناویاندا هاتوچۆ بکەن، بەڵام مافی ئەوەیان نەبوو لەو بەندەرەوە بەرەو ناوەوەی وڵات بچن، ئەوێ وەکو هەموو بەندەرەکانی تری دنیا خانەی گشتی و مەیخانەی زۆری تیابوو و لە مەیخانەو ماڵەکانی ئەوێ، بەردەوام دەنگی مۆسیقای سریانی دەهات.

کەشتیوانەکان و کرێکاری کەشتییەکان کاتێ دەهاتنە ناو ئەو بەندەرەوە خۆیان بە بەختەوەر دەزانی چونکە خواردەمەنی و خواردنەوە و ژن لەوێ زۆر بوو و ئەم جۆرە کەسانە جگە لەو سێ شتە هیچی تریان نەدەویست و لە هەر جێگایەک کە ئەم سێیانە هەبووایە خۆیان بە بەختیار دەزانی.

ئێمە ماوەیەک لەو بەندەرەدا ماینەوەو هەرکاتێ کەشتییەک بەرەو دورگەی (کریت) بەڕێ دەکەوت بە (مینا)م دەوت بەو کەشتییە بڕۆ، بەڵام ئەو وەڵامی دەدایەوە کە ئەم کەشتییە بچووکە و یان دەیوت لە دەریادا نقوم دەبێت، یان ئەم کەشتییە گەورەیە و لە کەشتییەکانی سووریایە و من ئامادەنیم سواری بم، یان دەیگوت کەشتیوانەکە کابرایەکی کەم تەرخەمەو دەترسم لە ڕێگا من بفرۆشێتە



کەشتیی دزە دەریاییەکان.

من لەو بەندەرە دەستم بەکارکردو نەخۆشەکان هاتنە لام، چونکە ناوبانگی پزیشکە میسرییەکان گەیشتبووە ئەو بەندەرەش.

یەکێک لەو کەسانەی بۆ چارەسەری نەخۆشییەکەی هاتە لام فەرماندەی پاسەوانەکانی بەندەر بوو. ئەو پیاوە بەهۆی هەڵسوکەوت کردن و رابواردن لەگەڵ ئەوژنانەی کە لە بەندەردا لە میوانخانە و ماڵەگشتییەکاندا (سۆزانیخانە) بوون، تووشی نەخۆشییەک ببوو کەمن لە کاتی مانەوەم لە سووریا (ئەزمیر) ئەو نەخۆشییەم ناسیبوو و شێوەی چارەسەرکردنەکەشی لە پزیشکە سریانییەکان فێربووم.

فەرماندەی پاسەوانەکانی بەندەر نەیدەتوانی لەگەڵ ژناندا کۆببێتەوەو دەیگوت ئەو ژنەم لە شیش دا، کە تووشی ئەم نەخۆشییەی کردم. ئەو پیاوە زۆر لە نەخۆشییەکەی خۆی دڵگران بوو چونکە لەو بەندەرەدا نەریت وابوو ئەو ژنانەی لە مەیخانەکان یان خانە گشتییەکاندا کاریان دەکرد، دەبوایە بەبێ کرێ لەگەڵ فەرماندەی پاسەوانەکانی بەندەردا رایبواردایەو لەبەرئەوەی نەیدەتوانی سوود لەو رابواردنە خۆڕاییە وەربگرێ لەم نەخۆشییەی دڵگران بوو.

کاتێ کە من چاکم کردەوەو هەستی کرد کە وەکو رابردوو لەش ساخییەکەی گەڕاوەتەوە، زۆر خۆشحاڵ بوو و بە منی وت ئامادەم بەقەدەر ئەندامە نەخۆشەکەی لەشم، کە ئێستا چاک بووەتەوە زێڕت بدەمێ وتم من زێڕی تۆم ناوێت و ئەگەر دەتەوێ شتێکم بدەیتێ، ئەو کێردەی خۆتم بدەیە کە بەقەدتەوەیە. فەرماندەکە پێکەنی و وتی ئەم کێردە بەکەڵکی چیت دێت چونکە نە زێڕەو نە زیوبشە، بەڵام من دەمزانی کە ئەو کێردە لەو کانزا سەرسوڕهێنەرە دروست کراوە کە پێی دەڵێن ئاسن و بەهای لە وڵاتانی دەرەوەی هاتیدا ئەوەندە زۆرە کە ئەو کێردە ئاسنییە دە ئەوەندەی کێشی خۆی زێڕ دەکات.

کاتێ کە لە ختوشە بووم دەمویست یەکێ لەو کێردانە بکڕم، بەڵام بۆم

دەرکەوت کە بە بیانییەکانی نافرۆشن و ئەگەر زۆرم لێ بکردنایە لەوانە بوو گومانیان لێم بکردایەو وایان بزانیایە مەبەستێکم هەیە و دەمەوێت ئەو کانزایە لە (هاتی) دەربکەم. بەڵام ئەم کێردە گرانبەهایە بۆ خودی دانیشتووانی هاتی ئەوەندە بەنرخ نەبوو، چونکە دەیانتوانی بە ئاسانی کێردی تری وەک ئەوە بکڕنەوە، کاتێ فەرماندەی پاسەوانەکان زانیی کە بەراستی کێردەکەیم دەوێت لەبەر ئەوەی دەیزانی بە زوویی لە (هاتی)دەردەچم رازی بوو کە بمداتێ و ئەو کێردە ئاسنییە ئەوەندە تیژە کە لە کێردی چەخماخ باشتر ریش دەتاشێ و دەتوانی بەو کێردە ئاسنییە کێردی مس یان زیو ببڕی.

لەو بەندەرەدا لەوەڕگەیەکی لێ بوو کە دانیشتووانی هاتی گایان لەوێ بەخێو دەکردو گەنجەکان گەمەیان بەوگایانە دەکردو لە بەردەمیاندا سەمایان دەکردو شیریان دەکرد بەپشتیاندا. (مینا) کە ئەو گایانەی بینی زۆر خۆشحاڵ بوو چونکە زانی کە دەتوانێت لەبەر دەمیاندا مەشق بکات.

کاتێ کە من بۆ یەکەمین جار سەمای (مینا)م لە بەردەم گایەکاندا بینی ئەوەندە سەرم سوڕما و ترسام کە وەسەف ناکرێ چونکە گایەکی لەو جۆرە گایانەی کە لە لەوەڕگەکەدا راگیرکرابوو لە فیلە کێوییەکانی باشووری میسر ترسناکتربوون، چونکە فیل ئەگەر حەقیان بەسەریەوە نەبێت، پەلاماری مرۆڤ نادات و ئازاری پێ ناگەیەنێت، بەڵام گا ئازارگەیەنەرە و هەر ئەوەندە مرۆڤ ببینێت یەکسەر پەلاماری دەدات و شاخەکانی وەک کێردو نێزە تیژن و بەیەک قۆچ شاخەکان بە سینگ و سکی مرۆڤدا دەکات و بەرزی دەکاتەوە و دەیکوتێ بەسەر زەویداو دەیداتە بەر لەقە.

(مینا) بە کراسێکی تەنکەوە لەبەردەم گایەک دەستی بە سەماکردن کردو بەلێزانییەکی سەرسوڕهێنەرەوە خۆی لە شاخەکانی رزگار دەکرد و ئەوەندە خێرا دەجووڵایەوە کە چاو نەیدەتوانی بەدوای جووڵەی سەماکەی بکەوێت و هەندێ جار بێباکیی دەگەیاندە ئەو رادەیە، کە بەیەک بزووتن خۆی دەخستە سەر ملی



گایەکەو شاخەکانی بەدەست دەگرت و قاچی دەخستە سەر سەری و تەقڵەیەکی لێدەداو لەسەر پشتی گایەکە دادەنیشت و دوایی دادەبەزی.

کاتێ کە سەماکەی (مینا) تەواو دەبوو گەنجەکان دەسکی گوڵیان بە ملیەوە دەکرد و ئەو کەشتیوانانەی لەوێ بوون وتیان ئێمە لە دورگەی (کریت) سەمای بەردەم گایەکانمان بینیوە، بەڵام هەرگیز نەماندیوە یەکێ بەو جورئەتە و بەو خێراییە سەما بکات.

کاتێ کە لە لەوەڕگەکە گەڕاینەوە خەم دایگرتم، لەبەرئەوەی دەمزانی ئەو گایەی ئەو لەبەردەمیدا سەما دەکات، دوایی ئەو کچە گەنجە دەکاتە بەڵاو گێری خۆی، چونکە (مینا) بەتەمابوو خۆی بکاتە قوربانی بۆ خوایەکەی خۆی و خوای ئەویش گایەک بوو یان لەگا دەچوو، دوایی کەشتییەک لە کەشتییەکانی دورگەی (کریت) هاتە ناو بەندەرەکەوەو ئەو کەشتییە نەگەورە بوو نە بچووک و کەشتیوانەکەی پیاوێکی چاک دەهاتە بەرچاو.

(مینا) وتی من بەم کەشتییە بۆ دورگەی (کریت)دەچم کە خۆم بگەیەنمە خوایەکەم و تۆش دوای رۆیشتنی من دەتوانی باشتر خەریکی ژیان و کارەکانت بیت و دەزانم بەهۆی رزگارکردنی من لە بابل زیانێکی زۆرت کرد و دواییش لەبەرئەوەی نەتدەویست من لە (هاتی)رابگری گەڕایتەوە.

وتم (مینا) من ناتوانم بهێڵم کە تۆ بە تەنیا بچی بۆ دورگەی (کریت). مینا وتی بۆچی حەز ناکەی بە تەنیا بڕۆم؟ ئەگەر لە کەشتیوانەکە دەترسێی، بزانە کە ئەو پیاوێکی چاکەو لە رێگا نامفرۆشێتە چەتە دەریاییەکان و من بە سەلامەتی دەگەمە دورگەی (کریت). وتم مینای من، دەزانم کەشتیوانەکە پیاوێکی چاکە و ناتفرۆشێ، بەڵام تۆ دەزانی کە بۆچی دەمەوێت لەگەڵ تۆدا بێم بۆ (کریت)و دەزانی دڵم پێتەوەیە.

(مینا) دەستی خستە سەردەستم و وتی (سینۆهە) من لە بەسەربردنی ژیان لەگەڵ تۆدا لەزەتم کرد، چونکە منت بۆ چەند وڵاتێک بردو گەلانی ئەو وڵاتانەت

نیشان دام و من بە دیتنی ئەو وڵاتانە وەها سەرگەرم و مەشغووڵ بووم کە وڵاتەکەمم لەبیر چوو. لەبەر ئەوە هەرکاتێ کە تۆ دەتگوت برۆ بۆ (کریت) من بە بەهانەیەک سەفەرەکەم دوا دەخست چونکە نەمدەویست لە تۆ جیا ببمەوە. بەڵام لە دوای ئەوەی لەبەردەم گایەکاندا سەمام کرد، هاتەوە یادم کە خواکەم چاوەڕوانی منە، کە بڕۆم و خۆمی پێشکەش بکەم و ئەگەر ئەو چاوەڕوانی من نەبووایە بەدڵنیاییەوە دەمامەوە و ژیانی خۆم پێشکەش بەتۆ دەکرد.

وتم (مینا) ئێمە جارێک لەمەڕ ئەم بابەتەوە گفتوگۆمان کردو من پێم وتی کە وازم لەم مەسەلەیە هێناوەو. خۆشویستنی تۆم بۆ ئەو شتە نییە کە تۆ بیری لێ دەکەیتەوە بەڵکو من هەست دەکەم کە بوونی تۆ وەک هەناسەکێشان بۆ من پێویستە، چونکە ئەو شتەی کە تۆ هەتە، ژنەکانی تریش هەیانە و هەر کاتێ پیاوێ داوایان لێ بکات کە ببنە خوشکی ، رازی دەبن.

تووڕەیی بەسەر (مینا)دا زاڵبوو و دەستی گوشیم و وتی ئەگەر تۆ حەزت لە ژنی ناو مەیخانەکانە، برۆ کاتەکانت لەگەڵیاندا ببەرە سەر، بەڵام ئەوە بزانە کە من ئەوەندە لێت تووڕە دەبم کە لەوانەیە بریندارت بکەم و خوێن بە لەشتدا بهێنمە خوارەوە. چونکە من حەز دەکەم تۆ وەک من بیت و هەروەها کە من جگە لەتۆ دڵم بەکەسەوە نەبەستووە تۆش دڵبەستەی کەس نەبیت و بزانی کە من لە دوای خوایەکەم، جگە لە تۆ بیر لەکەسی تر ناکەمەوە، وتم خواکەی تۆ قەدەغەی کردووە کە شوو بکەی، بەڵام هیچ کام لە خواکانی من لەم بارەیەوە رێگایان لەمن نەگرتووە. (مینا) وتی، بەڵام ئەگەر تۆ ببیتە هاودەمی یەکێکی ترو دوایی بتەوێ دەست بەسەر سەرمدا بهێنی بەو شێوەیەی کە پێم وتی بریندارت دەکەم.

وتم (مینا) لەم بارەیەوە خەیاڵت ئاسوودە بێت چونکە ئەمە کارێک نییە کە پیاوێکی وەکو من لە ئارەزوویدا بێت. من یەک جار دڵم بە ژنێکەوە بەست و لە پێناویدا هەموو شتێکم لە کیس چووو تووشی هەژاری هاتم و ئەم بابەتە وەها منی لە هاودەمێتیی ژنان بێزارکرد، کە بەراستی حەز ناکەم لە بارەیانەوە



بیرکەمەوە. (مینا) وتی من لە بەرئەوەی ژنم ئەم قسەیەم لەلا ناخۆشە، چونکە حەز ناکەم کە پیاوێک بڵێت لە هاودەمێتی کردنی ژنان یان لەبیرلێکردنەوەیان، بێزارم.

کاتێ کە شەو داهات و نووستم سەیرم کرد (مینا)، کە شەوانی رابردوو دەهاتە لام، ئەو شەوە نەهاتە هۆدەکەمەوە. بانگم کردو وتم (مینا) تۆ هەموو شەوێ بە دەنگە ناسکەکەی خۆت منت دەبردە بەرزاییەکانی ئاسمان، ئەی ئەمشەو بۆ بێدەنگی؟ ئایا لەبەر قسەکانی ئەمڕۆ لێم زیز بوویتە؟ (مینا) وتی نا (سینۆهە) من لێت زیز نەبوومە، بەڵام ئەمشەو لەشم دڵم ئەوەندە گەرمە کە دەترسم ئەگەر گوێت لە دەنگم بێت بەگەرمی ئاگری ئەو خەمەی لەدەروونمدایە بتسوتێنم، من هەڵسام و چوومە لای و دەستم بە لەشیدا هێناو هەستم کرد تای لێیەو پێم وت (مینا) وابزانم تۆ نەخۆشی بهێڵە با چارەسەرت بکەم.

(مینا) سەرەتا نەیدەویست چاکی بکەمەوەو دەیگوت خوایەکەم چاکم دەکاتەوە، بەڵام من پێم وت ئەگەرچی خوایەکەت دەتوانێ تینوێتی و برسێتی چارەسەر بکات کە بەهۆیەوە بتوانی خواردن و خواردنەوە نەنۆشی بەڵام بەبێ خواردن و خواردنەوە تینوێتی و برسێتی مرۆڤ ناشکێ. هەروەها نەخۆشیش دەبێ دەرمانی پزیشک بەکاربهێنێ تا نەخۆشییەکەی چاک بێتەوە.

(مینا) رازی بوو دەرمانی بدەمێ و دەرمانێکی هێورکەرەوەم دەرخوارد داو وتم ئێستا بنوو چونکە لە دوای خواردنی ئەم دەرمانە دەبێ بنووی بۆ ئەوەی نەخۆشییەکەت لەناوبچێ. (مینا) نووست، بەڵام من تا بەیانی بەدیاریەوە بەخەبەر مامەوەو کاتی بەرەبەیان بۆ نووستن چوومە ژوورەکەی خۆمەوە.

نەخۆشییەکەی (مینا) درێژەی نەکێشاو چاک بووەوە هەتا گەیشتینە ئەو رۆژەی کە بڕیارمان دابوو بە کەشتی بۆ دورگەی (کریت) بڕۆین بە (کاپتا)م وت کەلوپەلی سەفەر ئامادە بکات بۆ ئەوەی سواری کەشتی بین و بچین بۆ دورگەی (کریت) کە نیشتمانی (مینا)یە.

(کاپتا )وتی من پێشبینیم دەکرد کە بەهۆی بوونی ئەم کچە تۆ دەمبەیتە ناو کەشتییەوە، لە کاتێکدا کە بە منت وت جارێکی تر سواری کەشتی نابین و من دەبێ لەبەر ئەم بەدبەختییە کراسەکەی خۆم بدڕێنم، بەڵام نایدڕێنم چونکە دوایی ناچار دەبم بیدوورمەوە، هەروەها ناشگریەم چونکە دەترسم تاکە چاوەکەم لە کیس بدەم و تەنها یەک شت هەیە دڵم دەداتەوەو ئەویش ئەوەیە کە ئەم سەفەرە دەریاییە وەکو پێشبینی دەکەم دوا سەفەری دەریایی من بێت من لەمەودوا سواری کەشتی نابم بەڵام لەبەر ئەوەی دڵنیا بووم کە تۆ لەگەڵ ئەم کچەدا بۆ دورگەی (کریت) دەڕۆی، کەلوپەلەکەم ئامادەکرد.

من کە چاوەڕوان بووم کاپتا بە توندی نارەزایی دەربڕێ و دەست بکات بە شیوەن و ناڵەناڵ، سەرم سوڕما لەوەی کە زوو تەسلیم بوو. بەڵام دوایی زانیم کە ئەو دوو سێ ڕۆژ لەوەپێش لەگەڵ هەندێ لە کەشتیوان و دەریاوانەکان گفتوگۆی کردبوو و بۆ پێش گرتن لە نەخۆشیی دەریا، کە هۆیەکەی شەپۆلی ئاوەکە بوو، ناوی هەندێ دەرمانی لێیان پرسیبوو، لەوانە پێیان وتبوو ڕۆژێک بەر لە سواربوونی کەشتی بە تەواوەتی خۆت لە خواردن بپارێزەو پشتێنەکەت قایم ببەستە بۆ ئەوەی سکت کۆببێتەوەو پاشان بچۆرە ناو کەشتییەکە و دوای سواربوون، یەکسەر بنوو و بەم شێوەیە گرفتاری نەخۆشی دەریا نابێت.

کاپتاش ڕۆژێک بەر لە سواربوون هیچی نەخوارد و پشتێنەکەی توند بەست. فەرماندەی پاسەوانەکانی بەندەر بۆ بەرێ کردنی ئێمە تا بەردەم کەشتییەکە هات و ئێمەی بەکەشتیوانەکە سپارد. دوای ئەوە مەلەوانەکانی کەشتی، سەوڵە گەورەکانیان گرتە دەست و کەشتییان لە بەندەر بردە دەرەوە. لە پاش دەرچوونمان لەبەندەر، کەشتیوانەکە قوربانیی بۆ خوای دەریا و خوای کریت سەربڕی و دوایی فرمانی دا چارۆگەکانیان هەڵکرد. کە چارۆگەکان هەڵکران و کەشتی بەسەر ئاوەکەدا چەمییەوە، شەپۆلەکانی دەریا خستیانە جوولە جووڵ و من هەستم بە ناڕاحەتی و هەڵچوونی گەدە کرد و نووستم.



ڕۆژی دوایی لەخەو هەڵسام و بینیم لە ناوەڕاستی دەریادایین و لە هیچ لایەکەوە وشکانی دیار نییە. ئاسمان شین و خۆرگەرم و، نەسیمی دەریا بەهێز بوو و کەشتییەکەمان بەخێرایی ڕێگای دەبڕی.

یەکێ لە کەشتییە جەنگییەکانی (کریت) بە گومانی ئەوەی ئێمە چەتەی دەریایین لێمان نزیک بووەوە، بەڵام لە دوای ئەوەی زانیی لە کەشتییەکانی (کریت)ین بە ئاڵاکەی خۆی سەلامی لێ کردین و دوور کەوتەوە.

(کاپتا ) کە ئیتر لە نەخۆشیی دەریا نەدەترسا هاتە سەر کەشتییەکەو لەگەڵ مەلەوانەکان کەوتە قسەکردن و باسی کرد کە لە جیهاندا شتی زۆر سەیری بینیوە و سەفەرێکیان کە لە میسرەوە، بۆ سووریا دەچوو گرفتاری تۆفان بووەو ئەوەندەی نەمابوو بخنکێ. دوایی باسی گیانەوەرە دەریاییە سەیرەکانی ڕووباری نیلی کرد و دەیویست بەهۆی ئەو شتە سەیرانەی بینیبووی سەریان بسوڕمێنێ.

دوایی مەلەوانەکان دەستیان بە قسەکردن کردو باسی گیانەوەرە ترسناکەکانی دەریایان کرد وەک ماسی عەنبەرو ئەو ماسییانەی نیوەی سەرەوەی لەشیان مرۆڤە و دەنگێکی ناسک و خۆشیان هەیە و (کاپتا ) لە قسەکانی ئەوان ترسی لێ نیشت و حەپەساو بڕیاری دا کە ئیتر هەوڵی ئەوە نەدات بەقسەکانی خۆی دەریاوانەکان بترسێنێت.

هەر چەند لە (کریت) نزیک دەبووینەوە، (مینا ) زیاتر کەیف خۆش دەبوو و نەسیمی دەریا پرچی پەریشان دەکرد، جوانتر دەهاتە بەرچاو. بەڵام من لەوەی کە دەبووایە ئەوم لەدەست بدایە خەمبار بووم و بە خۆمم دەوت ئەگەر بەبێ (مینا ) لە (کریت) بگەڕێمەوە و بۆ میسر بچم گەڕانەوەکەم بۆ میسر هیچ تامێکی نابێت. چونکە بەبێ مینا ژیان لەچاومدا تاریک و لە چێژمدا تاڵ بوو و خەم و پەژارەی ئەوە دایگرتبوم کە لەمەودوا خۆم لە تەنیشت (مینا )وە نابینم و ناتوانم دەستەکانی بخەمە ناو دەستمەوە.

کەشتیوان و مەلەوانەکان کە خەڵکی دورگەی کریت بوون، ڕێزیان لە مینا

دەگرت چونکە دەیانزانی ئەو یەکێکە لەو کچانەی کە دەبێت کچێنییەکەی پێشکەشی خوای کریت بکات و هەروەها دەیانزانی کە ئەو لەبەردەم گایەکاندا سەمایەکی جوان دەکات.

کاتێ کە من دەمویست لەبارەی خوای کریت پرسیار لە مەلەوانەکان و کەشتیوانەکە بکەم ئەوان وەڵامیان نەدامەوە و سەریان بادەدا، یان دەیانگوت لەبەر ئەوەی تۆ بیانیت ئێمە لە زمانەکەت تێ ناگەین.

# لە کریت چیم بینی

ئەو رۆژە هات کە دورگەی (کریت) لە ئاودا سەری دەرهێناو مەلەوانەکانی کەشتی هاواری خۆشییان کرد چونکە گەیشتبوونە ولاتەکەی خۆیان و کەشتییەوانی کەشتییەکە لە شوکرانەی بە سەلامەتی گەڕانەوەی ڕێبواران، قوربانیی بۆ خوای دەریا کرد کە هەمان خوای (کریت) بوو و لە دەریادا فەرمانڕەوایی دەکرد.

هەرچەندە مەلەوانەکان و کەشتیوانەکەو (مینا)، لە بینینی دورگەی (کریت)و دار زەیتوونەکان و چیاکانی خۆشحاڵ دەبوون، من ئەوەندە غەمبار دەبووم. چونکە دەمزانی کە دەبێ (مینا)بە جێ بهێڵم و بەبێ ئەو بگەڕێمەوە.

(مینا) بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە بەهۆی بینینی ولاتەکەی دەگریا. بەڵام (کاپتا) کە سەری سوڕما بوو بە دەمی کراوەوە سەیری دەریای بەردەم (کریت)ی دەکرد و ئەو کەشتییانەی دەژمارد کە لەوێ بوون و لە دوای ئەوەی دە جار شەست کەشتیی ژمارد تێگەیشت کە هێشتا ئەوەندەی تر ماوە کە نەیژماردووەو وتی من لەو باوەڕەدام ئەوەندە کەشتییەی کە لێرەدا هەیە لە هەموو دنیادا نییە. (کریت) ئەوەندە باوەڕی بە دەسەڵاتی خوایەکەی هەبوو کە لە بەندەری ئەو ولاتە نە بورج هەبوو و نە قایمکاریی بەرگری کردن و خانووەکانی بەندەر لە قەراغی دەریاوە دەستی پێ دەکرد. کاتێ کە چوومە کریتەوە هەندێ شتم بینی کە لە هەموو جیهاندا لە ماوەی سەفەرەکانم شتی وام نەبینیوە[1].

دیارە پزیشکێکی وەک من کاتێ دەچێتە ولاتێکەوە سەرەتا چاو دەبڕێتە روخسار و دەموچاوی خەڵکی، کە بزانێ لەش ساغن یان نا. من زۆربەی خەڵکم



بە لەش ساغی و جوانی بینی و دوای ماوەیەکی کەم سەرنجم دا کە لە زمانی خەڵکی (کریت)دا وشەیەک نییە کە بتوانرێ لێیەوە واتای وشەی (مردن) بدات و خەڵکی بە رادەیەک خەریکی رابواردن و خووگرتووی خۆشگوزەرانی بوون، کە هەرگیز بیریان لە مردن نەدەکردەوە و ئەگەر یەکێ بمردایە بۆ بردنی تەرمەکەی هەموو جۆرە فێڵێکیان بەکار دەهێنا کە کەس نەزانێ پیاوێک یان ژنێک مردووە.

من بیستم کە لاشەی پیاوەکانیان دەسووتاند و لە ناویان دەبرد چونکە بە دڵنیاییەوە لەوێ مردووەکان نەدەنێژران و من لە (کریت)دا گۆڕم نەبینی و تەنیا چەند گۆڕێکی پاشا کۆنەکانی (کریت)ی لێ بوو کە بەردی گەورەیان لەسەری دانابوو. بەڵام خەڵکی کاتێ کە بەلای گۆڕەکانەوە تێ دەپەڕین رووی خۆیان وەردەگێڕا بۆ ئەوەی وای نیشان بدەن کە نایبینن و وایان دەزانی بەم شێوەیە دەتوانن نکۆڵی لە بوونی مردن بکەن.

هونەرمەندتر لە هونەرمەندان و پیشەسازانی (کریت)، لە هەموو جیهاندا بەدی ناکرێت و گۆزەکان و دەفرە سوفاڵ (هەرگینە)ییەکانیان زیاتر لە پارچەیەک گەوهەر دەچوو نەک گۆزە. کاتێ مرۆڤ بۆ ئاو خواردنەوە دەفرێکی سوفاڵی (کریت) بە دەستەوە دەگرێت لە سەیرکردنی تێر نابێت و لەسەر دەفرەکە وێنەی ماسییەکانی دەریاو پەپوولەکان لە هەواو لەسەر گوڵەکاندا دەبینراو هەر دەستەیەک لە گیانەوەرەکان رەنگێکی تایبەتییان هەبوو. بە شێوەیەک کە مرۆڤ وا هەست دەکات وەستای گۆزەکە لە جیاتی رەنگ گەوهەری بە گۆزەکەوە نووساندووە یان کێشاویەتی. هەر گۆزەکارێک نەخشی گۆزەکەی خۆی بە شێوەیەک دەکێشاو رەنگی دەکرد و لەسەر گۆزەکە وێنەی گیانەوەرانی دەریایی دەکێشا ولەسەر دەفرێ تر گیانەوەرەکانی وشکانی و لەسەر دەفری سێیەم باڵندەکان دەبینران.

یەکێک لەو شتانەی من لە **تەبەس** و بابلیش نەمبینی و یەکێک بوو لە

تایبەتمەندییە گەورەکانی شارستانییەتی جیهان کە تەنها دانیشتووانی (کریت) ئەم تایبەتمەندییەیان هەبوو، شێوەی دروستکردنی ئاودەستەکانی دورگەی کریت بوو و لە بابل ئاودەستەکان ئەوەندە پیسە، کە مرۆڤێکی شارستانی حەز ناکات بچێتە ناویانەوە و لە **تەبەس** لەگەڵ ئەوەشدا کە خوایەکانی ئێمە وتوویانە ئاودەستەکان خاوێن رابگرن، بەڵام وەکو پێویست خاوێن نەبوون، لە (کریت) هەموو ئاودەستێک نموونەی هونەرو زەوق و خاوێنییە، لەبەر ئەوەی بەردەوام شەو و رۆژ ئاوی شلەوتێن بەناو لەگەنی[٢] ئاودەستەکەدا تێ دەپەڕی و ئەوەندە جوانە کە هیچ جۆرە بۆنێکی ناخۆشی لێ نایات.

خانووەکانی کریت وەک ئەوانەی بابل بەرز و چەند قات نین. بەڵام لە جیاتی ئەوە بۆ ژیان زۆر باشترو ئیسراحەت ترن لە خانووەکانی بابل. لەبەر ئەوەی ژوورەکانیان گەورەو پەنجەرەکانیان بەرین دروست دەکرد و هەموو خانوویەک ژوورێکی گەرماو (حمام)ی هەبوو و هەر هۆدەیەک لەو گەرماوانە تەشتێکی گەورەی بۆ خۆشوشتن تیا بوو کە بەهۆی بەلووعەکانەوە ئاوی سارد و گەرم دەهاتە ناویەوە و من لە پێشا وام زانی کە ئەم ئاودەست و گەرماوە بێ هاوتایانە تایبەتن بە دەوڵەمەندەکان، بەڵام دوایی بینیم کە تەنانەت لە ماڵی هەژارترین خەڵکی ئەو شارەش ئاودەستی جوان هەبوو کە ئاوی ساردو گەرمی بۆ دەچوو و گەرماوە جوانەکانیش ئەو ئاوە سارد و گەرمەیان هەبوو. ئەو کاتە تێ گەیشتم کە بۆچی خەڵکی ئەوێ ئەوەندە جوانن،چونکە ئاودەستی خاوێن و حەمامێ کە ئاوی گەرم و ساردی هەبێت مرۆڤ جوان دەکات.

ژنەکانی کریت بە رۆژ ماوەیەک لە کاتەکانی خۆیان بە لێکردنەوەی مووی لەشیان و خۆشۆرین و ئارایشتی دەموچاویان دەبردەسەر و ئەوەندە لە ئارایشتدا بە دیقەت بوون کە هەرگیز لەکاتی دیاریکراودا لە میوانداریبیەکان ئامادە نەدەبوون و کەس ئەم بابەتەی پێ سەیر نەبوو. کراسی ژنەکانی کریت بەرگێکە، کە هەموو لەشیان دادەپۆشێ جگە لە دەست و پێ و شانیان، چونکە بە



دەستەکانیان نازیان دەکرد و حەزیان لێ بوو خەڵکی جوانییەکەیان ببینێ. ژنەکانی (کریت) قژی سەریان بەشێوەیەکی سەرنج راکێشە ئارایشت دەکرد، لە کاتێکدا کە لە (**تەبەس**) پایتەختی میسر ژنەکان قژی سەریان دەتاشی و من لەو باوەڕەدام لە رووی جوانیی ئەندامەکانی لەش ژنەکانی (کریت) نموونەی هەموو ژنەکانی دنیان. ئەوان باڵابەرز و باریکن و بەبۆنەی ناسکی ئەندامیان بەگرفتەوە منداڵیان دەبوو. بە گشتی لە یەک یان دوو منداڵ زیاتریان نەبوو وکەمی منداڵ لەلای خەڵکی کریت شەرم نەبوو.

پیاوەکانی کریت وەک ژنەکان ئەندامێکی ناسکیان هەبوو بەڵام ناوشانیان پان بوو و هەر پیاوێک هەوڵی دەدا کەمەری خۆی باریکتر نیشان بدات و ئەوانیش وەکو ژنەکان بە وردی مووەکانی لەشیان لە ناودەبرد بۆ ئەوەی لەکاتی یاری کردن لەگەڵ گایەکان، ئەندامەکانیان جوان بێتە بەرچاو و چەکمەی درێژیان لەپێ دەکرد و لە قەدی چەکمەکانیان شکڵی گیانەوەریان دەنەخشاند. پیاوەکانی کریت حەزیان نەدەکرد بۆ وڵاتانی تر بڕۆن چونکە لە وڵاتانی تر کەلوپەلی حەسانەوەو پاک و خاوێنی وەکو کریتی لێ نەبوو و دەیانگوت ئێمە ناتوانین لە خانووی گەلانی تردا بژین کە ئاودەستی خاوێن و گەرماویان نییە.

یەکێ لە شتە سەیرەکان کە لە کریت-دا بینیم و هاوتای ئەوم لە هیچ وڵاتێکی تردا نەبینی ئامێرێکی موسیقا بوو کە بەبێ ئەوەی کەس بیژەنێت دەنگی موسیقای لێ دەبیسرا بەڵام هەندێ دەنگی لێوە دەردەچوو کە پێشتر لەسەر هەندێ شت نووسرا بوو و من نەمتوانی تێبگەم چۆن دەنگ لەسەر شت دەنووسرێتەوە.هەروەها لە دانیشتووانی (کریت)م بیست کە ئەوان دەتوانن ئاوازەکانی مۆسیقا بنووسنەوە و دوایی لەسەر ئەو نووسینانە مۆسیقا لێ بدەن. بەجۆرێک کە ئەگەر یەکێک ئاوازێکی نەبیستبێ بەڵام نووسراوەی ئەو ئاوازەی دەست بکەوێت دەتوانێ لەسەر ئەو نووسینە ئاوازەکە لێ بدات. من لەبەر ئەوەی پزیشکم و تەنیا بۆ زانستی پزیشکی سەرنجی تایبەتیم هەبوو هەوڵم نەدا تێ

بگەم کە چۆن دەکرێ ئاوازی مۆسیقا بنووسرێتەوە و دیارە خەڵکیش وەکو من سەرنجیان نەدابووە ئەم بابەتە.

من لە کریت پەرستگەیەکم نەبینی کە بۆ خوای وڵاتەکەیان دروست کردبێ، بەڵام لە بری ئەوە گایەکانیان دەپەرستیی و لەبەر دەمیاندا سەمایان دەکرد و سەرنجم دا کە پەرستشی گایەکان لەلایەن خەڵکی (کریت)ەوە تەنها لەبەر خۆش ویستنی ئایینەکەیان نەبوو، بەڵکو خۆیان لەو سەماکردنە تام و چێژیان وەردەگرت و هیچ رۆژێ نەبوو کە ئەوان بۆ بینینی ئەو سەمایە ئامادە نەبن یان خۆیان سەمانەکەن.

یەکێ لەو خاڵانەی شایانی باسەو لە ژیانی ئەم گەلەدا لەبەرچاو بوو، ئەوەیە کە شەرابیان لە رادە بەدەر نەدەنۆشییەوە و من لە هەموو ماوەی مانەوەم لە (کریت) نەمبینی یەکێ مەست بێت یان وەک دانیشتووانی **تەبەس** بە هۆی خواردنەوەی زۆر تووشی رشانەوە بێت.

خاڵێکی بەرچاوی تر ئەوە بوو کە لە (کریت) ژن و پیاو لە کاتی بەرپاکردنی مەراسیمەکانیان، لەبەردەم گایەکاندا سەما دەکەن و ئەمە یەکێک بوو لە سەرگەرمییەکانیان و لەهەمان کاتدا گەورەترین بیروباوەڕیشیان بوو.

ئەو ژن و پیاوانەی لەبەردەم گایەکاندا سەمایان دەکرد دوو دەستە بوون، هەندێ لەوانە پیشەیان ئەوەبوو، ئەوان ئەگەر پیاو بوونایە نەیان دەتوانی ژن بهێنن و ئەگەریش ژن بوونایە نەیاندەتوانی هاوسەرێک بۆ خۆیان هەڵبژێرن. بەڵام دەستەکەی تر ئەو کەسانە بوون کە بۆ سەرگەرمی و خۆشی سەمایان دەکرد و ئەگەر پیاو بوونایە دەیانتوانی ژن بهێنن یان ئەگەر ژن بوونایە شوویان بکردایە. تەنیا یەک شتم لە داب و نەریت و هونەری خەڵکی (کریت) لەلا ناپەسەند بوو ئەویش سروشتی هەوەسبازی ئەوان بوو چونکە ئەم گەلە بەرادەیەک حەزیان بە شتی نوێیە کە ئەو شتەی ئەمڕۆ لەلای خەڵک پەسەندە دوو رۆژ دوای ئەوە لەبەر چاو دەکەوێت و هیچ بازرگانێ دڵنیانییە ئەو شتەی ئەمڕۆ خەڵکی



دەیکڕێ شەش مانگ دوای ئەوە دەفرۆشرێ یان نا.

دوای ئەوەی گەیشتینە (کریت) لە میوانخانەیەک نیشتەجێ بووین. ئەو کاتەی لە بابل لە میوانخانە چەند نهۆمییەکەی ئەوێ دابەزیبووم، بەخۆمم دەوت لە جیهاندا هیچ میوانخانەیەک نییە کە لەمە باشتر بێت، بەڵام دوای ئەوەی هاتمە (کریت)ەوە و میوانخانە جوان و خاوێنەکەی ئەوێم بینی، کە خزمەتکارەکانی میهرەبان و بێگانە نەوازبوون[٣]، تێگەیشتم کە میوانخانەکەی بابل لە ئاست ئەمەدا بێبایەخە، چونکە لە میوانخانەکەی بابل خزمەتکاری ناشیرین و تووڕەی لێ بوو، بەڵام لە میوانخانەکەی (کریت) کوڕ و کچە جوانەکان هەمیشە دەم بە پێکەنین بوون و پێشوازییان لە رێبواران دەکرد و لە هەرکاتێکدا کە بانگیان دەکرا ئامادەی خزمەت بوون. ئێمە دوای ئەوەی چووینە ئەو میوانخانەیەوە لە گەرماوە جوانەکانی ئەوێ کە ئاوی سارد و گەرمی تیادا رەوان بوو خۆمان شوشت و جلەکانمان گۆڕی و مینا قژی سەری لوول کرد و کراسی نوێی کڕی و من جووتێ گوارە و ملوانکەیەکم بۆ کڕی کە لە بەردی رەنگاورەنگ دروست کرا بوو. ئەو کراسەی مینا کڕیی لەو جۆرە جل و بەرگانە بوو کە ژنەکانی کریت لەبەریان دەکرد و مینا وا دیاربوو لە کڕینی کراسەکەی رازی بوو.

دوای ئەوەی جلکی لەبەرکرد بە منی وت کەژاوەیەک بە کرێ بگرە کە لە بەندەرەوە بەرە و شار بڕۆین بۆ ئەوەی من مامۆستاکەی خۆم ببینم.

میوانخانەکەی ئێمە لە بەندەری کریت واتە لە ناوچەی بەندەری بوو و ئێمە کەژاوەیەکمان بەکرێ گرت و سواری بووین و بەرە و شاری کریت رۆیشتین. شار لە چاو بەندەرەوە لە جێگایەکی بەرزتر بوو و ئەوەندە باخی تیا بوو کە بیناکان لە باخەکاندا ون ببوون.

مینا کەژاوەکەی لە بەردەم یەکێ لەو باخانەدا راگرت و ئێمە چووینە ناو باخەکەوە. مینا وتی ئێرە ماڵی مامۆستاکەمەو لە کریت ئەو کچ و کوڕانەی

لەبەردەم گایەکاندا سەما دەکەن هەر کامێکیان مامۆستایەکیان هەیە کە راهێنەرو پاڵپشتیانە و هونەری سەمایان فێر دەکات و بەرگری لە بەرژەوەندییەکانیان دەکات و ناهێڵێ خەڵکی تر مافی قوتابییەکەی پێشێل بکەن. مامۆستای مینا پیرەمێردێ بوو کە کاتێ ئێمە چووینە خانووەکەیەوە هەندێ پاپیرۆسی ( کاغەزی دنیای کۆن کە لەمیسرەوە بۆیان دەهات- وەرگێڕ) لەبەردەم خۆیدا دانا بوو و دەیخۆێندەوە. سەیرم کرد لەسەر ئەو کاغەزانە وێنەی گای لەسەر کێشرا بوو و بۆم دەرکەوت کە ئەو گایانە ئەو ئاژەڵانەن کە سبەینێ هەندێ کەس لەبەردەمیاندا سەما دەکەن و پیرەمێردەکە دەیویست بزانێت لەسەر کام یەک لەو گایانە گرەو بکات باشترە.

کاتێ کە مینای بینی خۆشحاڵ بوو و ماچی کردو وتی مینا من وام دەزانی تۆچوویتە بۆ لای خواو ئیتر نەگەڕاویتەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی بەتەواوی دڵنیا نەبووم کە ناگەڕێیتەوە لەجیاتی تۆ قوتابیی نوێم دانەناو ژوورەکەت هێشتا هەرماوە، بەڵام وابزانم ماوەیەکە خاوێن نەکراوەتەوە و لەوانەیە ژنەکەم وێرانی کردبێ و لە ناویدا حەوزی دروست کردبێ بۆ ئەوەی ماسییەکانی لەناودا پەروەردە بکات. چونکە ژنەکەم زۆر حەزی لە بەخێوکردنی ماسییە.

مینا بەسەرسوڕمانەوە وتی لەکەیەوە ژنەکەت حەزی لە پەروەردەکردنی ماسییە، چونکە ئەوکاتەی من لێرە ڕۆیشتم ئەو هیچ لە فکری بەخێوکردنی ماسیدا نەبوو.

پیرەمێردەکە وتی ئەمە ژنی تازەی منە کە تۆ نەتبینیوە و ئەگەر ئێستا ئەو پیاوە گەنجەی لەلای نەبووایە، من تۆم دەبردە لای و پێیم دەناساندی، بەڵام ئێستا گابازێکی[٤] گەنجی لەلایە کە تازە دەستی بەسەما کردووە و ئەگەر تۆ ببەمە لایان کارەکەیان لێ تێک دەچێت. ئایا ناتەوێ هاوڕێکەی خۆتم پێ بناسێنی بۆ ئەوەی منیش لەگەڵیدا ببمە هاوڕێ و ئیتر ئێرە بە ماڵی خۆی بزانێت.



مینا وتی هاوڕێکەی من پزیشکێکی میسرییە ناوی (سینۆهە) کوڕی کەرەو بەتەنیا دەژێت و ژنی نییە.

پیرەمێردەکە وتی ئەگەر ماوەیەک لەم وڵاتە بمێنیتەوە تەنیا نامێنێ و زۆر بەپەلە دەبێتە خاوەن ژن و منداڵ، بەڵام مینا، مەگەر تۆ نەخۆشی کە لەگەڵ پزیشکێکدا هاتوویت بۆ ئێرە. ئەگەر وابێت جێی خەم و پەژارەی منە، چونکە کاتێ هاتیتە ژوورەوە دڵم شاد بوو و وام زانی دەتوانم داوات لێ بکەم سبەینێ لەبەردەم گایەکدا سەمابکەیت و بەهۆیەوە هەندێ زێڕو پارەم دەست بکەوێت.

مینا وتی من نەخۆش نیم و خۆم لە هەموو کاتێ بە لەشساغتر دەزانم و لەبەر ئەوە لەگەڵ ئەم پزیشکە میسرییە سەفەر دەکەم، چونکە ئەو منی ڕزگارکرد و ئەگەر ئەو نەبووایە من لە بابل، یان دەکوژرام یان خۆم دەکوشت.

پیرەمێردەکە وتی ئومێدەوارم بەهۆی هاوڕێیەتی لەگەڵ ئەم پزیشکە میسرییە کچێنییەکەی خۆت لە دەست نەدابێ چونکە وەکو خۆت دەزانی ئەگەر کچێنییەکەت بەخشیبێ ڕێگا نادەن لەبەردەم گایەکاندا سەما بکەیت و ناتوانی بچیتە لای خوا، دوایی پیرەمێردەکە لە مینا نزیک بووەوەو کەمێک دەستی بەسینگیدا هێناو وتی دەترسم کچێنییەکەت لەکیس دابێت کە لێرە ڕۆیشتی سینەت بچووک بوو ئێستا کەمێک گەورە بووە. ئایا باشتر نییە بەر لەوەی لەبەردەم گایەکاندا سەما بکەی چاوێکت لێ بکەم و بزانم ئایا کچی یان نا؟

مینا بە تووڕەییەوە وتی من نامەوێت وەکو بازاڕی کۆیلە فرۆشەکانی بابل، کە لەوێ ژنە گەنجەکان دەپشکنن کە بزانن کچێنییان ماوە یان نا، لێرە فەحسم بکەی من پێت دەڵێم لەبەر ئەوە لەگەڵ ئەم پیاوەدا سەفەردەکەم،چونکە ڕزگارکەری منە و ئەگەر ئەو نەبووایە نەمدەتوانی بگەڕێمە بۆ (کریت)، بەڵام تۆ هەر لە فکری گایەکان و دەرامەتی خۆتی و گوێ نادەیتە قسەی من.

دوای ئەم قسەیە مینا کەوتە گریان و پیرەمێردەکە دوای بینینی فرمێسکەکانی لە قسەکەی خۆی پەشیمان بووەوەو وتی مینا، مەگریە، من

دڵنیام کە تۆ ڕاست دەکەی و هێشتا کچی و ئەم پیاوە تۆی دەرباز کردووە و ئەگەر ئەو نەبووایە نەتدەتوانی بگەڕێییەوە بۆ (کریت). دوایی بابەتی قسەکردنەکەی گۆڕی و وتی ئێستا هاتەوە بیرم کە من دەبێ ئەمڕۆ بچمە لای (مینوس) و لەبەر ئەوەی بۆ ڕۆیشتنم درەنگە ناتوانم کراسەکەم بگۆڕم و هەر بەم کراسەوە دەڕۆم و ئێوە لێرە پشووبدەن و نان بخۆن و ئەگەر ژنەکەم پرسیاری منی کرد بڵێن چووەتە لای (مینوس)و چونکە ئەو، گەنجە گابازەکەی لەلابوو نەیویست کاتتان لێبگرێ.

بە ژنەکەم بڵێن دوای ئەوەی لە ماڵی (مینوس) گەڕامەوە سەرێک لە گایەکانم دەدەم چونکە سبەینێ یەکێ لە گایەکانم کە هێشتا بەشداری یاریی نەکردووە دێتە ناو گۆڕەپانەوە و من دەبێ ببیینم.

مینا وتی لەبەر ئەوەی تۆ دەتەوێ بۆ ماڵی (مینوس) بڕۆی من و سینۆهەش لەگەڵتدا دێین و لەوێ هاوڕێکانم دەبینم و سینۆهەیان پێ دەناسێنم.

لەبەر ئەوەی ماوەی نێوان ماڵی پیرەمێردەکە و ماڵی مینوس زۆر نەبوو، ئێمە بەبێ کەژاوە بەرەو ئەوێ ڕۆیشتین و دوای ئەوەی چووینە خانووەکەی (مینوس)ەوە بەسەر سوڕمانەوە تێگەیشتم کە ئەوێ کۆشکێکی گەورەیەو دوای ئەوەی کە زانیم (مینوس) پاشای کریتە، بەشێوەیەک حەپەسام کە وەکو کاپتا دەیگوت وەک ئەوە وابو لە ناکاودا ببینم کە لەسەر سەر بەرێدا دەڕۆم.

لەوێ زانیم کە لە کریت ناوی پاشاکان (مینوس)ە و ئەوەندە (مینوس) ناو پاشایەتیی کریتیان کردبوو، کە هەندێ لە خەڵکی نەیاندەزانی پاشای ئەوکاتەیان کە فەرمانڕەواییان بەسەرا دەکات مینوسی، چەندەمە.

دوای ئەوەی چوومە ئەو تەلارەی کە مینوسی تیابوو، بینیم کە کۆمەڵێ ژن و پیاو لەو هۆڵەدان و ئەوەندە بەدەنگی بەرز قسەیان دەکرد و پێدەکەنین کە دەتگوت لە ماڵی خۆیاندان. پیاوەکانیان کراسی ڕنگاو ڕەنگی جوانیان لەبەردابوو و هەموویان خۆش ئەندام بوون و ژنەکان لە جوانی و ڕازاوەیی



کراسەکانیان لەگەڵ یەکتردا پێشبڕکێیان دەکرد. مینا منی بە هاوڕێکانی خۆی ناساند و ژنەکان لە باوەشیان دەگرت و ماچیان دەکرد و پیاوەکان بە بینینی خۆشحاڵییان دەردەبڕی بەبێ ئەوەی دیارنەبوونەکەی ئەویان پێ سەیربێ.

ئێمە بە بەردەم کۆمەڵێکی زۆر لە ژن و پیاوەکاندا تێپەڕین تاگەیشتینە بەردەم (مینوس)کە وەک ئەوانی تر لەگەڵ هەندێ کەسی دەوروبەریدا گفتوگۆیان دەکرد و پێدەکەنین. ئەویش بە بینینی مینا شاد بوو و دوای ئەوەی مینا منی پێ ناساند و مینۆس تێ گەیشت کە من ئەو کچە گەنجەم ڕزگارکردووە بەزمانی میسری سوپاسی کردم و وتی سینۆهە تۆ خزمەتێکی گەورەت بە خوایەکەی ئێمە کردووە چونکە کچێکت بۆ گەڕاندۆتەوە کە دەبێت بچێتە لای ئەو و مینا لە یەکەمین دەرفەتدا دەچێتە ماڵی خوایەکەی.

دوایی مینا منی لە تەلاری مینوس بردە دەرەوەو وتی وەرە ژوورەکانی ئەم کۆشکەت نیشان بدەم و لە هەر هۆدەیەکدا بە بینینی شتەکانی ناوی شادی دەردەبڕی و بینیم خزمەتکارەکانی ئەوێش لە بینینی ئەو کچە گەنجە خۆشحاڵ بوون، بەبێ ئەوەی ماوەی دیار نەبوونی دوورو درێژی مینایان لەلا سەیر بێت.

مینا هۆی ئەم ڕەفتارەیانی بۆ من باس کردو وتی هۆی ئەوەی کە لەم وڵاتەدا هیچ کەسێ ون بوونی ئەوانی تری لە لا سەیر نییە، ئەوەیە کە نایانەوێت خەم بۆ مردنی کەس بخۆن و پەژارە دەربڕن. کاتێ کە یەکێ دەمرێ کەس یادی ناکاتەوە و لەسەر ئەم پێوەرە کاتێ کە یەکێ دەمرێت کەس لێی ناپرسێت هەتا دەگەڕێتەوە و ئەگەر نەگەڕایەوە وا بیردەکەنەوە کە مردووە و پێویستە فەرامۆش بکرێ، لەبەر ئەوەی بە بیرهێنانەوەی خەڵکی، بە تایبەت ئەوانەی گومانی مردنیان لێ دەکرێ دەبێتە هۆی خەفەت و دڵگران بوون و لەم وڵاتەدا کەس نایەوێت خوێ بە دەست خەم و پەژارەوە بدات.

دوای ئەوەی مینا ژوورەکانی کۆشکی نیشان دام، منی بردە هۆدەیەکەوە کە لە سەرووی ژوورەکانی تردا بوو و لەوێوە لەوەڕگە گەورەکان کە گایەکانی تیا

دەڵەوەڕێن و باخەکانی زەیتوون و زەوی و زارەکانی دەرەوەی شار دەبینران و مینا پێی وتم ئەمە ژووری منە. وتم مینا تۆ لەم ژوورەدا دەژیایت؟ ئایا تۆ نیشتەجێی کۆشکی پاشایەتی بووی.

مینا وتی بەڵێ و ئەم جل و بەرگەی لێرەدا دەیبینی هی منە، بەڵام ناتوانم لەبەریان بکەم چونکە مۆدێلی نەماوە و لە وڵاتی ئێمە جل و بەرگ زوو لە مۆد دەکەوێ.

وتم مینا من ئەم قسەیەتم زۆر پێ سەیرە چونکە هەرگیز لەو باوەڕەدا نەبووم تۆ ژنێک بیت کە جێگات کۆشکی پاشایەتی بووبێ.مینا وتی ئەگەر تۆ ناوی پاشاکەی ئێمەت بزانیبایە تێدەگەیشتی کە ناوی من کە (مینا)یە لە وشەی (مینوس)ی پاشای ئێرە وەرگیراوە.وتم ئەی بۆچی ئەم شتەت بە من نەگوت کە من بمزانیبایە تۆ لە بنەماڵەی پاشایەتی (کریت)ی. مینا وتی بۆ بیڵێم؟ لێرە هەموو خەڵکی یەکسانن و بە پێویستم نەدەزانی پێت بڵێم کە من لە بنەماڵەی پاشای (کریت)م.

زانیم کە مینا راست دەکات و شێوەی رەفتاری خەڵکی لە تەلارەکەی مینوس-دا ئەم بابەتەی دەردەخست. چونکە خەڵکی لەوێ بە شێوەیەک هەڵسوکەوتیان دەکرد کە دەتگوت لە ماڵی خۆیاندان و نازانن پاشای کریت لەوێیە. هەروەها تێگەیشتم بۆچی لەو رۆژەوە کە مینام ناسیوە زێڕو پارە کاری لێ نەدەکرد و ئەگەر شتێکم بۆ بکڕیبایە و بە دیاری بمدابایەتێ خۆشحاڵ نەدەبوو. چونکە مینا لە منداڵییەوە راهاتبوو کە زێڕو پارە و گەوهەر ببینێ و ئەو شتەی من دەمدا پێی بەلایەوە گرنگ نەبوو تاکو دڵخۆشی بکات.

وتم مینا تۆ کە خزمی پاشای (کریت)ی چۆن لەبەردەم گایەکاندا سەما دەکەی. ئایا ئەم بابەتە بۆ ژنێ کە لە بنەماڵەی پاشەیەتی بێت ناپەسەند نییە؟ مینا وتی لە وڵاتی ئێمەدا سەماکردن لەبەردەم گایەکاندا کارێکە کە هەموو گەورەکان ئەگەر بتوانن خەریکی دەبن و هەر کەسێ کە لەم هونەرەدا



لێهاتووییەکی بەرچاوی هەبێت رێزی لێدەگیردرێ. لەبەر ئەوە، نە تەنها ئەم کارە شەرم نییە، بەڵکو کارێکی شەرەفمەندانەیە.

دوایی بەیەکەوە لە کۆشکی پاشایەتی هاتینە دەرەوە و بەرەو دامەزراوی گابازی (کریت) کەوتینە رێ. لەو شارەدا، دامەزراوی گابازی بریتی بوو لە شارۆچکەیەکی بچووک کە لە تەنیشت شاری گەورەوە دروست کرابوو.

لەم شارەدا چەند مەیدانێکی لێ بوو بۆ گابازی و بۆ راگرتنی گایەکان لە تەویلە گەورەکانی ئەوێ و لە تەنیشت تەویلەوە هەندێ لەوەڕگە هەبوو کە دەوراودەور پەرژین کرا بوو. کاتێ کە هەوای دورگەی کریت سارد دەبێت گایەکان دەگوازنەوە بۆ ناو پشتیرەکان و لە وەرزی گەرما لە لەوەڕگەکاندا دەیان لەوەڕێنن، بەڵام ئەو گایانەی کە دەبێ سبەی یان دوو سبەی لە گۆڕەپانی گابازیدا پەلاماری گەنجە سەماکەرەکان بدەن، لە پشتیرەکاندا دەبوون.

کاتێ گەیشتینە دامەزراوی گابازی مامۆستاکەی مینا لەوێ بوو و کە منی لەو جێگایە بینی خۆشحاڵی خۆی دەربڕی. هەروەها ئەو کاهینانەی کە کاریان پەروەردە کردنی گایەکان و راهێنانی سەماکەرەکان بوو بە بینینی مینا خۆشحاڵ بوون، بەبێ ئەوەی دیار نەبوونە درێژ خایەنەکەی ئەویان پێ سەیر بێت.

کاهینەکان لە دوای ئەوەی زانییان کە من پزیشکێکی میسریم لە بارەی خواردنی گایەکان و هەروەها لەبارەی ئەوەی لە چ کاتێکدا خواردنیان بدرێتێ کە ببێتە هۆی بریقەدار بوونی مووی لەش و زیاتر بوونی تەمەنیان، هەندێ پرسیاریان لێ کردم. لە کاتێکدا کە من دەمزانی زانیاریی ئەوان لەم بارەیەوە لە هی من زیاتر بوو، چونکە لە سەدان ساڵ لەمەوبەرەوە تا ئێستا باو و باپیرانی ئەوان خەریکی پەوەردەکردنی گایەکان بوونەو لە دوای هەر سەردەمێک زانیاری باوکان گوازراوەتەوە بۆ کوڕەکانیان و ئەو کوڕانەش زانیاریی زیاتریان دەخستە سەر و دەیاندایە جلی نوێ.

مینا لەلای کاهینەکان بەرێزو خۆشەویست بوو و کاتێ کە ئەویان بینی،

بەچاک زانینی مامۆستاکەشی، ڕەزامەندییان نیشان دا کە مینا سبەینێ لەبەردەم گایەکدا سەما بکات و گایەکیان بۆ دەست نیشان کرد. مینا لەم هەڵبژاردنە زۆر خۆشحاڵ بوو چونکە دەیزانی کە دەتوانێ سبەینێ هونەرەکەی خۆی نیشانی من بدات.لە دوای ئەوە مینا ڕێنومایی کردم و چووینە لای کاهینی گەورە کە سەرۆکی هەموو کاهینە گابازەکان بوو.کاتێ چووینە ناو ژووری کاهینەکەوە بەهۆی تاریک بوونی ژوورەکەی لە پێشاندا نەماندی، بەڵام لە دواییدا چاوم بە مرۆڤێ کەوت کە سەری وەک گا بوو و ڕەنگی زەرد بوو. ئەو مرۆڤەی سەری وەک گا دەهاتە بەرچاو،لە بەرامبەر ئێمە سەری دانەنواند و دوایی سەرە گایەکەی لەسەری هەڵگرت و تێگەیشتم سەرو دەموچاوی هەر وەک مرۆڤێکی ئاساییە.

ئەگەرچی ئەو پیاوە کە کاهینی گەورە بوو لەگەڵماندا بە پێکەنین بوو و ڕووی خۆش بوو بەڵام من لە چڕوچاوی ترسام، چونکە جۆرە مۆرکێکی قیناوی و بێ بەزەییانەی توندم لە دەموچاویدا هەست پێ کرد.

مینا کاتێ کە ویستی باسی بکات کە بۆچی ماوەیەک دیار نەبووە و نەیتوانیوە لە کاتی خۆیدا خۆی بۆ خوای کریت بکاتە قوربانی، کاهینی گەورە وتی پێویست ناکات بۆ منی باس بکەی.چونکە من ئاگام لەم بابەتە هەیە و دەزانم تۆیان ڕفاند و بۆ وڵاتانی تریان بردی. پاشان ڕێزو پێزانینی خۆی ئاراستەی من کرد و وتی سینۆهە لەبەر ئەوەی تۆ مینات گەڕاندەوە بۆ کریت کە بتوانێ خۆی بۆ خوایەکەی بکاتە قوربانی من فرمانم داوە دیارییەکت بۆ ببەن و کاتێ کە گەڕایتەوە میوانخانەکەت ئەو دیارییانە دەبینی.

وتم من نە بۆ پاداشت مینام ڕزگار کردووە و نە بۆ وەرگرتنی ئەو پاداشتەش هاتوومەتە کریت، بەڵکو مەبەستی من کۆکردنەوەی زانستە و بەر لەوەی بۆ کریت بێم بۆ وڵاتانی سووریاو بابل و هاتی سەفەرم کردووە و لەو وڵاتانە زۆر شت فێر بووم و ئێستا هاتوومەتە کریت کە لێرەش زانیارییەکانی خۆم دەوڵەمەند



بکەم.

لەبارەی خوای (کریت)ەوە شتی سەرنج ڕاکێشم بیستووەو بە منیان گوتووە کە ئێوە خوایەکی گەورەتان هەیە کە کچەکان و کوڕە گەنجەکانی خۆش دەوێت، بە مەرجێ کە هیچ پیس و پۆخڵییەک بە جەستەیانەوە نەبێت و ئەمە سیفەتێکی گەورەیە، کە لە خوایەکانی سووریاو بابل بەدی ناکرێت چونکە خوایەکانی سووریاو بابل ڕێگا دەدەن ژن و پیاو لەناو پەرستگەدا لەگەڵ یەکتریدا ڕابوێرن.

کاهینی گەورە وتی لێرەدا جگە لە خوای گەورەی ئێرە خوای تریش هەیە کە خەڵکی دەیپەرستێ و تەنانەت لە ناوچەی بەندەریش پەرستگە هەیە بۆ پەرستنی خوایەکانی وڵاتانی تر، تۆ دەتوانی ئەگەر حەزت لێ بێ لەو پەرستگانە بۆ خوای ئامون کە خوای میسرە قوربانی بکەی.

بەڵام بیانییەکان خوای گەورەی ئێمە ناناسن و ناشتوانن بیناسن چونکە تەنیا ئەو کەسانەی کە بۆ ناسینی ئەو پەروەردەکراون و لە شوێنکەوتووە ڕاهێنراوەکانن،بۆیان هەیە کە ئەو ببینن و تا ئێستا هەر کەسێ کە ئەوی بینیبێ نەگەڕاوەنەتەوە کە بڵێ خوای گەورەی ئێمە چۆنە و هەرئەوەندە بە ئێوە دەڵێم کە گەورەیی و بەختەوەریی گەلی کریت بەهۆی خوایە گەورەکەیەتی.

وتم ئەی کاهینی گەورە، ئەو کاتەی لە وڵاتی (هاتی) بووم لە دانیشتووانی ئەوێم بیست کە خوایەکانی ئەوان ئاسمان و زەوین و یەکێ لەوانە بەهۆی بارانەوە زەوی دوو گیان دەکات و دەیکاتە خاوەن بەروبووم. لەو کاتەدا بە شێوەیەکی ناتەواو کەوتە گوێم کە خوای کریت، دەریایە چونکە ئەو میللەتە دەسەڵات و بەختەوەریی خۆی لە ڕێگای دەریاوانییەوە دەست کەوتووە.

کاهینی گەورە وتی بەشێک لە قسەکانی تۆ ڕاستە و ئێمە زۆر لە هۆیەکانی بەختەوەریمان لە دەریاوانییەوە دەستکەوتووە. بەڵام خوای ئێمە دەریا نییە بەڵکو خوای دەریاشە.

سینۆهە دەبێ بزانی کە لە ناو هەموو گەلاندا گەلی کریت تەنیا گەلێکە کە

خوایەکی زیندوو بە خوای گەورەی خۆی دەزانێت لە کاتێکدا کە گەلانی تر خوایە مردووەکان دەپەرستن یان شێوەی ئەو خوایانە دەپەرستن کە بە بەرد، یان دار دروستیان کردووە. خوای ئێمە نە خوایەکی مردووە و نە بەرد و دارە، بەڵکو خوایەکی زیندووە و تا ئەو رۆژەی خوایەکەی ئێمە زیندوو بێت هیچ گەلێ ناتوانێ لەگەڵ میللەتی کریت-دا جەنگ بکات و ئەگەریش بیکات تێک دەشکێ.

وتم بیستومە خوایەکەی ئێوە لە ئەشکەوتێکدا، یان لە خانوویەک کە دالانی درێژ و تاریکی هەیە دەژێت و من زۆر حەز دەکەم کە ئەم ئەشکەوتە،یان ئەم خانووە ببینم، بەڵام نازانم بۆچی ئەو کەسانەی بۆ بینینی خوای ئێوە دەستنیشان دەکرێن و دەچنە جێگاکەی ئەو، ناگەڕێنەوە. لە کاتێکدا کە رێگایان پێدراوە کە بگەڕێنەوە، ئایا ئێوە ناتانەوێت بە من بڵێن بۆچی هیچ کامێک لەوانە نەگەڕاونەتەوە.

کاهینی گەورە وتی لەگەڵ ئەوەشدا کە خوای ئێمە لە شێوەی گایەکە، بەڵام ئەو خوایە گا نییە، بەڵکو بوونەوەرێکە کە کەس ناتوانێ بڵێت چییەو هەر ئەوەندە دەزانین کە ژیانی هەیە. بەڵام کە دەڵێن بۆچی ئەو کەسانەی دەچنە جێگاکەی ناگەڕێنەوە، ئەم بابەتە بەهۆی رادەی بەرزی بەختەوەری و شانازییە. چونکە گەورەترین شانازی و بەختەوەری بۆ کچ و کوڕە گەنجەکانی ئێمە ئەوەیە کە خوا ببینن و لەلای ئەو بمێننەوە و هەر لەبەر ئەوە کاتێ کە خوایەکە دەبینن ئەوەندە خۆیان بە بەختەوەر دەزانن، کە ژیانی ئەم دنیایەیان لەبەر چاو دەکەوێت، چونکە دەزانن کە ئەگەر بۆ ئەم دنیایە بێنەوە دەبێت ئازارو مەینەتی ئەم جیهانە بچێژن و خۆیانی بۆ بگرن.(مینا) ئایا تۆ ئارەزوو ناکەی بۆ ماڵی خوا بچیت و باقیی تەمەنت لەوێ بێت.

مینا وەڵامی نەدایەوە و من وتم ئایا من کە رێگام نادەن بچمە ناو خانووی خوا،دەتوانم دەرگای چوونە ژوورەوەکەی ببینم؟



کاهینی گەورە وتی ئەو شەوەی کە مانگ لە ئاسماندا بە تەواوەتی پڕ دەبێتەوە (مانگە شەو)و نزیک دەبێتەوەو لەو شەوەدا مینا دەچێتە ماڵی خواو لەوێوە تۆش دەتوانی دەرگای خانووەکە ببینی.

وتم ئەی ئەگەر مینا ئامادە نەبێت بۆ ماڵی خوا بچێت چۆن دەبێت؟

کاهین وتی هێشتا ئەم حاڵەتە رووی نەداوە کە کوڕێکی گەنج یان کچێ ئامادە نەبێت بۆ ماڵی خوا بچێت و (مینا)ش لە دوای ئەوەی لەبەردەم گایەکانماندا سەمای کرد بەوپەڕی حەزو ئارەزووەوە دەچێتە ماڵی خوا. لە دوای ئەم قسەیە کاهینەکە سەرە گایەکەی لەسەر کرد کە تێمان بگەیەنێت ماوەی چاوپێکەوتنەکە کۆتایی پێ هاتووە: مینا دەستی گرتم و لە هۆدەکە هاتینە دەرەوە.

دوای ئەوەی لە ماڵی کاهینەکە هاتینە دەرەوە مینا لێم جیا بووەوە و وتی لەبەر ئەوەی سبەینێ رۆژی سەما کردنمە ئەمشەو دەبێ لە دامەزراوی گابازیدا بمێنمەوە و من بە تەنیایی بۆ میوانخانەکە گەڕامەوە.

سەیرم کرد (کاپتا) کە شەرابی نۆشیبۆوە،کەیف خۆش بوو و وتی سینۆهە ... گەورەی من ... ئێرە سەرزەمینی رۆژئاوا و ناوەندی بەختەوەرییە (میسرییەکانی کۆن ئەو شتەی کە گەلانی تر لە چاخەکانی دوای ئەوان پێیان دەوت بەهەشت، ئەوان ناویان لێ نابوو سەرزەمینی رۆژئاوا - وەرگێڕ). لێرە خواردنەوە زۆر و هەرزانە و هیچ گەورەیەک بە گۆچان لە خزمەتکارەکەی خۆی نادات و لێی ناپرسێ چەندێ زێڕو پارەت لێ دزیوم و ئەگەر گەورەیەک لە بەندەکەی خۆی توورە بێت و لە ماڵ دەری بکات، بەندەکە یەک رۆژ خۆی دەشارێتەوە و رۆژی دوایی دەگەڕێتەوە ماڵ و خاوەنەکەی تاوانەکەی فەرامۆش دەکات، بەڵام مامەڵەچییەکانی ئێرە زۆر فێڵبازن و وەک چۆن بازرگانێکی ئەزمیر بازرگانێکی میسری هەڵدەخەڵەتێنێ ئەمانیش فێڵ لە مامەڵەچییەکانی ئەزمیر دەکەن.

لە جیاتی ئەوە لەم شارە، جۆرە ماسییەکی بچووک دەکەنە ناو رۆنی زەیتوونەوەو ماوەیەک تیایدا دەیهێڵنەوە و ئەم ماسییە ئەوەندە بەتام دەبێت کە هەر چەندێکی لێ بخۆیت تێر نابیت،(مەبەستی کاپتا ماسیی «ساردین» بوو کە دانیشتووانی کریت دەیانخستە ناو رۆنی زەیتوونەوەو هێشتا ئەم نەریتە لە ئەوروپا و ئاسیا بەردەوامە - وەرگێڕ).

لە پاش ئەم قسەیە بەندەکەم دەرگای هۆدەکەی داخست و دوای ئەوەی دڵنیا بوو کە کەس لە پشت دەرگاکەوە گوێی لە دەنگی ئێمە نابێت وتی: گەورەم لەم وڵاتەدا کارەساتی سەرسوڕهێنەر رووی داوە، چونکە من لە مەیخانەکانی ناوچەی بەندەری بیستم خوای کریت مردووە و کاهینەکان کە لە مردنی خوای کریت ترسیان لێ نیشتووە هەوڵ دەدەن خوایەکی تر بدۆزنەوە. بەڵام هەرکەسێ ئەم قسەیە بکات بە سەختی سزا دەدرێ و دوو نەفەر لە دەریاوانەکان کە ئەم قسەیەیان کردبوو لەسەر تاشە بەردەکانی قەراغ دەریای کریتەوە فڕێیان دانە ناو دەریا بۆ ئەوەی ببنە خۆراکی (ئەختوپوت)ەکانی دەریا (ئەختوپوت ئاژەڵێکی ترسناکی دەریاییە کە لە فارسیدا «هەشت پێ»ی پێ دەڵێن - وەرگێڕ)و لەبەر ئەوەی دانیشتوانی کریت دەڵێن دەسەڵات و بەختەوەرییان بە ژیانی خوایەکەیانەوە بەندە، کەواتە ئەگەر خوایەکەیان بمرێ گەلی کریت دەسەڵات و بەختەوەرییەکەیان لەکیس دەچێت.

کاتێ کە کاپتا ئەم قسەیەی کرد، ئومێدێ لە دڵمدا دروست بوو و پێم وت ئەگەر وابێت و خوای گەلی کریت وەکو دەڵێن مردبێ و وابزانم ئەم هەواڵە راستیشە، (چونکە ئەگەر چی حکومەتەکان بەردەوام هەوڵ دەدەن رووداوەکان لە خەڵکی بشارنەوە بەڵام خەڵکی ئاگاداری هەموو هەواڵێ دەبن). لە دوای ئەوەی مینا چووە ناو خانووی خواکەیان یەکسەر لەوێ هاتە دەرەوە.

***



(١)- خوێنەرانی بەرێز دەبێ سەرنج بدەن کە ئەم بەشە لە بەسەر هاتی سینۆهە لەبارەی دورگەی (کریت) کە یەکێکە لە ناوەندە گەورەکانی شارستانییەتی جیهان لە کاتی پزیشکی میسری (لە چوار هەزار ساڵ لەمەوبەر) لەرووی مێژووییەوە یەکێکە لە بەشە سەرنج راکێشەکانی ئەم بەسەرهاتە. چونکە مێژووی دورگەی (کریت) بە پێچەوانەی مێژووی میسرو ئێران و یۆنان و رۆم زۆر ناسراو نییە و لەوانەیە هێشتا هەندێ لە خەڵکی نەزانن کە (کریت) لە شارستانییەتی دنیادا چ دەورێکی کاریگەری هەبووە- وەرگێڕ.

(٢)- لەگەن: کۆڵ

(٣)- بێگانە نەواز: ئەوەی بیانی دەلاوێنێتەوەو رێزی لێ دەگرێ- میوان دۆست.

(٤)- گاباز: ئەو کەسەی کە لەبەردەم گایەکاندا سەما یان یاری دەکات-گاگەمە- ئەوەی کە ئێستا لە هەندێ لە وڵاتاندا هەر باوە ئەوەیە کە گابازەکە پەڕۆیەکی سوور بەدەستەوە دەگرێت و لەبەرامبەر گایەکەدا پەڕۆکە دەجووڵێنێتەوە و بەو شێوەیە تووڕەی دەکات - وەرگێڕێ کوردی

# لە گۆڕەپانی گابازیی (کریت) دا

رۆژی دوایی بەیارمەتیی مینا، کە لە مەیدانی گابازییەکە دەستی دەڕۆیی، منیان لە جێگایەک دانیشاند کە بتوانم لەوێوە هەموو شوێنێ بە باشی ببینم.

گایەکانیان یەک یەک هێنایە ناو گۆڕەپانەکەوەو سەیرم کرد لەگەڵ ئەوەشدا کە لەوێ زیاتر لە دە ریز تەماشاچیی لێ بوو، بەڵام هەموویان بە باشی دەیانبینی، چونکە جێگای تەماشاچییەکان بە شێوەیەک دروست کرابوو کە هەر ریزێک لە ریزەکەی دوای خۆیەوە نزمتر بوو، بەبێ ئەوەی هیچ کامێکیان بەرچاوی ریزی دواوەی خۆی بگرێ.

سەمای کچەکان و کوڕە گەنجەکان لەبەردەم گایەکاندا چەند جۆرێک بوو و لە هەمووی قورستر ئەو سەمایە بوو کە سەماکەرەکە دەبوایە بەسەر هەردوو شاخی گایەکەدا باز بدات و بچێتە سەرپشتی. من وەکو پێشتر باسم کرد، لە رابردوودا جارێک بینیبووم کە مینا ئەم سەمایەی دەکرد.

من بینیم دەوڵەمەندەکانی (کریت) لەسەر گایەکان گرەویان دەکرد و وەک ئەوەبوو کە بزانن هەندێ لە گایەکان لەوانەی تر باشترن. بەڵام لە دیدی من گایەکان هەموویان یەکسان بوون و نەمدەتوانی هەست بە جیاوازییان بکەم.

میناش وەکو خەڵکی لەبەردەم گایەکدا سەمای کرد، سەرەتا لە سەماکەی ترسام چونکە یەک قۆچی گایەکە بەس بوو بۆ ئەوەی مینا بکوژێت، بەڵام لە دوای ئەوەی دەست و بردبییەکەیم بینی و بۆم دەرکەوت ماسولکەکانی لەشی لە ژێر فەرمانیدان، ترسم نەماو وەک خەڵکی تر شادیم بۆ کرد.

لەکریت پیاوە گەنجەکان و کچەکان بە رووتی لەبەردەم گایەکاندا سەمادەکەن لەبەر ئەوەی سەماکەیان ئەوەندە مەترسیدارە کە ئەگەر کراسیان لەبەردابێت



لەوانەیە بکوژرێن، چونکە کراس ئەگەرچی تەنکیش بێت رێگا لەوە دەگرێت کە بتوانن بە ئاسانی بەسەر ماسولکەکانی لەشیاندا زاڵ بن. ئەگەرچی کچەکان هەموویان سەماکەیان جوان بوو، بەڵام لە دیدی مندا سەماکەی مینا لە هی هەموویان جوانتر بوو، بەڵام مامۆستاکەی مینا لەو باوەڕەدا بوو کە لەبەر ئەوەی ئەو کچە گەنجە ماوەیەک لە کریت دوور کەوتۆتەوە و مەشقی نەکردووە وەکو پێویست توانای سەماکردنی نییە.

لە دوای تەواوبوونی سەماکەی مینا لە کاتێکدا کە رۆنێکی تایبەتی لە لەشی دابوو، هاتە لام و وتی: سینۆهە دوو سبەی مانگ لە ئاسماندا دەبێتە بازنەیەکی تەواو و من دەبێت بچمە ماڵی خواوە و لەبەر ئەوە هاوڕێکانم بانگهێشتیان کردووم کە لە جەژنێکدا بەشداربم، ناتوانم لەگەڵ تۆدا بێم، بەڵام لەو شەوەی کە دەچمە لای خوا دەتوانی وەکو هاوڕێکانی ترم تا شوێنی چوونە ژوورەوە لەگەڵمدا بێیت.

وتم: مینا هەر چۆنێک کە حەزت لێیە وا دەکەم و لەو شەوەدا لەگەڵت دێم و لە ئێستاوە تا دوو سبەی شەو کاتەکانم بە بینینی شتە دیدەنییەکانی کریت بەسەر دەبەم و یەکێک لەو شتە دیدەنییانە کە خۆشییەکی بۆ منیش تێدایە ئەوەیە کە هەندێ لەو کچە گەنجانەی هاوڕێی تۆن و هێشتا خۆیان وەقفی خوا نەکردووە، بانگهێشتیان کردووم کە لەو میواندارییەدا بەشداربم کە بڕیارە بە زوویی لەم شارەدا بەرپا بکرێت و کاتەکانم بە شادمانی لەگەڵیاندا ببەمە سەر، ئەگەرچی ئەوان وەکو تۆ جوان نین بەڵام لەشولارێکی قەڵەویان هەیە و قەڵەوییەکەیان نوقسانیی جوانییەکەیان پڕدەکاتەوە.

مینا بازووی منی گرت و وتی: سینۆهە من رازی نیم کە تۆ لەو کاتەی منت لە لانیم بڕۆیتە لای ئەو کچانەی هاوڕێی منن و هەر نەبێ تا ئەو کاتەی دەچمە خانووی خواوە بوەستە و دوایی ئازادی کە چەندت حەز لێ بوو بچیتە لای ئەو کچانە و لەگەڵیاندا گفتوگۆ بکەیت.

وتم: مینا ئەم قسەیەم بەگاڵتە بوو، ئەگەرنا من حەزم لە هاونشینیی ئەوان نییەو ئێستا دەگەڕێمەوە ناوچەی بەندەری و خەریکی پزیشکی دەبم. چونکە لەوێ خەڵکێکی زۆر نەخۆشن کە هی وڵاتانی ترن و پێویستییان بە چارەسەرکردنی منن.

پاشان بەرەو میوانخانەکە گەڕامەوە و بە کارەکەمەوە خەریک بووم، هەتا شەو داهات و مانگ لە ئاسماندا دەرکەوت و لەو کاتەدا لە هەموو ناوچە بەندەرییەکەدا دەنگی مۆسیقاو ئاواز بەرزبووەوە، چونکە لە بەندەری کریت خانووی گشتی زۆر بوو و تەنانەت ئەو کەسانەی هەژاریش بوون لە کریتدا وەک دەوڵەمەندەکان کاتەکانیان بەخۆشی رادەبوارد و بە شێوەیەک دەژیان کە دەتگوت هەرگیز نامرن و لە جیهانێکدا دەژین کە خەم و پەژارە و ئازاری تیا نییە. من لە ژوورەکەی خۆم بەبێ ئەوەی چرا هەڵبکەم لە رووناکی مانگدا دانیشتبووم و کاپتا لە هۆدەکەی خۆی کە لە بەرامبەر ژوورەکەی من بوو راکشابوو و نووستبوو، یان خۆی ئامادە دەکرد کە بنوێت.

لەو کاتەدا ژنێکی گەنج هاتە ژوورەکەم و سەیرم کرد لەو کچانەیە کە لە میوانخانەکەدا کار دەکات و پێمی وت: سینۆهە... ئایا حەز دەکەی ببمە خزمەتکاری تۆ؟

وتم: نا... خزمەتکارم ناوێت..

وتی: ئەگەر بیردەکەیتەوە کە من هونەرێکم نییەو کابانییەکەمت بەدڵ نییە یەکێکی تر لە خزمەتکارەکانی میوانخانەکە بانگ دەکەم کە بێت و تۆ ئەو بکە بە کارەکەری خۆت.

وتم: نا... نا... من خزمەتکارم ناوێت و دەمەوێ تەنیا بم.

کچەکە وتی: سەیرە، بیانییەکان لەگەڵ ئەوەشدا کە وەسیلەیان هەیە کاتەکانیان بەخۆشی رابوێرن، کەچی بەهۆی بڕیارێک، خۆیان تووشی پەژارە دەکەن و تەنیا دەمێننەوە. لەکاتێکدا کە خوای کریت مرۆڤی بۆ سوود وەرگرتن لە



خەڵاتەکانی دنیا دروست کردووە.

دوایی لێم نزیک بووەوەو وتی: سینۆهە بۆ ئەوەندە زۆر لە خۆت دەکەی؟ لەگەڵمدا رابوێرە چونکە من حەزدەکەم بزانم کە پزیشکێکی میسری چۆن رادەبوێرێت.

وتم: وازم لی بێنە، چونکە بێ تاقەتم.

کچە گەنجەکە وتی: ئەگەر تۆ وەکو بیانییەکانی تر زەوقت نییە لەبەر ئەوەیە کە خۆت لێرەدا زیندانی کردووە.

وتم: لە هۆدەکەم بڕۆ دەرەوە و تا بانگم نەکردووی مەیەوە.

کچەکە وتی: من پێم سەیرە لە وڵاتێک کە پیاوەکانیان وەکو ئەم پزیشکە میسرییەیە، خەڵکی لەوێدا بە چ ئومێدێ دەژین.

من چاوم لە مانگ بڕیبوو چونکە دەمزانی تاکە ژنێک کە ئامادەم بیکەم بە خوشکی خۆم لێم جیا دەبێتەوە، بۆ ئەوەی بڕوات بۆ ماڵی خوایەکەی و کچێنییەکەی پێشکەش بکات. لەم بیرکردنەوەیەدا بووم کە لە ناکاو هەستم کرد یەکێک لە ژوورەکەمدایەو ئەو بۆن عەترەی لێ دەهات کە دوێنێ لە مەیدانی گابازییەکەدا بۆنم کردبوو. سەرم هەڵبڕی و ڕوانیم ئەو کەسە مینایە.

وتم: مینا چۆنە هاتوویتە بۆ ئێرە؟

مینا وتی: بەهێواشی قسە بکە چونکە حەز ناکەم کەس گوێی لە دەنگمان بێت دوایی لە تەنیشت منەوە دانیشت و وتی: لەبەر ئەوە هاتوومەتە ئێرە چونکە لە قەرەوێڵەکەی خۆم کە لە دامەزراوی گابازییە بێزار بوومە.

من بە بیستنی ئەم قسەیە سەرم سووڕما، چونکە زۆر دوور بوو ژنێکی وەک مینا بەو هەموو لایەنگیری کردنەی گابازی، رقی لەقەرەوێڵەکەی ئەو دامەزراوە بێت.

دوایی مینا وتی: خۆشم بە تەواوەتی نازانم بۆچی لەم کاتەدا هاتوومەتە ئێرە و لەوانەیە نەفرەت لێ بوونی قەرەوێڵەکەم منی بۆ ئێرە راکێشابێت. لەوانەشە

هاتبێتم لەگەڵ تۆدا گفتوگۆ بکەم و ئەگەر حەزت لە نووستنە، لێرە دەڕۆم و ئەگەریش ناتەوێ بنووی لەلات دەمێنمەوە و گوێ لە قسەکانت دەگرم و بۆنی دەرمانەکانت دەکەم و هەرکاتێ کاپتا قسەیەکی پێکەنیناوی بکات قژی سەری رادەکێشم. من وا هەست دەکەم سەفەر کردنی من لەگەڵ تۆدا بۆ ئەو وڵاتانە بیروڕامی گۆڕیوە و ئیتر وەکو پێشوو لە بۆنی گایەکان و سەیرکردنی گابازی و دەنگی هاواری تەماشاچییەکان چێژ وەرناگرم. تەنانەت بە پێچەوانەی رابردووەوە حەز ناکەم بچم بۆ ماڵی خوا و ئەو قسانەی خەڵکی لە دەوروبەرمدا لە بارەی ئەم بابەتە دەیکەن لە گوێمدا وەک قسەی بێ واتای منداڵان وایە و یاری کردنی هاوڕێکانم نابێتە هۆی سەر گەرمیم و وەک ئەوە وایە کە ئەقڵی لەسەرم دەرکردبێ و ئەقڵێکی تری خستبێتە مێشکمەوە، وەک ئەقڵی ئەو گەلانەی کە من ئەوانم بینی. لەبەر ئەوە ئێستا بە تۆ دەڵێم دەستم بگرە و ئەگەرچی ئەمڕۆ دەتگوت حەزت لە ژنی قەڵەوەو من قەڵەونیم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا حەزدەکەم دەستم بگری.

وتم: مینا من لە گەنجێتیمدا پیاوێکی سادە بووم و ئارەزووم ئەوە بوو ببمە خاوەن ژن و منداڵ، تا کاتێک کە تووشی ژنێکی تەماحکار و بێ بەزەیی بووم و هەرچییەکی هەمبوو لێی سەندم. لەو رۆژە بەدواوە ئیتر من حەزم لە هیچ ژنێک نەکرد، چونکە نەفرەتی ژنان چووبووە ناو دڵمەوەو وام بیر دەکردەوە کە هەموو ژنە گەنجەکان وەک ئەو ژنەن، بەڵام لە دوای ئەوەی تۆم بینی و شارەزای ژیریت بووم و هەستم بەوە کرد کە زێڕ و پارە هیچ سەرنجت راناکێشێت، تێگەیشتم کە لە دنیادا هەندێ ژن هەیە کە پیاو بتوانێ بیکات بە خوشکی خۆی، بەبێ ئەوەی لەبەر زێڕ و پارە خۆی بکات بە خوشکی.

لەوکاتەوە لە دڵمدا خۆشەویستیی بێ دەسەڵاتەکان و هەژاران دروست بوو و نەخۆشە کەمدەرامەتەکانم چارەسەر دەکرد بەبێ ئەوەی داوای هەق دەستیان لێ بکەم و ددانی ئەو کەسانەی ئازاری ددانی هەبوو دەمکێشا بەبێ ئەوەی داوای



پارەکە بکەم چونکە کاتێک کە دەمبینی تۆ تا ئەو رادەیە بێ بایەخ دەڕوانیتە ماڵی دنیا بە خۆمم وت منیش دەبێ ماڵی دنیا لەلام بێ بەها بێت، بەڵام ئێستا کە تۆ دەتەوێ لێم جیاببیتەوە و بۆ خانووی خوای کریت بڕۆی من هەم لە خوایەکان بێزار بوومە و هەمیش لە مرۆڤ، چونکە دەزانم دوای رۆیشتنی تۆ روحی من وەک قەلەڕەشێکی رەش وایە کە لە بیابانێکی رووتدا بێت و هەمیشە هاودەمی پەژارە بێت.

بۆیە بە تۆ دەڵێم مینا.. لە جیهاندا وڵات زۆرە، بەڵام زیاتر لە رووبارێک نییەو ئەویش رووباری میسرە. رووبارەکانی تر ئاویان هەیە و ئاویان تێدا دەڕژێت، بەڵام وەک رووباری نیل ژیان نابەخشن. ئەم رووبارە بەبێ هیچ بەربەست و دیوارێک کە لە بەردەمیدا دروست بوو بێت زەوییە رەشەکانی میسر ئاودێری دەکات و ئەگەر تەماح و چاوچنۆکی خاوەن زەوییەکان بهێڵێت ئەوەندە بەروبووم لە کێڵگەکانی میسردا بە دەست خەڵکی دەکەوێت، کە هەرگیز دانیشتووانی وڵاتەکەی من ناتوانن ئەو هەموو خواردنە بخۆن. وەرە با بڕۆین و خۆمان بگەیەنینە کەناری رووباری نیل و لەوێ خانوویەک بکڕین و گوێ لە دەنگی مراوییەکانی ناو قامیشەڵانەکان بگرین و کەشتیی خوای ئاموون (مەبەست خۆرە – وەرگێڕ) ببینین کە بە ئاسماندا دەڕوات.

مینا وەرە و باقیی تەمەنمان بە ژیانێکی بێ خەم ببەینە سەرو کاتێ کە گەیشتینە میسر بە یەکەوە گۆزە دەشکێنین کە ببینە ژن و مێردی یەکتر و ئەو کاتە لە یەکتری جیا نابینەوە و لە دوای مردنمان، تەرمی من و تۆ مۆمیایی دەکەن و دەچینە سەرزەمینی رۆژئاوا و هەتا هەتایە لەوێ بەیەکەوە دەژین.

مینا بەدەستەکانی خۆی دەست و چاومی نەوازش کرد و وتی: سینۆهە من ناتوانم لەگەڵ تۆدا بۆ میسر یان وڵاتێکی تر بێم، چونکە هیچ کەشتییەک من لێرە دەرناکات و بەتایبەت لە دوای سەماکردنەکەی ئەمڕۆ هەموو خەڵکی دەزانن کە من دەبێ بچمە ناوخانووی خواوە و هەر کاتێ تۆ بتەوێت بەرهەڵستی چوونی

من بکەیت دەتکوژن و من دەبێ هەر چۆنێک بێت بچم بۆ ئەوێ و هیچ هێزێک لە جیهاندا نییە کە بتوانێ پێش لەم کارە بگرێت.

وتم: مینا کەس نازانێ سبەینێ چی روودەدات و لەوانەیە تۆ لەو شوێنەی کە هیچ کەسێ لێی نەگەڕاوەتەوە بگەڕێیتەوە و لەوانەیە دوای ئەوەی چوویتە ژوورەوە و کچێنییەکەت پێشکەش کرد بە رادەیەک هەست بە بەختیاری بکەیت کە ئەم جیهانە فەرامۆش بکەیت. بەڵام ئەوەندەی من بزانم ئەو شتانەی بە دەم خوایەکانەوە دەیڵێن هەمووی ئەفسانەیە و من هێشتا لە وڵاتە جیاجیاکان شتێکم نەبینیوە کە باوەڕم بەرامبەر بە خوایەکان بەهێز بکات. بۆیە ئەگەر تۆ لەوێ نەگەڕێیتەوە، من دێمە ناو ئەو خانووەوە و تۆ دەگەڕێنمەوە ئەگەر چی ئەم کارە ئاخرین کردەوەی من لە ماوەی ژیانمدا بێت و دوای ئەوە بمرم.

مینا دەستی خۆی خستە سەر دەمم و بە ترسەوە سەیری دەوروبەری کردو وتی: ئەم فکرە لەسەرت دەرکە، چونکە خانووی خوا تاریکەو هیچ کەسێ تەنانەت دانیشتووانی کریت ناتوانن بچنە ناو خانووەکەوە، مەگەر ئەو کەسانەی کە وەکو من هەڵبژێردراون، ئەگەر نا ئەوانی تر دەمرن، بەڵام من دەتوانم بە رەزامەندیی خۆم لەو خانووە بگەڕێمەوە. چونکە دەزانم خوایەکەی ئێمە بێ بەزەیی نییەو من بە زۆر لە ماڵی خۆیدا راناگرێت و ئەگەر بەتەمای گەڕانەوە بم رێگام پێ دەدات کە بێمەوە. ئەم خوایە زۆر جوانەو هەمیشە ئاگای لە دانیشتووانی (کریت)ە کە لە بەختەوەریدا بژین و بەهۆی چاکەی ئەوە کە لەم وڵاتەدا گەنم پێ دەگات و لە زەیتوون رۆن دروست دەبێت و کەشتییەکان لە بەندەرێکەوە بۆ بەندەرێکی تر دەڕۆن و تەمە چڕەکانی دەریا نابێتە هۆی نقوم بوونی کەشتییەکان.

هەرکەسێ پشت بە خوایەکەی ئێمە ببەستێ بەردەوام خۆشبەخت و شادمان دەبێت و من دڵنیام ئەم خوایە بەدبەختم ناکات و ئەگەر بزانێت کە بەتەمای گەڕانەوەم، رێگام لێ ناگرێت.



من تێگەیشتم کە مینا لە منداڵییەوە بەو شێوەیە پەروەردە کراوە و گەورەبووە و پێی وایە خوای کریت لە هەموو کەسێ بەهێزترە. بۆیە ناتوانێت بەشێوەیەکی تر بیربکاتەوە و ئەگەر من بمویستایە بە قسەکردن تێی بگەیەنم کە زۆربەی ئەو شتانەی لە بارەی خوایەکانەوە دەیڵێن ئەفسانەیە، نەیدەسەلماند.

من لە جیاتی ئەوەی هەوڵ بدەم گفتوگۆی لەگەڵدا بکەم دەستیم گرت و ئەو خۆی لێم دوور نەخستەوە و دەگریا و دەیگوت: سینۆهە، من دەزانم تۆ گومانت لە من هەیە و وابیردەکەیتەوە کە لە دوای ئەوەی چوومە ئەشکەوتەکەوە، لەوێ نایەمە دەرەوە و ناگەڕێمەوە بۆ لای تۆ، لەبەر ئەوە حەز ناکەم خۆمت لێ تەریک بکەم و ئەگەر ئارەزووت لێیە هەر چییەکت دەوێ بیکە.

وتم: مینا من پیاوێک نیم کە بەبێ رەزامەندیی تەواو، ژنێک بکەمە خوشکی خۆم، چونکە ئەم جۆرە چێژ وەرگرتنە یەک لایەنەیە و بۆ من لەزەتی نییەو هەر ئەوەندە کە تۆ ئەمشەو هاتوویتە لام، بۆ من بەسە و ئەگەر دەتەوێت شتێکم بدەیتێ، ئەو تەوقە زێڕینەی پرچتم پێ ببەخشەو من پێی رازیم.

مینا کاتێک کە ئەم قسەیەی بیست دەستێکی بەلەشی خۆیدا هێناو وتی: سینۆهە، ئایا لەبەر ئەوەی کە لەڕ و لاوازم حەزت لە من نییە؟ ئایا حەز دەکەی کە من لە ماوەیەکی کەمدا خۆم وەها قەڵەو بکەم کە بە بینینی قەڵەوییەکەم ترست لێ بنیشێ؟

وتم: نا مینا.. هیچ ژنێک لە دیدی مندا لە تۆ جوانتر نییە، بەڵام من نامەوێت لە خۆشەویستییەکەی تۆ کەڵکی ناڕەوا وەربگرم و ئەم کارە بە ناڕەوا دەزانم و لێی بێزارم. بەڵام دەتوانم پێت بڵێم کارێک بکەین کە ببێتە مایەی خۆشحاڵیی هەردووکمان.

مینا وتی: ئەو کارە چییە؟

وتم: من و تۆ گۆزەیەک بەدەستەوە دەگرین و دەیشکێنین و بەهۆی ئەم کردارەوە دەبینە ژن و مێرد. ئەگەرچی لێرە کاهینێک نییە کە ناومان لە کتێبی

پەرستگەدا بنووسێت، بەڵام بە پێی داب و نەریتی میسر کاتێک کە ژن و پیاوێک بە مەبەستی هاوسەرێتی گۆزەیەکیان شکاند دەبنە ژن و مێرد.

مینا پێکەنی و وتی: زۆر باشە، دە گۆزەیەک بهێنە با بیشکێنین.

من لە ژوورەکە چوومە دەرەوە تاکو بەندەکەم هەڵسێنم کەپێم وابوو خەوتووە و پێی بڵێم گۆزەیەک بهێنێت، بەڵام سەیرم کرد کاپتا لە پشت دەرگای هۆدەکەمەوە دانیشتووەو دەگرییێت و وتی: گەورەم من لە بەرئەوە دەگریەم چونکە جەرگێکی ناسکم هەیە و کاتێ کە بیستم ئەم کچە ئەندام باریکە لەگەڵ تۆدا قسە دەکات و تۆ وەڵامی دەدەیتەوە گریانم هات.

من تووڕە بووم و شەقێکم لێدا و وتم: کاپتا ئایا تۆ هەر چییەک کە لەم هۆدەیەدا وترا بیستت؟

کاپتا وتی: بەڵێ، چونکە ئەگەر من نەمبیستبایە خەڵکی تر دەیبیست.

وتم: خەڵکی تر چۆن گوێیان لە قسەکانی ئێمە دەبوو؟

کاپتا وتی: ئەمشەو چەند کەسێ هاتنە ئێرە کە مینا بخەنە ژێر چاودێرییەوە و جاسووسی بکەن، چونکە مینا لەبەر ئەوەی ناسراوە و هەموو دەزانن کە دەچێتە خانووی خواوە، ئێستا لە ژێر چاودێریدایە تاکو هەڵ نەیێت.منیش زانیم کە ئەگەر لە پشت دەرگای ژوورەکەتدا دانەنیشم ئەوان لێرە دادەنیشن و گوێیان لەو شتانە دەگرت کە پەیوەندیی بەوانەوە نییەو لەبەر ئەوە من لێرە دانیشتم بۆ ئەوەی خەڵکی نەتوانن گوێ لە نهێنییەکانت بگرن و دوای دانیشتنم لێرە بەبێ ئەوەی نیازی گوێ گرتنم هەبێت گوێم لە گفتوگۆکانتان بوو و لەبەر ئەوەی قسەکانتان منداڵانە و راست بوو گریانم هات، چونکە وەک پێم وتی جەرگی من ناسکەو زوو دەکەومە گریان.

من چیتر لە کاپتا تووڕە نەبووم و وتم: لەبەر ئەوەی گوێت لێبووە چیمان وتووە، برۆ و گۆزەیەک بهێنە.

کاپتا درێژەی پێداو وتی: چ جۆرە گۆزەیەکت دەوێ؟ ئایا گەورە بێت یان



بچووک؟ رەنگدار بێت یان بێ رەنگ؟

وتم: تۆ خۆت دەزانی کە هەموو گۆزەیەک بۆ ئەم کارە دەست دەدات، بە مەرجێ زوو برۆی گۆزەیەک بهێنی ئەگەرنا ناچارم دەکەی بە گۆچان بتنێرم.

کاپتا وتی: من دەمتوانی کاتێ کە گۆزەت ویست یەکسەر برۆیشتمایە و گۆزەیەکم بۆ بهێنایتایە، بەڵام بۆ ئەوە قسەم کرد کە تۆ دەرفەتی بیر کردنەوەت هەبێ، چونکە گۆزە شکاندن لەگەڵ ژن، کارێکی گرنگە و دەبێ بیری لێ بکەیتەوە و دوایی بڕیاری لەسەر بدەی، بەڵام لەبەر ئەوەی پێ دادەگری کە لەگەڵ ئەم ژنەدا گۆزە بشکێنی دەڕۆم و گۆزەیەک دەهێنم چونکە ناتوانم فەرمانەکانت جێبەجێ نەکەم.

دوایی رۆیشت و گۆزەیەکی هێنا کە بۆنی ماسیی لێ دەهات و دیار بوو کە ماسییان تێ کردبوو و لەبەردەم مندا دایناو من و مینا هەریەکە دەستێکی گۆزەکەمان گرت و بەرزمان کردەوە و دوایی دامان بە زەویداو شکاندمان.

لەدوای گۆزەشکاندنەکە کاپتا لەسەر زەوی دانیشت و قاچی مینای خستە بان سەری خۆی و وتی: لەمەودوا تۆ خانمی منی و وەک گەورەکەم دەتوانی فەرمانم پێ بکەیت و لەوانەیە لە سینۆهەش زیاتر کارم پێ بکەی، بەڵام هیوادارم لەکاتی تووڕە بووونتدا ئاوی کوڵاوم پیا نەکەی و پێڵاوی بێ پاژنە لە پێ بکەی بۆئەوەی لەو کاتەی تووڕە دەبی و دەیکێشی بەسەرمدا سەرم نەشکێ و نەئاوسێ. من لە هەموو کاتێکدا هەر وەکو وەفاداری سینۆهەم، لەگەڵ تۆشدا بەوەفا دەبم، چونکە نازانم لەگەڵ ئەوەشدا کە تۆ لەڕ و لاوازی بۆچی من خۆشم دەوێیت و پێم سەیرە چۆن گەورەکەم تۆی هەڵبژاردووە، چونکە ئەگەر من لە جیاتی گەورەکەم بوومایە، هەرگیز کچێکی ئەوها لەڕ و لاوازم نەدەکردە هاوسەری خۆم، بەڵام واهەست دەکەم کە لە دوای منداڵ بوون قەڵەو ببی و من بەڵێنت دەدەمێ وەکو چۆن لە گەورەکەم، کەم دەدزم، دزیی زۆر لە تۆش نەکەم.

کاپتا کاتێک کە قسەی دەکرد وەها تێکچوو بوو کە کەوتە گریان و مینا

ماوەیەک دەستی بەسەر و گەردنیدا هێناو وتی: مەگری. منیش پێم وت: کەرتە گۆزە شکاوەکان کۆبکەرەوەو بیبەرە دەرەوە.

ئەو شەوە من و مینا وەکو رابردوو لەتەنیشت یەکەوە راکشاین بەڵام من نەمویست سوود لە مافی هاوسەرێتییەکەم وەربگرم و وەکو برایەک کە دەچێتە لای خوشکەکەی خۆی کەڵکی لێ وەربگرم چونکە دەمزانی کە مینا لە هاودەمێتیی من خۆشحاڵ نابێت و من نەفرەتم لەو خۆشحاڵییە یەک لایەنەیە بوو.

ڕۆژی دوای ئەوە مینا وەک ڕۆژی پێشوو لەبەردەم گایەک سەمای کردو هیچ ڕووداوێکی خراپ ڕووی نەدا، بەڵام کوڕێکی گەنج کاتێک کە خەریکی سەماکردن بوو، بازی دایە سەرگایەک کە بچێتە سەر پشتی و کەوتە سەر زەوی و گایەکە بە شاخەکانی کوشتی.

تەماشاچییەکان کاتێک کە ئەم ڕووداوەیان بینی هەڵسان و هاواریان کردو من بۆم دەرکەوت کە لە خۆشیدا هاوار دەکەن، نەک لەوەی پێیان ناخۆش بێت.

دوایی گایەکەیان لەو گەنجە دوورخستەوەو خەڵکی دەورەیان لە لاشەکەی داو ژنەکان دەستیان بە خوێنی کوڕەکە سوور دەکردو گوێم لێ بوو کە دەیانگوت تەماشاکردنێکی خۆش بوو و، پیاوەکان دەیانگوت ماوەیەکی زۆرە وەک ئەمڕۆ شتی دیدەنیمان نەبینیبوو.

دوایی ژن و پیاوەکان بەرەو ماڵەکانی خۆیان ڕۆیشتنەوە و ئەو شەوە چراکانی بەندەر و ناوشار لە شەوەکانی تر زیاتر هەڵکرابوون، چونکە ژن و مێردەکان ئەو شەوەیان کردە جەژن و ئەم جۆرە خۆشگوزەرانییە لە کریت باو بوو. ئەم رابواردنە تەنیا بە بۆنەی گابازییەکەی ئەو ڕۆژەو مردنی یەکێک لە گابازەکان نەبوو، بەڵکو لەبەر ئەوەی ژن و پیاوەکان دەیانزانی کە لەو شەوەدا کچێکی جوان دەچێتە خانووەکەوە شادییان دەکرد.

من بە پێچەوانەی ئەو خەڵکە لەو شەوەدا تەنیا بووم، چونکە دەمزانی کە



مینا لەو شەوەدا بە سواری گالیسکەیەکی زەرد بەرە و خانووی خوا دەڕوات و هاوڕێکانی بە سواری کەژاوە، یان بە پێ لە دوایەوە بە خۆشی و پێکەنین دەڕۆن.

من لەبەر ئەوەی دەمزانی کە دەبێ لە دوای میناوە بڕۆم، سەر لە بەیانی ئەو ڕۆژە کەژاوەیەکم بۆ ئەو مەبەستە بەکرێ گرت و کاپیتاش لەبەر ئەوەی دڵی بە میناوە بوو، وتی لەگەڵتدا دێم و لە ڕێگا لە نێوان شار و ئەشکەوتەکەدا هەموو شادمان بوون، جگە لە من، چونکە دەمزانی کە لەوانەیە ئیتر مینا نەبینمەوە.

کاتێک لە خانووی خوا نزیک بووینەوە هەموویان بێدەنگ بوون و لە ڕووناکیی مانگدا لەو شوێنە وردبوومەوە کە بزانم چۆنە. لە خانووەکەدا جگە لە دەرگاکانی هیچی ترم نەبینی، دوو دەرگای حەوجۆش (مەفرەغ)ی گەورە و قورسی یەک لە دوای یەکی لێ بوو و بۆ ئەوەی ئەو دەرگایانە بکەنەوە مینایان بردە ناو پەرستگەیەک کە لە نزیک خانووی خوایەکەیان بوو و ئەوانەی لەوێ بوون پێیان وتم ئەو پەرستگەیە شوێنی نیشتەجێ بوونی پاسەوانەکانی خانەی خوایە.

کاتێک کە مینا چووە ناو پەرستگەوە کراسی لەبەردا بوو و لە دوای کاتژمێرێک کە لەو پەرستگەیە دەرچوو بینیم کراسی لەبەردا نییە و ڕووتە، بەڵام پرچی سەری بە پەڕۆیەکی سپی وەک تۆڕ بەستبوو.

مینا لە دوورەوە سەیرێکی کردم و بزەخەنەیەکی هاتێ، بەڵام هەستم کرد کە بزەی سەر لێوی لە ناچارییەو بۆ دڵدانەوەی منە، ئەگەرنا مینا خۆشحاڵ نییە تا پێبکەنێ. هەروەها بینیم لە دوای دەرچوونی مینا لە پەرستگەکە کاهینە گەورەکەی کە سەری گای بەسەر خۆیدا کردبوو و دەم و چاوی نەدەبینرا، شمشێرێکی بە قەدیەوە کردبوو و لە تەنیشت میناوە دەڕۆیشت.

لە نێوان بێدەنگیی خەڵکی، کاهینە گەورەکە و مینا گەیشتنە دەرگای خانووەکە و پاسەوانەکانی پەرستگە ئەو دەرگایەیان کردەوە کە بۆ کردنەوە و

داخستنی هێزی بیست نەفەری دەویست. دوایی دەرگای دووەمیان کردەوە و لەوێدا یەکێ لە پاسەوانەکان مەشخەڵێکی هەڵکرد و دایە دەست میناو دوایی کاهینە گەورەکە و مینا چوونە ناو دالآنێکی گەورەوە، کە وادیار بوو دوور و درێژە و پاسەوانەکان هەردوو دەرگاکەیان داخست.

بینینی ئەو دیمەنەو لەبەر چاو ون بوونی مینا لەو جێگایە ئەوەندە خەم هێنەر بوو کە نەمتوانی بەپێوە بوەستم و لەسەر ئەو گیایەی لەبەردەم خانووەکەدا شین ببوو کەوتمە سەر ئەژنۆ و دەم و چاوم خستە سەر گیایەکان و لەگەڵ ئەوەشدا کە مینا بەڵێنی پێدابووم کە لەو خانووە بگەڕێتەوە و لەگەڵ مندا بژێت، بەڵام دەمزانی کە هەرگیز نایبینمەوە.

تا ئەو کاتەی کە مینام لێوە دیار بوو ئومێدم هەبوو کە بیبینمەوە، بەڵام لە دوای ئەوەی کە بینیم دەرگا قورسەکانیان لە دوایەوە داخست، زانیم کە نابێ بە هیوابم ئەو کچە ببینمەوە.

کاپتا لە تەنیشت منەوە لەسەر گیایەکە دانیشت و دەینالآند، چونکە ئەویش هەستی کردبوو کە ئیتر مینا نابینێتەوە، بەڵام هاوڕێکانی مینا کە لەگەڵیدا هاتبوون و تا ئەو کاتە بێدەنگ بوون، هەر ئەوەندە دەرگای خانووەکە داخرا، وەک ئەو کەسانەی کە لە ناکاودا تووشی شێتی ببن مەشخەڵەکانیان هەڵکرد و سەری گۆزەکانیان کردەوە و هەندێکیان خواردەوە، هەرئەوەندە کەمێک لەشەو تێپەڕی، لەبەر رووناکیی مانگ و رۆشنایی مەشخەڵەکان کەوتنە سەماکردن و ئەو سەمایە ئەوەندە گەرم و سەرسوڕهێنەر بوو کە من تا ئەو شەوە هاوتای ئەوەم لە هیچ ولآتێکدا نەبینیبوو هەر ئەوەندە سەریان گەرم بوو ئیتر ژن و پیاوەکان خۆیان رووت کردەوەو بێشەرمانە ئەو ئەندامانەی کە دەبێ داپۆشرێ نیشانی ژن و پیاوەکانی تریان دەدا.

کاپتا کاتێک کە بینیی هەموو خەریکی سەماکردنن هەڵساو رۆیشت و دوای چەند ساتێ بە گۆزەیەکی شەرابەوە گەڕایەوە. من دەمزانی گۆزەکەی لەناو



کەژاوەکەوە هێنابوو، چونکە بەر لەوەی لە شارەوە بەڕێ بکەوین پێیان وتبووین کە لە ماڵی خوا و لە پەرستگەکە هیچ خواردن و خواردنەوەیەکی لێ نییەو ئێمە دەبێ خواردن و خواردنەوەی خۆمان لە شارەوە ببەین و کاپتا چەند گۆزەیەکی خواردنەوەو هەندێ نانی لە شار کڕیبوو و لە ناو کەژاوەکە دایانابوو.

کاتێک کە گۆزەکەی هێنا وتی: سینۆهە ئێستا منیش هێندەی تۆ خەمبارم، چونکە منیش وەکو تۆ هەست دەکەم کە ئەو کچە نابینمەوە، بەڵام چونکە من و تۆ لەم کاتەدا بۆ بینینی ئەو هیچمان پێ ناکرێت باشتر وایە کە بنۆشینەوە و خەم لە ناو ببەین.

بەڵام من نەمتوانی بنۆشمەوە و وەک ئەو ژن و پیاوانەی کە شێتانە لەو ناوەدا سەمایان دەکرد خۆشحاڵ بم. بەڵام رێگام لە خواردنەوەی کاپتا نەگرت، چونکە دەمزانی کەمێک خواردنەوە بەسوودە و توانا دەبەخشێتە ئەو پیرەمێردە.

مەشخەڵەکان هەڵکرابوون و مانگ دەدرەوشایەوە و ژن و پیاوەکان بەبێ ئەوەی بایەخ بەوانی تر بدەن، لە مەشخەڵەکان دوورکەوتنەوەو کە وەکو خوشک و برا(واتە ژن و مێرد) لەگەڵ یەکتریدا کۆببنەوەو من بیرم دەکردەوە کە ئێستا مینا لە کوێیە و چی دەکات.!

لە ناکاودا کاپتا وتی: سینۆهە... لەبەر ئەوەی من هێشتا زۆرم نەنۆشیوەتەوە، چاوەکانم هەڵە ناکەن کە بڵێم بەهۆی سەرخۆشییەوە شتی لێڵ دێتە بەرچاوم.

وتم: کاپتا چی دەڵێی؟

بەندەکەم وتی: دەمەوێت بڵێم ئەو پیاوەی شمشێرێکی بە پشتەوە بوو و دوو شاخ لە سەری رووابوو و لەگەڵ مینادا چووبووە ژوورێ، لەوێ هاتە دەرەوە، لە کاتێکدا کە دەرگای خانووەکە نەکراوەتەوە و ئەمە بابەتێکە شایانی بیرکردنەوەیە.

من سەیرێکی دەوروبەرم کرد و کاهینی گەورەم بینی و سەیرم کرد وەکو

خەڵکی خەریکی سەماکردنە. لە کاپتام پرسی: ئایا تۆ دڵنیایت کە ئەو لە دەرگای ئەشکەوتەکەوە نەهاتە دەرێ؟

کاپتا وتی: کاتێک کە تۆ سەرت خستبووە سەر زەوی و ناڵە ناڵت دەکردو دەگریای، من یەک چرکەش چاوم لە دەرگای خانووەکە هەڵنەگرت، چونکە چاوەڕوان بووم کە مینا لەوێ بێتە دەرەوە، بەڵام لەناکاو بینیم شاخە زەرد ڕەنگەکانی ئەم پیاوە لە ڕۆشنایی مەشخەڵەکاندا دەدرەوشایەوەو لەبەر ئەوەی دەرگای ئەشکەوتەکە نەکرابووەوە، بە خۆمم وت دیارە خانووی خوا جگە لەو دەرگا گەورانەی کە ئێمە دەیبینین ڕێگای تری هەیە کە ئەم پیاوە لەوێوە هاتۆتە دەرەوە.

من هەڵسام و بەرەو کاهینی گەورە ڕۆیشتم و دەستیم گرت و وتم مینا لە کوێیە؟

کاهینەکە ئەوەندە لەم قسەیەی من تووڕە بوو کە بە توندی سەری گایەکەی لە دەم و چاوی کردەوە و وتی: ئەگەر تۆ هاووڵاتییەکی (کریت) بوویتایە و لەم کاتەی کە ئێمە خەریکی سەماکردنین ئەم پرسیارەت بکردایە و سەماکەمانت لێ تێک بدایە، فەرمانم دەدا لە بان تاشە بەردەکانەوە فڕێت بدەنە ناو دەمی (ئەختوپوت)ەکانەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی پیاوێکی بیانیت و ڕێ و ڕەسمی ئێرە نازانی چاوپۆشی لە بە سزا گەیاندنت دەکەم.

پێم وت: مینا لە کوێیە؟ وەڵامم بدەوە، پێم بڵێ بۆ کوێت برد؟

کاهینەکە وتی: من مینام بردە ناو خانووی خواوەو ئەوم لە تاریکیی ئەشکەوتەکەدا بەجێ هێشت و گەڕامەوە کە لەم سەمایە بەشداربم. بەڵام تۆ هەقت بەسەر میناوە چییەو بۆچی سۆراغی دەپرسی؟ لە کاتێکدا کە من پاداشتی ماندووبوونەکەی تۆم داوەتەوە و دیاریم بۆ ناردوویتە میوانخانەکە، چونکە مینات بۆ گەڕاندبووینەوە.

وتم: ئەی کاهینی گەورە چۆنە کە تۆ لە خانووی خوا هاتوویتە دەرەوە، بەڵام



(مینا)ت لەگەڵدا نییە؟ چونکە میناش دەیتوانی لەو ڕێگایەی کە تۆ لێی هاتوویتە دەرەوە بهاتایەتەوە.

کاهینەکە وتی: ئەی پیاوی میسری، تۆ زۆر قسە دەکەی وخۆت لەو کارانەی کە پەیوەندیی پێتەوە نییە هەڵدەقورتێنی و بۆ دوایین جار پێت دەڵێم واز لەم لێکۆڵینەوانە بهێنە، ئەگەرنا دەرخواردی ئەختوپوتەکانت دەدەم.

من تووڕە بووم و وتم: ئەم کارە پەیوەندیی بە منەوە هەیەو من دەبێ بزانم کە مینا لە کوێیەو چۆن تۆ لێی جیابوویتەوە و لە کوێ بە جێت هێشت و گەڕایتەوە؟

بەڵام لەم کاتەدا کاپتا دەستی گرتم و لە کاهینەکە دووری خستمەوەو وتی: گەورە خەمبارەکەم مەگەر تۆ شێت بوویت کە لەگەڵ ئەم پیاوە شاخدارەدا لە ناو ئەم هەموو ژن و پیاوە دەنگە دەنگ دەکەیت و سەرنجی هەموویان بۆ لای خۆت ڕادەکێشی؟

دوایی چرپاندی بە گوێمداو وتی: تۆش وەک ئەمان سەما بکەو شادی دەربڕە و بۆ ئەوەی کاهینی گەورە فریو بدەی وەک ئەم خەڵکە بچۆرە ناو قەرەباڵغییەکەوەو کارێک بکە کە وا بزانن تۆ بەراستی شادمانی.

وتم: من ئەم کارە ناکەم و بە درۆ خۆم خۆشحاڵ نیشان نادەم و حەز ناکەم سەرنجی کەس رابکێشم، بەڵکو ئەگەر ئەم پیاوە پێم نەڵێ مینا لە کوێیە و چۆن دەکرێ بگەمە لای ئەو بەم کێردە ئاسنەی لە وڵاتی (هاتی) دەستم کەوتووە دەیکوژم و ئەم کێردە ئەوەندە تیژە کە کاتێک بچێتە ناو لەشی یەکێکەوە تا دەسکەکەی دەچێتە خوار.

کاپتا وتی: وسکت بە... وسکت بە... وەرە بڕۆین کەمێ خواردنەوە بنۆشە، چونکە چاوەکانت بەم شەوە وەک چاوی کوندەبەبوو لە تاریکیدا بریقە دەداتەوەو دەبێ بنۆشیتەوە بۆ ئەوەی تووڕەییەکەت هێور بکاتەوە و ئەگەر بە قسەم بکەی و کەمێ بنۆشینەوە پێت دەڵێم کە لە چ ڕێگایەکەوە دەتوانی بگەیتە مینا. چونکە

رێگای هاتنە دەرەوەی ئەم پیاوەم دۆزیوەتەوە.

کاپتا منی لە نێوان ئەو ژن و پیاوانەی سەمایان دەکرد هێنایە دەرەوەو لە بان گیایەکان لەسەر زەوی داینیشاندم و کەمێ شەرابی دەرخوارد دام و من هەستم کرد کە ناتوانم بەخەبەر بمێنمەوە و دەبێ بنووم و لەبەر ئەوەی ئەم خەوە نائاسایی بوو، بۆم دەرکەوت کە کاپتا تریاکی خستبووە ناو شەرابەکەوە و تۆڵەی رووداوەکەی بابلی لێ کردبوومەوە. بەڵام ئەگەر لەوشەوەدا کاپتا تریاکی تێکەڵی شەرابەکە نەکردایەو دەرخواردمی نەدایە، من کاهینی گەورەم دەکوشت و دانیشتووانی کریتیش منیان دەرخواردی ئەختوپوتەکان دەدا، یان بە شێوەیەکی تر دەیانکوشتم و کاپتا لەو شەوەدا گیانی منی رزگار کرد.

کاتێک کە لە خەو هەڵسام، روانیم رۆژەو خۆر هەڵهاتووە و من لەسەر گیایەکان راکشاوم. سەرم بەرزکردەوە و سەیرێکی دەوروبەرم کرد و بینیم ژن و پیاوەکان بەرووتی لەسەر گیایەکە کەوتبوون. چونکە دوێنێ شەو تا بەیانی خەریکی نۆشین و سەما کردن ببوون و ماندوێتی لە پێی خستبوون.

دوای ئەوەی خۆر بەرز بووەوە و گەرمای خۆر ژن و پیاوەکانی لەخەو هەڵساند، ژنەکان پرچی خۆیان رازاندەوە و بەرە و دەریا رۆیشتن کە خۆیان بشۆن، بەڵام لەبەر ئەوەی راهاتبوون کە لە گەرماوەکانی ماڵەوەدا خۆیان بشۆرن، هەر کە هەنگاویان دەخستە ناو دەریاوە، دەگەڕانە دواوەو نەیاندەتوانی لە ناو ئەو ئاوە ساردەدا خۆیان راگرن.

دوای ئەوەی ژنەکان بە هاوکاریی یەکتری خۆیان رازاندەوەو ژاکاوییەکەیان نەهێشت، پرسییان: ئێستا کێ لە چاوەڕوانی مینادا دەمێنێتەوە و کێ دەگەڕێتەوە بۆ شار؟

هەندێ لە ژنەکان وتیان دەگەڕێینەوە بۆ شار و بەرێکەوتن و گەڕانەوە، بەڵام دەستەیەک لە ژنەکان کە گەنجتر و هاوتەمەنی مینا بوون، وتیان ئێمە چاوەڕوان دەبین تا ئەو بگەڕێتەوە. هەندێ لە ژنە گەنجەکان کە بەتەمای مانەوە بوون لەوێ



مانەوەو هەر یەکەیان دەیوت کام پیاو ئامادەیە بمێنێتەوەو یەکێک لەپیاوەکان ئامادەیی خۆی دەربڕی کە بمێنێتەوە و ئەو ژنە بەتەنها نەمێنێتەوە. من لە سەرەتادا تێنەگەیشتم کە ئەمانە بۆچی لەوێ کۆبوونەتەوە و دوایی بۆم دەرکەوت کە بۆ چی هەر ژنێک لەنێوان پیاوەکاندا یەکێکیان بانگهێشت دەکات و زانیم کە ئەگەر ژنەکان هەندێکیان دەعوەت نەکەن، هەموو پیاوەکان دەگەڕێنەوە بەرەو شارو ئەوان(ژنەکان) بەتەنیا دەمانەوە.

لە نێوان ئەو وڵاتانەی کە من تا ئەو کاتە بینیبووم کریت تاکە وڵاتێک بوو کە ژنەکان بۆ ئەوەی سەرنجی پیاوەکان بۆ لای خۆیان رابکێشن دەبوایە ئەم رێگەیەیان بەکار بهێنایە. لە مەیدانی گابازییەکەش سەرنجم دابوو کە ژن و پیاوەکان کاتێک کە بە رووتی لەبەردەم گایەکاندا سەما دەکەن، خەڵکی زیاتر بۆ هونەری گابازییەکەیان خۆشی دەردەبڕن و لەگەڵ ئەوەشدا کە کوڕێک یان کچێکی جوان سەرنجی خەڵکی رادەکێشا، بەڵام وەک وڵاتانی تر نەبوو و هۆیەکەشی ئەوە بوو کە لە کریت ژن و پیاوەکان لەرابواردن لەگەڵ یەکتری دا ئازاد بوون.

کاهینی گەورە لەو پیاوانە بوو کە دەیویست بگەڕێتەوە بۆ شار و من لێیم پرسی: ئایا دەتوانم لێرە بمێنمەوە تا ئەو کاتەی مینا لە خانووی خوا دێتە دەرەوە؟

کاهینی گەورە وتی: هیچ کەس رێگا لە مانەوەت ناگرێت، بەڵام مانەوەی تۆ لێرەدا بێ سوودە، چونکە تا ئێستا رووی نەداوە کە کەسێ بچێتە ماڵی خوا و دوایی بگەڕێتەوە.

من خۆم لە گێلی داو وتم: ئەی کاهینی گەورە، من حەزم بە گەڕانەوەی مینا نییە و نامەوێت بیبینم، بەڵکو ئەم بابەتە بەهانەیەکە بۆ ئەوەی لێرە بمێنمەوە و بە رابواردن لەگەڵ ئەم ژنە جوانانە، خۆم سەرگەرم بکەم. چونکە تەنیا زەوی و ئاسمانی (کریت)ـە کە بوونەوەری ئەوها لەش ساغ و جوان دەهێنێتە کایەوە.

هەروەها ئەگەر شەوی رابردوو قسەی توندم بەرامبەرت کرد، داوای لێبووردن دەکەم، چونکە شەوی رابردوو مەست بووم و نەمدەزانی چی دەڵێم و چی دەکەم و لەگەڵ کێدا گفتوگۆ دەکەم. بەڵام ئێستا، کە هاتوومەتەوە هۆش دەزانم کە رەفتاری دوێنێ شەوی من زۆر ناپەسەند بووە.

ئەم قسانە کاری لە کاهینی گەورە کردو دەستی بەسەرمدا هێناو بزەیەکی هاتێ و وتی: زۆر باشە لەبەر ئەوەی حەز دەکەی لەگەڵ ژنەکاندا رابوێری، لێرە بەو من رێگا لە مانەوەت ناگرم، بەڵام وریابە ژنەکانی ئێمە سکیان لەتۆ پڕنەبێ چونکە لەبەو ئەوەی تۆ بیانیت باش نییە ژنەکانی ئێمە لەتۆ دووگیان بن و لێرە ئەوەندە چاوەڕوان بە هەتا مینا دەگەڕێتەوە.

وتم: ئەی کاهینی گەورە من لە بارەی ژنەکانەوە پیاوێکی کەم ئەزموون نیم، چونکە لە سووریاو بابل بینیم کە چۆن کچە گەنجەکان دەچوونە پەرستگە بۆئەوەی جەهازی بووکێنیی خۆیان کۆبکەنەوە...

من بە شێوەیەک بەسادەیی دەدوام، کە کاهینەکە وابزانێت من پیاوێکی دەبەنگم و منیش خۆم مەبەستم ئەوە بوو و دەمویست کە ئەو بە پیاوێکی نەفامم بزانێت بۆ ئەوەی بڕیار نەدات لەوێ دوورم بخەنەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا کاتێک کە کاهینی گەورە بەرەو شار گەڕایەوە، هەستم کرد کە پاسەوانەکانی پەرستگەی راسپارد کە ئاگاداری من بن.

هەروەها دیاربوو بە ژنەکانی وتبوو گاڵتەو گەفم لەگەڵدا بکەن، چونکە کاتێک کە رۆیشت کۆمەڵێ لەو ژنانە لە دەورم کۆبوونەوەو داوایان لێ کردم لەوێ دووركەوینەوەو لەگەڵیاندا بم و بەیەکەوە بخۆین و بخۆینەوە. من بەدەم بانگهێشتەکەیانەوە چووم و بەیەکەوە چووینە ناو بێشەیەکەوەو ئەو کاتە بۆم دەرکەوت کە ژنەکانی کریت چەند سووکن، چونکە هیچ شەرمیان لە من نەدەکرد و گاڵتە و گەفی ناشیرینیان دەکرد کە لە شاری (**تەبەس**) یش کە گەورەترین شاری دنیایە لە ناو مەیخانەکانیدا ئەو کردارانە نەدەکرا، لە کاتێکدا کە من



دڵنیابووم ئەو ژنانەی کە منیان بۆ ناو بێشەکە برد، هەموویان لە بنەماڵە ناودارەکانی کریت بوون و کاتێک کە بینیم ژنەکان زۆر ئازارم دەدەن و حەزیشم بە هاودەمێتیی رابواردن لەگەڵ هیچیان نەبوو، خۆم وا نیشاندا کە سەرخۆشم و خەوم لێ کەوتووە و ئەوان بە رقەوە لێم دووركەوتنەوە و وتیان: ئەم بیانییە پیاوێکی کێوییە، ئەگەر نا ئەوەندە بەبێ بایەخی رەفتاری لەگەڵ نەدەکردین.

کاپتاش هات کە من لەوێ دەربکات و پێی وتم: تۆ کە ناتوانی خۆت بۆ سەرخۆشی بگری بۆچی ئەوەندە زۆرت خواردۆتەوە کە لە پێ بکەوی؟

ژنەکان کە بەندەکەی منیان بینی و روانیانە سکە زلەکەی، دەستیان بە گاڵتەوگەف و پێکەنین کرد و لێی نزیک بوونەوەو ئەگەرچی بەندەکەی من ناشیرین بوو و یەک چاوی هەبوو، بەڵام لەبەر ئەوەی بە بیانی لەقەڵەم دەدرا هەستی ژنەکانی دەبزواند کە بیدوێنن و شتی لێ بپرسن. چونکە ژنەکان لە هەموو وڵاتێ، کاتێک کە بیانییەک دەبینن لەبەر فزولی هەوڵ دەدەن لێی بکۆڵنەوە. ژنەکان کاپتایان لەگەڵ خۆیاندا بۆ ناو بێشکەکە برد.

من لەبەرئەوەی دەمزانی کە لەوانەیە مانەوەم درێژە بکێشێ هەڵگرەکانی کەژاوەکەم ناردن بۆ شار کە ئازووقەو خواردنەوە بکڕن و لەگەڵ خۆیاندا بیهێنن و بەتایبەتی زیاتر خواردنەوە بکڕن، کە هەم خۆیان بینۆشنەوە و هەم ئێمەش سوودی لێ وەربگرین.

ئەو رۆژە ئەوانەی لەوێ بوون، کاتەکانیان بە خواردن و نۆشینەوە و رابواردن بردەسەر و من تێگەیشتم کە ئەوان زۆر زوو لەم کارە ماندوو بوونە، چونکە رابواردنێک کە ملکەچی یاسایەک و سنوورێک نەبێت، زووتر لە کار و ژیانی رێک و پێک مرۆڤ ماندوو دەکات.

شەوی دوایی تا بەیانی ژن و پیاوەکان خەریکی سەما و گۆرانی وتن بوون و تا بەیانی گوێم لە هاوار و پێکەنینیان بوو و کاتێک کە خۆر هەڵهات هەموویان لە تاو ماندوێتی نووستن و لە دوای ئەوەی کە هەڵسان هەندێکیان گەڕانەوە

شارو تەنیا ئەو کەسانە مانەوە کە لەبەر تەمەڵیی رابواردن تێرنەبوون. بەڵام ئەم کۆمەڵەش رۆژی سێـیـەم گەڕانەوە شار و هەندێکیان لەتاو خۆشگوزەرانی و رابواردن و خـــواردنەوە و نەنووســـتنیـــان، نەیاندەتوانی بەرێدا بڕۆن و من کەژاوەکەی خۆم داپێیان کە ئەوان بباتەوە بۆ شار و هەڵگرەکانی کەژاوەکەشم روخسەت دا و پێیانم وت هیچکە پێویستیم بە کەژاوە نییە.

لە رۆژی دووەمـــەوە کـە بەندەکـانی کـەژاوەکـە خـواردنەوەیەکی زۆریان بۆ هێنابووم، هەمـــوو شـــەو و رۆژێ دووجـــار بەشـــەو و رۆژ شـــەرابم دەدایە پاسەوانەکانی پەرستگە، بۆ ئەوەی بیانکەمە هاورێ و دۆستایەتیان بۆ لای خۆم رابکێشم. لە رۆژی سێیەمدا کە کەس لەوێ نەما، پاسەوانەکان مانەوەی منیان پێ سەیر بوو و هۆی سەرسوڕمانەکەشیان ئەوەبوو کە دەیانزانی ئەو کچەی چووەتە خانووی خواوە هەرگیز لەوێ نەگەڕاوەتەوە.

ئەوان دەیانزانی کە هەموو دانیشتووانی دورگەی (کریت) ئەم بابەتە دەزانن و خۆیان بەگەڕانەوەی ئەو کچەوە مەحتەل ناکەن کە چووەتە ماڵی خوا، بەڵام من لەبەر ئەوەی بیـــانیـــیـــەک بووم، ئەوان وایان دەزانی کـــەلە داب و نەریت و بارودۆخی ئەوێ بێ ئاگـام و لەبەر ئەوە لە دوای رۆیشتنی ئەو خەڵکە من هەر لەوێ ماومەتەوە.

***

# چوونە ژوورەوەی
# من و بەندەکەم بۆ خانەی خوا

کاتێک کە شەو داهات دوو گۆزەی گەورەی شەرابم بۆ پەرستگەکە برد، کە تریاکم کردبووە ناوی. پاسەوانەکان کاتێک کە گۆزەکانیان بینی، بەخۆشحاڵییەوە لەدەوری کۆبوونەوە و دەستیان بە خواردنەوەی شەرابەکە کرد و من لە پەرستگەکە دوور کەوتمەوەو کاپتام بردە کەنارێک و وتم: خوایەکان ویستوویانە کە من و تۆ لە یەکتر جیابینەوەو لەبەر ئەوەی مینا لە خانەی خوا نەگەڕاوەتەوە، من دەبێ بڕۆم و بیدۆزمەوە و لەوێ بیهێنمە دەرەوەو، لەبەر ئەوەی ئەو کەسانەی کە چوونەتە ژوورەوە نەگەڕاونەتەوە، لەوانەیە منیش کە بۆ هێنانەوەی مینا بۆ ئەم خانەیە دەڕۆم نەگەڕێمەوە و ئەگەر تا سبەینێ بەیانی نەگەڕامەوە، تۆ بگەڕێوە شار و بۆ دیار نەمانی من هەر بەهانەیەک دەدۆزیتەوە بیدۆزەوە، چونکە دەزانم تۆ لە درۆ کردن و بەهانە دۆزینەوە کارامەی و دەتوانی قەناعەت بە خەڵک بکەی. بۆ نموونە بڵێ لە شاخەوە بەربۆتەوە و بووە بە خۆراکی ئەختوپوتەکان یان بڵێ لە دەریادا خنکاو ئاو لاشەکەی بردە ژێر دەریاوە، یان شتێکی تر.

من لەوحەیەکی خاکی ڕۆسم بۆ نووسیوی و مۆری خۆمم لێ داوە و لە دوای ئەوەی گەڕایتەوە ئەزمیر دەتوانی زێڕ و پارەکەی من لە خانە بازرگانییەکان وەربگریتەوە یان بەناوی خۆتەوە بیخەیتە کار و ئەگەر حەز دەکەی خانووەکەم لە ئەزمیر بفرۆشە و بەو زێڕ و پارەیەی کە دەستت دەکەوێ بگەڕێوە بۆ میسر و ئەگەریش لەوە دەترسی کە لە میسر بە تۆمەتی بەندەیەکی هەڵهاتوو دەستگیرت بکەن، ئەوە لە ئەزمیر بمێنەوە و بە قازانجی زێڕ و پارەکەی من، کە بە تۆ دەگات



بە ئاسوودەیی ژیان ببەرەسەر و خەمی مۆمیایی کردنی لاشەی منت نەبێ، چونکە ئەگەر من نەتوانم مینا بدۆزمەوە لەلام گرنگ نییە لە جیهانی ڕۆژئاوادا چۆن بژیم و لاشەکەم مۆمیایی بکرێ یان نا.

کاپتا تۆ لەگەڵ ئەوەشدا کە بەندەیەکی زۆر بڵێ بوویت و هەندێ جار گرفتت بۆ دروست دەکردم، بەڵام من هەمیشە تۆم خۆش دەویست و ئەگەر هەندێ جار بە گۆچان دارکاریم دەکردی لەبەر مەسلەحەت و قازانجی خۆت بووە و دەمەویست بەباشی پەروەردە بکرێی و لەگەڵ ئەوەشدا بۆ ئەو گۆچانانەی کێشاومە بە شان و پشتتدا، داوای لێ بووردنت لێ دەکەم.

کاپتا کەمێ بێدەنگ بوو و دوایی وتی: گەورە ئازیزەکەم ئەگەر چی لێدانی گۆچانەکەت هەندێ کات بەهێز بوو، بەڵام من رق و کینەم لە دڵدا نییە، چونکە وەکو خۆت دەڵێی لەبەر چاکە لە منت داوەو من دەمبینی لەگەڵ ئەوەشدا کە تۆ لێت دەدام، بەڵام زۆربەی کاتەکان وەک هاوڕێیەک ڕەفتارت لەگەڵدا دەکردم و لە کارەکانتدا سوودت لە بیرۆکەکانی من وەردەگرت. بەشێوەیەک کە هەندێ جار هەستم نەدەکرد کە من بەندەی تۆم، بەڵکو تۆم بە دۆستی خۆم دەزانی، تا ئەو کاتەی لێدانی گۆچانەکەت بەرشانم دەکەوت و ئەو کاتە تێدەگەیشتم کە خوایەکان جیاوازییان دروست کردووە لە نێوان بەندە و گەورەکەی و ئێستا دەبینم کە تۆ دەتەوێ بۆ هێنانەوەی مینا کە چووەتە ئەشکەوتەکەوە بچیتە خانەی خواوە، بەڵام ئەم مینایەی تۆ دەتەوێ بچی بیدۆزیتەوە خانمی منیشە و قاچی خۆی خستۆتە بان سەرم و منیش دەبێ بۆ دیتنەوەی کارێک بکەم و ئەگەر مینا خانمی من نەبوایە ئەرکی من نەبوو کە بە شوێنیدا بگەڕێم. بەڵام ئەگەر ئەوهاش نەبوایە، هەر نەمدەهێشت تۆ بە تەنهایی بچیتە ناو ئەشکەوتەکەوە ،چونکە خانەی خوا جێیەکی تاریکەو لەو تاریکخانەیەدا تۆ پێویستیت بە هاوڕێ یان بەندەیەکی دڵسۆز هەیە.

وتم: کاپتا ئەمە یەکەمین جارە کە دەبیستم بەبێ گریان و شیوەن گفتوگۆ

دەکەی و بەڕای من قسەکەت ژیرانەیە. لەبەر ئەوەی نابێت من بە تەنهایی بۆ ئەو خانەیە بڕۆم چونکە لەوەیە لەو تاریکستانە ڕێگام لێ بزر بێت، بەڵام لەبەرئەوەی دڵنیانیم کە لەو خانووە بەزیندوویەتی بگەڕێمەوە، وا باشترە کە یەک کەس بکوژرێت نەک دووان.

کاپتا وتی: سینۆهە ئەگەریش نەهێڵی لەگەڵتدا بێم، من هەر ناهێڵم بە تەنیا بڕۆی و هەر چۆنێک بێت لەبەر ئەوەی لەتۆ بەساڵاچووترم و زیاتر لە تۆ ئەزموونم بینیوە، لە هەندێ شت تێدەگەم کە تۆ لەگەڵ ئەوەشدا کە لە خانەی ژیان خوێندووتە توانای لێتێگەیشتنیت نییە. بەڵام ئەوە بزانە کە من لە تاریکی دەترسێم و جگە لە مەشخەڵ دەبێ بهێڵی گۆزەیەک شەرابیش لەگەڵ خۆمدا بۆ ئەوێ بهێنم بۆ ئەوەی هەر کاتێ ترس دایگرتم هەندێکی لێ بخۆمەوە.

وتم: زۆر باشە.. کاپتا هەرچییەکت دەوێ بیکەو لەبەر ئەوەی ئەو تریاکەی کە تێکەڵی شەرابی پاسەوانەکانمان کردووە کاری خۆی کردووە و خەویان لێ کەوتووە، واباشترە هیچکە خۆمان دوا نەخەین و بچینە ناو خانەکەوە.

کاتێک کە چووینە ناو پەرستگەکەوە سەیرمان کرد پاسەوانەکان هەموویان نووستوونەو خەڵووزێکی بەئاگر و چەند مەشخەڵێکمان هەڵگرت و کلیلی دەرگا بچووکەکەی ئەو خانووەشمان دەست کەوت کە کاپتا دەیزانی لە کوێوەیە، چونکە بینیبووی کە لە شەوی چوونە ژوورەوەی مینا، کاهینی گەورە لە دەرگا بچووکەکەوە هاتبووە دەرێ. بەرێ کەوتین و کە گەیشتین، دەرگا بچووکەکەمان کردەوەو چووینە ژوورەوە و من دەرگاکەم داخست، بەڵام کلیلەکەم هێشتەوە.

کاتێک کە دەرگا داخرا کاپتا لە ترسا کەوتە لەرزین و وتی: گەورەم خێرا مەشخەڵێ هەڵکە، چونکە ئێرە ئەوەندە تاریکە کە پیاو لە ترسا دەلەرزێت. من فووم لە خەڵووزەکە کردو مەشخەڵێکم پێ هەڵکرد و بینیم کە ئێمە لە هەشت سووچێکی گەورەداین کە (١٠) داڵانی لە چەند لایەکەوە لێ دەبووەوەو هەر کامێکیان بەلایەکدا دەڕۆیی.



من بە بینینی ئەو داڵانانە سەرم سووڕما، چونکە بیستبووم کە خوای دوورگەی کریت لە خانەیەکدا دەژیت کە وەک (لابیرنێت)ڕێگای زۆری هەیە[١].

بە کاپتام وت: نابێت لێرە بوەستین و دەبێ بەرێ بکەوین و من لەو باوەڕەدام کە لەم ڕێگایەوە بڕۆین. کاپتا سەیرێکی داڵانەکەی کرد و وتی: سینۆهە ڕۆیشتن لەم داڵانە گرفتی تیانییە، بەڵام دەبێ کارێک بکەین کە دوایی بتوانین بگەڕێینەوە.

دوایی بینیم لەو کیسەیەی کە بە کۆڵیەوە بوو و گۆزە خواردنەوەکەی لەناو دانابوو، گلۆڵەیەک بەنی قایمی دەرهێنا کە لە تاڵی گیا بوو و سەرێکی بەنەکەی بەو دارەوە گرێدا کە بەدیوارەکەوە بوو.

وتم: کاپتا ئەتەوێ چی لەم پەتە بکەی؟

کاپتا وتی: ئەم بەنە بۆ گەڕانەوەمان بە کەڵکە، چونکە دەتوانین بەو بەنە بگەڕێینەوە.

ئەگەرچی کەرەستەی کاپتا بۆ گەڕانەوە شتێکی سادەبوو، بەڵام من بە تەنیایی نەمدەتوانی ئەو شتە بدۆزمەوە و وتم: کاپتا بیرۆکەیەکی باشت بەکار هێنا. پاشان بەرێ کەوتین و هەر چەندە بەرەو پێشتر دەچووین کاپتا گلۆڵە بەنەکەی زیاتر دەکردەوە. لە دوای هەر ڕاڕەوێک، دەگەیشتینە داڵانێکی نوێ و کە ئەویشمان تێدەپەڕاند دیسانەوە داڵانێکی ترمان دەهاتەوە پێش.

لەو کاتەدا کاپتا سەری بەرزکردەوەو بۆنی هەوای کرد و وتی: سینۆهە.. ئایا هیچ بۆنێک ناکەی؟

منیش بۆنێکی هەوام کرد و بۆنێکی وەک خانەی مردووەکانی **تەبەسم** هەڵمژی، کە مردووەکانیان تێدا مۆمیایی دەکرد و کاپتا کە ڕەنگ بە دەم و چاویەوە نەمابوو قومێک شەرابی خواردەوەو بە ئیشارەتی من کەوتینەوە ڕێ.

لە ناکاودا قاچم لە شتێ کەوت و داچەمیمەوە لە رووناکیی مەشخەڵەکە بینیم کە ئەوەی لەوێ کەوتووە سەری ژنێکە، بەڵام سەرەکە بەهۆی تێپەڕبوونی

کات بۆگەن ببوو و لە تێک چووندا بوو، کاتێک کاپتا ئەو کەللە سەرەی بینی کەوتەگریان، چونکە من و ئەو تێگەیشتین کە میناش گرفتاری وەزعی ئەو ژنە بووەو کوشتوویانە، یان ئێمە ناتوانین بەزیندوویەتی بیبینینەوە.

من لەگەڵ ئەوەشدا کە ئومێدێکم نەمابوو کە مینا بە زیندوویەتی بدۆزینەوە، بە کاپتام وت: درێژە بە رێگاکەمان دەدەین و ئەو وەک پێشوو گلۆڵەکەی دەکردەوە و بەرەو پێش دەچووین. سەیرم کرد کاپتا وەستاو بە چاوێکی تۆقاوەوە سەیری زەویی دەکرد. منیش سەیری زەویم کرد و بینیم ریخێکی مانگا لەسەر زەوی کەوتووە، بەڵام ئەوەندە گەورە بوو کە مرۆڤ لێی دەترسا.

وتم: کاپتا ئایا دەبینی ئەم ریخە چەند گەورەیە و، ئایا دەکرێ بڵێین گایەکی ئەوها هەیە؟

کاپتا وتی: نا گەورەم گای وەها نییە، چونکە ئەگەر گایەکی لێ بووایە کە بیتووانیایە ئەم ریخە بکات، نەیدەتوانی بەم ڕاڕەوانەدا بڕوات.

وتم: ئەی بەڕای تۆ ئەمە پاشماوەی چ گیانەوەرێکە؟

کاپتا وتی: من لەو بڕوایەدام کە هی عەزیایەکی گەورە بێت، چونکە جگە لە مارە گەورەکان هیچ گیانەوەرێکی تر ناتوانێت پاشماوەی وەها گەورە بکات.

لە دوای ئەم قسەیە کاپتا قومێکی گەورەی خوارد و وتی: پەنا بە خوایەکان، نازانم کۆتایی ئەم کارە چی دەبێت. بەڵام من پێشبینیم دەکرد کە کۆتایی کارەکە چی دەبێت، چونکە ئەگەر عەزیایەکی گەورە بەو رێگایانەدا هاتوچۆ بکات، بێ گومان مینا نەماوە و ئەو کچە جوانە بووەتە خۆراکی مارەکە.

کاتێک کە من بینیم کاهینی گەورە کچە گەنجەکە (مینا)ی بردە ناو خانووی خوای (کریت)ەوە لەگەڵ ئەوەشدا کە دەمزانی هەموو مانگێ یەکێک دەبەنە ئەو خانووەوە، بەڵام وام بیردەکردەوە کە مەبەستی کاهینی گەورە یان کەسێکی تر، کە لەو خانووەدا نیشتەجێیە ئەوەیەکە لەگەڵ ئەو کچانەدا رابوێرێ و دوایی لە ناویان ببات. بەڵام دوو بەڵگەی بەرچاو هەبوو کە نەیدەهێشت ئەم بیرکردنەوەیە



بسەلمێنم. یەکێکیان ئەوەبوو کە تەنیا کچەکانیان نەدەبردە ئەو خانووە و، هەندێ کات کوڕە گەنجەکانیشیان دەبردە ئەوێ و ئەگەر خوای کریت مەبەستی رابواردن بووایە بانگهێشتی کوڕەکانی نەدەکرد.

دووەمیان ئەوەبوو کە لە دورگەی کریت پەیوەندییەکانی ژن و پیاو ئەوەندە ئازادبوو کە کاهینی گەورە یان خوای کریت، بۆ هاودەمێتی لەگەڵ کچەکاندا پێویستییان بەوە نەبوو کە بیانبەنە خانوویەکی تاریکەوە و دوایی بیانکوژن. بۆیە تێگەیشتم کە بردنی مینا بۆ خانووی خوا هۆیەکی تری جگە لە عەشق هەیە و کاهینی گەورە نەیدەویست لە رووی جنسییەوە سوود لە ئەوان وەربگرێت.

هەرچەندە کە لە ڕاڕەوەکەدا بەرەو پێشتر دەچووین بۆنەکە توندتر دەبوو، تا وای لێهات توانای خۆگرتنمان نەماو وەک ئەوەبوو کە سەدان لاشەی مرۆڤ و ئاژەڵ لەوێ بۆگەن بووبێ و ئەو بۆنە بۆگەنەی دروست کردبێ. ئێمە رێگامان بڕی، تا ئەو کاتەی کە ئەو داڵانەی ئێمە بە رووناکی مەشخەڵەکە پیایدا دەڕۆیشتین، رووناک بووەوە و بینیم کە لە دەرەوە رووناکییەک دێتە ناو ئەشکەوتەکەوە و هەرچەندە بەرەو پێشتر دەچووین ڕاڕەوەکە رووناکتر دەبووەوە، تا ئەوەی گەیشتینە دەرەوەی ڕاڕەوەکەو چاومان بە دەریای سەوز کەوت و دەنگی بە کەنارە کەوتنی شەپۆلەکانی دەریا کەوتە بەرگوێمان و روانیم لەسەر ئاوەکە ریزێک کوندەی یەک لە دوای یەک بەرزببۆوە.

ئینجا تێگەیشتین کە ئەو کوندانە بریتی بوو لە بەشەکانی سەرەوەی لەشی عەزیایەکی گەورە کە هەڵئاوسابوو و لاشەکەی بۆگەن ببوو و سەری کەوتبووە ژێر ئاوەکەوەو نەدەبینرا. ئینجا من و کاپتا بۆمان دەرکەوت ئەو پڕۆپاگەندانەی لەبارەی مردنی خوای کریت دەگوترا راست بوو و ئەو مارە گەورەیە کە ماوەیەک بەسەر مردنیدا تێپەڕیبوو (ئەگەر نا ئەوەندە بۆگەن نەدەبوو)، هەمان خوای کریت بوو کە لە دیدی خەڵکی شاردبوویانەوە و هەموو مانگێ کچێکی گەنج، یان کوڕێکی لاویان، کە هێشتا چێژی لە ژیان وەرنەگرتبوو دەخستە ناو ئەو ڕاڕەوە

تاریکانەوە بۆ ئەوەی ئەو گیانەوەرە بیکاتە خۆراکی خۆی و مانگانە مرۆڤێک بۆ خۆراکی ئەو مارە بەس بوو.

لەو تاریکاییەدا، لە ناکاو مارەکە قەپاڵی بە کچ و کورە گەنجەکان دا دەکردو بەرلەوەی بزانن چییان بەسەر هاتووە دەچوونە ناو سکی مارەکەوەو لەبەرئەوەش کە لە وشکانیدا گیانەوەرێکی وەها گەورە ناژێت، بەڵگەنەویست بوو کە ئەم عەزیا ترسناکە لە دەریادا ژیاوە و بەهۆی ئاوەکەوە یان هەر هۆیەکی تر، هاتووەتە کەناری دورگەی کریت و پڕوپووچ پەرستەکانی کریت بە گومانی ئەوەی کە خوای دەریایە، ڕێگای گەڕانەوەی ئەو گیانەوەرەیان گرتبوو بۆ ئەوەی هەمیشە لە کریتدا بمێنێت. ئینجا بۆ هاتوچۆ کردنی مارەکە ئەو داڵانە پێچاو پێچانەیان دروست کردبوو و هەموو مانگێ کوڕ یان کچێکی گەنجیان پێشکەشی دەکرد بۆ ئەوەی لە برسا نەمرێت یان بیر لە دەربازبوون نەکاتەوە. بەڵام لە دوای ئەوەی مارەکە مرد ناچاربوون وای نیشان بدەن کە زیندووە و وەک جاران هەموو مانگی کچێک یان کوڕێکیان دەکردە ناو داڵانەکانەوە و پاشان لەبەر ئەوەی مارە گەورەکە مردبوو و لەوێ نەبوو کە قووتیان بدات، دەبێ تێبگەین کە چییان لە مینا کردووە و لە دوای هاتنە ژوورەوەی بۆ کوێیان بردووە.

من کە لە نائومێدیی دۆزینەوەی مینا خۆم پێ ڕانەدەگیرا، بەردەوام بانگم دەکرد و دەنگم لە داڵانەکانی ئەوێ بڵاو دەبووەوە و دەنگی دەدایەوە، تا کاتێک کە کاپتا بە پەنجە زەوییەکەی نیشانم داو وتی: سەیرکە..

لەسەر زەوی تنۆکی خوێنی لێ بوو و لە کەناری دەریا کۆتایی پێ دەهات. کاپتا وتی: گەورەم بەم شێوەیەی کە دەیبینی ئەم تنۆکە خوێنانە تا ئاوەکە دەڕوات و وا چاکە بەدوای ئەم خوێنەدا بڕۆین.

کاتێک کە گەیشتینە کەناری دەریا لاشەی مینام بینی کە لە بنی ئاوەکە کەوتبوو و لەبەر زوڵاڵ بوونی ئاوەکە لاشەکەی بە جوانی دیاربوو و هەندێ قرژاڵکی دەریایی دەورەیان لێی دابوو و خەریکی خواردنی گۆشتی لەشی بوون.



من هاوارم کردو کەوتمە سەر ئەژنۆ و ئەگەر کاپتا لەوێ نەبوایە منیش خۆم دەگەیاندە مینا. بەڵام کاپتا کە دەیبینی ڕۆژهەڵاتووە و لەوانەیە پاسەوانەکان کە بە هۆی دەرخوارد دانی تریاکەکە نوستبوون، هەڵبستن، بەهۆی ئەو بەنەی لە زەوی ڕای خستبوو منی لە خانەی خوای کریت هێنایە دەرەوەو کاتێک کە هاتینە دەرەوەو بەرەو پەرستگەکە ڕۆیشتین، سەیرمان کرد هێشتا پاسەوانەکانی پەرستگە هەر نووستوونە.

کاپتا بەبێ ئەوەی لە نزیک خانەی خوا ڕابوەستێت و پشوو بدات منی گەڕاندەوە بۆ شار. لەو کاتەدا ئاگام لە خۆم نەمابوو و لە ڕێگا وەک ئەوانەی کە سەرخۆشن بەڕێدا دەڕۆیشتم و کاپتا بە خەڵکی دەگوت هۆی سەرخۆشییەکەی ئەوەیە کە لە چاوەڕوانیی میනادا زۆری خواردۆتەوە و زیاتر لە خەڵکی تر لە بەردەم خانووی خوا ماوەتەوەو هەموو کەسێ ئەم بیانووەی دەسەلماند، چونکە دەیانزانی کە من بیانیم و نازانم کە هیچ کەسێ لەماڵی خوا نایەتەوە دەرەوە.

لە دوای گەڕانەوەمان بۆ میوانخانەکە، لەتاو تووڕەیی و نائومێدی خواردنەوەیەکی زۆرم خواردەوەو، پاشان نووستم، بەڵام کاتێک کە لە خەو هەڵسام هەستم دەکرد رق و کینەی کاهینی گەورەم لە دڵدا نەمابوو کە مینای بردبووە ناو خانەی خواو پاشان لەوێ کوشتبووی (لەبەرئەوەی کە جگە لەو کەسێکی تری لێ نەبوو کە مینا بکوژێت.) و ئەو کاهینە ناچار بوو کە وەکو پێشوو وای نیشان بدات کە خوا زیندووە و دەبێ کچە گەنجەکان بچن بۆ لای و کچێنییەکەی خۆیانی پێشکەش بکەن. بەڵام لە داب و نەریت و ئایینەکەیان رق ئەستوور بووم، کە بۆچی کوڕ و کچە گەنجەکانیان دەرخواردی ئەو مارە گەورەیە دەدا.

ویستم هەڵسم و لە شەقامەکانی شاردا بەڕێ بکەوم و بڵێم: ئەی خەڵکی نەفام ئەو خوایەی کە ئێوە دەتانپەرستیی مارێک بوو کە ئێستا ماوەیەک بەسەر مردنی تێپەڕیوە و ئێوە نابێت ڕێگا بدەن کە لەمەو بەدوا گەنجەکانتان بۆ خانەی

خوا بچن، چونکە دەیانکوژن بۆ ئەوەی لەوێ نەگەڕێنەوە. بەڵام تێگەیشتم کە وتنی ڕاستییەکان کارێکی سەختەو خەڵکی ئامادەنین کە گوێ لە ڕاستی بگرن، ئەگەرچی بە قازانجیشیان بێت و عەقڵیان بە جۆرێک لەگەڵ پڕوپووچ پەرستی و خەیاڵات ڕاهاتووە کە هەموو بیرۆکەیەکی نەفامانە دەسەلمێنن، بەڵام حەقیقەتێکی ژیرانە وەرناگرن و بەرلەوەی بتوانم خەڵکی بۆ خانووە تاریکەکە ببەم و لاشەی مارەکەیان نیشان بدەم دەمکوژن. ئەگەریش خەڵک منیان نەکوشتایە خزمەتکارەکانی ئایینی کریت و کاهینی گەورە کە لە ساویلکەیی خەڵکی قازانجێکی زۆریان کردبوو یەکسەر منیان دەکوشت و خۆم بەوە دڵخۆش دەکرد کە ئەگەر دینی دانیشتووانی کریت ڕاست بێ، لەبەر ئەوەی خوایەکەیان مردووە بە زوویی دەسەڵات و بەختیاری ئەو خەڵکە لەناو دەچێت و بەڵایەکی سروشتی یان هێرشێکی وڵاتانی تر کریت لە ناو دەبات و لە کۆڵان و شەقامەکانی خوێن دەڕژێت و سەدان کەشتی کە لە بەندەری کریتدا لەنگەری گرتبوو نقوم دەبێت و لەوە بەدوا ئەو میللەتە وەحشییەی کە پەلاماری کریتی داوە جێی ئەو خەڵکە دەگرێتەوە و لەبەر ئەوەی ئەو کێوییانە شایانی ئەوەنین نییە کەڵک لە گەرماو و ئاودەستە جوانەکانی ئەوێ وەربگرن تێکی دەدەن و وەک ئەو شارانەی کە بینیومە، پیس و پۆخڵی هەموو جێگایەک دەگرێتەوە.

دوایی بە خۆمم وت: خوای کریت پەیوەندیی بە منەوە نییە، چونکە من لەم وڵاتەدا پیاوێکی بێگانەم و دەبێ لێرە بڕۆم و چارەنووسی من و میناش وەکو ئەستێرەناسەکانی بابل دەیانگوت لە لایەن ئەستێرەکانەوە دیاری کراوە، چونکە چارەنووسی هەموو کەسێ لە لایەن ئەستێرەکانەوە دەستنیشانکراوەو شەڕکردنی ئێمە لەگەڵ قەزاو قەدەر ناتوانێ بڕیاری چارەنووس بگۆڕێت.

لەو کاتەدا بۆ ئەوەی دیسان بخەومەوە، داوای شەرابم لە کاپتا کرد، بەڵام ئەو لە جیاتی شەراب خواردنی بۆ هێنام و من پێم وت: شەرابم دەوێت نەک خواردن و، ئەگەر شەرابم بۆ نەهێنی ئێسکەکانت بەم گۆچانە تێک دەشکێنم.



کاپتا ناچاربوو بڕوات و شەرابم بۆ بهێنێ. لەو ڕۆژە بەدواوە کاتێک کە دەمخواردەوە ئۆقرەم دەگرت و ئەگەر زۆرم بخواردایەتەوە شتەکانم بەدووان دەبینی و بەرواڵەت وام دەزانی کە هەموو شتێک دووانە، لەکاتێکدا کە دڵنیابووم وانییە.

ڕۆژێکیان ویستم لەم بارەیەوە لەگەڵ کاپتا بدوێم و پێی بڵێم هەموو ڕاستییەک بەم شێوەیەو مرۆڤ ڕاستی دەبینێت و گومانی لە بوونیدا نییە. لە کاتێکدا کە دەزانێت ئەوەی دێتە بەرچاوی لە ڕاستییەوە دوورە، بەڵام کاپتا ئامادەنەبوو لەم بارەیەوە قسەم لەگەڵدا بکات و بە منی دەگوت: تۆ توانای شەراب خواردنەوەی زۆرت نییەو دەترسم لەناو بچی و ئەو کاتە چارەی من لەم وڵاتە بێگانەیەدا چییە؟ چۆن لاشەکەت ببەمەوە بۆ **تەبەس** و بە خانەی مەرگی بسپێرم و بڵێم مۆمیایی بکەن؟

لەگەڵ ئەوەشدا کە کاپتا ڕێگای لە خواردنەوەم دەگرت، بەڵام من ئەمڕۆ بۆم دەردەکەوێت کە ئەگەر لەو کاتەدا شێت نەبوومە یان هەوڵی کوشتنی کاهینی گەورەم نەداوە، لەبەرئەوە بووە کە خواردنەوە منی تووشی جۆرە کەم توانایی و سستییەک کردبوو کە تەنها دەمەویست بنووم و ئەگەر خواردنەوە نەبوایە لەبەر ئەوەی بەردەوام بیرم لە مینا دەکردەوە، تووشی شێتی دەبووم یان هەوڵی کوشتنی کاهینی گەورەم دەدا و دوایی دەیانکوشتمەوە.

چەند جارێک بە کاپتام وت کە بڕوات و کاهینی گەورە بهێنێت بۆ میوانخانەکە و هەموو جارێ بەندەکەم لە جێبەجێ کردنی ئەو فەرمانە سەرپێچی دەکرد. دوایی زانیم کە گۆچان و کێردە ئاسنییەکەمی شاردۆتەوە بۆ ئەوەی نەتوانم لێی بدەم و بیکوژم یان خۆمی پێ بکوژم.

ڕۆژێکیان کاتێک کە لە خەو هەڵسام بینیم کاپتا لە سووچێکی هۆدەکە دانیشتووە و خەریکی گریانە. گۆزەی خوارنەوەکەم هەڵگرت و قومێکم خواردەوە و وتم: بۆ دەگرییی؟

ماوەیەک بوو قسەم لەگەڵ کاپتادا نەکردبوو، چونکە سەرو چاوە خەمناکەکەی ئازاری دەدام و نەمدەویست گوێم لە دەنگی بێت. بەڵام ئەو رۆژە کاتێک کە گریانەکەیم بینی ویستم بپرسم بۆچی فرمێسک دەڕێژێت؟

کاپتا وتی: کەشتییەک لەبەندەرەوە بەرەو سووریا دەڕوات و ئەمە ئاخرین کەشتییە کە بۆ سووریا دەچێت و لە دوای ئەو بە هۆی تۆفانەکانی وەرزی زستان تا ساڵی ئاینده هیچ کەشتییەکی تر بۆ سووریا ناڕوات.

هاوارم کرد: هەڵسەو برۆ بۆ بەندەر و سواری کەشتییەکە بەو من لە شەڕی قەڵافەتە بێ فەرەکەت ئاسوودە بکەو چی تر نامەوێت تۆ ببینم.

کاپتا وتی: سینوّهە لەبەر ئەوەی پێشبینی دەکەم کە دوای ئەم قسەیە ئێسکەکانم تێک دەشکێنی، بەڵام پێت دەڵێم کە منیش لەم ژیانەی تۆ کە وەک ژیانی مێشەکانی دەوروبەری گۆزەی شەرابە، ماندوو بوومەو شەرابخۆری و مەستیی هەمیشەیی تۆ منی بە جۆرێک بێزار کردووە کە ئیتر شەراب لە ناو دەممدا تامی نییەو من کە تەنها ئارەزوو و دڵخۆشیم شەراب نۆشی بوو ئێستا ناخۆمەوە. سینوّهە هەرکاتێ باسی زانست دەکرێ تۆ شانازی بە خۆتەوە دەکەی کە لە قوتابخانەی خانەی ژیان خوێندنت تەواو کردووە و زانای و هەزارەها مردووت بینیوە یان بەدەستی خۆت ناوسکی مردووەکانت هەڵدڕیوە و تۆ هێشتا ئەوە نازانی کە ئەو کەسەی مرد ئیتر لەناو دەچێ و جارێکی تر زیندوو نابێتەوە، تۆ ئەگەر هەموو رۆژێ دە گۆزە شەرابیش بنۆشیتەوە و لە بەیانییەوە تا ئێوارە شیوەن بکەی ئەو ژنەی کە لەبەر ئەو ئەم ژیانەت گرتۆتەبەر، زیندوو نابێتەوە و جارێکی تر نایبینی و تەنها دەرەنجامێک کە لەم کارە دەستت دەکەوێت ئەوەیە کە تۆش بۆ لای ئەو دەچیت.

تۆ ئەگەرچی گەنجی بەڵام بەهۆی خواردنەوە بە جۆرێک دەستت دەلەرزێ کە ناتوانی سەرێک کون بکەی و سکێ هەڵبدڕی و ددانێک دەربکەی و هەرچییەک زێڕ و پارەت هەبوو هەموویت بە کڕینی شەراب تەواو کرد، واتە فڕێتدا. من لە



سەرەتادا کاتێک کە بینیم تۆ وەک گۆزەیەک کە بنی نەبێ شەراب دەنۆشێتەوە خۆشحاڵ بووم، چونکە وامزانی هاوپیاڵەم بۆ پەیدا بووە و تەنانەت لە دوکانەکانی بەندەر دەمگوت گەورەیەکم هەیە کە لە رێگای خواردنەوەدا هەرچییەک زێڕ و پارەی هەبێ خەرجی دەکات. بەڵام کاتێ: کە سەرنجم دا هەموو بەیانییانێک کە لەخەو هەڵدەستی بە جۆرێک دەکەویتە شەراب نۆشین کە دەڵێی ئەو رۆژە دوایین رۆژی ژیانتە، ترسم لێ نیشت و جەرگم پێت سووتا[٢]و دەشمزانی کە ئەگەر تۆ بمری من دەتوانم بگەڕێمەوە بۆ ئەزمیر و بەپێی ئەو نووسینەی کە لەسەر لەوحەکە بۆت نووسیوم، زێڕ و پارەکەت لە کۆمپانیاکانی کەشتیوانی بسەنمەوە و خانووەکەت داگیربکەم و هیچ کام لەم کردارانە دزی نەبوو، چونکە تۆ خۆت پێت بەخشیبووم، بەڵام من ناتوانم ببینم کە تۆ بەهۆی خواردنەوەی شەراب لەناودەچی و زانست و شارەزاییەکەت کە سەرچاوەی زێڕ و پارەیە وشک ببێت.

ئاه... گەورە ئازیزەکەم... سوێند بێ بە خوایەکان ئەگەرچی تۆ جنێوم پێ دەدەی و جارجار بە گۆچان لێم دەدەی، بەڵام من تۆم خۆش دەوێت و ناتوانم بەبێ تۆ بژیم و ئەم خۆشەویستییە بۆ زێڕ و پارە و خانوو و خواردن نییە، چونکە وەکو پێم وتی قازانجی من لەوەدایە کە تۆ بمری و من لە ئەزمیر دەست بەسەر کانزاکان و خانووەکەتدا بگرم، بەڵام لەبەر ئەوەی خۆشم دەوێیت نامەوێت گەورە ئازیزەکەم بەهۆی زیادەڕەوی لە خواردنەوەی شەراب و بیرکردنەوەی خۆڕایی لە مردوویەک کە هەرگیز زیندوو نابێتەوە، ماڵئاوایی لە ژیان بکات.

قسەکانی کاپتا زۆر کاری تێکردم، چونکە وەکو ئەو دەیگوت روانیم دەستم دەلەرزێت و بەردەوام بوون لەسەر خواردنەوە، لەناوم دەبات و بیرم کردەوە کە بەهۆی زیادە نۆشی هەموو ئەو زانیارییانەی کەلە میسر و بابل و سووریاو شوێنەکانی تر فێری ببووم، هەمووی بێ سوود دەبێت، چونکە ئەوها بێت دەمرم و نەمدەتوانی کەڵک لە زانستەکەم وەربگرم. بۆم دەرکەوت کە زیادەڕەوی لە

هەموو شتێکدا تەنانەت لەشادی و خۆشیشدا زیانی هەیەو نیشانەی شێتییە.

بەڵام نەمدەویست بە کاپتا بڵێم کە قسەکەی ئەو کاری تێ کردووم. بۆ ئەوەی لە خۆی بایی نەبێت و وتم: قسەکەی تۆ لە گوێی مندا وەک گیزەگیزی مێش وایەو وتەکانتم بەدڵ نییە، بەڵام چەند رۆژێکە خۆم بڕیارم داوە کە چیی تر شەراب نەنۆشمەوە، چونکە خواردنەوەی شەراب دەستمی لەرزۆک کردووە و بەردەوام بێ تاقەتم. لەبەر ئەوە لە ئەمڕۆوە شەراب نانۆشمەوە و لەبەر ئەوەی نامەوێت هیچکە لە کریت بمێنمەوە، هەر ئەمڕۆ دەگەڕێینەوە.. بڕۆ و کەل و پەلی گەڕانەوەمان ئامادە بکە.

کاتێک کە کاپتا ئەم قسەیەی بیست لە خۆشیا وەک منداڵ هەڵپەڕی و دوایی لە هۆدەکە چووە دەرەوە کە کەل و پەلی گەڕانەوەمان ئامادەبکات. لەهەمان رۆژدا ئێمە بە کەشتی بەڕێ کەوتین و سەوڵ لێدەرەکان بۆ دەرکردنی کەشتییەکە لەبەندەر بەناو سەدان کەشتیی گەورەو بچووکدا سەوڵیان لێ دەدا.

لە دوای ئەوەی گەیشتینە دەریا کەشتییوانەکە قوربانیی بۆ خوای دەریا کردو لەو کاتەدا چارۆگەکانیان هەڵکرد و کەشتی بەهۆی پاڵەپەستۆی هەوا بەسەر رووی ئاوەکەدا چەمییەوەو دەنگی شەپۆلەکانی دەریا کەلە قەدی کەشتییەکەی دەدا دەهاتە بەر گوێ.

کەشتییەکەمان رێگای رۆژهەڵات، واتە سووریای گرتەبەر و لەوکاتەدا دوورگەی کریت وەک دیمەنی خەوێک کە لە دوای هەڵسانی مرۆڤ نەمێنێت، لەبەر چاوان ون بوو و جگە لە فراوانیی دەریا هیچ شتێکی تر لە دەورو بەرماندا نەما..

***

١- لابیرنێت بە واتای مەجازی بریتییە لە ژێرزەمینێک کە هەر چەندە تیادا بەرەوپێش بڕۆن تووشی چوار رێیانی نوێ دەبن بە جۆرێک کە دوایی تیایدا بزر دەبن - وەرگێڕ.



٢- وەکو پێشتر باس کرا هەندێ لە وشەکان و شێوەی دەربڕینی مەبەستەکان لەم کتێبەدا تایبەتە بەو سەردەمە، ئەگەر نا لە زمانی کوردی تەنانەت فارسیشدا ناگوترێ جەرگم پێی سووتا - وەرگێڕی کوردی.

# گەڕانەوە لە کریت و بارودۆخی تازەی ئەزمیر

بەم شێوەیە لەدوای سێ ساڵ کە لە بابل و (هاتی)و کریت بووم، گەڕامەوە بۆ ئەزمیر لە سووریا. لەم سێ ساڵەدا وانەکانی ژیان منی پێ گەیاندو من بەرلەوە کاڵ و کەم ئەزموون بووم.

بای دەریاو لێکدانی شەپۆلەکان و مەستیی شەراب، بیرکردنەوەو ئەندێشەکانی رابردوومیان لە یاد بردەوە و کاتێک کە پاڵم بە دیواری کەشتییەکەوە دەدا و سەیری شەپۆلەکانم دەکرد، دەموچاو و ئەندامی مینا وەک خەونێکی شیرین کە ئەوەندە جوان بوو و دەزانم هەرگیز لەبێداریدا بەو جۆرە نایبینمەوە، دەهاتە بەرچاوم.

من خۆشحاڵ بووم کەمینا و سەماکردنیم لەبەردەم گایەکاندا بینی، هەروەها رازیش بووم کە بینیم مینایان لە خانەی خوای کریتدا کوشت، چونکە ئەزموونێکی ترم دەست کەوت. نامەوێت بڵێم مەرگی مینا شادمانی کردم یان ئارەزووی مردنی ئەوم هەبوو، بەڵکو دەمەوێت بڵێم ئاشنایی لەگەڵ ئەو کچەدا بووە هۆی ئەوەی کە بۆ کریت بچم و بینینی گەرماو و ئاودەستەکانیان و داب و نەریتی دانیشتووانی ئەوێ و ئەو باوەڕەی بە خوایەکەی خۆیانیان هەبوو (لەکاتێکدا نەیانبینیبوو)و فیداکارییە سەرسوڕهێنەرەکەیان لە رێگای ئەو خوایە، کەجگە لە مارێکی گەورەی دەریایی هیچی تر نەبوو، بووە هۆی ئەوەی فێرە ئەزموونێکی زۆر ببم، کە ئەگەر بەو جۆرە نەبوایە نسیبم نەدەبوو.

مرۆڤ تا ئەوکاتەی هەست بەکارێکی نوێ نەکات، خۆی بەزانا دەزانێت، بەڵام لەدوای ئەوەی زانی کە جگە لە زانیاری و زانستەکەی ئەو لە جیهاندا



زانست و زانیاریی تر هەیە، هەست بە نوقستانی و نەزانیی خۆی دەکات و هەر لەبەر ئەوەشە کە خەڵکانی نەزان و بێ ئاگا زۆر لە خۆیان بایی دەبن چونکە وا هەست دەکەن کە هەموو شتێ دەزانن و لەجیهاندا لەوان باشترو گەورەتر نییە. بۆیە هەر کاتێ کە دەبینن ژنێک یان پیاوێ لە خۆی بایی دەبێت و بەچاوی سووک سەیرمان دەکات، دەبێ بزانین کە نەزان و دەبەنگە و لەبەر ئەوەی هیچ شتێ نازانێت و فێرە ئەزموونێک نەبووە، خۆی لە خەڵکی بە گەورەتر دەزانێت.

کاتێک کە گەیشتمە ئەزمیر سەیرم کرد خانووەکەم هەر لەو شوێنەدا ماوەتەوە بەڵام، دزەکان هەر چییەکی تیابوو بردبوویان و دراوسێکان لەوێ نەبوونی ئێمەیان بە هەل زانیبوو و حەوشەکەیان کرد بووە زبڵدان و مشکی گەورە لە خانووەکەماندا غارغارێنیان دەکرد.

جیرانەکان کاتێک منیان بینی نەفرەتی خۆیان دەربڕی و گوێم لێ بوو دەیانگوت ئەمە میسرییە و هەموو بەدبەختییەکانی ئێمە بەهۆی میسرەوەیە. من رق و کینەی دراوسێکانم پێ سەیر بوو و لە میوانخانەیەک نیشتەجێ بووم هەتا کاپتا چەند کرێکارێک بگرێ و خانووەکەیان پێ خاوێن بکاتەوە.

کاتێک کە هاتمە ناو ئەزمیرەوە زێڕوپارەم نەبوو و لەبەر ئەوەی ماوەی سێ ساڵ دەبوو لەوێ نەمابووم بەترس و لەرزەوە بەرەو کۆمپانیاکانی کەشتیوانی رۆیشتم چونکە لەوباوەڕەدا نەبووم ئەوان ئەو زێڕو پارەیەم بدەنەوە کە لەو نووسینگانەدا بەکارم خستبوو. بەڵام خاوەن کۆمپانیاکان سەرمایەکەی منیان بە قازانجەوە دایەوە و بۆم دەرکەوت لەماوەی ئەو سێ ساڵەی کە من لەوێ نەبوومە، لەگەڵ ئەوەشدا کە چەند کەشتییەک نقوم ببوون، بەڵام زێڕوپارەکەم لە جاران زیاتر ببوو.

یەکێک لەبەر پرسەکانی ئەو کۆمپانیا دەریاوانییانە منی بانگهێشت کرد بۆ ماڵی خۆی و وتی سینوهە ئەگەرچی ئێمە تۆمان خۆش دەوێت، چونکە دەزانین کە پزیشکێکی لێهاتوویت و دەتوانی نەخۆشەکانمان چارەسەربکەیت، بەڵام دەبێ

پێت بڵێم کە گەلی سووریا زۆر رقیان لە میسرییەکان دەبێتەوە، چونکە ئەو سەرانەیەی کە فیرعەون لە ئێمەی دەستێنێت گەلێ زۆرە. چەندجار میسرییەکانیان لەسەر شەقامەکان بەردباران کردووە و لاشەی سەگ و پشیلەیان فرێ داوەتە ماڵەکانیانەوە. لەبەر ئەوە ئەگەر چی ئێمە تۆمان خۆش دەوێت، بەڵام ئەم بابەتەت پێ رادەگەیەنین بۆ ئەوەی ئاگاداری خۆت بی و بزانی کە لە ئەزمیر چۆن رەفتار بکەی.

من لەم قسەیە سەرم سوڕما ، چونکە سێ ساڵ لەمەوبەر کاتێک کە لە ئەزمیر دەڕۆیشتم خەڵکی لەگەڵ میسرییەکاندا دۆست بوون و چاویان لەداب و نەریتی میسری دەکرد. هەروەها ئێمەش لە **تەبەسی** پایتەختی میسر، پەیڕەوی داب و نەریتی دانیشتووانی سووریامان دەکرد. کاپتا پشتگیریی لە وتەی خاوەن ماڵەکە کرد و کاتێک کە لە ماڵی بەرپرسی کۆمپانیاکە گەڕاینەوە وتی وا هەست دەکەم گیانە ئازار گەیەنەرەکان چوونەتە لەشی سریانییەکانەوە، چونکە شێت بوونە و ئیتر حەز ناکەن بەزمانی میسری بدوێن و من ئەمڕۆ بۆ ئەوەی تینوێتییەکەی خۆم بشکێنم چوومە مەیخانەیەک بۆ ئەوەی گۆزەیەک ئاوی جۆ بنۆشمەوە، بەڵام هەر ئەوەندە کە زانییان من میسریم منیان دەرکرد و منداڵەکان بەبەردو قەستەقول لێیان دام و بە دووم کەوتن. کە زانیم خەڵکی ئەزمیر رقیان لە میسرییەکانە چوومە مەیخانەیەکی تر بەڵام ئەم جارە هیچ قسەم نەکرد و قامیشێکم هەڵگرت و کردمە ناو گۆزەیەکی ئاوی جۆ و نۆشیمەوە[١].

دوایی وتی: بەڵام لەلام ناخۆش بوو چونکە کاتێک کە ئاوی جۆ دەخۆمەوە و خۆم لە نێوان کۆمەڵێکدا دەبینم، دەبێ زمانم بەکاربهێنم و بدوێم، چونکە بۆ من زۆر زەحمەتە قسە نەکەم. ئەگەر چی سەرم دانەواندبوو و بەقامیشەکە بیرەم دەخواردەوە، بەڵام گوێم لێ بوو کە خەڵکی جنێو بە فیرعەون و میسرییەکان دەدەن و دەڵێن ئەزمیر لە رابردوودا شارێکی ئازاد بووەو سەرانەی نەداوە، بەڵام ئەمڕۆ هەموو خەڵکی ئەم شارە دەبێ باج بدەنە فیرعەون و نەوەکانمان لە



منداڵییەوە دەبنە بەندەی فیرعەونی میسر.

من نەموێرا پێیان بڵێم کە فیرعەونی میسر لەبەر بەرژەوەندی و خێرخوازیی خەڵکی ئەزمیر سەرپەرشتی و پشتگیریی ئەوان دەکات و لەرابردوودا بەرلەوەی فیرعەون بیکاتە ژێر رکێفی دەسەڵاتی خۆی، بەدرێژایی ساڵ دانیشتووانی سووریا بەگژ یەکتردا دەچوون و وەک کۆمەڵە پشیلەیەک بوونە کە کردبێتیانە ناو گونییەیەکەوەو نەتوانن رابکەن و ناچار پەلاماری یەکتری بدەن. سریانییەکان باس لەوە دەکەن کە ئەگەر ئەو دەسەڵاتدارانەی لە سووریا دان یەکتر بگرن، هێزێک دروست دەبێت کە فیرعەونیش توانای بەرەنگاربوونەوەیانی نییە، بەڵام ئایا ئەو رۆژە دێت کە پاشاکانی سووریا بتوانن یەک بگرن، بەدڵنیاییەوە، نا.

من کە نەمدەتوانی وەڵامیان بدەمەوە و توانای بیستنی قسەی ئەوانم نەبوو، بەپەلە بیرەکەی خۆم نۆشییەوەو لە دووکانەکە هاتمە دەرەوە.

لەدوای ئەوەی قسەکانی کاپتام بیست جل و بەرگی سریانیم لەبەرکرد و لەماڵ دەرچووم و تێگەیشتم کەبەندەکەم راست دەکات و خەڵکی بەشێوەیەک لەناو شەقامەکاندا بەرامبەر بە میسرییەکان رق و کینەیان دەردەبڕن کە ئەوان ناچار دەبوون بە پاسەوانەوە هاتوچۆ بکەن و لەگەڵ ئەوەشدا کە خەڵکی ئەوێ میوەو ماسیی بۆگەنیان تێ دەگرتن، بەڵام کەس سەرنجی نەدەدایە من، چونکە من جلکی سریانیم لەبەردابوو. گوێم راگرتبوو کە بزانم خەڵکی لە چ شتێ نارازین و بیستم هەموویان گلەیی و گازندە لەو سەرانەیە دەکەن کە فیرعەون لە سووریای دەستێنێ. بەڵام ئاگایان لەوە نەبوو کە فیرعەون بەشێکی ئەو باجە لەبەڕێوەبردنی ئیش و کاری سووریادا سەرف دەکات. هەروەها ئەگەر گەنمی میسر نەبێت و لەوێوە گەنم بۆ ئەزمیر و شارەکانی تری سووریا لە کەناری دەریا نەچێت، خەڵکی ئەوێ لەبرسان دەمرن.

لەگەڵ ئەوەشدا کە دەمزانی خەڵکی رقیان لە میسرییەکانە بەڵام دەرمانگەکەی خۆم لەناو خانووەکەمدا کردەوەو هەندێ نەخۆش هاتنە لام. لەبەر

ئەوەی کاتێک کەیەکێ نەخۆش دەکەوێت و ئازار پەیدا دەکات کاری بەرەگەزی پزیشکەکەوە نییە و لەبری ئەوە حەزدەکات بزانێت کە پزیشکێکی شارەزایە یان نا و ئایا دەتوانێ چاکی بکاتەوە یان نا. بەڵام هەندێ لە نەخۆشەکان دەرگای گلەییان دەکردەوە و دەیانگوت میسر ئەمڕۆ وەک زاڵووی لێ هاتووە و بەمژینی خوێنی ئێمە قەڵەو دەبێت. لەکاتێکدا کە ئێمە ساڵ بە ساڵ هەژارتر دەبین و بیانووی میسر بۆ سەندنی سەرانە ئەوەیە کە لەشارەکانی ئێمە سەربازگەیان داناوە کە ئاسایش بپارێزێت، لەکاتێکدا کە ئێمە بەبێ هێزی میسریش دەتوانین هێمنی و ئارامیی خۆمان بپارێزین و یەکێک لەسووکایەتی پێ کردنەکانیان ئەوەیە کە ئێمە ناتوانین قەڵاو بورجەکانی خۆمان چاک بکەینەوە و قەڵای نوێ دروست بکەین لەکاتێکدا خەرجیی نۆژەن کردنەوەو دروستکردنی قەڵای نوێ لەسەر خۆمانە.

ئەگەر میسر سەرانەی لێمان نەسەندایە ئێمە دەبووینە گەلێکی بەختەوەرو حەساوە، بەڵام میسر وەکو لافاوی کوللە داوێتی بەسەر سووریادا و فیرعەونەکەی ئێوە دەیەوێت خوایەکەی خۆی بسەپێنێت بەسەر ئێمە، لەکاتێکدا کە ئێمە خوای ئەومان ناوێت و خوایەکەی خۆمان دەپەرستین.

من وتم میسر لەبەر ئەوە ڕێگا نادات کە ئێوە قەڵاکانی خۆتان چاک بکەنەوە و قەڵای نوێ بینا بکەن، چونکە دەزانێت ئەم خۆ قایم کردنە بۆ دژایەتی کردنی میسرەو دەتانەوێت ڕۆژێک لەگەڵ میسردا بجەنگن. ئێوە دەڵێن کە لەرابردوودا ئازاد بوونە، بەڵام فەرامۆشتان کردووە کەبەر لەوەی فیرعەونی میسر سووریا بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە، ئێوە هەمیشە لەگەڵ یەکتریدا دەجەنگان و پاشاکانتان کە لە هەر ویلایەتێک دا سەربەخۆیی خۆیان هەیە هەرچییەکیان بویستایە لەگەڵ ئێوەدا دەیانکرد و دەوڵەمەند و هەژار لەدەستی ئەوان ناڵەناڵیان بوو، بەڵام ئەمڕۆ، یاساکانی میسر پشتگیری لە ئێوە دەکەن و ڕێگا نادات پاشاکانی سووریا ستەمتان لێ بکەن و هەژارو دەوڵەمەندەکانتان لە ژێر



پاراستنی یاساکانی میسرن.

نەخۆشەکانم دەیانگوت ستەمی پاشاکانی سووریا تۆمەتێکە کە میسرییەکان بۆ ئێمەیان دروست کردووە، بۆ ئەوەی ئێمە ناچار بکەن کە ئازادیی خۆمان فەرامۆش بکەین و ببینە بەندەی میسر، بەڵام گریمان پاشاکانی ئێمە زاڵم بن، خۆ هەر پاشای خۆمانن و ئێستاش هەن و دەست درێژی کردنی ئەوانمان زۆر پێ باشترە لە ستەمی بیانی، بەڵام ئەمڕۆ هەموومان بووینەتە بەندەی فیرعەونی میسر و ئەو زوڵم لە ئێمە دەکات بەبێ ئەوەی لە ئێمە بێت.

وتم من لە لەشی ئێوەدا هیچ داخێکی بەندەیی بەدی ناکەم و ئێوە ئازادن و لە رابردوو قەڵەوتر بوونە و ئەم قەڵەوییەتان نیشان دەدات کە باشتر دەژین. ئەگەر ئێوە وەک رابردوو بوونایە و یاسای میسر نەیپاراستنایە، بەردەوام کەشتییەکانی یەکترتان دەدزی و دارەکانتان دەبڕییەوەو هیچ ڕێبوارێک لە ڕێگاکانی سووریا-دا بێ مەترسی نەدەبوو، بەڵام ئەمڕۆ کەس کەشتییەکانتان نادزێت و درەختە میوەدارەکانتان نابڕێتەوەو دەتوانن بەبێ مەترسی لەهەر لایەکی سووریاوە بۆ لایەکی تر بچن. بەڵام سریانییەکان بەڵگەکانی منیان نەدەسەلماند و لەدوای ئەوەی کە چارەسەر دەکران، دیارییەکەی خۆیان بەرقەوە لەبەردەمم دادەنا و لەکاتی ڕۆیشتندا دەیانگوت تۆ لەگەڵ ئەوەشدا کە جلکی سریانیت لەبەردایە هەر میسریت و هەموو میسرییەک لە هەرجێگایەک کە بژیت هەرستەمکارە و میسرییەکی باش بەدی ناکرێت مەگەر یەکێ کە مردبێ.

بەهۆی ئەم نەفرەتە گشتییەی کە خەڵکی بەرامبەر بە میسرییەکانیان دەردەبڕی من تێگەیشتم کە چیتر ناتوانم لە ئەزمیردا بژیم، چونکە ئەگەر ئەو خەڵکە بەتەمای کوشتنیشم نەبوونایە، رق و کینەکەیان ژیانی لەمن تاڵ دەکرد و وەک ئەوە وابوو کە پیاوێک لە ماڵێکدا میوان بێت بەڵام خاوەن ماڵەکە رقی لێی بێت کە بەم جۆرە حەوانەوە لەو ماڵەدا زۆر زەحمەت دەبێت.

من داراییەکانی خۆم لە ئەزمیر وەرگرتەوە و خۆم ئامادەی گەڕانەوە بۆ میسر

کرد چونکە لە دوای ئەو چەند ساڵە کە بە وڵاتانی بێگانەدا دەسووڕامەوە ناچاربووم بگەڕێمەوە بۆ میسر و گوزارشتی کارەکەی خۆم بە (هورم هەب)ی فەرماندەی سوپای میسر رابگەیەنم کە پێی سپاردبووم لە وەزعی سەربازی پاشاکان و گەلانی تر زانیاریی بۆ کۆبکەمەوە.

بەیانییەک لە ئەزمیر کاتێک کە خەڵکی لەخەو هەڵسان بیستیان کە شەوی رابردوو سەربازێکی میسرییان سەر بڕیوە. خەڵکی بەم رووداوە بە جۆرێک لە ترسی تووڕەیی فیرعەون هەراسناک بوون کەچوونە ماڵەکانی خۆیانەوە و دەرگەیان لە خۆیان داخست و نەهاتنە دەرەوە. ئەم رووداوە بووە هۆی ئەوەی کە جۆش و خرۆشی خەڵکی لە دژی فیرعەون و میسرییەکان هێور ببێتەوە. بەڵام من دەمزانی کە ئەو دامرکاندنەوەیە کاتییەو لە دوای ئەوە خەڵکی بەرامبەر بە میسرییەکان رق ئەستوورتر دەبن.

هەر وای لێ هات و بکوژی سەربازە میسرییەکە نەدۆزرایەوە و لەدوای دوو سێ رۆژ خەڵکی لە ماڵەکانیان هاتنە دەرەوە و ئەم جارەیان بە شێوەیەک رقیان لە میسرییەکان هەڵگرت کە هیچ میسرییەک نەیدەوێرا بەبێ چەک لە ماڵەکەی بێتە دەرەوە و لەناو شەقامەکاندا بسووڕێتەوە.

من لەبەر ئەوەی جل و بەرگی سریانیم لەبەردا بوو بەبێ مەترسی لەماڵ دەردەچووم و هەندێ لە شەوەکان بۆ پەرستگەی (عەشتار) دەچووم و تا هەندێکی شەو لەوێ دەمامەوە.

شەوێکیان کە لە پەرستگەی (عەشتار) دەگەڕامەوە، تووشی هەندێ لە سریانییەکان بووم و یەکێک لەوان وتی وابزانم ئەم پیاوە میسرییە و ئەگەر میسری بێت ئێمە دەبێ تەمێی بکەین بۆ ئەوەی جارێکی تر نەچێتە پەرستگەکەی ئێمەوە.

دوایی لێم نزیک بوونەوە و وتیان دەمانەوێت تۆ بپشکنین بۆ ئەوەی بزانین میسریت یان نا؟ وتم من لەگەڵ ئەوەشدا کە میسریم، بەڵام بەزۆری دەچمە ئەم



پەرستگەیە و تا ئێستا کەس پێی نەوتووم بۆ ئەم پەرستگەیە مەیە، ئێوە بۆچی رێگام لێ دەگرن؟ سریانییەکان کاتێک کە وەڵامەکەی منیان بیست بەتووڕەییەوە پەلاماریان دام و منیان بە عەرزا دا و سەرمیان کوتا بەزەویدا بەشێوەیەک کە لە دڵی خۆمدا وتم ئەمە دوایین ساتەکانی تەمەنمە. بەڵام لەناکاودا یەکێک لەوان وتی ئاە... ئەم پیاوە سینۆهە(ابن الحمار)ەو دۆستی پاشاکانی سووریایە. ئەوانی تر کە ئەم وتەیەی ئەویان بیست منیان بەرداو دامێنی جلەکانیان بەدەمو چاویاندا گرت بۆ ئەوەی من نەیانبینم و نەیانناسم و بەهاوارکردنەوە رایان کرد و من توانیم هەڵبستمەوە و بگەڕێمەوە بۆ ماڵ.

***

١- باسمان کرد کەهەموو تۆمارکراوەکانی ئەم کتێبە کەپیوەندی بەژیان و رێوڕەسم و بیروباوەڕی گەلانی رابردووەوە هەیە، رووداوی مێژووییەو ئەفسانە نییەو ئێوە لێرەدا دەیخوێننەوە کە کاپتا بۆ ئەوەی خواردنەوە بخواتەوە قامیشێک دەگرێتە دەست و دەیکاتە ناو گۆزەی ئاوی جۆکەوەو دەینۆشێتەوەو ئەمە لەو مێژووەدا بەکارهاتووە چونکە وا دەزانین کە بەقامیش یان قەدی رووەکی گەنم یان برنج مۆدێلێکی تازەیە کە لەئەوروپاوە بۆ رۆژهەڵات هاتبێ، لە کاتێکدا کە ئەم جۆرە نۆشینەوەیە چوارهەزار ساڵ لەمەو بەر لەرۆژهەڵات باو بووەو لەوێوە بۆ ئەوروپا چووە.

# نەخۆشیی منداڵێک

دوو رۆژ دواتر کە خەریکی ئامادەکردنی کەل و پەلی گەڕانەوەم بووم بۆ میسر، و هێشتا نەخۆشەکانم چارەسەر دەکرد، پیاوێک بەسواری ئەسپەوە، کە بە خێرایی با دەڕۆیی لەبەردەم خانووەکەمدا وەستا. لە میسر و سووریا سواربوونی ئەسپ باو نەبوو، چونکە ئەسپ گیانەوەرێکی سەرکێش و مل هوڕ و قەبارە گەورەیە و کاتێک یەکێک سواری دەبێت هەردوو دەستی بەرز دەکاتەوە و سوارەکە بەزەویدا دەدات. هەر لەبەر ئەوەشە کە لە میسر و سووریا خەڵکی لە هەموو کاتێکدا سواری گوێدرێژ دەبن کە ئاژەڵێکی بێ ئازارو گوێڕایەڵەو تەنانەت گالیسکە جەنگییەکانیش گوێدرێژی لێ دەبەستن.

کاتێک کە ئەسپ بە گالیسکەی جەنگییەوە دەبەستن مەترسی زیاتر دەبێت و بەڕادەیەک کێوی دەبێت کە رادەکات و گالیسکەکە تێک دەشکێنێت و دانیشتووانی گالیسکەکە دەکوژێت. لێخوڕینی ئەو گالیسکانەی کە ئەسپیان پێوە بەستراوەتەوە لێهاتووییەکی زۆری دەوێت و دەبێ یەکێک بەردەوام لەسەر پشتی دابنیشێ و پەنجەی خۆی بکاتە ناو کونە لووتی ئەسپەکەوە بۆ ئەوەی ملکەچ بێت.

کاتێک کە سەیری پیاوە ئەسپ سوارەکەم کرد بە هۆی جلەکانییەوە زانیم کە لە دانیشتووانی هەرێمی شاخاویی سووریایەو دوور نەبوو چەتە بێت، چونکە ئەسپ گیانەوەری سواریی رێگرەکان، یان دانیشتووانی چیاکان بوو. پیاوەکە بانگی کرد سینۆهە(ابن الحمار) من لە رێگایەکی دوورەوە و لە وڵاتی (ئامورۆ) وە دێم و پاشای ئەم وڵاتە کە تۆ دەناسێت منداڵێکی هەیە کە نەخۆش کەوتووە



و بەهۆی نەخۆشیی منداڵەکەیەوە لە تووڕەییدا وەکو شێر دڕندە بووە و کەس ناوێرێت لێی نزیک بکەوێتەوە. زوو سندوقی کەرەستەکانی پزیشکیت هەڵبگرە و بەرێ بکەوە و لەگەڵ مندا بۆ وڵاتی (ئامورۆ)وەرە و کوڕی پاشاکەمان چاک بکەوەو ئەگەر دوا بکەوی بەم کێردە سەرت لە لەشت جیادەکەمەوە و سەرە بێ لاشەکەت بەسەر زەویدا دەتلێنمەوە.

وتم ئەگەر تۆ سەرم لە لەشم جیابکەیتەوە کوڕی پاشاکەتان چارەسەر ناکرێت، چونکە ئەگەر سەرم بەلاشەمەوە نەبێت، دەستەکانم ناتوانن منداڵەکە چاک بکەنەوە. من بۆ هاتن و چارەسەری کوڕی پاشاکەت ئامادەم نەک لەبەر ئەوەی کە لە هەڕەشەکەت دەترسێم، بەڵکو لەبەر ئەوەی کە پاشای (ئامورۆ) هاوڕێمەو پێویستە کوڕەکەی چاک بکەمەوە.

پاشای (ئامورۆ) ئەوە بوو کە بەر لە چەند ساڵ لەمەو پێش کە لە سووریا بووم ددانەکانیم چاک کردەوە و دوایی داوای کەنیزە جوانەکەمی کرد و ویستی لێمی بکرێتەوە و وەکو باسم کرد کەنیزەکەم پێی نەفرۆشت و پێشکەشم کرد. بە کاپتام وت بڕوات و کەژاوەیەک بەکرێ بگرێت و بیهێنێت و لەدوای ئەوەی کە هێنای لەگەڵ ئەسپ سوارەکەدا بەرێ کەوتین تا لە دەشتەکانەوە تێپەڕین و گەیشتینە ناوچەیەکی شاخاوی. لەوێ منیان لە کەژاوەکە داگرت و سواری گالیسکەیەکی جەنگییان کردم و ئەو ئەسپانەی کە وابزانم کێوی بوون گالیسکەکانیان بە شێوەیەک بەرێوە دەبرد کە ترسم لێ نیشت گالیسکە کە وەک کەشتیی خوای (ئامون) بە ئاسماندا بفڕێت. من بەترسێکی زۆرەوە هاوارم دەکرد بەڵام ئەوەی گالیسکەکەی لێ دەخوڕی بەبێ ئەوەی گوێ بداتە ترسانی من بەخێرایی لێی دەخوڕی و لەدوای ماوەیەک کە بەوشێوەیە رێگامان بڕی گالیسکەکە وەستا.

من خۆشحاڵ بووم چونکە وام زانی سەفەرەکەمان کۆتایی پێ هاتووە، بەڵام منیان لەو گالیسکەیە هێنایە خوارەوە و سواری گالیسکەیەکی تریان کردم کە

ئەسپی تازە نەفەسی پێوە بوو و دیسانەوە گالیسکەکە بە وزەی ئەسپە بەهێز و کێوییەکانەوە بەڕێ کەوت و من هاوارم دەکرد و دەمگوت هێواش بڕۆن و هەر کاتێک کە خێرایی گالیسکەکە کەم دەبووەوە و دەمتوانی دەستم لە قەراغەکەی بەربدەم پشتی عارەبانچییەکەم دەدایە بەرمست، بەڵام ئەو بەبێ ئەوەی گوێی بداتێ و بڵێ بۆچی بەمست لێم دەدەی هەر بە خێرایی دەڕۆیی.

هێشتا نازانم کە لەو ڕێگا شاخاوییانە، لە کاتێکدا کە ئەو ئەسپە سەرکێشانە گالیسکەکەیان ڕادەکێشا، چۆن وەرنەگەڕاین و گالیسکەکەمان تێک نەشکاو نەکوژراین.

بەرلەوەی خۆر لە ئاسۆی ڕۆژئاوا نزیک ببێتەوە لەو هەرێمە شاخاوییە گەیشتینە شارێک کە شوورەیەکی تازە دروست کراوی لێ بوو و دەروازەکەی داخرا بوو، بەڵام کە ئێمەیان بینی دەروازەیان کردەوە و گالیسکەکەمان بە هەمان خێراییەوە کە لە ڕێگا شاخاوییەکانەوە دەهات بەناو شەقامەکانی شاردا ڕۆیشت و لە ڕێگا هەندێ لە ژن و پیاوەکان سەبەتەی پڕ لە میوەیان بەرەڵلا کرد و لەترسی گالیسکەکە هەڵدەهاتن و گۆزە پڕ لە ئاوەکان دەکەوتن و دەشکان.

کاتێک کە لەبەردەم کۆشکی پاشای (ئامورۆ)دا وەستاین و منیان دابەزاند بە جۆرێک ئەندامەکانی لەشم کوترا بوو کە نەمدەتوانی بەرێدا بڕۆم و بەندەکان منیان بەسەر دەستیانەوە بردە ناو کۆشکەوە. لەهەشت گۆشە(سووچ)ەکەی کۆشک دەیان جۆرە چەک و کلکی شێرو پەڕی باڵندەکانیان بەدیوارەوە هەڵواسیبوو کە گەیشتمە ژوورەوە پاشای (ئامورۆ) وەکو فیلێک کە بەدەستی ڕاوچی بریندار کرا بێ و شاڵاو ببات، بەرەو من هات.

سەیرم کرد کراسەکەی دڕابوو و خۆڵەمێشی بەسەر خۆیا کرد بوو. هاواری کرد ئەی چەتەکان بۆ ئەوەندە درەنگ هاتن؟ ئایا بەقەستی خۆتان دواخست کە کوڕەکەم بە نەخۆشییەوە بمرێ. پاشا ئەوەندە تووڕە بوو کە تەوقە ئاڵتوونییەکەی بەدەوری ردێنەوە بەستبووی کرایەوە. گالیسکەچییەکە وتی ئەمرۆ ئێمە ئەوەندە



بە خێرایی بەشاخەکانەوە تێدەپەڕین کە باڵندەکانیش نە دەگەیشتنە ئێمە و تۆ دەبێ مەمنوونی ئەم پزیشکە میسرییە بیت، چونکە هەرکاتێ کە ئێمە خاومان دەکردەوە ئەو بەمست دەیکێشا پیاماندا کە خێراتر بڕۆین و بەشێوەیەک دەیقیراند کە ئەسپەکانمان هەڵدەبەزینەوە و بە خێرایی گالیسکەکەیان ڕادەکێشا. هیچ یەکێک لە باو باپیرانی ئێمە بە بیریان نایات کە ماوەی نێوان ئەزمیر و ئامورۆ بەم ماوە کەمە بڕابێت.

دوایی پاشا منی لەباوەش گرت و ماچی کردم و دەستی بەگریان کرد و وتی: سینۆهە تۆ دەبێ کوڕەکەم چارەسەر بکەیت و من سەلامەتیی کوڕەکەم لە تۆ دەوێت.

وتم جارێ تۆ بهێڵە کوڕەکەت ببینم و بزانم نەخۆشییەکەی چییە ئینجا خەریکی چارەسەر کردنی دەبم.

پاشا منی لەگەڵ خۆیدا بردە هۆدەیەکەوە و بینیم ئاگردانێکی گەورەی پڕ لە ئاگریان لە ژوورەکە داناوە و منداڵێک لە لانکێکدا ڕاکشابوو، بەڵام بە جۆرێک بە پارچەی خوری پێچابوویانەوە کە ڕەنگی منداڵەکە ڕەش هەڵگەڕابوو و عارەق لە سەروچاویدا دەتکایەوە و بەدەنگی بەرز دەگریا. من بە بینینی منداڵەکە یەکسەر زانیم کە هیچ نەخۆشییەکی نییە مەترسیی مردنی لێ بکرێت چونکە ئەگەر لە مردن بووایە بەو شێوەیە هاواری نەدەکرد. سەیرێکی دەوروبەرم کرد و بینیم ژنێکی قەڵەو و سپی لە هۆدەکەدا دانیشتبوو و بە گریانەوە سەری بەزەویدا دەدا و ناسیمەوە و زانیم کە ئەو کەنیزەیە کە خۆم دابووم بە پاشا. چەند ژنێکی تریش لە ناو هۆدەکەدا بوون و ئەوانیش دەگریان و بینیم دەموچاوی هەندێکیان بریندار بوو و پاشان بۆم دەرکەوت کە پاشا لێی دابوون، لەبەر ئەوەی نەیانتوانیبوو منداڵەکە هێور بکەنەوە.

بە پاشام وت ئەوەندە بێ هورە مەبە چونکە منداڵەکەت نامرێت و من بەرلەوەی چارەسەری بکەم دەبێ خۆم خاوێن بکەمەوە و لە پێش هەموو شتێکدا

ئەم ئاگردانە لێرە ببەنە دەرەوە.

دایکی منداڵەکە کە لە رابردوودا کەنیزی خۆم بوو وتی ئەگەر ئاگردانەکە ببەنە دەرەوە منداڵەکەم سەرمای دەبێت، وتم نا منداڵ لە هەوای هاویندا سەرمای نابێت. ئاگردانەکە ببەنە دەرەوە و ئەگەر سەرمای بوو من لێی بەرپرسم.

ژنەکە منی ناسییەوە و بزەخەنەیەکی هات و وتی ئاە... سینۆهە؛ ئەمە تۆی... کاتێک کە هاتیتە ژوورەوە نەمناسیتیەوە چونکە سەیرم کرد کراسی سریانیت لەبەردایە. وتم ئەوەندە بەپەلە بۆ چارەسەرکردنی ئەم منالە بەرێ کەوتم، کە نەمتوانی کراسە سریانییەکەم دابنێم و جلی میسری لەبەر بکەم.

پاشا کە هێشتا چاوی بە فرمێسک بوو وتی سینۆهە کوڕەکەم سێ رۆژە خواردن ناخوات و هەر چییەک دەخوات دەیهێنێتەوە و بەشێوەیەک هاوار دەکات و دەناڵێنێ کە ناتوانم یەک ساتیش ئارام بگرم.

وتم دایەنەکان و بەندەکان ببەنە دەرەوە و دوایی خۆم شوشت و لەدوای خاوێن بوونەوەم وتم پەنجەرەکانی ژوورەکە بکەنەوە و خۆشم ئەو پارچە خورییانەی کە لە منالەکەیانەوە، پێچابووکردمەوە. منالەکە کە تائەو کاتە هاواری دەکرد و دەینالاند، هێور بووەوە و قاچە ئەستورەکانی خۆی جوولاندەوە و سەیرم کرد منداڵەکە لەگەڵ ئەوەشدا کە ساوا بوو وەکو باوکی قژێکی رەش و زۆری هەیە. هەندێک لێی ورد بوومەوە کە بزانم نەخۆشییەکەی چییە و لەناکاودا دەمی منداڵەکە کەوتەوە یادم و دەمیم کردەوە و بینیم ددانێکی بچووک لەناو دەمیدا رواوە و تێگەیشتم کە نەخۆشیی منداڵەکە تەنها ددان هاتنەکەیەتی.

بانگی پاشام کرد و ددانی منداڵەکەیم پێ نیشان داو وتم سەیرکە، تۆ تەنها بۆ ئەم رووداوە بێ بایەخە ناودارترین پزیشکی سووریات بە ئەسپە کێوییەکان هێناوەتە ئێرە و زیاتر لە پەنجا جار منت خستە بەر مەترسیی مردن لەکاتێکدا کە هەرکەسێ کەمێک ئەزموونی هەبێت دەزانێت کە کاتێک منداڵ ددانی دێت بێ تاقەت دەبێت و لەوانەیە تای لێ بێت و ئەو تایە مەترسیدار نییە، بەڵام



رشانەوەکەی هۆیەکی سروشتیی هەیە، چونکە تۆ و دایکی و دایەنەکان بەردەوام شیری چەورتان کردۆتە ناو سکی ئەم منالەوە و ئەویش کە نەیتوانیوە تەحەمولی ئەو هەموو شیرە بکات، دەرشایەوە. ئێستا بەدایکی بڵێ کاتێک کە مەمکی دەداتێ ئاگادار بێت چونکە لەوانەیە منداڵەکە بە ددانی مەمکی بریندار بکات.

دەمی منداڵەکەم لەبەردەم پاشا کردەوە و ددانەکەم نیشانی دا. پاشا کاتێک کە لە نەخۆشیی منداڵەکەی تێگەیشت و زانی مەترسیی نییە لە هۆدەکەدا کەوتە سەماکردن و دایکی وتی هەرگیز ددانی وا جوانم لە دەمی هیچ منداڵێکدا نەبینیوە. کاتێک کە ویستی دووبارە منالەکە لە پارچەکانەوە بئالێنێ من نەمهێشت و وتم: کراسێکی کەتان بۆ داپۆشینی ئەو بەسە.

پاشا هیچ بە خەیاڵیدا نەدەهات کەمنی لە ئەزمیرەوە بۆ شتێکی ئەوها بێ بایەخ بانگ کردووە و فرمانی دا گەورەکانی دەربار و هاوڕێکانی بێن و ددانی منالەکەی ببینن و ئەوان لە ناکاودا هێرشیان کردە ناو ژوورەکەوە هەموویان دەیانویست پەنجەئەستوور و پیس و خۆڵاوییەکانیان بکەنە ناو دەمی منداڵەکەوەو دەست لە ددانی بدەن، بەڵام من بە پاشام وت ئەوان دوور بخاتەوە، ئەگەر نا منالەکەی بەراستی نەخۆش دەکەوێت.

لەدوای ئەوەی گەورەکانی کۆشک و هاوڕێکانی رۆیشتن پاشا وتی: ئەم منالە لە پێڵووی چاوەکانم خۆشەویستترەو لە هەموو ئەو شتانەی کە من هەمە گرانبەهاترە و چەند شەوێک دەبێت کە من بە دیار لانکەکەیەوە نەنوستوومە، چونکە دەترسام بمرێت و لەدوای من کەس نەبێت کە لە جیاتی من لەوڵاتی (ئامورۆ) پاشایەتی بکات.

دوایی دەستی خستەسەر سەری من و وتی سینۆهە تۆ نازانی کە بەبۆنەی ئەوەی ئەم بارە قورسەت لەسەر سینەم هەڵگرت، چەندە خۆم بە قەرزاری تۆ دەزانم. دوایی منداڵەکەی نیشان دام و وتی تۆ کە وڵاتێکی زۆرت بینیوە ئایا تا

ئێستا دیوتە منداڵێک لەم تەمەنەدا ئەوەندە جوان بێت. قژە زۆرەکانی کوڕەکەم لە یاڵی شێر دەچێت و سکە قەڵەوەکەی لە بەرمیلێکی بچووک دەچێت و دەست و قاچە ئەستوورەکانی وا نیشان دەدات کە لە ئایندەدا وەک من بەهێزو بەقوەت دەبێت.

شەو داهات و هەوا تاریک بوو و چراکانیان هەڵکردو من کە بەهۆی ئەو سەفەرە بەپەلەو خێرایە پێویستم بە پشوودان بوو و نەمدەتوانی گوێ لە قسەکردنی پاشا بگرم، پێم وت ئەمڕۆ لە بەیانییەوە تا نزیکی ئێوارە من لەناو گالیسکەکانی تۆ بە ڕێگا شاخاوییەکانەوە بە خێرایی با دەهاتم و ئێستا لەتاو ماندوێتیم هەموو ئەندامەکانی لەشم ژان دەکەن و دەبێ نان بخۆم و پشوو بدەم، بەڵام تۆ لە جیاتی ئەوەی خواردنم بدەیتێ وبڵێیی جێگایەکی نووستنم بۆ ئامادە بکەن بەردەوام قسەدەکەی.

پاشا پێکەنی و وتی منیش چەند ڕۆژێکە لەتاو خەم و پەژارە نەمدەتوانی خواردن بخۆم، بەڵام ئەمشەو دەتوانم تۆڵەی رابردووش بکەمەوە. دوایی فەرمانی دا خواردنمان بۆ بهێنن و بەندەکانی مەڕو بەرخی برژاوو نانیان بۆ هێناین و لەدوای ئەوەی کە تێرم خوارد هەستم کرد ماندوویەتییەکەم کەمتر بووتەوە.

من چەند ڕۆژێک لەلای پاشا مامەوە و ئەو دیاریی گرانبەهای لە زێڕو کانزا پێدام و سەرنجم دا کە ئەو لەچاو جاری پێشوو کە من بینیبووم دەوڵەمەندتر ببوو. لێم پرسی ئەو سامانەت لە کوێوە دەست کەوتووە چونکە جاری پێشوو ئەوەندە دەوڵەمەند نەبووی. وەڵامی دایەوەو وتی سینۆهە ئەو ژنەی کە تۆ پێت دام سەربەرست بوو و بووە هۆی دەوڵەمەندیم.

لەو چەند ڕۆژەدا کەمن لەلای پاشای ئامورۆ بووم ژنە خۆشەویستەکەی واتە کەنیزەکەی کە من دابووم پێی بەباشی میوانداریی لەمن کرد و بۆم دەرکەوت کە ئەو لەگەڵ ئەوەشدا کە قەڵەو بوو، بەڵام دیسانەوە هەوڵ دەدات خۆی قەڵەوتر بکات، چونکە لە وڵاتی (ئامورۆ) بە پێچەوانەی میسر هەرچەندە ژن قەڵەوتر



بێت زیاتر پەسند دەکرێت و لەبەر ئەوە لەو وڵاتەدا هەمووان، تەنانەت منداڵەکان هەندێ گۆرانییان دەوت کە تیایدا باس لە جوانیی ئەو ژنە دەکراو گوێم لێ بوو ئەو ئاوازانە یەک جۆر بوو و چەند وشەیەکیان دەیان جار دووبارە دەکردەوە، بەبێ ئەوەی لە دووبارەکردنەوەی ئەو بابەتانە بێزار بن.

پاشای ئامورۆ ژنی تریشی هەبوو کە کچی سەرۆکی هۆزەکان بوون، بەڵام تەنها بۆ دەربڕینی وەفاداری دەچووە ماڵەکانیان و بە منی وت حەز ناکەم کاتەکانی خۆم لەگەڵ ئەوانەدا بەسەر ببەم، بەڵام لەبەر ئەوەی کچی سەرۆک هۆزەکانن دەبێ لەگەڵیاندا بگونجێم بۆ ئەوەی لە نێوان من و سەرۆکی هۆزەکان ناکۆکی دروست نەبێت. پاشای ئامورۆ کە دەیزانی من سەفەرێکی زۆرم کردووە و وڵاتێکی زۆرم بینیوە بە پێویستی دەزانی کە لەلای من خۆی هەڵبکێشێت بۆ ئەوەی من تێ بگەیەنێت کە ئەو لە پاشاکانی تر بچووکتر نییە و لەگەڵ وەسف کردنی خۆیدا هەندێ شتیشی پێم وت کە من دڵنیام لە دوای ئەوەی لە وڵاتەکەی ئەو دەرچووم لە باس کردنی ئەو بابەتانە پەشیمان دەبێتەوە. بۆ نموونە وتی: بەکرێ گیراوەکانی ئەو پێیان سپێردراوە کە لە ئەزمیر ئازاری میسرییەکان بدەن و ئەو شەوەش کە پەلاماری منیان دابوو، بەدەستی بە کرێ گیراوەکانی ئەو لێم درا، بەڵام ئەوان نەیاندەزانی کەمن سینۆهەم ئەگەر نا لێیان نەدەدام. هەروەها ئەو سەربازە میسرییەی کە لە ئەزمیر کوژرا پیاوەکانی ئەو کوشتبوویان. پاشا وتی: ئازاردانی میسرییەکان لە ئەزمیر ئەوەندە درێژە دەکێشێت هەتا میسرییەکان واز لە سووریا دەهێنن و دەڕۆن هەروەها دەیگوت دانیشتووانی ئەزمیر و بەندەرەکانی تری سووریا لە کەنارەکان، خەڵکانێکی ترسنۆک و خۆپارێزن و جگە لە قازانجی خۆیان هیچ بیروڕا و مەبەستێکی تریان نییە چونکە هەموویان مامەڵەچین و لەبەر ئەوە دەبێ پیاوێکی بە جەرگ پێشەوایەتیی ڕاپەڕینێکی دژبە میسر بگرێتە ئەستۆی خۆی و میسرییەکان لە سووریا دەر بکات بۆ ئەوەی سووریا بگات بە ئازادیی پێشووی خۆی.

وتم بۆچی تۆ ئەوەندە بەرامبەر بەمیسرییەکان کینەت لە دڵدایە، من باوەڕناکەم میسرییەکان لە گەلانی تر خراپتر بن.

پاشا دەستی بە ریشە لوولەکەی خۆیدا هێناو وتی: من رقم لە میسرییەکان نییە، لەبەر ئەوەی تۆ میسریت و رقم لە تۆش نییە و من لە منداڵییەوە لە کۆشکی فیرعەون بوومە و لە میسرییەکانەوە فێری زۆر شت بووم و توانیم لەوێ فێری خوێندن و نووسین ببم و رابردووەکانی ژیانی من بەو شێوەیەیە کە دەبێت میسرییەکانم خۆش بوێت نەک رقم لێیان بێت، بەڵام تۆ سینۆهە لەگەڵ ئەوەشدا کە پزیشکێکی گەورەیت و زۆر وڵاتت بینیوە لەبەر ئەوەی پاشایەتیت نەکردووە ناتوانی تێ بگەیت کە لە دیدی پاشایەک یان سەرۆکی وڵاتێک رق و کینە چ واتایەکی هەیە.

پاشا یان سەرۆکی وڵات، لەگەڵ هیچ میللەتێکدا رق و کینەی نییە و لە خۆیدا بەرامبەر بە هیچ قەومێ هەستی دوژمنایەتیی نییە. بەڵام کینە لە دەستی پاشاو سەرۆکی وڵات هۆکارێکی بەهێزە و تەنانەت لە چەکیش بە هێزترە. دوایی وتی هەتا خەڵکی کینەیان نەبێت ناتوانن ئەو دەستەی کە شمشێرو نێزەکانیان پێ گرتووە بەرزی بکەنەوە و بیوەشێنن. سەرۆکی وڵاتێک کە خۆی رقی لە هیچ گەلێک نییە دەبێ کینە لە دڵی خەڵکیدا دروست بکات بۆ ئەوەی بتوانێت بەهۆی نەفرەتی ئەوانەوە دەسەڵات بەدەست بهێنێت و منیش کینەی میسرییەکان دەخەمە ناو دڵی خەڵکی سووریاوە و ئەوەندە ئەم رق لێ بوونەوەیان بەهێز دەکەم کە هەموو کەسێکی خەڵکی سووریا دڵنیابێت لەوەی کە لە میسرییەکان بێ بەزەییترو سووکتر و فێڵبازتر لە هیچ جێگایەکدا نییەو دەبێت ئەم دوژمنایەتی و رق ئەستوورییە ئەوەندە بەتین بێت کە هەر ژن و پیاوێکی سریانی بەبیستنی ناوی میسرییەکان لەشی لە رق و نەفرەتدا بکەوێتە لەرزە و ئیمانی بەوە هەبێت کە میسرییەکان ترسناکترین و خوێن مژترین و دڵ رەقترین گەلێکن کە لە سەرەتای دروست بوونی دنیادا هاتوونەتەکایەوە و لەمەو بە دواش لەوان خراپتر



دروست نابێت. کاتێک کە رقی سوورییەکان بەرامبەر بە میسر گەیشتە ئەم ئاستە، ئەوساکە ئەم دوژمنایەتییە ئەوەندە بەهێز دەبێت کە دەتوانێت کێو بهێنێتە لەرزە، تا چ بگات بە دەرکردنی دەسەڵاتدارانی میسری و سوپاکەیان لە سووریا.

وتم ئێوە خۆتان دەزانن کەوا نییە و ئەوەی دەیڵێن لەراستییەوە دوورە. پاشا وتی راستی ئەوەیە کە من دەیخەمە ناو مێشکی خەڵکی سووریاوەو کاتێک کە من شتێکم خستە ناو گیانیانەوە، باوەڕ دەکەن کە ئەو شتە حەقیقەتە و بەشێوەیەک باوەڕیان پێی بەهێز دەبێت کە ئەگەر هەر کەسێ بە پێچەوانەی ئەوە شتێک بڵێت دەیکوژن.

من بە خەڵکی سووریا رادەگەیەنم کە ئەوان بۆ ئەوە دروست بوونە کە بە ئازادی بژێن و ئازادی شتێکە کە لە خواردن و جل و بەرگ و خانوو وتەنانەت گیانی مرۆڤیش بایەخی زیاترە و خەڵکی بەهۆی ئەم راگەیاندنانەی من ئەم راستییە دەسەڵمێنن و ئەوەندە باوەڕ و خولیای ئازادی دەکەوێتە مێشکیانەوە کە ئامادە دەبن لە پێناویدا گیانی خۆیان بەخت بکەن و هەرکەسێک کە باوەڕی بە ئازادی هەبێت هەوڵ دەدات خەڵکانی تریش بهێنێتە ریزەوە و ئەوەندەی پێ ناچێت کەلەسەرتاسەری سووریادا جگە لە یەک بیروباوەڕ هیچ شتێکی تر دروست نابێت کە ئەویش بڕوا گەیشتن بە ئازادییە و دانیشتووانی سووریا تێ ناگەن کە باوەڕیان بەشتێکی خەیاڵی هەیە، چونکە ئەو ئازادییە شتێکە کە نەک تەنها گەلی سووریا، بەڵکو هیچ گەلێکی تر نییەتی، بەڵکو بەهانەیەکە کە من بەهۆیەوە خەڵکی سووریا دەخافڵێنم بۆ ئەوەی خۆم بتوانم لە سووریادا بمێنمەوە. ئێوەش کاتێک کە هاتنە سووریا دروشمەکەتان ئەوە بوو کە بە تەمان سووریا ئازاد بکەن و بەم دروشمە کە لە دیدی خەڵکیدا رواڵەتێکی بریقەداری هەبوو، هەموو دانیشتووانی سووریاتان کرد بە بەندەی خۆتان و ئێستا باجیان لێ دەستێنن.

وتم ئایا تۆ باوەڕت بە ئازادی نییە.

وتی نا و چونکە تۆ پزیشکیت ناتوانی لەوە تێبگەی کە هیچ دەسەڵاتدارێک باوەڕی بە ئازادی نییە بەڵکو بەو دروشمە خەڵکی فریو دەدەن بۆ ئەوەی خۆیان بتوانن حوکم بکەن. من خەڵکی سووریا وا تێدەگەیەنم کە پێویستە ئازاد بن و بە ئازادی ناگەن هەتا ئەو کاتەی کە لە دژی میسر یەک دەگرن و کاتێک کە میللەتی سووریا یەکیان گرت و بە باوەڕی خۆیان گەیشتن بە ئازادی، بێ ئاگان لەوە کە ئەوان ئەو ئازادییەیان بۆ من ڕەخساندووە کە بتوانم فەرمانڕەوایییان بەسەردا بکەم و ئەوان دەبێ وەکو هەمیشە زەحمەت بکێشن و سەرانە بدەن و بەکورتی لە ڕابردوودا میسر ئەو سەرانەیەی لێ دەسەندن و لە دوای ئەوە من لێیانی دەستێنم و بەردەوام پێیان دەڵێم کە ئێوە لە هەموو گەلانی تری ئەم دنیایە بەختەوەر ترن. چونکە ئازادن و ئەوانیش بەو دروشمە خەیاڵییە دڵخۆش دەبن.

سینۆهە تۆ ئەوە نازانیت کە میللەت وەکو مێگەلێکی مەڕ وایە و دەبێ بەشتێکەوە خەریکیان بکەیت بۆ ئەوەی بتوانی فەرمانڕەواییان بەسەردا بکەیت و یەکێک لە باشترین هۆکارەکانی سەرگەرم کردنی خەڵکی ئەوەیە کە پێیان بڵێی ئێوە ئازادن و بۆ ئەوە دروست بوونە کە لە ئازادیدا بژێن و خەڵکی لەبەر ئەوەی ڕەشۆکین، هەر چییەک ببیستن دەیسەڵمێنن و بەڕاستی دەزانن. بەگشتی دەبێ ئەوەندە ئەو بابەتە بە گوێی خەڵکیدا بخوێنینەوە هەتا لە ڕوحیان و لە باوەڕیاندا دەچەسپێت.

وتم ئایا دەزانی قسەکانی تۆ چەندە ترسناکە و ئەگەر فەرماندەی میسر بزانێت کە تۆ چ مەبەستێکت هەیە گالیسکە جەنگییەکانی خۆی دەنێرێتە وڵاتەکەت و ئەم شارە وێران دەکات و تۆش دەسگیر دەبی و سەر بەرەو خوار لە سێدارەت دەدەن. یان دەتبەنە **تەبەس** و لەوێ بەدارەوەت دەکەن.

پاشا وتی فیرعەونی میسر باوەڕی بە من هەیە چونکە (خاچی ژیان)ی[1]



پێداوم ومن پەرستگەیەکم بۆ خوایەکەی دروست کردووە و ئەو زیاتر لە هەندێ لەسەردارەکانی خۆی باوەڕی بەمن هەیە، ئێستا وەرە بڕۆین شتێکت پێ نیشان بدەم کە لەلات سەیر بێت.

بەیەکەوە بەرێ کەوتین و ئەو منی بەرەو شوورەی (دیوار) شارەکە برد و سەیرم کرد پیاوێکیان لەبان دیوارەکەوە سەرە و ژێر هەڵواسیوە. پاشا وتی ئەم پیاوەی کە دەیبینی میسرییە و ئەگەر گومانت لە ڕەگەزەکەیدا هەیە سەیری خەتەنەکەی بکە بۆ ئەوەی شکت نەمێنێ.

پرسیم بۆچی ئەم میسرییە بەدبەختەتان هەڵواسیوە؟

وتی ئەم پیاوە باج وەرگری فیرعەون بوو و هاتبووە ئێرە کە داوای سەرانەمان لێ بکات و دەیگوت چەند ساڵێکە باجتان دواخستووەو دەبێ خەراجی ئەو چەند ساڵە بدەن.

وتم تاوانی کوشتنی ئەم پیاوە بێ چارەیە بەگەردنی تۆوە دەبێت و تۆ گرفتاری سزایەکی سەخت دەبیت، چونکە لە میسر دەتوانی گاڵتەبە هەموو شتێک بکەی جگە لە باج وەرگری فیرعەون کە پێسپێردراوی وەرگرتنی باجە.

پاشا پێکەنی و وتی من بە جۆرێک پیلانەکەم داڕشتووە کە فیرعەون لە جیاتی ئەوەی لێم تووڕە بێت دەستخۆشیشم لێ بکات کە ئەم فەرمانبەرە گەندەڵەم بە سزای خۆی گەیاندووە. چونکە زیاتر لە دە لەوحەم بۆ دەسەڵاتدارانی میسر ناردووە کە لە سەریان نووسیومە کە ئەم پیاوە لەدوای ئەوەی هاتووەتە سووریا لە وڵاتەکەی مندا دەست درێژیی کردووەتە سەر ژنان و جنێوی بە خوایەکانی سووریا داوەو لە پەرستگەکەی ئێمەدا کرداری ناشیرینی تریشی کردووە و لە یاساکانی ئێمە نووسراوە کە ئەگەر پیاوێک بەبێ ڕەزامەندیی ژنەکە بە زۆر لەگەڵیدا کۆببێتەوە، یان جنێو بە خوایەکان بدات، یان لە پەرستگە کاری پیس و پۆخڵ بکات دەبێ بکوژرێت.

هەرچەندە زیاتر لەگەڵ پاشای (ئامورۆ)دا گفتوگۆم دەکرد لەدیدمدا زیاتر لە

(هورم هەب)ی فەرماندەی سوپای میسر دەچوو، کەمنی راسپاردبوو زانیاری لە وڵاتانی ترەوە بۆ کۆ بکەمەوە و جیاوازییەک کە ئەم دووانە لەگەڵ یەکتریدا هەیان بوو ئەوە بوو کە پاشای ئامورۆ لە (هورم هەب) بەتەمەنتر و فێڵبازتر بوو، چونکە پاشای ئامورۆ لە وڵاتێکدا پاشایەتیی دەکرد کە لە کۆنەوە دەسەڵاتدارانی ئەوێ بەردەوام لەگەڵ پاشاکانی تری سووریادا بەشەڕ دەهاتن و ئەوانیان دەکوشت، یان خۆیان دەکوژران و ناکۆکی و دژایەتیی هەمیشەیی لەگەڵ دراوسێکاندا، ئەم جۆرە پاشایانە لە هونەری سیاسەتدا شارەزاتر و بەئاگاتر دەکات.

لەگەڵ ئەوەشدا کە پاشای ئامورۆ فێڵبازترو لێهاتووتر دەهاتە بەرچاو بەڵام من لەو باوەڕەدا نەبووم کە توانای پاشایەتی کردنی بە سەر سووریادا هەبێت. پێم وت تۆ ئەگەر چی لە منداڵییەوە لە میسر ژیاویت، بەڵام لەبەر کەم تەمەنیت نەتتوانیوە هەست بە گەورەیی و دەسەڵاتی فیرعەونی میسر بکەیت چونکە فیرعەون سامانێکی زۆری هەیە و دەتوانێت سوپایەکی گەورە بەرەو وڵاتەکەت بنێرێت و ئەم سەرزەمینە وێران بکات و تۆ نابێت بە دەسەڵاتی خۆتەوە بنازی و وابزانی کە دەتوانی لەگەڵ فیرعەونی میسردا رکەبەری بکەیت. کاتێک کە کیسەیەک بە رۆن چەور دەکەن و دوایی کونەکانی دەگرن و هەوای تێ دەکەن کیسەکە دەئاوسێ و خاوەنەکەی وا دەزانێت کە شتێکی گەورەی لەدەست دایە. بەڵام کە کیسەکە کون دەکەن بایەکەی بەتاڵ دەبێتەوەو دەگەڕێتەوە دۆخی یەکەم. تۆش ئێستا وەک کیسەیەک وای کە هەوایان تێ کردبێت و هەرئەوەندە کونێکت تێ بکەن یەکسەر فس دەبیتەوە.

پاشا پێ کەنی و رووکەشە ئاڵتونییەکانی ددانەکان دەرکەوت وتی من ئەگەر چی کیسەیەکی پڕ لە هەوام، بەڵام هاوپەیمانی بەهێزم هەیە کە پاشاکانی بابل و (هاتی)ن، کە بۆ دەرکردنی میسر لە سووریا هاوکاریی من دەکەن.

وتم فریوی هاوپەیمانێتیی پاشاکانی بابل و هاتی مەخۆ چونکە چەقەڵ لەوەیە



بۆ راوکردنی ئاژەڵانی تر لەگەڵ شێردا یەک بگرێت بەڵام لە دوای راوکردنی نێچیر باشترینی گۆشتەکە شێر دەیخوات و چەقەڵەکە تەنها ریخۆڵەو گەدەی بۆ دەمێنێتەوە. ئەم دوو پاشایەش کە بۆ دەرکردنی میسر لە سووریا لەگەڵ تۆدا هاوپەیمانن، مەبەستیان ئەوە نییە کە تۆ ببیتە پاشای سووریا. بەڵکو دەیانەوێت وڵاتی سووریا داگیر بکەن و تۆ بەس وڵاتی ئامورۆت بۆ دەمێنێتەوە، ئەویش ئەگەر بۆت بمێنێتەوە.

پاشا زۆر پێ کەنی و وتی سینۆهە من حەز دەکەم کە وەکو تۆ فێری زانست ببم و ببمە زانا و وەکو تۆ بۆ وڵاتانی تر بچم بۆ ئەوەی فێری زانستی ئەو وڵاتانە ببم بەڵام لەبەر ئەوەی کە دەبێت وڵاتەکەی خۆم بەڕێوە ببەم دەرفەتی سەفەرکردن بۆ ئەو جێگایانەم نییە.

ئەو گفتوگۆیانەی کە لەگەڵ پاشای ئامورۆدا کردم منی تێگەیاند کە هەرچی زووتر لە وڵاتەکەی ئەو بگەڕێمەوە باشترە، چونکە ئەگەر فیرعەونی میسر بەتەمای تۆڵەسەندنی باج وەرگرەکەی خۆی بێت لەشکرکێشی دەکات بۆ وڵاتی ئامورۆ و لەدوای هاتنی سوپای میسر بۆ ئامورۆ بوونی من لەو وڵاتەدا باش نییە و لەوانەیە پاشای ئامورۆ لە تاو رق لێ بوونی میسرییەکان من بکوژێت. لەبەر ئەوە رۆژی دوایی بە پاشام وت ماوەیەکە میوانی تۆم و نامەوێت لەمە زیاتر لە میوانداری کردنەکەت کەڵکی نارەوا وەربگرم و ئەگەر کەژاوەیەکم بۆ ئامادە بکەیت دەگەڕێمەوە ئەزمیر و لەوێش نامێنمەوە، بەڵکو دەگەڕێمەوە بۆ میسر، چونکە لە ئارەزووی خواردنەوەی ئاوی نیلم.

من بەراستیم بوو چونکە دەبووایە بۆ میسر بگەڕامایەتەوەو ئاکامی لێکۆڵینەوەکانی خۆمم بە (هورم هەب) رابگەیەندایە.

پاشا وتی باڵندەیەک کە هێلانە دروست ناکات هەرگیز فکری ئاسوودە نابێت و تۆ لەدوای سووڕانەوەت لە وڵاتان، وا باشترە کە واز لە جیهانگەردی بهێنی و لەم وڵاتەدا نیشتەجێ ببی و ئەگەر حەزت لەمانەوە بێت لەم شارەدا خانوویەکت

بۆ دروست دەکەم و یەکێک لە کچە جوانەکانی ئەم شارەت دەدەمێ کە بیکەی بە هاوسەری خۆت.

من بەگاڵتەوە وەڵامم دایەوە ئامورۆ ناخۆشترین وڵاتی جیهانە و ژنەکانی وڵاتی تۆ بۆنی بزنی بەساڵاچوویان لێ دێت و حەز ناکەم لەم وڵاتەدا بمێنمەوە و لەگەڵ ژنێکدا بژیم کە بۆنی ناخۆشی لێ دێت. جگە لەمەش ماوەیەکە لەمیسر دوور کەوتوومەتەوە و بیری وڵاتەکەم دەکەم و دەمەوێت بگەڕێمەوە بۆ ئەوەی گوێم لە دەنگی مراوی و قازەکانی کەناری نیل بێت و لەبەر سێبەری دار خورماکانی میسر دابنیشم و گوێ بیستی گۆرانیی مەلەوانەکانی رووباری نیل بم و هەتاوی گەرمی میسر لە لەشم بدات و دوایی بچم بۆ خانەی ژیان و زانیارییە پزیشکییەکەی خۆم بە قوتابییە گەنجەکانی ئەوێ رابگەیەنم بۆ ئەوەی بایەخی زانستیی خانەی ژیان پارێزراو بێت کە بەردەوام گەورەترین قوتابخانەی پزیشکیی جیهان بووە.

پاشا وتی ئەگەر چی حەز ناکەم لێرە بڕۆی بەڵام لەبەر ئەوەی حەزت بەمانەوە نییە کەژاوەیەکت بۆ ئامادە دەکەم و چەند سەربازێکت لەگەڵدا دەنێرم کە تۆ بگەیەننە ئەزمیر، چونکە رق و کینەی سریانییەکان بەرامبەر بە میسرییەکان بەرادەیەک پەرەی سەندووە کە لەوانەیە لە رێگا بتکوژن.

من کە نەمدەتوانی جارێکی تر بەو گالیسکە جەنگییانە سەفەر بکەم بە کەژاوە لە پایتەختی (ئامورۆ) وە گەڕامەوەو سەربازەکانی ئەو منیان گەیاندە ئەزمیر.

لەگەڵ گەیشتنم بۆ ئەزمیر یەکسەر بە کاپتام وت زوو ئەم خانووەی کە لێرە هەمانە بیفرۆشە، چونکە لەمەو بەدوا ئەزمیر و سووریا بۆ ئێمەو بۆ هەر میسرییەکی تر مەترسیی هەیەو دەبێ بگەڕێینەوە بۆ میسر.

***



(١) لە سەردەمی سینۆهەدا لغاوی ئەسپ دانەهێنرا بوو کە بەهۆیەوە ئەسپەکە ملکەچ بکەن لەبەرئەوە پەنجەی خۆیان دەخستە کونی لووتییەوە کە گوێڕایەڵی بکەن – وەرگێڕ–

# گەڕانەوە بۆ میسر بۆ بینینی هورم هەب

من باسی سەفەرەکەم لە کاتی گەڕانەوەم بۆ میسر ناکەم و تەنها ئەوەندە دەڵێم کە کاتێک کەشتییەکە کەوتە ڕێ هەرچەندە کە لە میسر نزیکتر دەبووینەوە، زیاتر هەستم بەبێ سەبری دەکرد و ئۆقرەم نەدەگرت و بەردەوام لەسەر رووی کەشتییەکە پیاسەم دەکرد، چونکە بەپەلە بووم زووتر بگەمە میسر و کاتێک کە کەشتییەکەمان لە شارەکانی کەناری سووریا لەنگەری دەگرت، لەبارەی وەزعی ژیان و نەریتی دانیشتووانی لێکۆڵینەوەم نەدەکرد لەبەر ئەوەی ماندووببووم و تەنانەت رەنگی کێوەکانی سووریاشم بەلاوە سەیر نەبوو کە لە کاتی ئاوابوونی خۆردا رەنگی ئەرخەوانییان دەگرت.

لە سووریا وەرزی بەهار هاتبوو و پەرەسێلکەکان دەفرین و دەیانجریواند و کاتێک کە لە شارەکانی کەناری دەریا دەوەستاین دەنگی ئەو باڵندانەمان لەبان سەرمانەوە دەبیست.

کاهینەکانی خوای بەعل (خوای سووریا) بە بۆنەی هاتنی بەهار لە پرستگەکاندا هاتبوونە دەرەوە و لە کۆڵانەکاندا دەیاننەڕاند و دەموچاویان دەڕووشاند و لە دوایانەوە ژن و کچە گەنجەکان هەندێ گالیسکەیان رادەکێشا کە خەڵکی دەبوایە دیارییەکانی خۆیان بکردایەتە ناویەوەو پێشکەشی خوای (بەعل)یان بکردایە.بەڵام هەموو ئەمانە لە دیدی مندا کە دەمەویست بگەڕێمەوە بۆ میسر بێ بایەخ بوو و حەزم نەدەکرد جارێکی تر ئەو دیمەنانە ببینمەوە، چونکە لە رابردوودا بینیبووم.

وەزعی من لەو کاتەدا کە بەرەو وڵاتەکەم دەچوومەوە، وەک زانایەک وابوو کە



عاشقی ژنێک بێت و دەزانێت کە دەبێ بۆ چاوپێکەوتنی ئەو ژنە بچێت، یان ژنەکە بێت بۆ ماڵی زاناکەو ئەویش نەتوانێ لاپەڕەکانی پاپیرۆس (کاغەزی میسری کە لە جۆرە گیایەک دروست دەکرێ)ەکەی بخوێنێتەوە و ئەگەریش بیخوێنێتەوە هیچ لەو زانستانە ناگات کە لەسەر کاغەزەکە نووسراوتەوە، مەگەر ئەوەی کە ژنەکە ببینێت و دوایی بە مێشکێکی سافەوە خەریکی خوێندنەوە بێت.

منیش بەبۆنەی ئەوەی کە دەمزانی بۆ میسر دەڕۆم و وڵاتی خۆم دەبینمەوە لە سەیرکردنی دیمەنی شارەکانی سووریا و داب و نەریتی خەڵکەکەی بێزار بووم. دەمەویست خۆم بگەیەنمەوە **تەبەس** و لە سەرەتای شەوەوە لە کۆڵانەکانی شاردا پیاسە بکەم و بەبەردەم خانووە قوڕەکانەوە تێپەڕم و سەیری ئەو ئاگردانانە بکەم کە لە بەردەم خانووەکاندا دانراون و ماسیی لەسەر دەبرژێنن و بە هەناسەی قووڵ بۆنی ئەو ماسییە هەڵمژم و بادەی (شەراب)ی میسر بخۆمەوە و لەسەر زمانم تامەکەی بچێژم و بەئاوی رووباری نیل کە بۆنی قوڕولیتەی لێ دێت خۆم تێر ئاو بکەم، هەرچەندە لەلای من ئەو ئاوە بۆنی خۆشە.

دەمەویست زووتر بگەمە میسر بۆ ئەوەی بەسەر ئەو پاپیرۆسانەدا بڕۆم کە لە کەنارەکانی نیلدا دەڕوێت و لەژێر هەنگاوەکانی پێمدا هەستی پێ بکەم و بۆنی گوڵە کێوییەکانی کەناری نیلم بکردایەو لە کاتێکدا کە خۆر هەڵدێت و لە کۆڵەگە(دینگە) رەنگاورەنگەکانی پەرستگەی (ئاموون) دەدات ستایشی درەوشانەوەی رەنگەکانی بکەم.

لەگەڵ ئەوەش، کە لە شاری **تەبەس** وەکو پێشتر باسم کرد بەدبەخت بووم، بەڵام بەسەرچوونی کات ئەو بەدبەختییەی بە تۆزی فەرامۆشی داپۆشیبوو و لەو کاتەدا کە دەگەڕامەوە خۆم نە بە بەدبەخت دەزانی و نە بە بەختەوریش، بەڵکو دەردی نیشتمیانم هەبوو و دەمویست بڕۆم و خۆم لەو جێگایەدا کە چاوم تیادا هەڵهێنابوو و گەورە ببووم و خۆم تیا ناسیبۆوە ببینم.

کاتێک کە گەیشتینە کەناری زەویی سینا لەگەڵ ئەوەشدا کە وەرزی بەهار بوو بەڵام ئەو بایەی کە لە وشکانییەوە بۆ دەریا دەهات لە دەموچاومان دەکەوت و دەیسووتاندەوە، چونکە بیابانی سینا یەکێکە لە جێگا گەرمەکانی جیهان.

لە پاش ئەوەی ماوەیەک بە درێژایی کەنارە سوورەکانی سینا بەسەر دەریادا ڕۆیشتین، گەیشتینە جێگایەک کە ڕەنگی دەریا زەرد بوو و لەوێ مەلەوانەکان گۆزەیەکیان خستە ناوئاوەکەوە کە بە گوریس بەستبوویانەوەو لە دوای ئەوەی پڕ بوو هەڵیان کێشایەوەو من لەو ئاوەم خواردەوەو هەستم کرد کە تارادەیەک شیرینە و تامی ئاوە لیتاوییەکەی نیلی دەدا چونکە ئاوی شیرین و لیتاوی نیل کاتێک کە دێتە ناو ئاوی سوێری دەریاوەو ماوەیەک لەسەری دەمێنێتەوە بەڵام تێکەڵی ئاوەکە نابێت.

ئەو ڕۆژە کاتێک کە لە ئاوی نیلم نۆشییەوە بە کاپتام وت ئەم ئاوە لە چێژی مندا لە باشترین شەرابەکان بەتام ترە، بەڵام کاپتا وتی ئاو لە هەموو شوێنێ هەر ئاوە ئەگەرچی لەناو ڕووباری نیلیشدا بێت و ناتوانێت جێگای شەراب بگرێتەوە. وتم من لەبەر ئەوە خواردنەوەی ئەو ئاوەم پێ خۆشە، چونکە دەزانم کە گەیشتووینەتەوە میسر.

کاپتا وتی: هەر کاتێ کە خۆم لە یەکێ لە مەیخانەکانی **تەبەس** دا ببینییەوە و ببینیم کە گۆزەیەکی ئاوی جۆیان لەبەردەمم داناوە و لە کاتی خواردنەوەیدا دەنکە جۆ نایەنە ناو دەممەوە، ئەوساکە دڵنیادەبم کە گەیشتوومەتە میسر. چونکە لە دەرەوەی میسر کەس توانای دروست کردنی بیرەی نایابی نییەو ئەوان بە شێوەیەک دروستی دەکەن کە مرۆڤ دەبێ لە پێشا بیپاڵێوێ بۆ ئەوەی دەنکە جۆیەکانی ناوی فڕێ بدات و دوایی بینۆشێتەوە.

بەڵام گریمان خۆمان لە میسر، ببینییەوە، من لەو باوەڕەدا نیم کە گۆڕانکارییەک لە وەزعی ژیانی مندا ڕووبدات، چونکە من هەر بەندە بوومەو چ میسرو چ جێگایەکی تر بۆ من هەر یەکە.



وتم کاپتا سەفەرە دوورو درێژەکانمان تۆی بێ باک کردووەو بە جۆرێک دەدوێی کە جاری وا هەیە لەبیرت دەچێت کە بەندەی منی و بەشێوەیەک وەڵامم دەدەیتەوە کە هەر کەسێ ببیستێ وا دەزانێت مافی خۆتە لەگەڵ مندا دەمەتەقێ بکەیت و ئەگەر لە میسر بوینایە دار حەیزەرانێکم لە کەناری نیل لێ دەکردەوەو چەند دارێکم دەکێشا بە شان و ملتدا و ئەو کاتە تۆ تێدەگەیشتی کە بەندەی و مافی ئەوەت نییە لەگەڵ ئاغاکەی خۆتدا دەمەتەقێ بکەیت.

کاپتا دەستەکانی بە ئەژنۆیەوە ناو داچەمییەوەو وتی گەورەم تۆ هەم پزیشکی و هەم وتەبێژێکی هونەرمەندیشی، چونکە دەزانی کە لە هەر کاتێکدا چ وشەیەک بەکاربهێنی و ئەوەی ئێستا وتت منی خستەوە بیری لێدانی گۆچان و دار حەیزەران و بە یادی هێنامەوە کە لێدان بە گۆچان و دار حەیزەران، زیاتر لە ئاوە لیتاوییەکانی ڕووباری نیل و دەنگی مراوی و قازەکان و بۆنی ماسیی سوورەوە کراو و عەتری بوخووری پەرستگەکانی **تەبەس**، پێناسە و نیشانەی میسرە، چونکە هەزاران ساڵە کە لەم وڵاتە بەندەکان بە گۆچان و دار حەیزەران تەمێ دەکرێن و بەهێزی ئەم دارانەیە کە لە میسردا هەموو شتێ لە جێگای خۆیدا ماوەتەوە و کەس زیاتر لە بەرەکەی خۆی پێ ڕاناکێشێت و لەگەڵ ئەوەشدا کە هەزاران ساڵە میسر هەیە، بەڵام هیچ شتێک گۆڕانی بە سەردا نەهاتووە و ئێستا، کە دەبێ بە دار حەیزەران دارکاری بکرێم، دڵنیابووم کە گەیشتوومەتە میسر و سەردەمی سەفەرە درێژەکانمان کە تیایدا زۆر شتی سەیرم بینی، بەسەر چوو ... ئاە ... ئەی دار حەیزەران ... خوایەکانی میسر بەرەکەتت تێ بخەن، چونکە دەتوانی هەموو کەسێ لەسەر جێگای خۆیدا دابنیشێنیتەوەو نەهێڵی کە کەس لە سنووری خۆی زیاتر پێ رابکێشێت.

لە دوای ئەم قسەیە کاپتا بەهۆی کارتێکردنی زۆرەوە کەوتە گریان و دوایی بەرەو سووچێکی کەشتییەکە ڕۆیشت و لەوێ نووست و تا ئەو کاتەی کە کەشتییەکەمان گەیشتە ناو بەندەر کاپتا هەر نووستبوو.

کاتێک کە کەشتی چووە ناو رووباری نیلەوە و لەناو بەندەردا وەستا چاوم بە بارەبەرە میسرییەکان کەوت کە تەنها سوخمەیەکیان لەبەردا بوو و ریشیان تاشیبوو و لەو کاتەدا هەستم کرد کە چەند رقم لە جل و بەرگی درێژ و ردێنی لوولی سریانییەکانە.

لە سووریا ژن و پیاو قەڵەو بوون، بەڵام ئەو کاتەی کە چوومەوە میسر بینیم ژن و پیاوە میسرییەکان قەد باریک بوون و لەشیان بەهۆی بەزو چەورییەوە قەڵەو نەبوو. تەنانەت بۆنی عارەقەی لەشی بارەبەرەکانیشم لەلا خۆش بوو و لەو کاتەی کە ناوی من و کاپتایان نووسی کاپتا خۆی بە خەڵکی سووریا نووسی بۆ ئەوەی کەس ئازاری نەدات (چونکە بەندەیەکی هەڵهاتوو بوو). ئێمە لە کەشتییەکە دابەزین و من جل و بەرگە خوربیە سریانییەکەم داکەندو کراسی کەتانیی میسریم لەبەرکرد.

لە پاش ئەوەی کە دوو رۆژ لە بەندەر پشوومان دا سواری کەشتییەک بووین کە بەرەو **تەبەس** دەڕۆیشت و لەوە بەدوا سەفەرەکەمان لەسەر ئاوی نیلدا دەستی پێ کرد. ئێمە کە ماوەیەک بوو دیمەنەکانی میسرمان نەبینیبوو لە بەیانییەوە تا ئێوارە لەسەر کەشتییەکە سەیری کەنارەکانی راست و چەپمان دەکرد و بە دیتنی گوندنشینە رەش و رووتەکان کە بە گایەکانی خۆیان جووتیان دەکرد و هەروەها بە بیستنی دەنگی قاز و مراوی و حاجی لەق لەقەکانی چێژمان وەردەگرت.

هەر کاتێک کە کەشتی لە یەکێک لە کەنارەکانی رووباردا دەوەستا، کاپتا یەکسەر دادەبەزی و خۆی دەگەیاندە مەیخانەیەک و گۆزەیەک بیرەی میسریی دەنۆشییەوەو ئەو شتانەی کە لە وڵاتانی تر بینیبووی بۆ کرێکارەکانی دەگێڕایەوە کە لە مەیخانەکەدا بوون و ئەوان بە جۆرێک لە قسەکانی کاپتا سەریان دەسوڕما کە پەنایان دەبردە بەر خوایەکانی میسر.

هەرچەندە زیاتر لە **تەبەس** نزیک دەبووینەوە، دانیشتووانی ئەمبەر و ئەوبەری نیل زیادی دەکرد و لە نزیکی **تەبەس** بە شێوەیەک زەوی و زارو گوندەکان



بەیەکەوە نووسابوون کە وەک ئەوە بوو بە نێوان دوو شاردا تێپەڕین کە یەکێکیان لە وشکانیی لای راست بێ و ئەوەی تریان کەناری لای چەپ. لەو کاتەدا لەلای رۆژهەڵاتی نیلەوە سێ چیا دەرکەوت کە دەتگوت سێ پاسەوانی هەمیشەیی شاری (**تەبەس**)ن و دوایی دیوارە بەرزەکانی شارو پەرستگەی گەورەی (ئاموون)و بیناکانی دەوروبەرو دەریاچەی پیرۆز دەرکەوت.

کاتێک کە شاری مردووەکانم لەلای رۆژئاوادا بینی پێی دڵگران بووم، باسم کرد کە شاری مردووەکان جێگایەکە کە مردووەکان لە دوای مۆمیایی کردن لەوێ دەنێژرێن و ئارامگەی هەموو فیرعەونەکان و شاژنەکانی میسر لەوێ بوو و گڵکۆ سپییەکانیان لە دوورەوە ئەدرەوشایەوە و لەبەردەم هەریەکە لە گۆڕی شاژنەکانی میسر داریان چاندبوو و لە وەرزی بەهاردا (ئەو وەرزەی ئێمە تیایدا گەڕاینەوە میسر) ئەو درەختانە گوڵیان دەردەکرد.

هۆی دڵگران بوونەکەم لە کاتی بینینی شاری مردووەکان ئەوە بوو کە بە بیرم هاتەوە دایک و باوکم لەناو پێستێکی گا لە نزیک ئارامگەی یەکێ لە فیرعەونەکان ئارامیان گرتبوو، چونکە لەبەر ئەوەی گۆڕەکەیانم بەهۆی خۆشەویستیی ژنێکی تەماح کارەوە فرۆشتبوو نەمتوانی بوو لە گۆڕەکەی خۆیاندا بیاننێژم یان گۆڕێکی نوێیان بۆ بکڕم بۆ ئەوەی لەو دنیا بێ جێگا نەبن.

لەلای باشوور، لەو شوێنەی کە رووباری نیل پێچێکی فراوانی تێ دەکەوێت کۆشکی فیرعەون لە نێوان درەختە سەوزەکانەوە بە رەنگێکی زێڕین ئەدرەوشایەوەو من بیرم لەوە دەکردەوە کە ئایا (هورم هەب) فەرماندەی سوپای میسر هێشتا لەو کۆشکەدا نیشتەجێیە یان نا.

ئەو کاتەی کە لە میسر دەڕۆیشتم ئەو پیاوێکی بەدەسەڵات بوو و لە فیرعەونەوە نزیک بوو،بەڵام کەس لە پێشهاتەکانی قەزاو قەدەر ئاگادار نییەو نازانێت ئایا پیاوێک کە ئەمڕۆ لە پاشاوە نزیکە سبەینێش ئەو نزیکییەی دەمێنێت یان نا.

کەشتییەکەمان لە دارەڕا (اسکلە)ی دابەزینی بەندەری **تەبەس** لە نزیک ئەو گەڕەکەی کە تیایدا گەورە ببووم راوەستاو لەو کاتەدا وەک ئەوە وابوو کە منداڵ بم و خۆم لە نێوان دیمەنە هەمیشەییەکانی سەردەمی منداڵیمدا ببینمەوە. لە بەیادهێنانەوەی یادەوەرییەکانی سەردەمی منداڵی و لاویم هەم خۆشحاڵ بووم و هەم غەمگین و زۆر بەزەییم بە حاڵی دایک و باوکمدا هاتەوە چونکە ئەو دووانە لە هەموو تەمەنیاندا ئازارو مەینەتییان چێشت بۆ ئەوەی بتوانن من بکەنە خوێندەوارو بۆ قوتابخانەم بنێرن، بەڵام من بەهۆی گەنجی و وەسوەسەی ئەو ژنە خیانەتم لێیان کردو گۆڕەکەیانم فرۆشت و ئەوەندە شەرمەزار بووم کە دەمویست دەموچاوم داپۆشم بۆ ئەوەی خەڵکی **تەبەس** نەمبینن و نەڵێن ئەمەیە سینۆهەی حەق نەناس کە دایک و باوکەکەی خۆی لە دنیای تردا بێ جێگاو رێگا کرد.

بەر لەوەی بێمە ناو **تەبەسەوە** بەرنامەیەکی دیاریکراوم بۆ ژیانی خۆم نەبوو ،چونکە وەزعی ژیانی من بەوەوە بەسترابۆوە کە (هورم هەب) ببینم و بزانم کە لە دوای بیستنی گوزارشتەکەی من چی دەڵێت. بەڵام هەرکە هەنگاوم نایە ناو (**تەبەس**)ەوە هەستم کرد کە لەو شارەدا وەکو پێشوو دەبمە پزیشک، بەڵام نە پزیشکێکی گەورەو ناودار بەڵکو پزیشکێک کە نیشتەجێی گەڕەکی هەژارەکان بێت و نەخۆشە کەم دەرامەتەکان چارەسەر بکات و لەگەڵ ئەوەشدا کە دەمزانی نیازی ئەوەم نییە کە زانیارییەکانی خۆم کە لەوڵاتە بیانییەکان فێریان ببووم بکەمە هۆکارێ بۆ ناوبانگ و سامان و حەزم لە گەڕەکی هەژارەکان بوو، بەڵام هەستم دەکرد کە خۆشبەخت و ئاسوودەم.

ئەگەر پزیشکێکی تر لە جیاتی من بووایەو ئەو هەموو زانیارییانەی دەرەوەی هەبووایە لە دوای گەڕانەوە بۆ **تەبەس** لە یەکێ لە گەڕەکە دەوڵەمەندکاندا نیشتەجێ دەبوو و ناوی خۆی لەسەر کەتیبەیەکی[١] جوان بەقەد خانووەکەیەوە دەنووسی بۆ ئەوەی هەموو کەس بزانێت ئەم پزیشکە ناوبراوە لە هەموو پزیشکەکانی تر چاکترەو ئەو کەسانەی کە بۆ چارەسەر کردن دێنە لای دەبێ



دیاریی گرانبەهای بدەنێ. بەڵام زۆر سەیر بوو کە من لەگەڵ ئەوەشدا کە دەمویست لە گەڕەکە هەژارەکاندا بژیم و نەناسراو بم بەڵام خۆم لەو شێوەی بیرکردنەوەیە بە خۆشبەخت دەزانی و ئەم بابەتە ئەوە نیشان دەدات کە ئێمە جاری وا هەیە سەبارەت بە حەزەکانی خۆشمان لە هەڵەداین و نازانین چیمان دەوێت و جیهان دەخەینە ژێر پێوە و لەم وڵات بۆ ئەو وڵات دەڕۆین و زانیاری یان زێڕ و پارە کۆدەکەینەوە کە لە دوای گەڕانەوە بۆ وڵات وەکو یەکێ لە دەوڵەمەندەکان بژێین و دەوڵەمەندییەکەی خۆمان بە چاوی خەڵکیدا بدەین، بەڵام لە پاش گەڕانەوە بە سەرسوڕمانەوە دەبینین ئەو شتەی چێژمان دەداتێ ئەوەیە کە لە گۆشەیەکدا بە نەناسراوی بژین.

باربەرەکانی ئەوێ دەورەیان لێداین کەبارەکەمان لە کەشتی دابگرن و بۆ یەکێ لە میوانخانەکانی ببەن و کرێیەکی باشمان لێبستێنن، چونکە لە هەموو شوێنێ کاتێک کە رێبوارێک دەگاتە شارێک، باربەرەکان زیاتر لە خەڵکی تر پارەی لێ ەستێنن، بەڵام من بە کاپتام وت، حەزناکەم بۆ میوانخانە بڕۆم و بە باربەرەکان بڵێ کەلوپەلەکانمان داناگرین. کاپتا وتی مەگەر بەتەما نیت لەم شارەدا بمێنیتەوە. وتم مەبەستم ئەوەیە کە بە تۆ بڵێیم خێرا بڕۆ و لە گەڕەکی هەژارەکاندا خانوویەکەم بۆ بکڕە و تا دەتوانی هەوڵ بدە لە نزیک خانووەکەی دایک و باوکمەوە بێت. هەروەها کرینی خانووەکە دەبێ ئەمڕۆ تەواو بێت بۆ ئەوەی لە سبەینێوە بتوانم لە خانووی خۆمدا خەریکی پزیشکی بم.

کاپتا لەم قسەیەی من زۆر نارازی بوو، چونکە وای دەزانی دەچینە میوانخانەیەک و بەندەکانی ئەوێ لەجیاتی ئەو خزمەت دەکەن، بەڵام قسەی نەکردو سەری دانەواندو رۆیی.

هەمان شەو من چوومە خانووەکەی خۆمەوە کە لە گەڕەکی هەژارەکان بوو و بەر لە من هی مسگەرێک بوو. لە خانووەکانی دەوروبەرو بەرامبەر خانووەکەی ئێمە ژنەکان لەبەردەم ماڵەکاندا خەریکی سوورکردنەوەی ماسی بوون لە سەر

ئاگردان و لە هەموو گەڕەکەکاندا بۆنی ماسیی سوورەوەکراو دەهات.

کاتێک کە کەمێک لە شەو تێپەڕی چرای ماڵە گشتییەکان[۲] هەڵکراو دەنگی مۆسیقای سریانی و گۆرانیی مەلەوانە مەستەکان دەهاتە گوێ و کاتێک کە سەیری ئاسمانم دەکرد دەمبینی کە بە هۆی چراکانی ناوەندی شار ڕەنگی سوور ببوو.

لە پاش ئەو چەند ساڵەی کە لە ئەم لاو ئەو لای جیهان سەفەرم دەکردو زانیاریم کۆ دەکردەوە، گەڕامەوە جێی یەکەم واتە خانووی خۆم و پێم سەیر بوو کە من لە سووریاو بابل و کریت ئەو هەموو دیمەنە جوانەم بینی و بۆن و بەرامەی ڕۆنە بۆن خۆشەکانیانم هەڵدەمژی، چۆن چێژم لە بۆنی ناخۆشی ماسیی سوورەوە کراو و بینینی هەژاری و نەبوونیی دراوسێکان وەردەگرت.

بەیانیی ڕۆژی دوایی بە کاپتام وت کەتیبەیەکی سادەی بێ نەخش لە قەدی خانووەکەمدا هەڵبواسێ بۆ ئەوەی خەڵکی بزانن ئەمە ماڵی پزیشکەو کاتێک کە نەخۆشەکان دێن پێیان مەڵێ کە من پزیشکێکی ناودارم، بەڵکو تەنها ناوەکەم بڵێ و پێیان بڵێ کە ئەم پزیشکە نەخۆشە کەمدەرامەتەکانیش چارەسەر دەکات و هەموو کەسێ دەتوانێت بە پێی توانای خۆی دەسهەق بدات.

کاپتا وتی گەورەم بۆچی تۆ کە پزیشکێکی گەورەو ناوداری و بەهۆی گەڕان لە وڵاتانی جیهاندا زانستت کۆکردۆتەوە، خۆت دەکەیتە پزیشکی هەژاران؟ ئایا ئاوی زەڵکاوت خواردۆتەوە (کە دەبێتە هۆی نەخۆشی)، یان دووپشک پێوەی داوی کە بەم شێوەیە بیر دەکەیتەوە.

وتم کاپتا ئەوەی پێت دەڵێم ئەوە بکەو فرمانەکەم جێ بەجێ بکە، ئەگەر نا لە ماڵی من بڕۆ و هەر چۆنێک کە خۆت دەتەوێت ژیان بەسەر ببە. چونکە من دەزانم ئەوەندەت دزی لەمن کردووە کە دەتوانی ئەمڕۆ خانوویەکی پێ بکڕی و ژنێکیش بهێنی.

کاپتا وتی گەورەم ئەگەر تۆ تات لێ نەبێ بەم شێوەیە نادوێی و ئەم قسانە



ناکەیت، چونکە من پیاوێک نیم کە ژن بهێنم و بەردەوام لەماڵەوە لەگەڵیدا بەشەڕ بێم و نانی من بخوات و دوایی لە کاتی ناکۆکیدا بە گۆچان یان دار حەیزەران بکەوێتە گیانم. بەرای من کاتێک کە مرۆڤ بتوانێت ئازاد بێت و لەوپەڕی ئاسوودەییدا بژێت، ژن هێنان شێتییە، بەڵام لەبەر ئەوەی تۆ گەورەی منی ئەگەر لەسەر حەسیریش بنووی منیش دەبێ چاو لە تۆ بکەم، بەڵام ناتوانم نارەزایی خۆم دەرنەبڕم چونکە دەبینم ئەم ئیشەی تۆ شێتانەیە و تەنها شێت گەوهەر لەژێر پاشماوەی ئاژەڵاندا دەشارێتەوەو تۆش زانست و شارەزایی خۆت لەژێر کۆنە پۆشاکی هەژاراندا دەشاریتەوە.

وتم کاپتا کاتێک کە مرۆڤ دێتە دنیاوە هەژار بێت یان دەوڵەمەند، بە رووتی هەنگاو دەنێتە ئەم جیهانەوەو لە کاتی نەخۆشیدا هیچ جیاوازییەک لە نێوان هەژارو زەنگیندا نییەو هەردووکیان ئازار دەکێشن و پێویستییان بە چارەسەر هەیە.

کاپتا وتی بەڵام لە نێوان ئەو دیارییەی کە دەوڵەمەندێک دوای چارەسەر دەیدات لەگەڵ ئەو دیارییەی کە لە هەژارێکی وەردەگری جیاوازییەکی زۆر هەیە. ئەگەر من لە سەرەتادا بەندە بوومایە و لەکاتی لەدایک بوونم بە بەندەیەک لە قەڵەم بدرامایە دەمتوانی بیرۆکەکەی تۆ بسەلمێنم، بەڵام لەبەر ئەوەی لە سەرەتادا ئازاد بووم و دوایی بوومە بەندە ناتوانم ئەوە بسەلمێنم کە دەوڵەمەندو هەژار لە دیدی مرۆڤدا یەکسان بن.

وتم کاپتا من نەخۆشی هەژارو دەوڵەمەند بەیەک چاو سەیر دەکەم و هەروەها بۆ ئەوەی بزانی پێت دەڵێم کە ئەگەر منداڵێکی بێ سەرپەرشت پەیا بکەم دەیکەم بە منداڵی خۆم.

کاپتا وتی ئەمە کارێکی بێ سوودە چونکە منداڵە بێ خاوەنەکان لە پەرستگەیەکی تایبەتدا بەخێو دەکرێن و دەبنە کاهینی پلە نزم و هەندێکیان دەکەنە خواجە[۳]و دەیان نێرنە ماڵی دەوڵەمەندکان کە بیانکەنە خزمەتکار یان

پاسەوانی ژنەکان بن و بێگومان ئەم خواجانە لەوێ، لە ماڵی دایک و باوکی خۆیان باشتر دەژیان ئەگەر (زیندوو بمابانەوە). ئەگەر تۆ منداڵت دەوێت واز لە ژن هێنان بهێنە و لەگەڵ هیچ ژنێکدا گۆزە مەشکێنەو لە جیاتی ئەوە لە یەکێ لەو ژنە گەنجانەی کە توانای بەخێوکردنی منداڵەکانی خۆیان نییە داوا بکە کە لە دوای منداڵ بوون کۆرپەکەی، بداتە تۆو ئەو ژنە دە جاریش سوپاسی خوا (ئاموون) دەکات کە تۆی خستۆتە سەر ڕێگای ئەو بۆ ئەوەی منداڵەکەی لێوەربگری و بەخێوی بکەی. ئەگەریش ناتەوێت منداڵی خەڵکی بەخێو بکەی کەنیزێکی جەحێل و جوان بکڕە کە هەم منداڵت لێی ببێ و هەمیش لە کارەکانی ماڵەوەدا یارمەتیی من بدات، چونکە من پیر بوومەو هەڵسووڕاندنی ئیش و کاری ماڵەوە لەلام زەحمەتەو جاری وا هەیە دەستەکانم دەلەرزێت و من پێویستە هەم ئیشەکانی ماڵەوە ڕاپەڕێنم و هەم پارەکەشم بخەمە گەڕ بۆ ئەوەی قازانجێکم لێ دەست بکەوێت.

وتم من حەز ناکەم کەنیز بکڕم بەڵام تۆ دەتوانی بۆ ئیش و کاری ماڵەوە خزمەتکارێ بگری چونکە مافی ئەوەت هەیە کە لەمەودوا لە ماڵی مندا پشوو بدەیت و ئەمە پاداشتی خزمەتەکانی رابردوو و وەفاداریی تۆیەو لەبەر ئەوەی دەزانم کە تۆ لەم شارەدا بۆ مەیخانەکان دەڕۆی، بەهۆی تۆوە دەتوانم لەو زانیاری و دەنگوباسانەی کە خەڵکی لەوێ دەیڵێن ئاگادار ببم. چونکە لە هیچ جێگایەک وەکو مەیخانەکان خەڵکی لە کانگای دڵیانەوە قسە ناکەن و خەڵکانێکی زۆر هەن کە هەرگیز نهێنییەکانی خۆیان نادرکێنن ،بەڵام لە دوای ئەوەی خواردیانەوە دەکەونە قسەو ئەوەی لە دڵیاندایە هەڵیدەڕێژن.

لەدوای ئەم قسەیە لە ماڵ دەرچووم بۆ ئەوەی یەکێ لە ئاشناکانی رابردووم بدۆزمەوەو بچمە لای (هورم هەب) فەرماندەی سوپای میسر. پاشان بۆ ئەو مەیخانەیە چووم کە دەمزانی (تۆتمس)ی هاوڕێی هونەرمەندم بۆ ئەوەێ دەچێت و سۆراغیم گرت و مەیفرۆشەکە وتی نازانم لە کوێیەو چی دەکات، چونکە



ماوەیەکە کە نەهاتۆتە ئێرە بەڵام بەر لەوەی بێ سەرو شوێن بێت دەمدی وێنەی پشیلەکان دەکێشێت. من بە سەرسوڕمانەوە وتم بۆچی وێنەی پشیلەی دەکێشا. مەیفرۆش وتی لەبەر ئەوەی ناچار بوو کە بەم شێوەیە خەرجی پەیا بکات و بۆ ئەو کتێبەی کە لەمنداڵان لەقوتابخانەکاندا دەیخوێنن وێنەی پشیلە دروست بکات.

لەوێ هاتمە دەرەوەو بۆ خانەی سەربازەکان (واتە سەربازگە – وەرگێڕ) چووم کە لەوێ (هورم هەب) ببینم. بەڵام روانیم سەربازگەکان سەربازێکی کەمی تیایەو وەکو پێشوو سەربازەکان لە حەوشەکەدا خەریکی زۆرانبازی نەبوون و بە تیروکەوان نیشانەیان نەدەنایەوە نەیزەیان بۆ کیسە پڕ لە کایەکان نەدەهاوێشت.

ئەفسەرێکی بەشی لە حەوشەکەدا وەستا بوو و پەنجەکانی قاچی لە خاک وەردەدا و بە زمانی حاڵ لە منی دەپرسی بۆ هاتوویتە ئێرەو ئیشت چییە؟ من لێم پرسی ئایا (هورم هەب) لەوێیە و ئەگەر لەوێ نییە لە کوێ دەتوانم بیدۆزمەوە.

ئەفسەرەکە لە دوای ئەوەی ناوی (هورم هەب)ی بیست سەری دانەواندو من لەم رێزلێنانەی تێگەیشتم کە (هورم هەب) هێشتا پلەی فەرماندەیی هەیە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بۆ دڵنیا بوون لێیم پرسی کە ئایا (هورم هەب) وەکو پێشوو فەرماندەی سوپایە یان نا ؟

ئەفسەرەکە وتی: بەڵێ ئەو هەر فەرماندەی سوپایە، بەڵام ئێستا لێرە نییەو بۆ سەرزەمینی (کووش) رۆیشتووە تاکو سەربازگەکانی ئەو جێگایە هەڵبوەشێنێتەوەو ئەو سەربازانەی کە لە واجبدان ئیزنیان بدات و مەعلووم نییە کەی دەگەڕێتەوە.

من حەڵقەیەکی زیوم دا بە ئەفسەرەکەو ئەو بە بینینی حەڵقەکە حەپەساو هەستی خۆ بەشت زانینەکەی نەماو بە پێکەنینەوە بە منی وت (هورم هەب) فەرماندەیەکی گەورەیە، چونکە دەزانێت کە سەربازەکان چییان دەوێت و چۆن

دەبێ لەگەڵیاندا رەفتار بکات، بەڵام فیرعەون وەکو بزن وایە و لە وەزعی سەربازەکان و باری دەروونیان بێ ئاگایەو گوێیان ناداتێ. هەر لەبەر ئەوەشە ئێستا، کە (هورم هەب) لێرە نییە وەک دەبینی سەربازگەکە چۆڵەو سەربازەکان رۆیشتوون بۆ ئەوەی دەرۆزە بکەن و سکی خۆیان تێر بکەن. بەڵام من لەبەر ئەوەی ئەفسەرم ناتوانم بۆ سواڵ کردن بچم و داواکارم لە (ئاموون) کە لەبەرئەوەی ئەم حەڵقەیەت داوە بەمن پیرۆزت بکات. چونکە چەند مانگێکە کە نەمتوانیوە بچم بۆ مەیخانەو بیرە بخۆمەوە و ئەمرۆ دەرۆم و دەنۆشمەوە. بەر لەوەی کە بمانکەن بە سەرباز بەڵێنیان بە ئێمە دا کە ئەگەر ببینە سەرباز کانزایەکی زۆرمان دەست دەکەوێت و هەرچەند خواردنمان بوێت بۆمانی ئامادە دەکەن و سکمان بەردەوام پڕ دەبێت لە خواردن و خواردنەوە.

پاشان من لە خانەی سەربازەکان هاتمە دەرەوەو بۆ خانەی ژیان رۆیشتم کە لەوێ سەر قلێشێنی فیرعەون ببینم بەڵام پێیان وتم کە دوو ساڵ لەمەوبەر مردووە و لاشەکەیان لە شاری مردووەکان ناشتووە.

لەو قسانەی کە لە خانەی ژیاندا لەگەڵ مندا کردیان بۆم دەرکەوت کە فیرعەون بەهۆی شوێن کەوتنی خوایەکەی خۆی کە (ئاتوون)ی ناوە ئەو سەربازانەی ئیزن دابوو کە باوکی بە کرێی گرتبوون چونکە دەیگوت کە لەگەڵ هەمووواندا بە ئاشتی و خۆشی دەژێت و پێویستی بە سەرباز نییە.

پێشتر ئاماژەم بۆ کرد کە خوێندنگەی خانەی ژیان لەناو پەرستگەی (ئاموون)دایە و بڕیارم دا بڕۆم و وەزعی پەرستگە ببینم بۆ ئەوەی بیرەوەرییەکانی گەنجێتیم بهێنمەوە یاد.

روانیم کاهینەکان بە سەری تاشراوی بە رۆن چەور کراو و جلە سپییەکانیانەوە پەرێشان بوون و لە کاتی قسەکردندا بە مەترسییەوە سەیری دەوروبەریان دەکرد و وەک ئەوە وابوو کە لەوە بترسێن یەکێ گوێی لە قسەکانیان بێت و کاتێک کە منیان بینی بە گرژییەوە سەیری منیان کردو لەوانەیەگومانیان



کردبێت کە من جاسووسم.

بەبەردەم پەیکەری گەورەی فیرعەونەکاندا تێ پەڕیم و خۆم گەیاندە کۆتایی پەرستگەکەو لەوێ بە سەرسوڕمانەوە بینیم کە پەرستگەیەکی نوێیان دروست کردبوو.

ئەو کاتەی کە من لە پەرستگەی ئاموون-دا بووم ئەو پەرستگەیەی لێ نەبوو و دیار بوو کە لە دوای دەرچوونی من و لە دوای رۆیشتنم لە **تەبەس** دروستیان کرووە.

کاتێک کە چوومە ناو ئەو پەرستگەیەوە سەیرم کرد دیواری نییە، بەڵکو حەوشەیەکی بەرفراوانە کە ئەستوونی (کۆڵەگە) بەرزیان بە دەوریدا دروست کردبوو و لایەکی حەوشەکە کراوە بوو، واتە بەبێ ئەستوون بوو و میحرابی پەرستگەکە لەوێدا بوو. لە میحرابەکە نزیک بوومەوەو بینیم لە جیاتی ئەوەی کە دیاریی ئاسایی واتە مەڕی قوربانی و مەسینەی مسی[٤] لەسەر میحرابەکە دابنێن، گەنم و گوڵ و میوەیان لەوێ دانابوو و لە سەرووی میحرابەکەوە نەخشێکی بەردینی گەورەیان لێ دروست کردبوو کە خوای (ئاتوون)ی لە شێوەی بازنەیەکدا نیشان دەدا (مەبەست خۆرە - و. کوردی)و لەم بازنەیەوە هەندێ تیشک بۆ دەوروبەری کێشرابوو و کۆتایی هەر تیشکێک دەستێکی پێوە نووسابوو و لەناو هەر دەستێک (خاچێکی ژیان)[٥]ی تیا بوو.

کاهینەکانی ئەم پەرستگەیە کراسی سپییان لەبەردا بوو بەبێ ئەوەی سەریان تاشیبێت و سەیرم کرد هەموویان گەنجن و کاتێک کە چوومە ناو ئەو پەرستگەیەوە کاهینەکان دەورەیان لە میحراب دابوو و سروودی پیرۆزیان دەخوێند.

گوێم گرت و سەرنجم دا کە ئاهەنگی ئەو سرووده لە گوێمدا ئاشنایەو ئەو سروودەم لە (ئورشەلیم)، لە وڵاتی سووریا گوێ لێ ببوو. بەڵام لە هەموو شتەکانی ئەم پەرستگەیە سەیرتر پەیکەری فیرعەون بوو کە لەبان ئەستوونەکاندا

دەبینرا. ئەستوونەکانم ژمارد و بۆم دەرکەوت کە چل دانەیەو هەر ئەستوونێک بتی بەردینی فیرعەونی پێوە بوو کە گەورەتر بوو لە هەیکەلی خۆی. پەیکەرەکانیان بە جۆرێک دروست کردبوو کە فیرعەون هەردوو دەستی بە سینگیەوە نابوو و بە دەستێکی قامچییەکەی و بە دەستەکەی تری گۆچانی پاشایەتییەکەی گرتبوو و ئەو پەیکەرانە دەیانڕوانییە میحرابەکەو من نازانم کە کام پەیکەرتاش رەنگرێژی ئەو هەیکەلانەی کرد بوو و پاشان بە شاگردەکانی خۆبسپاردبوو کە دروستی بکەن. بەڵام دەزانم کە پەیکەرتاشەکە بە ئەنقەست مەبەستی وا بووە کە هەموو نوقستانیی ئەندامەکانی فیرعەون بە پێچەوانەوە نیشان بدات. بۆ نموونە دەست و قاچەکانی فیرعەون لەڕو باریک بوون بەڵام لە پەیکەرەکەیدا دەست و پێیان ئەوەندە ئەستوور دروست کردبوو کە دەتگوت کوندەی ئاوساوە. هەروەها جگە لە ئەندامەکانی لەشی، پەیکەرتاشەکە، شێوەی دەموچاوی فیرعەونیشی گۆڕیبوو.

هەموو هونەرمەندەکان و پەیکەرتاشانی پێشوو کە پەیکەری فیرعەونەکانی رابردوویان دروست کردبوو هەوڵیان دەدا کە ئەو پەیکەرە وەک شێوەی ئەسڵیی خۆی بێت بۆ ئەوەی ئەو کەسەی کە هەزارەها ساڵ لە دوای ئەوە چاوی بە پەیکەرەکە دەکەوێت بزانێت کە شکڵ و شێوەی چۆن بووە، بەڵام ئەو هونەرمەندەی پەیکەری فیرعەونی تاشیبوو سەرنجی لێکچوونی نەدابوو و کاتێک کە مرۆڤ دەموچاوی فیرعەونی بە گۆشە گەورەو بچووکەکان و روومەتی بەرجەستەو دەموچاوی درێژ ببینیایە دەترساو ئەگەر هاوڕێ هونەرمەندەکەم (توتمس) لەوێ بوایەو ئەو بتەی لەوێ ببینیایە دەیگوت ئەمە قوتابخانەیەکی هونەری نوێیەو لە هونەری نوێدا شێوەی کەسەکان و شتەکانی تر نابێت وەک خۆیان بن بەڵکو هونەرمەند پێویستە بەو شێوەیەی کە خۆی ئەو شتانە دەبینێت ئەندامەکانی بکێشێت یان پەیکەرەکەی دروست بکات. شتێکی تر کە بەلای منەوە سەیر بوو ئەوە بوو کە چۆن فیرعەونی میسر (ئامن هوتپ)ی چوارەم



رێگای داوە کە پەیکەری ئەو بەو شێوەیە بتاشن و ئایا خودی ئەویش خۆی بەم شێوەیە دەبینی کە بۆیە رەخنەی لە پەیکەرتاشەکە نەگرتووەو وەک ئەو کەسانەی کە بە تۆمەتی کوفرکردن دەکوژران لە سێدارەی نەداوە.

سەرنجم دا کە پەرستگەی نوێ تەماشاچیی زۆری لێ نییە و ئەوانەی دەهاتن دوو دەستە بوون هەندێکیان ئەوانە بوون کە کراسی کەتانیان لەبەردا بوو و ملوانکەی زێڕیان بە ملەوە بوو و دیار بوو کە لە دەرباریەکانی میسر بوون و لەبەر ئەوەی دەیانزانی فیرعەون سەرنج دەداتە ئەو پەرستگە تازەیە بۆ ریایی هاتبوونە ئەوێ و دەستەکەی تر خەڵکی ئاسایی بوون کە بەسەر سوڕمانەوە گوێیان لە سروودی کاهینەکان دەگرت چونکە لێی تێ نەدەگەیشتن و ئاوازی ئەم سرووده لە گوێیاندا سەیر بوو و ئەوان لە منداڵییەوە لەگەڵ ئەو سروودانە راهاتبوون کە لە سەردەمی دروستکردنی هەرەمەکانەوە (اهرام) لە پەرستگەکانی میسر دەخوێندران و ئەو سروودانە بە جۆرێک لە روحیاندا چەسپا بوو کە ئەگەر لە کاتی خەویشدا بیانبیستایە لەواتاکەی تێ دەگەیشتن بەڵام سروودە تازەکان بە گوێ و روحی ئەوان ئاشنا نەبووە.

لەدوای ئەوەی سروودەکە خوێندرا پیاوێک لە کاهینەکان نزیک بووەوە کە لەسەرو وەزعی دیار بوو جووتیارەو لە بیابانەوە هاتووەو لێیانی پرسی ئایا دەکرێ تەلەسمێک یان چاوێکی ئەو مانگاو مەڕە قوربانییانە، کە مەترسی لەناو دەبات، بە بەهایەکی هەرزان پێی بفرۆشن بۆ ئەوەی لەگەڵ خۆیدا بیبات و لە تەنگ و چەڵەمە و مەترسییەکان پارێزراو بێت. کاهینەکان لە وەڵامی ئەو پیاوەدا وتیان خوای (ئاتوون) تەلەسم و چاوی قوربانی نافرۆشێت و پێویستی بەوانە نییە بەڵکو هەر کەسێک باوەڕی پێی هەبێ ئەو پشتیوانیی لێدەکات و دەیپارێزێت بەبێ ئەوەی دیارییەکی لێ وەربگرێت.

کاتێک کە پیاوەکە ئەم وتەیەی بیست رەنگی تێکچوو و گەڕایەوە دواوە و گوێم لێ بوو بە بۆڵە بۆڵەوە دەیگوت خوای (ئاتوون) خوایەکی درۆینەو دوایی

بەرەو پەرستگەی تر واتە (ئامـوون) بەڕێ کـەوت کـە لە کـاهینەکـانی ئەو پەرستگەیە تەلەسم یان چاوی قوربانی وەربگرێت.

ژنێکی تریش لە کاهینە گەنجەکان نزیک بووەوەو وتی مەگەر خوای ئێوە کەناوی (ئاتوون)ە مەڕو گای قوربانی وەرناگرێت و کەس قوربانیی بۆ ناکات کە ئێوە گۆشت بخۆن و قەڵەوبن و ئەگەر خوایەکەی ئێوە بە شێوەیەک کە خۆتان دەیڵێین بەهێز بێت، کاهینەکانی دەبێ قەڵەوبن نەک ئەوها لەڕولاوازو، بێ هێزییەکەتان وای نیشان دەدات کە خوایەکی بێ دەسەڵاتتان هەیە. لە کاتێکدا کە (ئامـوون) بەهێزەو گۆشت دەرخواردی کاهینەکانی خۆی دەدات و لەبەرئەوە هەموویان قەڵەون.

یەکێ لە کاهینەکان کە کەمێک لەوانەی تر بەتەمەنتر بوو وتی (ئاتوون) رقی لە قوربانییەو نایەوێت خوێنی ئاژەڵان بۆ ئەو بڕێژن و تۆ نابێت لەم پەرستگەیە ناوی (ئامـوون) بهێنی چونکە ئامـوون خوایەکی درۆیینەو بەم زووانە تەختی خوایەتییەکەی سەرنگون دەبێت و پەرستگەکەی وێران دەبێ.

ژنە کە دوو هەنگاو هاتە دواوە و وتی ئەی (ئامـوون) ئاگاداربە کە من ئەم قسەیەم نەکردووە بەڵکو ئەو پیاوە وای وت و نەفرەتی تۆ تەنها دەبێ ئەو بگرێتەوە نەک من. ژنەکە لەگەڵ ئەو کەسانەی تر کە خەڵکی ئاسایی بوون لەوێ رۆیشتن و کاهینەکان بە گاڵتەو پێکەنینەوە بەوانیان دەگوت بڕۆن، بڕۆن ئەی خەڵکی بێ ئیمان ئەوە بزانن کە ئاموون خوایەکی درۆیینەو ئەوەندەی پێ ناچێت کە هێزەکەی وەک گیایەک کە بەداس درەو بکرێت لەناو دەچێت.

لەو کاتەدا یەکێ لە پیاوەکان داچەمییەوە و بەردێکی لەسەر زەوی هەڵگرت و بەرەو کاهینەکانی هاوێشت و بەردەکە کەوت بە دەموچاوی یەکێ لەوان و برینداری کرد و کاهینەکان بانگی پاسەوانەکانی پەرستگەیان کرد کە ئەو پیاوە دەستگیر بکەن بەڵام ئەو هەڵ هات و نەیان توانی بیگرن.

من لە کاهینەکان نزیک بوومەوە و بە ئەدەبەوە پێیانم وت من میسریم و



ماوەیەک لەم ولاتە دوور کەوتبوومەوە و بەر لەوەی لە میسر بڕۆم ناوی خوای (ئاتوون)م بیستبوو، بەڵام سەرنجم لێی نەدابوو و دواییش بەبۆنەی دوورکەوتنەوەم لە میسر نەمتوانی لە بارەی ئەو خوایە زانیاری بەدەست بهێنم و ئێستا کە گەڕاومەتەوە حەز دەکەم بزانم خوای (ئاتوون) کێیە؟ و چی دەڵێت و چی دەوێت و چۆن ئەو دەپەرسترێت.

کاهینەکان کەمێک لێم وردبوونەوە کە بزانن ئایا گاڵتەیان پێدەکەم یان بە راستی دەدوێم و لە دوای ئەوەی کە تێگەیشتن پرسیارەکەم بە راستییە یەکێک لەوان وتی (ئاتوون) تاکە خوای راستەقینەیە ... هەموو ئەو خوایانەی کە بەر لە (ئاتوون) هاتوونە خوای درۆیین و هەموو ئەوانەی کە لە دوای ئەویش دێن خوایەکی ناراستن. ئاتوون ئاسمان و زەوی و رووباری نیل و هەموو بوونەوەرانی دروست کردووەو هەمیشە هەبووە و لەمە و بەدواش دەبێت و ئێستا خۆی نیشانی کوڕەکەی خۆی، فیرعەون، داوەو هەمووان دەبێت بیپەرستن. ئەم خوایە بە پێچەوانەی خوایەکانی تر کە هەموویان ناراستن دیاریی خەڵکی ناوێت و حەز ناکات کەس قوربانیی بۆ بکات و بەیەک چاو دەڕوانێتە دەوڵەمەند و هەژار و هەر کەسێک کە باوەڕی پێ بهێنێت لە پەنای خۆیدا دایدەنێت، (ئاتوون) بە پێچەوانەی خوایە درۆیینەکان هەرگیز نامرێت و لە هەموو شوێنێکدا هەیەو هیچ رووداوێک بەبێ ویستی ئەو روو نادات.

وتم ئەو بەردەی کە ئێستا دەموچاوی ئەم کاهینە گەنجەی بریندار کرد بەپێی ویستی (ئاتوون) بەر دەموچاوی کەوت، چونکە تۆ دەڵێی کە هیچ رووداوێک بەبێ ئیرادەی ئەو بە ئەنجام ناگات.

کاهینەکان کاتێک کە ئەم وتەیەیان بیست بەسەرسوڕمانەوە لە یەکتریان روانی و وتیان دیارە تۆ بە تەمای گاڵتەمان پێ بکەی. بەڵام ئەو کاهینەی کە بەردەکەی پێ کەوتبوو بە دەنگێکی بەرز وتی بەڵێ ئەم رووداوە لەسەر ویستی (ئاتوون) روویدا، چونکە من شایانی ئەونیم و ئاتوون ئەم رووداوەی دروست

کرد بۆ ئەوەی من خۆم بکەمە شایانی ئەو. (ئاتوون) لەبەر ئەوە ئەم رووداوەی بەسەر مندا هێنا، چونکە من لە روحی خۆمدا بەبۆنەی ئەو رێزەی کە لەلای فیرعەون هەمە لەخۆم بایی ببووم و (ئاتوون)م فەرامۆش کردبوو. من لەبەر ئەوە لەلای فیرعەون خۆشەویستم ،چونکە دەنگێکی خۆشم هەیەو دەتوانم سروود بڵێم و فیرعەون کاتێک کە بینی من ئامادەم باوەڕ بە خوایەکەی بهێنم منی ناردە ئەم پەرستگەیەو بەم پلەو پایەیەی گەیاندم.

وتم کەواتە ئەگەر وابێت خوای (ئاتوون) ئەوەندە دەسەڵاتی هەیە کە بتوانێ فیرعەون وا لێ بکات کە پیاوێک لەناکاودا لە خاک بەرز بکاتەوەو بیخاتە ناو پەرستگەکەیەوەو ببێتە کاهینی ئەو.

یەکێک لە کاهینەکان وتی فیرعەونی ئێمە سەرنج ناداتە وەزعی مادیی خەڵکی، بەڵکو سوود لەو وزەیە وەردەگرێت کە (ئاتوون) داویەتێ و دڵی خەڵکی دەخوێنێتەوەو دەزانێت کە ئایا شیاوی بەرزکردنەوەن یان نا.

وتم چۆن فیرعەون دەتوانێت دڵی خەڵک بخوێنێتەوە و هەست بەو شتە بکات کە لەناو دڵیاندایە چونکە تەنها (ئوزی ریس) خاوەنی ئەم دەسەڵاتەیەو توانای خوێندنەوەی دڵی مرۆڤی هەیە[٦].

کاتێک کە من ئەم قسەیەم کرد کاهینەکان لەناو خۆیاندا دەستیان بە راوێژو گفتوگۆ کرد کە چ وەڵامێک بدەنەوە من و یەکێکیان وتی: (ئوزی ریس) خوایەکی پلە دوو بەڵکو پلە سێ و چواریشە و بگرە لە بارەی بوونیشیەوە گومان هەیە. (ئوزی ریس) بوونی نییە بەڵکو گومان و مەزندەی خەڵکی رەشۆکی هێناویەتە کایەوە. بەڵام (ئاتوون) بوونی هەیە و خوای نەبینراو و هەمیشەییە و فیرعەون لەگەڵ ئەوەشدا کە مرۆڤە جەوهەری (ئاتوون)ی هەیە لەبەر ئەوە دەتوانێت لەیەک کاتدا چەند کەسایەتییەکی هەبێت و ئەو هۆیەی کە دەتوانێت دڵی خەڵکی بخوێنێتەوە ئەوەیە کە لەیەک کاتدا چەند کەسایەتیی پێکەوە هەیەو وەک ئەوە وایە کە لەیەک کاتدا چەندین کەس بێت. لەبەر ئەوە ئەو



هونەرمەندەی پەیکەری فیرعەونی دروست کردووەو تۆ ئێستا ئەو پەیکەرە لەسەر ئەستوونەکان دەبینی، بەشێوەیەک فیرعەونی دروست کردووە کە هەم ژن بێت و هەم پیاو، چونکە جەوهەری خوا لە فیرعەون-دایە و بە بۆنەی ئەم جەوهەرە توانای ئەوەی هەیە کە هەم خاوەنی هێزی نێرە بێت و هەم هێزی مێیینەشی تیادا بێت.

من سەرم بە هەردوو دەست گرت و وتم من وەک ئەم ژنە کە هەر ئێستا لێرە رۆیشت پیاوێکی سادەم و ناتوانم لە واتای قسەکانی ئێوە تێ بگەم و عەقڵم نایگرێت کەسێک هەم پیاو بێت و هەم ژن. هەم بتوانێ ئاوی روون[٧] دروست بکات و هەم شیرخۆرەیەکیش لە سکیدا رابگرێت و گەورەی بکات و بە دنیای بهێنیت. هەروەها ئێوە خۆشتان لەمەڕ خوای (ئاتوون)ەوە ناکۆکیتان هەیەو وەک ئەوە وایە کە نەزانن کێیەو چی دەڵێت، چونکە کاتێک کە من پرسیارێکتان لێ دەکەم لەگەڵ یەکتریدا راوێژ دەکەن و دوایی وەڵامی من دەدەنەوە.

کاهینەکان نارەزاییان بۆ ئەم قسەیەی من دەربڕی و وتیان وا نییە و ئێمە لە بارەی خوا (ئاتوون)ەوە بچووکترین دوو دڵیمان نییەو ئەو خوایەکی تەواوە. واتە کەم و کوڕیی نییەو هەمیشە هەبووە و بەردەوام دەمێنێت، بەڵام ئێمە نوقستانیمان هەیەو لەبەر ئەو نوقستانییەمان ناتوانین خوا (ئاتوون) بە دروستی بناسین، بەڵام هەرچەندە بیرکردنەوەو خوێندنەومان هەبێت زیاترو باشتر دەیناسین و بێگومان چەند ساڵێکی تر ئێمە لە ئەمڕۆ زیاتر لە (ئاتوون) تێ دەگەین و بیست ساڵی تر زانستی ئێمە زۆر زیاتر دەبێت لە ئەمڕۆ و تەنها یەک کەس (ئاتوون) بە تەواوەتی دەناسێت و ئەویش فیرعەونە، چونکە ئەو جەوهەری ئاتوونە و وەک ئەوەیە کە (ئاتوون) روحی فیرعەون بێت.

لەگەڵ ئەوەشدا کە بەم قسەیەیان قەناعەتم نەکرد بەڵام زۆر کاری تێ کردم لەبەر ئەوەی تێ گەیشتم کە بە دڵپاکییەوە دەیانگوت و هەستم کرد کە لەوانەیە لەم قسەیەیاندا راستییەکی گەورە هەبێت و ئەو حەقیقەتەش ئەوەیە، کە ئێمە

نەزانین، نەک خوایەکان و لەبەر ئەوەی کە عەقڵ و تێگەیشتنی ئێمە کەم و کوڕی و ناتەواویی هەیە، وا هەست دەکەین کە خەڵکی نەفام و بێ عەقڵن.

بۆم دەرکەوت کە لە جیهاندا لەوانەیە هەندێ راستی هەبێت کە چاوی ئێمە نەیبینێ و گوێمان نەیبیستێ و دەستمان هەستی پێ نەکات بەڵام ئەو راستییانە بوونیان هەیە. کەواتە کاتێک کە ئێمە لە شتێک تێناگەین نابێت ئینکاریی بوونی بکەین و بڵێین نییە و لەوانەیە فیرعەونیش حەقیقەتێکی بۆ دەرکەوتبێت کە ناوی لێ ناوە (ئاتوون) بەڵام من کە عەقڵ و فامێکی تەواوم نییە ناتوانم تێبگەم (ئاتوون) کێیەو چییە؟.

لەبەر ئەوەی نەمتوانی ئاشناکانی رابردووم بدۆزمەوە گەڕامەوە ماڵ و روانیم کاپتا بەپێی فرمانی من کەتیبەیەکی بە خانووەکەوە هەڵواسیبوو و خۆی لە خانووەکەدا دانیشتبوو و گۆزەیەک ئاوی جۆی لە بەردەمیدا دانابوو و جار بەجار قومێکی دەخواردەوە.

لە خانووەکەمدا چەند نەخۆشێک دانیشتبوون و چاوەڕوانی گەڕانەوەی من بوون و سەرەتا ئەو دایکەم بانگ کرد کە منداڵێکی لاوازی لە باوەشدا بوو و پێی وتم رۆژ بە رۆژ منداڵە شیرەخۆرەکەم لاواز تر دەبێت. سەیرم کرد نە دایکەکە نەخۆشەو نە منداڵەکەی و بە دایکەکەم وت هۆی نەخۆشیی منداڵەکەت ئەوەیە کە تۆ بایی پێویست خواردن ناخۆیت و ئەگەر خواردنی تەواو بخۆیت و شیری پێویست بە منداڵەکەت بدەی قەڵەو دەبێت. لەدوای ئەوەی کە ژنەکە رۆیشت بەندەیەکم بینی کە پەنجەی چووبووە ژێر بەردی دەستاڕەوەو برینی پەنجەیم دەرمان کردو پێچامەوە. دوایی پیاوێکی نووسەرم فەحس کردو بینیم غودەیەکی گەورە بەقەدەر مشتێک، لە ناوەڕاست قوڕگیدایەو دەرمانێکم دەرخواردی دا کە لە گیایەکی دەریایی دروست دەکراو وتم ئەم غودەیە دەبێ لە قوڕگتدا دەربکرێ و لەدوای ئەوە دەبێ ماوەیەک رابکشێی تا برینەکە چاک دەبێتەوە، ئایا دەکرێ بێم بۆ ماڵتان و لەوێ ئەو غودەیە لە قوڕگتدا دەربهێنم، پیاوەکە رەزامەندیی نیشان



داو بڕیارمان دا کە من سبەینێ بڕۆم بۆ ماڵی ئەو و غودەکە لە قوڕگی دەربهێنم.

پیاوەکە کاتێک کە دەیویست بڕوات دوو حەڵقەی مسی لە گیرفان هێنایە دەرەوە کە لە بری حەقدەستی چارەسەرکردن بمداتێ، بەڵام من پێیم وت من هێشتا چاکم نەکردوویتەوە کە شتت لێ بسەنم. وتی تۆ دەرمانت دەرخواردم دا و من دەبێ حەقەکەت بدەمەوە. وتم من بەبێ ئەوەی هیچ دیارییەکت لێ بسەنم چارەسەرت دەکەم و لەجیاتیی ئەوە ئەگەر رۆژێک پێویستیم بە نووسەر بوو سوود لە هونەرەکەی تۆ وەردەگرم. دوایی ژنێکی گەنج کەلە یەکێک لە خانووە گشتییەکانی بەرامبەردا دەژیا چاوەکانی خۆی بە من نیشان داو وتی چاوم دەیەشێت و ئازارەکەیم بۆ چارەسەر بکە.

دەرمانم کردە چاویەوەو دوایی ژنەکە ویستی دەسهەقی من وەکو ئەو ژنانەی کە لەشی خۆیان هەرزان فرۆش دەکەن بدات، بەڵام من پێیم وت پێویست بەم کارە ناکات و حەقدەستت لێ ناستێنم و لەبەر ئەوەی کە باشتر خزمەتیم کرد بێت دوو لووی بچووکی سەر سکیم نەشتەر کرد کەوەکو دووگمە بە سکیەوە بوو بۆ ئەوەی لەچاوی موشتەرییەکانیدا ناشیرین نەبێ.

ئەو رۆژە کە یەکەم رۆژی کارکردنم بوو تەنانەت یەک حەڵقە مسیشم لە نەخۆشەکان نەسەند و کاتێک رۆیشتن کاپتا خواردنی بۆ هێنام و وتی گەورەم تۆ ئەمڕۆ ئەوەندە قازانجەت لە کارەکەی خۆت نەکردووە کە تەنانەت بکاتە بەهای ئەو خوێیەی کە من کردوومەتە ناو چێشتەوە.

کاپتا خواردنەکەی ئەو رۆژەی، کە مراوییەکی سوورەوە کراو بوو لە یەکێ لە خواردنگەکانی **تەبەس** کڕیبووو گەرم رایگرتبوو بۆ ئەوەی لە کاتی نان خواردندا بۆ منی دابنێت. لە شاری **تەبەس** مراوی و قازیان بەشێوەیەک سوور دەکردەوە کە من هاوتای ئەوەم لە هیچ یەکێک لە وڵاتانی تردا نەدیبوو و لە شاری ئێمەدا مراوی و قازیان دەخستە ناو دەفرێکی کانزایی (فلزی)و سەرەکەیان دەنایەوەو دوایی ئەو دەفرەیان دەخستە ناو کوورەیەکەوەو لە ئاکامدا مراوی و قازەکە بە

جۆرێک دەبرژا کە هەموو ئاو و چەورایییەکەی لە خودی خواردنەکەدا دەمایەوەو هیچی بەفیرۆ نەدەچوو و ئەو جۆرە لێنانە لە هیچ ولاَتێکدا باو نییەو تەنها لە تەبەس ئەم خواردنە بەتامە لێدەنێن[٨]. کاپتا لەو شەوەدا خواردنەوەی خۆشی دەرخوارد دام و لەگەڵ ئەوەشدا کە لەو رۆژە من حەقدەستم لەکەس وەرنەگرتبوو، بەلاَم ئەوەندە خۆشحاڵ بووم کە دەتگوت بازرگانێکی دەوڵەمەندم چارەسەر کردووە و ئەویش ملوانکەیەکی زێڕی داوە پێم. ئەوەش بلێم کە ئەو بەندەیەی لەو رۆژەدا پەنجەیم دەرمان کرد دوای چەند رۆژێکی تر کە پەنجەی چاک بووەوە هاتە لام و دەفرێک ئاردی بۆ هێنام و دەیگوت ئەو ئاردەم لە یەکێک لە ئاشەکان دزیوە بۆ ئەوەی حەقدەست بداتە من و بۆیە کارکردنی رۆژی یەکەمم بەقەدەر ئەو برە ئاردە قازانجی بۆم هەبوو، بەلاَم من ئەو ئاردەم لێوەرنەگرت و وتم بۆ خۆت بێت.

رۆژی دوایی بەندەکەم کە لە ماڵ چووبووە دەرەوە گەڕایەوە و بە منی وت سینۆهە من لەو باوەڕەدام کە ئەمرۆ و رۆژەکانی تر نەخۆشێکی زۆر دێن بۆ لای تۆ چونکە کاتێک کە لە ماڵ دەرچووم گوێم لێ بوو خەڵکی دەیانگوت لە دوێنێوە پزیشکێک هاتووەتە خانووی مسگەرەکەوە کە زۆر شارەزایەو نەخۆشەکان چارەسەر دەکات و هیچیان لێ ناستێنێ و حەڵقەی مسیش دەداتە نەخۆشە هەژارەکان. کاپتا دەیگوت هەژارەکان بەیەکتری رادەسپێرین کە زووتر بچنە لای ئەم پزیشکە بۆ ئەوەی هەم نەخۆشییەکەیان چاک ببێتەوەو هەمیش مسی لێ وەربگرن چونکە ئەم پزیشکە بەم شێوەیە کانزا دەداتە خەڵکی و هیچ وەرناگرێت بە زوویی هەژاری یەخەی دەگرێت و ناچار دەبێت خانووەکەشی بفرۆشێت و لەو گەرەکە بڕوات. هەندێکیشیان دەیانگوت لەوانەیە ئەم سینۆهە یە شێت بووبێت و ئەگەر لەسەر ئەم شێت بوونەی بەردەوام بێت لە ژوورێکی تاریکدا دەست بەسەری دەکەن و زاڵوو دەخەنەبان سەری بۆ ئەوەی شێت بوونەکەی چاک ببێتەوە.



من کە ئەم قسانەم لە خەڵکی بیست پێکەنینم بە نەفامییەکەیان هات چونکە دەمزانی کە تۆ، گەورەی من، پیاوێکی دەوڵەمەندی چونکە لەسەر فەرمانی تۆ من کانزاکانتم خستۆتە ئیشەوەو دەتوانی بە قازانجی ئەو زێڕانەی کە هەتە بە باشی بژیت و هەموو شەوێ وەک ئەم شەو مراوی یان قاز بخۆی.

دوایی کاپتا وتی بەلاَم من لە یەک شتی تۆ دەترسم و ئەویش نائاسایی بوونی تۆیە و تۆ پیاوێکی ئاسایی نیت و لەبەر ئەوە لەوانەیە رۆژێک بێت کە بەتەما بیت هەرچییەک پارەت هەیە فڕێی بدەی و ئەم خانووە هاوپێچ لەگەڵ مندا ،کە بەندەی تۆم بفرۆشی. چونکە جارێکیان ئەم کارەت کردووە و خانووەکە و منیشت فرۆشت بەو ژنەی کە عاشقی ببوویت و ئەگەر من هەڵ نەدەهاتم ئێستا بەندەی ئەو ژنە بووم. بۆیە سبەینێ تۆ دەبێت کاغەزێک بە نووسەرێک بنووسی و تیایدا ئاماژە بەوە بکەیت کە من ئازادم و دەتوانم بە کەیفی خۆم بۆ هەر شوێنێ کە حەزم لێیە بڕۆم و کەس نەتوانێت من بکڕێتەوە چونکە بەندە نیم.

من لەبەر ئەوە نووسراویشم لێت دەوێت چونکە قسە نامێنێت بەلاَم نووسراو هەتا هەتایە هەر دەمێنێت لەبەر ئەوەی پاپیرۆس لەناوچوونی نییە.

***

(١) کەتیبە: نووسراوەی سەر بەرد یان کاشی یان خشت .

(٢) ماڵە سۆزانییەکان – ئەو مالاَنەی بۆ مەبەستی رابواردن بوون – و. کوردی.

(٣) نێرەمووک – خەساو .

(٤) مطهرە – إبريق .

(٥) (صليب الحياة) .

(٦) (ئۆزی ریس) یەکێک لە خوایە ناودارەکانی میسر بوو و لەبەر ئەوەی ئەم خوایە لەو مێژووانەدا کە ئەوروپییەکان لە بارەی میسرەوە نووسیویانە زۆر ناوی هاتووە، لە نێوان خوایەکانی میسر زیاتر ناوبانگی هەبووە – وەرگێڕ–

(٧) نطفة.

(٨) ئەم بەشە لەسەر گوزەشتی سینۆهە ئیسپاتی دەکات کە لێنانی خواردن لە فڕن (تەنوور)، کە ئێمە وا دەزانین لە داهێنانەکانی رۆمییەکانەو لەوانەوە هاتووەتە ئەوروپا، لە داهێنانی میسرییەکان بووە و دانیشتوانی **تەبەس** بەم شێوەیە خواردنیان دروست دەکرد – وەرگێڕ.

# نیگەرانیی خەڵکی تەبەس بۆ داهاتوو

شەوەکەی کە کاپتا ئەو قسەیەی کرد من بە بۆنەی ئەوەی توانیبووم هەژارەکان بە خۆڕایی چارەسەربکەم شادمان بووم و خواردن و خواردنەوەکەش ئەوەندەی تر شادمانییەکەی منی زیاتر کرد.

بەهاربوو و، گوڵەکانی ئاقاقیا بۆنی هەوای خۆش کردبوو و لە دارەڕاکەی کەناری نیل بۆنی کەل و پەلی سووریا دەهات و لە ماڵە گشتییەکان دەنگی مۆسیقای سریانی دەهاتە بەر گوێ و کوندەبەبووەکان دەیانخوێند و من روحی خۆم لە شادمانیدا دەبینییەوە.

بۆیە رێگام بە کاپتا دا کە لە جامێکی گڵیدا خواردنەوە بۆ خۆی تێ بکات و پێم وت: کاپتا بەر لەوەی داوام لێ بکەی ئازادت بکەم، من لە دڵمدا تۆم ئازاد کردبوو و ئازادیی تۆ لەو رۆژەوە دەستی پێکرد کە من و تۆ دەمانویست لەم شارە دەربچین و من کانزام نەبوو و تۆ هەموو پاشەکەوتەکەی خۆت دا بە من بۆ ئەوەی بتوانین دەرباز بین.

لەو رۆژەدا من بڕیارم دا کە هەر کاتێ دەوڵەمەندبووم ئازادت بکەم و دوایی پێت بڵێم ئەگەر حەزت لێیە وەکو خزمەتکارێک (نەک وەک بەندە) لەلای من بمێنەوە، ئەگەرنا بۆ هەر شوێنێ کە دەتەوێ بڕۆ. ئێستاش پێت دەڵێم کە ئازادی و بۆ زیاتر دڵنیابوونت سبەینێ نووسراوێک بە نووسەرێ دەنووسم بۆ ئەوەی باوەڕ بکەی کە ئازادی، بەڵام تۆ وتت لەمەودوا من بە قازانجی زێڕ و پارەکەم ژیان دەبەمەسەر، پێم بڵێ زێڕی من چۆن سوودی دەبێت، مەگەر وەک پێم وتبووی زێڕەکانی منت لە پەرستگەی (ئاموون)دا بە ئەمانەت دانەناوە؟



کاپتا بە تاکە چاوەکەی سەیری کردم و وتی: نا سینۆهە.. ئێستا کە ئازادم، پێت دەڵێم کە من فەرمانەکەی تۆم جێ بە جێ نەکردووە و زێڕەکانی تۆم لە پەرستگە دانەناوە، چونکە فەرمانەکەی تۆ لە عەقڵەوە دووربوو و من ئەو کارانەی دژی ئەقڵ بن جێ بە جێی ناکەم و لەبەرئەوەش کە دەزانم لەوانەیە لە ناکاودا تووڕە بیت، بۆ دووربینی گۆچانەکەتم شاردۆتەوە کە نەیکێشی بەشان و پشتمدا. بەڵام بۆ ئەوەی بزانی کە بۆچی فەرمانەکەتم ئەنجام نەداوە دەبێ پێت بڵێم کە تەنها خەڵکی نەفام زێڕی خۆیان لە پەرستگە دادەنێن، چونکە بە ئەمانەت دانانی زێڕ و پارە لە پەرستگە دوو خراپەی گەورەی هەیە: یەکەم ئەوەی کە کاهینەکان و لە ئاکامدا فیرعەونیش لەبری سامانی تۆ ئاگادار دەبنەوە و دەزانن کە تۆ چەند زێڕت هەیە و یەکێک لەو کارانەی کە نیشانەی شێتییە ئەوەیە کە مرۆڤ خەڵکی تر لە چەندێتیی داراییەکەی خۆی ئاگادار بکاتەوە.

دووەمیشیان ئەوەیە کاتێک کە تۆ زێڕەکەت لە پەرستگە دادەنێیت و لە خەزێنەی ئەوێ دەمێنێتەوە، هەموو ساڵێک دەبێ هەندێک لەو زێڕە لە بری هەقی خەزنەداری بدەیتە پەرستگەو لە ئاکامدا ساڵ بە ساڵ زێڕەکەت کەمتر دەبێتەوە. بۆیە ئەو کاتەی تۆ بۆ پیاسەکردن لە ماڵەوە چوویتە دەرەوە کە هاوڕێکانی رابردووت ببینی، من لە شاردا سووڕامەوە بۆ ئەوەی بزانم چۆن دەکرێ زێڕ بخەیتە کارەوە کە بە هۆیەوە قازانجت دەست بکەوێت و بەبێ ئەوەی ئیشێک بکەی و ماندوو بیت سوود وەربگریت و من زانیم کە لە شاری (**تەبەس**)دا چیی تر خەڵکی زێڕی خۆیان لە پەرستگەی ئاموون‌دا، دانانێن، چونکە لێی دڵنیانین و دەترسێن زێڕەکەیان لەوێ بفەوتێ.

هەروەها لەبەرئەوەی بۆ سپاردنی ئەو زێڕە متمانە بە پەرستگە ناکرێت، کەواتە لە سەرتاسەری میسر جێگایەکی ترنییە کە مرۆڤ بتوانێت بە دڵنیاییەوە داراییەکەی خۆی لێ دابنێت. جگە لەوەش لەگەڵ ئەو زانیارییانەی کە دەستم کەوت بۆم روون بووەوە کە خوا (ئاموون) زەوییەکانی خۆی دەفرۆشێت.

وتم: درۆ دەکەی و خوا (ئاموون) واتە پەرستگەی (ئاموون) هەرگیز زەوی نافرۆشێت، بەڵکو بەردەوام زەوی و زار دەکڕێت و هەموو ساڵێ داراییەکەی خۆی زیاتر دەکات.

کاپتا وتی: بەڵام ئێستا پەرستگەی ئاموون بە دزییەوە زەوییەکانی دەفرۆشێت و ئەو زەوییانە دەکاتە زێڕ و پارە و دەیخاتە ناو خەزێنەکەی خۆیەوە و ئەوەندە ئەو پەرستگەیە زەویی فرۆشتووە و زێڕی کۆکردۆتەوە، کە ئێستا لە میسر زێڕ و کانزا کەم بووتەوە.

وتم: ئایا تۆ زێڕەکەی منت بە زەوی داوە؟

کاپتا وتی: نا گەورەم، من زێڕەکەتم بە زەوی نەداوە، چونکە نەتۆ لە کشتوکاڵ دەزانیت و نە من و ئەگەر ئاڵتوونەکەتم بدایەو زەویم بکڕیایە سەرکارو جووتیارو ئەو بەندانەش کە تیایدا کاریان دەکرد بەروبوومی ئەو کێڵگانەی تۆیان لێ دەدزیم. لە کاتێکدا کە من خۆم لەم شارەدا دزی دەکەم، واتە خەڵکی فریو دەدەم. هەروەها من وا هەست دەکەم کە فرۆشتنی ئەو زەوییانە لە لایەن پەرستگەی ئاموونەوە، واتە لە لایەن ئەو پەرستگەیەی کە زیاتر لە سەدان ساڵە زەوی دەکڕێت، بەبێ هۆنییە و ئەو پەرستگەیە دەزانێت کە توانای بەرگری کردنی نییە لە بەرامبەر خوای نوێ و دەبێ لە ناو بچێت. بۆیە پێشتر زەوییەکانی دەفرۆشێت تاکو خوای تازەی فیرعەون دەستی بەسەردا نەگرێت، لەبەرئەوە کڕینی زەوییەکانی پەرستگەی ئاموون مەترسیی هەیە، چونکە لەوانەیە دوایی خوای نوێ بڵێت هەموو ئەو زەوی و زارانەی خوای پێشوو کە لە لایەن ئەوەوە بە خەڵکی فرۆشراوە هی منن و دەست بەسەر هەموو ئەو زەوییانەدا بگرێت کە خەڵکی لە پەرستگەی (ئاموون)یان کڕیوەتەوە، بەبێ ئەوەی بەهاکەی بدەنەوە خەڵکی.

وتم: ئەمانەی کە تۆ باسی دەکەی مەسائیلی لاوەکین و من لێتم پرسی چیت لە زێڕەکەم کردووەو لە چیدا سەرفت کردووە کە دەڵێی قازانجت لێی دەست



دەکەویت؟

کاپتا وتی: لەبەر ئەوەی پەرستگەی ئاموون کێڵگە کشتوکاڵییەکانی خۆی دەفرۆشێت و زێڕ و زیو کۆدەکاتەوە، وەکو باسم کرد زێڕ و پارە لە میسر کەم بووەتەوە و ئەو کەم بوونەوەیەش بۆتە هۆی ئەوەی کە بەهای خانووی نیشتەجێیی و جێگا بازرگانییەکان دابەزێت. بۆیە من کە زانیم خانوو هەرزان بووە بەشێکی زێڕەکەتم داوەو چەند خانوویەکی نیشتەجێیی و چەند جێگایەکی بازرگانیم کڕیوەو تۆ ئەم خانووانە بەکرێ دەدەیت و هەموو ساڵێک کرێکەیان وەردەگری و هەمیشە خانووەکانت دەمێنێت و سوودی لێ وەردەگری و لە بەرئەوەش کەوام بیردەکردەوە لە لایەن تۆوە دەسەڵاتی تەواوم هەیە بۆ کڕینی ئەو خانووانە، بەبێ مۆری تۆ ئەو جێگایانەم کڕی و ئەگەر کڕیارەکان (کرێ چییەکان) بەبۆنەی دەڵاڵییەوە دیارییەکم بدەنێ پەیوەندیی بە تۆوە نییە، بەڵکو پەیوەندیی بە دەبەنگیی خۆیانەوە هەیە، چونکە من لەم کارەدا هیچ شتێکت لێ نادزم، بەڵکو دیارییەک لە کڕیارەکان وەردەگرم و ئەگەر تۆش بتەوێ دیارییەک بە بەندەکەی پێشووت بدەی ئەوا لێتی وەردەگرم.

وتم: کاپتا، من هیچ بەخشییەکت نادەمێ، چونکە دەزانم کە تۆ لەم کارەدا رەچاوی قازانجی خۆت کردووە و پێشبینی دەکەی کە لە رێگای وەرگرتنی کرێی خانوو و هەروەها لە رێگای خەرجی دۆزینەوە بە ناوەی چاک کردنەوەی خانووەکان دزییەکی باشم لێ دەکەیت.

کاپتا وتی: تۆ لە هەڵەدای و ئەگەر گەورەیەکی ستەمکار و قرچۆک بوویتایە من وەهام بیردەکردەوە و ئەو پێشبینییەم دەکرد کە لە داهاتوودا چۆن سوود لەو خانووانە وەربگرم، بەڵام تۆ گەورەیەکی بە بەزەیی و بەخشندەی و پێویست ناکات کە من لە لای خۆم ئەم حیسابانە بکەم، چونکە هەر چییەک کە تۆ هەتە لە ژێر دەستی مندایەو من ماڵی تۆ بە هی خۆم دەزانم و کاتێک کە پارێزگاری لە بەرژەوەندییەکانی تۆ دەکەم لە راستیدا بەرژەوەندییەکانی خۆم پاراستووە و

لەبەر ئەوە بە بەشێکی تر لە پارەکەت هەندێ دانەوێڵەم لە جووتیارەکان کڕیوەتەوە.

وتم: کاپتا دانەوێڵەت بۆچی کڕیوە؟

وتی: ئەم ناکۆکییەی کەلە میسردا لە نێوان ئەو دوو خوایە دەستی پێکردووە بێگومان چارەنووسێکی ترسناکی بۆ گەلی میسر دەبێت، چونکە هەر کاتێک کە خوایەکان ناکۆکییان هەبێت وەک ئەو کاتانەی کە گەورەکان لەگەڵ یەکتریدا بەشەڕ دێن زیانەکەی لە خەڵکی دەکەوێت و میللەت دەبێ بۆ جەنگی نێوان خوایەکان و گەورەکان قوربانی بدات و من وابیردەکەمەوە کە بەهۆی شەڕی نێوان ئەو دوو خوایە لە میسردا بارودۆخەکە بەرە و شێواوی و ئاڵۆزی دەچێت و ئەم بێ بەندو بارییە کێڵگەکان وەک بیابانێکی رووت لێ دەکات و جگە لەوەش ئەمڕۆ هەر کەسێک کە کەمێ زێڕ و زیوی هەیە لە ترسی بەگژیەکدا چوونی خوایەکان زەوی دەکڕێت، چونکە دەزانێت کە زێڕ و پارە دەدزرێت، بەڵام زەوی نادزرێت.

ئەو کەسانەی کە زەوی دەکڕنەوە هەموویان بازرگانن، یان لە دەرباریبیەکان و کاهینەکانن کە زەوی لە پەرستگە دەکڕن بۆ ئەوەی لە ژێر دەسەڵاتی پەرستگە دەربچێت و ببێتە هی خۆیان، بەڵام هیچ یەکێ لەو کەسانە جووتیار نییە و ناتوانێت لە زەوییەکەدا کشتوکاڵ بکات و لە ئاکامدا هەموو ئەو زەوی و زارانە بە بەیاری دەمێننەوە و خەلەو خەرمان و دانەوێڵە زۆر کەم دەبێت و میسر تووشی کەمیی ئازووقە دەبێت و لەو کاتەدا دەتوانین ئەو دانەوێڵەیەی کە کڕیومانە بە بەهایەکی باش بیفرۆشین[1].

من دەزانم کە تۆ وابیردەکەیتەوە دەغل و دان وەک بەرد نییە کە هەزاران ساڵ بمێنێتەوەو مشک دانەوێڵە دەخوات و بەندەکان دەیدزن، بەڵام مرۆڤ هەتا کەمێک زەرەر نەکات قازانجی زۆری دەست ناکەوێت و من هەندێک لەو خانووانەی کە کڕیومە بۆ عەمبارکردنی دانەوێڵەکەمە کە ئەو دەغڵ و دانەی



کڕیومە لەوێ دایبنێم و پارێزگاریی لێ بکەم کە نە مشک بیخوات و نە بەندەکان بیدزن. ئەو رۆژەش کە دەغڵ و دانەکەمان فرۆشت و ئیتر پێویستیمان بە عەمبار نەما بە کرێ دەیدەینە بازرگانەکان کە کەل و پەلی خۆیانی تیا دابنێن یان بیکەنە ژووری بازرگانی.

وتم: کاپتا من بە پێچەوانەی تۆوە زۆر ئومێدەوار نیم کە ئەم کارانە سوودی بۆ من هەبێت، بەڵام لەبەرئەوەی مامەڵەت کردووە من رەخنەت لێ ناگرم، بە مەرجێ لە داهاتوودا واز لە من بهێنی و بۆ بەڕێوەبردنی ئەم خانووانە و فرۆشتنی دەغڵ و دانەکە نەبیتە هۆی زەحمەت دانی من.

کاپتا وتی: من بیرێکی تریشم کردۆتەوە کە بۆ دەوڵەمەندیی تۆ زۆر بەکەڵکەو ئەویش کڕینی یەکێک لە بازاڕەکانی کۆیلە فرۆشییە، ئەگەرچی من سەرم لە کشتوکاڵ دەرناچێت، بەڵام لە بری ئەوە هەتا بتەوێ لە کڕین و فرۆشتنی کۆیلە شارەزام و دەزانم کە چۆن بەندەکان بە هەرزان بکڕم و کەموکوڕییەکانیان داپۆشم بۆئەوەی کڕیارەکە هەست بە ئەو خەوشانە نەکات. هەروەها دەزانم کە چۆن بەهۆی دار و قامچی ئەو کۆیلانە گوێڕایەڵ بکەم، چونکە خۆم کۆیلە بوومەو ئەو کەسەی کە خۆی بەندە بێت ئاشنای هەموو فرت و فێڵێکی کۆیلە فرۆشتنەو، من دڵنیات دەکەم کە ئەگەر ئێمە ئەم بازاڕە بکڕین لە دوای چەند ساڵێ تر تۆ دەبیتە یەکێک لە دەوڵەمەندە گەورەکانی میسر.

وتم: کاپتا لەگەڵ ئەوەشدا کە کۆیلە فرۆشی قازانجی هەیە، بەڵام من حەز لە کڕین و فرۆشتنی بەندە ناکەم، چونکە کۆیلە فرۆشی کارێکی پیس و نەفرەت لێ کراوە. من دەزانم کە زۆربەی مامەڵەچییەکان ئەم کارە دەکەن و هەمووشیان پێویستییان بە بەندەیە و دەیکڕن، هەروەها لە رابردوودا من، تۆ و ئەو کەنیزەی کە بۆتم هێنابوو کڕیمەوە، بەڵام ئەمڕۆ حەز ناکەم کۆیلە فرۆش بم.

کاپتا هەناسەیەکی هەڵکێشاو وتی: نازانم تۆ بۆ ئەوهایت و بۆچی ناتەوێت وەکو خەڵکی تر لە ماوەیەکی کەمداو بەبێ ماندووبوون دەوڵەمەندبیت. ئێمە

ئەگەر بازاڕێکی کۆیلە فرۆشی و چەند خانوویەکی گشتیمان بکڕیایە، کەنیزە جوانەکانمان لە بازاڕی کۆیلەکانەوە بۆ ئەو خانووانە دەبرد و هەموو شەوێک لەهەر یەکێک لەو خانووانە سوودێکی زۆرمان دەست دەکەوت، بەلاّم من چی بکەم، خوایەکان گەورەیەکیان داوە بە من کە دەست و دڵی لەگەڵ خەڵکی تر جیاوازە، بەلاّم ئێستا کە ناتەوێت بازاڕی کۆیلەو خانەی گشتی بکڕی، داواکارییەکی تری من پەسەند بکە.

پرسیم: داواکارییەکەت چییە؟

کاپتا وتی: لەبەر ئەوەی تۆ ئەمڕۆ منت ئازاد کردووە حەز دەکەم کە ئەم رووداوە بکەین بە جەژن. ئەگەرچی داواکارییەکەی من لە دیدی تۆدا لە ئەدەبەوە دوورە، بەلاّم دەمەوێت لەگەڵ مندا بێیت بۆ ئەوەی بەیەکەوە بڕۆین لە مەیخانەی (کلکی تیمساح) کە لە کەناری رووباردایە و لە ناوچەی بەندەرییە، شەرابێ بنۆشینەوە کە ناوی (کلکی تیمساح)ە، واتە ئەو شەرابە بە ناوی ئەو جێگایەوە ناونراوە کە خواردنەوەیەکی بەهێزە و لە خواردنەوەکانی تر زیاتر نەشئەی هەیە.

ئەگەرچی داواکارییەکەی کاپتا بێ ئەدەبی بوو و خزمەتکار یان بەندە بۆی نییە داوا لە گەورەکەی خۆی بکات کە لەگەڵیدا بۆ مەیخانە بڕوات و پێکەوە بخۆنەوە، بەلاّم داواکارییەکەی کاپتام پەسند کرد، چونکە لەو شەوەدا خۆشحاڵ بووم و وام بیردەکردەوە کە ڕۆیشتن بۆ مەیخانە و رابواردن لەوێ بۆنەیەکی خۆشە.

هەروەها بیرم کردەوە کە ئەو کاتەی لە کریت بووین کاپتا ئامادەبوو کە لەگەڵ مندا بچێتە ناو خانەی خوا، لە کاتێکدا کە دەیزانی کەس لەو جێگایە ناگەڕێتەوە، منیش ئێستا دەبێ داواکارییەکەی جێبەجێ بکەم و لە گەڵیدا بۆ مەیخانە بڕۆم، چونکە ڕۆیشتن بۆ مەیخانە زۆر ئاسانترە لەوەی کە مرۆڤ بزانێ بۆ جێگایەک دەچێت کە ئیتر ناتوانێت لەوێ بگەڕێتەوە.

کاپتا کاتێک کە بیستی داواکارییەکەی ئەوم پەسەند کرد، زۆر دڵخۆش بوو



و ڕۆیشت و بالاّپۆشەکەم[٢] و گۆچانەکەی کە شاردبوویەوە هێنای و من بالاّپۆشەکەم لە شان کرد و گۆچانەکەم گرتە دەست و لەماڵ دەرچووین و بەرەو مەیخانەی (کلکی تیمساح) بەڕێ کەوتین.

(کلکی تیمساح) لە ناوەڕاستی گەڕەکی بەندەری، لە نێوان دوو خانوودا بوو و بەر لەوەی بچینە ناو مەیخانەکەوە روانیم لە سەر مەیخانەکە تیمساحێکی گەورەی وشک کراوە هەڵواسرابوو کە چاوی شووشەیی پێوە بوو و دەمە کراوەکەی ددانە سپییەکانی پیشان دەدان.

کاتێک کە هەنگاومان نایە ناو مەیخانەکەوە سەیرم کرد دیوارەکانی ئەستوور بوو و، قازانجی ئەستوور بوونی دیوار لەوەدایە کە لە وەرزی هاوین و زستاندا فێنکی و گەرمای مەیخانەکە رادەگرێت. لە شێوەی هاتنە ژوورەکەی کاپتا تێگەیشتم کە هەر نەبێت جارێک هاتۆتە ئەو مەیخانەیەوە و شارەزای رێ و رەسمی ئەو جێگایەیە.

لەدوای ئەوەی کە دانیشتین روانیم زەویی مەیخانەکە و دیوارەکانی وەکو ماڵی دەوڵەمەندەکان بەدار فەرشکرابوون و نەخشی جۆراوجۆریان لەسەر کێشرابوو. کاپتا کە بینیی سەرنجم داوەتە تەختەدارەکانی زەوی و دیواری مەیخانەکە، وتی: ئەم دارانەی دەیبینی لە ئەو کەشتییانەوە دەست کەوتووە کە سکراب کراون و هەر یەکە لەم تەختانە هی کەشتییەک بووە کەلە دەریادا هاتوچۆی کردووە و باو باران رەنگیانی گۆڕیوە.

ئەو کڕیارانەی کە لە دووکانەکەدا بوون سەیرێکی منیان کرد و دوایی سەرگەرمی کارەکەی خۆیان بوونەوە. کاپتا فەرمانی دا (کلکی تیمساح)مان بۆ بهێنن و بە خاوەنی مەیخانەکەی وت: خۆت (کلکی تیمساح)ەکەی ئێمە ئامادە بکەو، دیاربوو (کلکی تیمساح) مەشرووبێک بوو کە دەبوایە ئامادە بکرایە. واتە وەکو خواردنەوەکانی تر نییە کە یەکسەر لە گۆزەکەوە بیکەنە ناو پیاڵەوە و بیهێنن.

دوایی سەیرم کرد ژنێک دوو پیاڵەی بەدەستەوە گرتووە و بەرەو ئێمە دێت و سەرو وەزعی نیشانی دەدا کە خزمەتکاری مەیخانەکەیە. ئەو ژنە زۆر گەنج نەبوو و، لە وڵاتێکی وەکو میسر کە ژنەکان رووتن ئەو پۆشتەبوو و حەڵقەیەکی زیوی بە گوێیەوە کردبوو و دوو دەستبەند (بازنگ)ی زێڕ بە مەچەکی هەردوو دەستییەوە دەبینرا. هەرچەندە نزیکتر دەبووەوە زیاتر جوانییەکەی دەردەکەوت و کاتێک گەیشتە لای ئێمە، روانیم برۆی باریک و چەماوەبوو و چاوەکانی سەرنج راکێش و رەنگی ئەسمەر بوو.

کاتێک کە چاوم بڕییە ناو چاوەکانییەوە ئەو وەکو هەندێ لەو ژنانەی روویان هەڵدەسووڕێن رووی خۆی وەرنەگەڕاندو روانییە چاوەکانی من و یەکێک لە پیاڵەکانم لە دەستی وەرگرت و کاپتاش پیاڵەی دووەمی لێ وەرگرت و وتم: ئەی ژنی جوان، ناوت چییە؟

ژنەکە وتی: ناوم (مەریت)ە و کەس بەناوی ژنی جوانەوە بانگم ناکات و لەبەرئەوەی تۆ بەم ناوەوە بانگم دەکەیت وا تێدەگەم کە تۆ پیاوێکی (مەحجوب)ی و وەک گەنجێکی تازە پێگەیشتوو، کە بەم جۆرە قسانە جورئەت دەداتە خۆی بۆ ئەوەی بتوانێ دەستی خۆی لەسەر دەستی ژنێک دابنێت، تۆش بوێرانە دەتەوێ دەستت لە سەر دەستی من دابنێیت.

دوایی لێی پرسیم ئایا تۆ پزیشک نیت و ناوت سینۆهە نییە؟

وتم: با...

وتی: ئەگەر حەزدەکەی کە دووبارە بە بینینی خۆت خۆشحاڵمان بکەیت پێم مەڵێ ژنی جوان و سووکایەتیم پێ مەکە.

وتم: چۆن زانیت من سینۆهەم؟

(مەریت) وتی: ناوبانگی تۆ لە خۆت زووتر هاتە ئەم مەیخانەیەوە، بە جۆرێک کە من لەگەڵ هاتنە ژوورەوەتدا تۆم ناسییەوە و ئێستا دەبینم کە ناوبانگت بەبێ هۆ نەبووە.



کاتێک (مەریت) گفتوگۆی لەگەڵدا دەکردم بزە دەهاتە سەر لێوی، بەڵام هەستم کرد کە خەندەی سەر لێوانی لە شادمانییەوە نەبوو، بەڵکو نیشانەی پەژارە بوو و لە چاوەکانیشیدا ئەم خەمە هەست پێ دەکرا.

وتم: (مەریت) ئەگەر تۆ لە زمانی کاپتاوە کە دێتە ئێرە و لە رابردوودا بەندەی من بووە و ئێستا ئازادم کردووە، وەسفی منت بیستووە، ئەوا بزانە کە متمانە بە قسەکانی کاپتا ناکرێت، چونکە ئەم پیاوە خوویەکی تایبەتی هەیەو جەوهەری ئەو خووەی بە جۆرێکە کە زمانی ناتوانێت لە نێوان راست و درۆدا جیاوازی بکات، بۆیە زیاتر درۆ دەکات و من ئەگەرچی پزیشکم، بەڵام نەمتوانیوە ئەم نەخۆشییەی چارەسەر بکەم و لێدانی گۆچانەکەشم سەبارەت بە چارەسەرکردنی ئەم عەیبەی بێ ئاکام مایەوە.

(مەریت) بە خەمبارییەوە بزەخەنەیەکی هات و وتی: سینۆهە، زۆرجار درۆ لە راستی باشترە، چونکە درۆ مرۆڤ ئومێدەوار و دڵخۆش دەکات. لە کاتێکدا کە وتەی راست دەبێتە هۆی نائومێدی. بۆ نموونە کاتێک کە تۆ بە من دەڵێی (ئەی ژنی جوان) لەگەڵ ئەوەشدا کە دەزانم درۆ دەکەی بەڵام دڵم بەم درۆیە شادمان دەبێت. ئێستا حەزدەکەم لەم مەشرووبەی (کلکی تیمساح) کە بۆم هێناوی بنۆشی و پێم بڵێی کە ئایا ئەم شەرابە بەهێزترە یان ئەو نۆشینەوانەی کە لە وڵاتانی تردا خواردووتەوە.

بەبێ ئەوەی چاو لە (مەریت) هەڵبگرم قومێکم لەو شەرابە نۆشییەوە، بەڵام دوایی نەمتوانی سەیری بکەم، چونکە قوڕگم و دوایی سکیشم سووتایەوە و لە ناکاودا خوێن لە لەشمدا هاتە جۆش و لەدوای ئەوەی ئارام بوومەوەو کاریگەرێتیی نەشئەکەی دەرکەوت، وتم: کاپتا ئەگەرچی زۆر درۆ دەکات، بەڵام ئەوەی سەبارەت بە مەشرووبی ئەم مەیخانەیەوە دەیگوت راستە، چونکە ئەم خواردنەوەیە لە هەموو ئەو شەرابانەی کەلە وڵاتانی بیانی نۆشیومەتەوە بەهێزترە و گەرماییەکەی لەو رۆنە رەشەی دانیشتووانی بابل لە زەوییەوە بە دەستی

دەهێنن و دەیکەنە ناو چراکانی خۆیانەوە زیاترە. (مەبەستی نووسەر لەم رۆنە رەشە نەوتە- وەرگێڕ) و وەک چۆن تیمساحێکی راستەقینە بەلێدانێکی کلکی مرۆڤێکی بەهێز بەزەویدا دەدات، نۆشابەکەی تۆش پیاوێکی بەتوانا لەکار دەخات.

لەناو قورگمدا بۆن و بەرامە و تامێکی عەتراوی چەند جۆرە گیاو بەهاراتێکم هەست پێ دەکرد و لەناکاودا هەستم بە کەیف خۆشی کردو حەزم کرد کە زیاتر لەگەڵ (مەریت)دا بدوێم و پێم وت: (مەریت) من نازانم ئایا ئەم نۆشینەوەیە منی وەها شادمان کرد، یان ئامادەبوونی تۆ روحی منی شاد کردووە و ئەوەندە دەزانم کە خۆشحاڵم و حەز دەکەم کە دەستم لەسەر دەستەکانت دابنێم و ئەگەریش لەم کارە نارازیت لێم مەگرە چونکە (کلکە تیمساح)ەکەی تۆ منی بێ باک کردووە.

ژنەکە کەمێک چووە دواوەوە و وتی: من خاوەنی ئەم مەیخانەیە نیم و خزمەتکاری ئێرەم، بەڵام ئەم شەرابە من دروستی دەکەم و تەنها جەهیزییەیەک کە باوکم بەمنی داوە، شێوەی دورست کردنی ئەم شەرابەیە و ئەوەندە ئەم شەرابە سەرنجی خەڵکی راکێشاوە کە بەندەکەی تۆ کاپتا، کە دەڵێی ئازادم کردووە، خۆی وانیشان دەدات کە منی خۆش دەوێت بۆ ئەوەی بتوانێت چۆنیەتیی دروست کردنی ئەم شەرابە لەمنەوە فێربێت و کاتێک کە بەندەکەت زانیتی کە بەهیچ شتێک ناتوانێت سەرنجی من رابکێشێت و بمکاتە خوشکی خۆی، بڕیاری دا ئەم مەیخانەیە بە زێڕ بکڕێتەوەو حەزیش دەکات کە شێوەی دروست کردنی ئەم شەرابەشم لێ بکڕێتەوە.

کاپتا کاتێک کە گوێی لەم قسەیە بوو، ئاماژەی بۆ ژنەکە کرد کە بێدەنگ بێت، بەڵام من چونکە شادمان بووم وتم: (مەریت) ئێستا ،کە (کلکی تیمساح)م نۆشیوەتەوەو خۆم خۆشحاڵ دەبینم، وا تێدەگەم کە کاپتا ناهەقی نەبووە دڵی پێتەوە بێت و بیەوێت تۆ بکاتە هاوسەری خۆی. من ئەم وتەیە



لەکاتی سەرخۆشیدا دەکەم و سبەینێ، کاتێک کە هۆشیار بوومەوە لەوانەیە لە قسەکەم پەشیمان ببمەوە. ئایا راستە کە کاپتا زێڕی داوەو ئەم مەیخانەیەی کڕیوەتەوە.

بەرلەوەی ژنەکە وەڵامم بداتەوە کاپتا وتی: سینۆهە من نەمدەویست کە تۆ بەم شێوەیە لە هەواڵی کڕینەوەی ئەم مەیخانەیە ئاگادار ببیتەوە، بەڵکو بەتەمابووم خۆم ئەم بابەتەت پێ رابگەیەنم، بەڵام ئێستا کە ئەم ژنە نهێنییەکەی منی درکاند دەبێ بڵێم کە من ئەم جێگایەم بە زێڕی خۆم، واتە بەو زێڕەی کە لەماوەی ئەم چەند ساڵەدا لە تۆم دزیوە، کڕیوەتەوە، چونکە توانای بەڕێوەبردنی مەیخانەم هەیەو دەزانم کە ئەم کارە ئاسانەو گرفت دروست ناکات و پێویستی بە هێزی گەنجێتی نییە.

من ئەوەندە لە مەیخانەکاندا بەبێ پارە شەراب و بیرەم خواردۆتەوە کە بەبینینی موشتەری یەکسەر دەزانم ئایا دەتوانێت پارەی خواردنەوەکەی بدات یان نا و ئایا متمانەی پێ دەکرێت شتی بەقەرز پێ بفرۆشرێت یان نا؟ پیشەی مەی فرۆشی کارێکی بێ گیروگرفتەو چێژ وەرگرتنەکەی لەوەدایە کە مرۆڤ لە مەیخانەدا خەڵکانی جۆراوجۆر دەبینێت و لەهەر یەکێک لەوان شتێکی تازە دەبیستێ و، بۆ من، کە مرۆڤێکم لە شت دەکۆڵمەوە و حەز دەکەم کەلە هەمووشتێ ئاگادار ببم، زۆر بە سوودە.

لەم کاتەدا کاپتا پیاڵەکەی خۆی هەڵقوڕاندو بەکەیف و خۆشییەوە وتی: گەورەم تاکە کاسبییەک کە هەرگیز بێ بازاڕ نابێت، مەی فرۆشییە، چونکە هەتا دنیا بمێنێت، خەڵکی هەر دەخواتەوەو لەوانەیە فیرعەونەکان نەمێنن و خوایەکان لە عەرشی خوایەتییەکەیان بکەونە سەر زەوی، بەڵام بادەفرۆش هەرگیز لەناو ناچێت. چونکە خەڵک کاتێک کە دڵخۆش و بەختەوەرن دەنۆشنەوەو کاتێکیش کە بەدبەخت و خەمبارن دیسانەوە هەر بۆ دامرکاندنەوەی پەژارەکەیان پەنا دەبەنەبەر بیرە و شەراب.

کاتێک کە پیاوێک عاشق دەبێت ئەڤینەکەی خۆی بە خواردنەوە بەهێز دەکات و کاتێکیش لەگەڵ ژنەکەی خۆیدا بەشەڕ دێت دیسانەوە بۆ نەهێشتنی تووڕەبییەکەی دێتە ئەم مەیخانەیە و دەنۆشێتەوە.

کاپتا درێژەی بەقسەکانی داو وتی: سینۆهە لەوانەیە تۆ کە پیاوێکی نائاساییت شێوەی بیرکردنەوەکەی منت بەدڵ نەبێت و بڵێیت مرۆڤ دەبێ ماندووبێت و بژێوی خۆی پەیدا بکات، بەڵام من دەڵێم پیاوی زیرەک ئەو کەسەیە کە بەبێ ماندووبوون سوود لە دەسرەنجی خەڵکی وەربگرێت و کاتێک کە خەڵکی لەگەڵ ئەوەشدا کە تێدەکۆشن، بەڵام هەر بەبرسێتی دەمێننەوە، ئەو لە ئاسوودەییدا بژێت.

من لەو باوەڕەدام کە جگەلە پیشەی ژنە خۆفرۆشەکان هیچ پیشەیەک لە مەی فرۆشی ئاسانتر نییە و جیاوازییەکەی ئەوەندەیە کە ئەو ژنانە پێویستیان بەسەرمایەی پێشوەخت نییە و سەرمایەکەیان لە خۆیاندایەو ئەگەر دووربین بن، دەتوانن لەکۆتایی تەمەنیان لە خانوویەکدا کە بە وزەی خۆیان دروستیان کردووە ژیان ببەنەسەر و بحەسێنەوە.

بەڵام من داوای لێبووردنت لێ دەکەم کە زۆر بڵێیی دەکەم و زۆر وتنەکەم لەبەر ئەوەیە کە هێشتا لەگەڵ خواردنەوەی شەرابی (کلکی تیمساح) ڕانەهاتووم و یەک پیاڵە لەم مەشرووبە بەرادەیەک دەمشێوێنێت کە توانای ڕاگرتنی زمانم نابێت.

باسەکەی من لە بارەی ئەم مەیخانەیەوە بوو و وتم کە ئەم مەیخانەیە هی منە و ئێستا دەڵێم کە من و خاوەنی پێشووی مەیخانەکە بەهاوکاری (مەریت) ئێرە بەڕێوە دەبەین و قازانجەکەی لە نێوان هەردووکماندا دەکەینە دووبەشەوە.

خاوەنی پێشووی ئەم مەیخانەیە کە لەمەودوا دەبێتە کرێکاری من، سوێندی بە هەزار خوای میسر خواردووە کە زیاتر لە نیوەی قازانجەکە هەڵنەگرێت و دزیم لێ نەکات و من دڵنیام دزی ناکات، چونکە پیاوێکی خواپەرستە و هەندێک



لەموشتەرییەکانی کاهینن، کە بە کڕیاری باش لە قەڵەم دەدرێن، چونکە زۆر (کلکی تیمساح) دەنۆشنەوە و هۆیەکەی ئەوەیە کە کاهینەکان ڕاهاتوونە لە شەرابی بەهێزی ڕەزەکانی پەرستگەی ئاموون بنۆشنەوە و ئەوانەی کە ئەم شەرابە دەنۆشنەوە بەیەک دوو (کلکی تیمساح) سەرخۆش نابن.

هەندێک لە کڕیارەکانی ئەم مەیخانەیە کاهینن، چونکە مەی فرۆش بیر لەوەدەکاتەوە کە لە نێوان بەرژەوەندیی کەسابەت و بەرژەوەندیی ئایینی پەیوەندییەک دروست بکات بۆ ئەوەی یەکەمیان سوود لە دووەم وەربگرێت و تا ئەمڕۆ هەر وا بووە، بەڵام وابزانم من زۆر قسە دەکەم و زۆر بڵێییەکەی من لەبەر ئەوەیە کە ئەمڕۆ یەکێکە لە ڕۆژەکانی شادمانیی من. باوەڕ بکە کە یەکێک لە گەورەترین هۆیەکانی خۆشحاڵیی من ئەوەیە کە دەبینم تۆ لێم تووڕە نیت و وەکو جاران من بە خزمەتکاری خۆت دەزانی. لە کاتێکدا کە من ئەمڕۆ پیاوێکی ئازاد کراوم و دەستم بە مەی فرۆشی کردووە. هەرچەندە هەندێ کەس وابیردەکەنەوە کە مەی فرۆشی کارێکی باش نییە.

لە دوای ئەم قسەیە کاپتا بە سەرخۆشییەوە دەستی بە گریان کرد و سەری خستە سەر ئەژنۆم و من بە زۆر سەریم لە سەر ئەژنۆکانم هەڵگرت و وتم: هەڵسە و لە ناو مەیخانەدا ئەم ڕەفتارە ناشیرینە مەکە، چونکە ئەگەر موشتەریەکانت ببینن کە خاوەنە نوێیەکەی ئەم مەیخانەیە ئەوەندە سووکە، لێت بەدگومان دەبن و لەوەیە چیتر نەیەن بۆ ئێرە.

لە دوای ئەوەی کە کاپتا سەری هەڵبڕی لێیم پرسی: خاڵێک هەیە کە من لێی تێناگەم و ئەویش مەسەلەی فرۆشتنی ئەم مەیخانەیەیە، چونکە ئەگەر ئەم جێگایە بەو شێوەیەی کە تۆ باسی لێوە دەکەی ڕەواجی هەبێت، بۆچی خاوەنەکەی ڕازی بووە کە پێتی بفرۆشێت و دواییش وەکو شاگردێک کارت بۆ بکات و لە قازانجەکەشدا شەریک بێت.

کاپتا کە هێشتا فرمێسکی چاوی وشک نەبووبووەوە وتی: سینۆهە، تۆ

توانایەکی تایبەتت هەیە کە بە هۆی بەڵگە هێنانەوەکانی خۆت کە لە (ئەفسنتین)[3] تاڵترە شادیم لێ دەکەیتە ژەهری مار.

ئەگەر پێت بڵێم کە من و ئەم مەیفرۆشە هاوڕێی سەردەمی منداڵین و لە رابردوودا لە خۆشی و ناخۆشی یەکتریدا هاوبەش بووینە، ئایا دەیسەلمێنی کەلەبەر ڕێزی دۆستایەتیی کۆن ئامادەبووە ئەم مەیخانەیەم پێ بفرۆشێت، بەڵام لەبەرئەوەی کە دەزانم قەناعەت بەم قسەیە ناکەیت، ناچارم دانی پێدابنێم کە خۆشم قەناعەت بەم قسەیە ناکەم و مەجبوورم بیسەلمێنم کە فرۆشتنی ئەم مەیخانەیە لەلایەن مەی فرۆشەکەوە نهێنییەکی تێدایە.

من واهەست دەکەم کە نهێنیی مەی فرۆشەکە دەگەڕێتەوە بۆ جەنگی نێوان خوای نوێی فیرعەونی میسر لەگەڵ (ئاموون) خوای دێرین و لەبەرئەوەی کە لە هەموو پەرێشانی و تێک ڕژانێکدا یەکەم شوێنێک کە پەلاماری دەدرێ مەیخانەیە و خەڵکی دەرژێنە ناوی و تابتوانن شەراب و بیرە دەنۆشنەوەو کووپە و گۆزەکان دەشکێنن و مەی فرۆشەکەش لە رووباری نیلدا دەخنکێنن، بۆیە خاوەنی ئەم مەیخانەیە ترسی لێ نیشتووە، چونکە ئەو یەکێکە لە لایەنگرە راستەقینەکانی خوای دێرینی میسر و ئەوەندە بەخەستی گرتوویەتی کە ئەمرۆ ناتوانێت نکۆڵی لە خوای کۆن بکات و باوەڕ بە خوای نوێ بهێنێت، چونکە کەس عەقڵی نایگرێت کەئەو باوەڕی خۆی گۆڕیوە و بووەتە شوێن کەوتووی خوای تازە.

سەرەڕای ئەوەش تێگەیشتووە کە خوا (ئاموون) بەسەختی گرفتاری ترس و هەراس بووە، بە رادەیەک کە پەرستگای ئاموون زەوییە کشتوکاڵییەکانی خۆی دەفرۆشێت و وا بیردەکاتەوە کە لەوانەیە رۆژێک زەوی و زارەکانی لێ بسەننەوە. منیش لەدوای ئەوەی کە زانیم مەی فرۆشەکە تووشی ترس هاتووە، بەشێوەیەک قسەم کرد کە زیاتر ترس لە دڵی نیشت و وتم هەرچی زووتر خۆت لەم مەیخانەیە رزگار بکە، چونکە ئەگەر هەل و مەرجێکی نالەبار بێتەپێشەوە



سەرمایەکەت لەم مەیخانەیەدا لەناودەچێت. ئەویش کە زۆر ترسابوو رازی بوو و ئەم جێگایەی پێ فرۆشتم، بەڵام لەبەرئەوەی کە دەمزانی ئەو بۆ بەڕێوەبردنی مەیخانەکە لێ هاتووە و شاگردی لەو باشتریشم دەست ناکەوێت، داوام لە ئەو و لە (مەریت) کرد کە لێرەدا بمێننەوە.

وتم: کاپتا من نازانم کە ئایا لەمەوبەدووا سوود لەم مەیخانەیە وەردەگری یان نا؟ بەڵام ئەوە دەزانم کە تۆ لە یەک رۆژدا ئیش و کارێکی زۆرت ئەنجام داوە و ئەگەر من بوومایە نەمدەتوانی بەیەک رۆژ ئەم هەموو کارە راپەڕێنم. دوایی هەڵساین و لە مەیخانەکە هاتینە دەرەوە.

من هەستم دەکرد کە کاپتا بە تەواوەتی مەستەو ناتوانێت بەباشی بەڕێدا بڕوات و یەک (کلکی تیمساح) بەتەواوەتی شێواندبووی.

***

١- میکاڤالتاری فینلەندی کە بیرەوەرییەکانی سینۆهەی لەسەر پاپیرۆسە میسرییەکانەوە نووسیوەتەوەو ئێستا لە مۆزەخانەی شاری (لۆڤەر)ی فەرەنسا-دایەو ئەو دەستنووسانە دەگەڕێتەوە بۆ ماوەیەک لە نێوان هەزار و سێ سەدساڵ تا هەزار و چوار سەد ساڵ بەر لە زایین، (نزیکەی سێ هەزار و چوار سەد ساڵ لەمەوبەر)، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا دەبینن کە وەزعی کڕینی زەوی و زار لە میسر وەک کڕینی زەوی بووە لە ئێران لە سی تا چل ساڵ لەمەوبەر و لە لایەن ئەو کەسانەی کە تەنانەت جووتیار نەبوونە کە کشتوکاڵ بکەن، بەڵکو زەوییەکەیان تەنها بۆ ئەوە کڕیوەتەوە کە بە بەیاری بە جێی بهێڵن تا ئەو کاتەی کە گران دەبێت و من یەکێکم دەناسی کە ماوەیەکە دەموچاوی لە ژێر پەردەی خاکدا شاردراوەتەوە و من ناوی ناهێنم و ئەو کابرایە میلیۆنەها مەتری چوارگۆشە زەوی کڕیبووەوە بەبێ ئەوەی بەکاری بهێنێت یان خەڵکی تر کشتوکاڵی تێدا بکات و تەنها بۆ ئەوەی کە لە داهاتوودا بتوانێت بە بەهایەکی زۆر بیفرۆشێت – وەرگێڕ.

٢- باڵاپۆش : عەبا

٣- ئەفسنتین: وشەیەکی یۆنانییە و بە گیایەک دەڵێن کە خۆڕسکەو لە کۆندا بۆ چارەسەرکردنی شەلەل و لەرزۆکی دەست و نەخۆشییەکانی گەدەو جەرگ و نەهێشتنی کرمی ناوسک بەکار هاتووە – وەرگێڕی کوردی.

**بەشی بیست و نۆیەم**

# سەرەتای فیتنەیەکی گەورە لە میسر

بەم شێوەیە من لە گەڕەکی هەژارەکانی **تەبەس** و لە ماڵی مسگەری پێشوو بوومە پزیشکی ئەو گەڕەکەو بەو شێوەیەی کاپتا پێشبینی کردبوو نەخۆشێکی زۆر هاتنەلام. من سوودم لەو نەخۆشانە وەرنەدەگرت و بە پێچەوانەوە زەرەریشم دەکرد، چونکە جگە لەوەی کە بەخۆڕایی دەرمانم پێدەدان، هەندێ جار ناچاردەبووم خواردنیشیان بدەمێ، چونکە کاتێک کە دەمبینی چارەسەر کردنی نەخۆشێک بەوەوە بەستراوەتەوە کە خواردن بخوات، ناچار دەبووایە لە جیاتی دەرمان، خواردنم بدایەتێ.

ئەو دیارییانەی کە هەندێک لە هەژارەکان بۆ چارەسەری خۆیان دەیاندا پێم بایەخی نەبوو، بەڵام لەبەر ئەوەی کە بە نییەتێکی پاکەوە دەیانداپێم منی شادمان دەکرد و زیاتر بەوە دڵخۆش بووم کە خەڵکی ناوی منیان بە پیرۆز دەزانی و بەشێوەیەک باسی منیان دەکرد کە دەتگوت یەکێکم لە خێرۆمەندە گەورەکانی جیهان.

کاپتا کە بە بۆنەی پیری و بە تایبەتی لەبەر دەوڵەمەند بوونەکەی نەیدەتوانی وەکو جاران ئیش و کارەکانم ئەنجام بدات بۆ ئەو مەبەستە ژنێکی پیری بەکرێ گرت، کە هەم لە پیاو بێزار بوو و هەمیش لە ژیان، بەڵام لەبەر ئەوەی کە هەرچۆنێک بێت مرۆڤ دەبێ تا ئەو رۆژەی دەمێنێت، یان تا ئەو کاتەی توانای کاری هەیە ئیشێک بکات، ئەویش لە ماڵەکەماندا کاری دەکرد.

ئەم ژنە ئەگەرچی بەبۆنەی بەساڵاچوونییەوە سەرنج راکێش نەبوو، بەڵامله جیاتی ئەوە خواردنی بەلەزەتی لێ دەنا و من هەرگیز گلەییم لە چێشتەکانی نەبوو. هەروەها ئەو ژنە رقی لە بۆنی بۆگەنی ئەو هەژارانە نەدەبووەوە کە بۆ چارەسەر دەهاتنە لام. لە کاتێکدا کە (کاپتا) لەو بۆنەیان بێزار بوو. من لەگەڵ ئەو ژنەدا بە تەواوەتی راهاتم و ئەو بەردەوام لەوێ بوو، بەڵام من کەمتر دەمبینی و بە ناوی (موتی) بانگم دەکرد.

شەوان شاری **تەبەس** بە شەوقی چراکان رووناک دەبووەوە و مەیخانەکان و ماڵەگشتییەکان پڕ دەبوو لە موشتەری و ئەوەی کەمێک عەقڵی هەبوایە هەستی دەکرد کە کارەساتێک روودەدات، چونکە ناکۆکیی نێوان خوای نوێی فیرعەون (ئاتوون) و خوای کۆن (ئاموون) زیاتر گڕوتینی دەگرت.

دوو سێ مانگ تێپەڕی و خەڵکی **تەبەس** لە عاقیبەتی ئەو ناکۆکییە لە دڵەڕاوکێدا بوون و (هورم هەب) فەرماندەی سوپای میسر هەر نەگەڕایەوە. بە رۆژ گەرمای خۆر زیادی دەکرد، بەرادەیەک کە هەندێ جار لە تاو گەرما و ماندوێتی، لەگەڵ کاپتادا بۆ مەیخانەی (کلکی تیمساح) دەڕۆیشتین، بەڵام هیچکە لەو شەرابە بەهێز و سووتێنەرەم نەدەنۆشییەوە، بەڵکو بە بیرەی ئاسایی کە تینوێتیی دەشکاند و لەشی فێنک دەکردەوە و نەدەبووە هۆی سەرخۆشی، ئیکتیفام دەکرد.

لەبەرئەوەی ناو مەیخانەکە فێنک بوو لەوێ خۆم لە ئاسوودەییدا دەبینی و لە بینینی جوانیی (مەریت) چێژم وەردەگرت و کاتێک کە چاوەکانی دەبڕییە چاومەوە هەستم دەکرد کە دڵم دەگوشرێ و حەزم دەکرد دەستم لەسەر دەستەکانی دابنێم.

لە پاش ئەوەی کە چەند جارێک چوومە ئەو مەیخانەیەوە، هەستم کرد کە موشتەرییەکانی ئەو مەیخانەیە خەڵکانێکی تایبەتن و رێگا بەهەموو کەسێک نادەن بێنە ئەوێوە. یان وەزعی مەیخانەکە بەو شێوەیە بوو کە خەڵکانی کەم دەرامەت نەتوانن بێن بۆ ئەو جێگایەو شەراب و ئاوی جۆ، یان (کلکی تیمساح) بنۆشنەوە.

کاپتا بە هێواشی بەمنی وت: کە لە نێوان موشتەرییەکانی ئێرە هەندێ کەس هەن کە دەوڵەمەندییەکەی خۆیان لە ڕێگای تاڵان کردنی گۆڕی مردووەکانەوە بەدەست هێناوە، بەڵام کاتێک کە بۆ ئەم مەیخانەیە دێن وەکو گەورەکان هەڵسوکەوت دەکەن و ڕەفتاری ناشیرین نانوێنن.

هەروەها دەیگوت هەموو موشتەرییەکانی ئەم جێگایە ئەو کەسانەن کە پێویستییان بە یەکتری هەیەو کڕین و فرۆشتن و پێویستییە مادییەکانی دیکە ڕایان دەکێشێت کە بۆ ئێرە بێن، ئەگەر نا تەنها حەزی نۆشینەوەی (کلکی تیمساح) نایانهێنێتە ئێرە.

تاکە موشتەرییەک کە کەس پێویستی پێی نەبوو، من بووم. چونکە من نە شتم دەکڕی و نە شتیشم دەفرۆشت و نە زێڕ و پارەشم بەقەرز دەدا کە قازانجم لێی دەست بکەوێت و نەقەرزیشم وەردەگرتەوە، بەڵام لەبەرئەوەی کە هەموویان دەیانزانی هاوڕێی کاپتام، ڕێگایان پێ دەدام بێمە ناو مەیخانەکەوە بەبێ ئەوەی کە زۆر لە گەڵمدا گەرم بن، چونکە دەیانزانی کە هیچ قازانجێکیان لەمن دەست ناکەوێت.

من لەو مەیخانەیەدا زانیاریی زۆرم سەبارەت بە بارودۆخی **تەبەس** و میسر و ڕووداوەکانی وڵات، دەست دەکەوت. لەوانە شەوێک کە لە مەیخانەکەبووم، ڕوانیم بازرگانێک کە دەمزانی بخوور دەفرۆشێت، لە کاتێکدا کە کراسەکەی دڕاندبوو و خۆڵەمێشی بەسەر خۆیدا کردبوو هاتە ناو مەیخانەکەوە و پیاڵەیەک (کلکی تیمساح)ی نۆشییەوەو وتی: هیوادارم ئەم فیرعەونە هەتا هەتایە نەفرەت لێ کراو بێت، چونکە ئەم تیمساحە حەز ناکات شوێن ژێری بکەوێت و هەرچییەک بەبیریدا بێت جێبەجێی دەکات.

هەتا ئەمڕۆ ژیانی من لە ڕێگای فرۆشتنی بخوورەوە بەڕێوە دەچوو کە لە وڵاتانی دوورەدەستەوە دەهات و هەموو ساڵێک لەوەرزی هاویندا چەند کەشتییەک لێرەوە بەرەو دەریاکانی ڕۆژهەڵات دەچوون و ساڵی دواتر هەرنەبێت



دوو کەشتی لەو دە کەشتییە بەجۆرەها کەل و پەلی ڕۆژهەڵاتییەوە، لەوانە بخوور، دەگەڕانەوە[1].

ئەمساڵ کاتێک کە کەشتییەکان ویستیان بەرەو دەریا بەڕێ بکەون، لەناکاو و بێ ئاگا، فیرعەون هاتە کەنارەی بەندەر و من سەرم سوورما کە بۆچی ئەم پیاوە دەست لە هەموو کارێک وەردەدات، لە کاتێکدا کە ئەم کارانە پەیوەندیی بە ئەوەوە نییە. ئەی ئەم هەموو نووسەر و بەڕێوەبەرانەی کە لە **تەبەس**-دا هەن چی دەکەن، مەگەر ئەرکی ئەوان نییە کە وریا بن هەموو کارێک بە پێی یاساو ڕێ و ڕەسم ئەنجام بدرێت؟ کاتێک کە فیرعەون هاتە دارەڕاکەی بەندەر، مەلەوانەکان دەگریان و ژن و منداڵەکانیان لە وشکانی فرمێسکیان دەڕشت و دەم و چاویان دەڕووشاند، چونکە دەیانزانی کە هەندێک لەو مەلەوانانە ناگەڕێنەوە و لە دەریادا دەخنکێن، بەڵام ئەم بابەتە لەڕێو ڕەسمە باوەکانەو شتێکی تازە نییەو هەرکاتێک کە کەشتییەکان بەڕێ دەکەون ژن و منداڵی مەلەوانەکان شیوەن دەکەن.

بەڵام ئەم فیرعەونە مەلعوونە، کاتێک کە شیوەنی ژنەکان و زاریی مەلەوانەکانی بینی قەدەغەی کرد کە کەشتییەکان بۆ دەریای ڕۆژهەڵات بڕۆن و هەموو بازرگانێک دەزانێت کەئەم قەدەغەکردنەی فیرعەون، وەک دەرچوونی بڕیاری لەناوبردنی بازرگانەکان و ژن و منداڵەکانیانە، چونکە هەتا کەشتییەکان بۆ دەریا نەڕۆن، بازرگانەکان قازانج ناکەن و ژن و منداڵی مەلەوانەکان بە برسێتی دەمێننەوە. هەر کەسێک کە لەمیسردا دەژێت دەزانێت کە نابێ قەت خەفەت لەو مەلەوانانە بخۆن کە بە کەشتی سەفەر دەکەن، چونکە هیچ کەسێک بەویست و ئارەزووی خۆی نابێتە مەلەوان. بۆیە بەردەوام ئەو تاوانبارانەی کە دادوەر سزایان دەدات و خراپەکارن، ناچار دەکرێن کە ببنە مەلەوان، کەواتە بۆچی بۆ خنکانیان لە دەریادا سەغڵەت بین.

ئایا مەرگی هەندێ لە ئەو تاوانبارانە کە ناچار دەکرێن ببنە مەلەوان بەزەییی

پیاهاتنەوەی زیاترە، یان لەدەست چوونی سەرمایەی ئەو بازرگانەی کە کەشتییان دروست کردووە و کەل و پەلیان بۆ ئامادە کردووە، چونکە کەشتی لە خۆیەوە دروست نابێت، بەڵکو دەبێت سەرمایەیەکی تیابخەنە کار و دروستی بکەن و دوایی پێداویستییەکانی تەواو بکەن و بە ئازووقەی پێویستەوە بەرەو دەریاکانی رۆژهەڵاتی رەوانە بکەن و من جەرگم بۆ بازرگانە میسرییەکان دەسووتێت کە ئێستا لە شوێنی دوورن و ژن و منداڵەکانیان لە میسردان و ئەو ژن و منداڵانە هەرگیز مێردەکانیان نابیننەوەو ئێستا ئەو بازرگانانە لە جێگا تازەکانیان ژنیان هێناوە و دەڵێن ئەو منداڵانەی کە دەمانبێت پێستی لەشیان لەککەی پێوەیە.

بازرگانەکە ماوەیەک بەم شێوەیە گلەیی کرد و نەفرەتی لە فیرعەون دەکرد و دەیگوت: ئەم پیاوە هەم بازرگانی ئێرە لەکار دەخات و هەمیش بازرگانەکانی جێگا دوورەکان لەناو دەبات کە کەل و پەل دەنێرن بۆ میسر. بەڵام لە دوای ئەوەی کە سێ (کلکی تیمساح)ی نۆشییەوە هەڵچوونەکەی نیشتەوە و داوای لێبوردنی لە قسەکانی خۆی کرد کە بەرامبەر بە فیرعەون وتبووی و وتی: لە تاو خەم و پەژارە ئەو قسانەی کردووە.

دوایی وتی: من لەو باوەڕەدا بووم کە (تی) دایکی فیرعەون، دەتوانێت فیرعەونی کوڕی بهێنێتە سەر رێگای راست، بەڵام ئەو بیر لەوە ناکاتەوە. هەروەها وای دەزانی کە (ئامی) پێشەوای گەورەی پەرستگەی نوێی فیرعەون دەتوانێت بۆ ئەو ئامۆژگاری کەرێکی دڵسۆز بێت، بەڵام ئەم پیاوە تەنها بیر لە شتێک دەکاتەوە، ئەویش ئەوەیە کە بە هەر شێوەیەک بێت (ئاموون) لە ناو ببات.

بەرلەوەی کە فیرعەون ژن بهێنێت وام دەزانی کە سەرەڕۆییەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ژنی نەهێناوە و لە دوای ئەوەی کە (نەفر تیتی) بووە ژنی ئەو، سەرەڕۆییەکەی لەناو نەچوو و (نەفر تیتی) لەو کاتەوە کە بووەتە شاژنی میسر



مۆدێلی سەرسوڕهێنەری لە جل و بەرگ هێناوەتە کایەوە کە ژنەکانی دەربار (کۆشک) چاو لەو دەکەن و ئێستا ژنەکانی کۆشک بە پەیڕەوی (نەفر تیتی)رەنگی سەوز لە دەوری چاویان دەدەن و وەک ژنەکانی سووریا کراس لەبەر دەکەن، بەڵام بەشی پێشەوەی کراسەکەی ئەوان بە تەواوەتی کراوەتەوە.

کاپتا وتی: من ئەم جۆرە بەرگ پۆشینەم لە هیچ وڵاتێکدا نەبینیوە و باوەڕیش ناکەم کەس بینیبێتی، ئایا تۆ دڵنیایت لەوەی کە جگە لە (نەفر تیتی) و بانووەکانی کۆشک، کەسانی تریش هەبن کە چاو لەو مۆدێلە بکەن و ئایا بەچاوی خۆت ئەوانت بینیوە کە ئەوان ئەو بەشەی پێشەوەیان بەتەواوەتی دەربخەن کە پێویستە داپۆشرێت.

بازرگانەکە وتی: من هاوسەرم هەیەو چەند منداڵیشم لێی هەیە و، خۆم بە پیاوێکی شەریف دەزانم و کاتێک کە هەندێ کەسم بینی ئەم جۆرە کراسەیان لەبەردایە و بەشی پێشەوەیان رووتە، سەریری لەناوک بەرەو خوارەوەیانم نەکرد.

لەم کاتەدا (مەریت) خزمەتکاری مەیخانەکە هاتە ئاخاوتن و بە بازرگانەکەی وت: ئەگەر تۆ خۆت پیاوێکی بەد سەلیقەی ئەوە نابێتە بەڵگەی تاوانی ژن، چونکە لە وەرزی هاویندا چاو لێ کردنی ئەم مۆدێلە شتێکی باشەو ژنەکان رازاوەتر دەکات و من ئامۆژگاریت دەکەم کە ئەگەر ئەمجارە ژنەکانت بە مۆدێلی تازەوە بینی بزانە کە ئەو بەشەی تۆ رەخنەت لەرووت بوونی هەیە بەپارچەیەکی کەتان دا پۆشراوە کە چاوی چاوتیژترین پیاوانیش لێی تێپەڕ نابێت.

بازرگانەکە ویستی وەڵام بداتەوە، بەڵام مەستی رێگای لە وەڵام دانەوەی گرت و سەری خستە سەر دەستەکانی و بۆ مۆدێلی تازەی کراسی ژنان و قەدەغە کردنی هاتوچۆی کەشتییەکان و بێبەش بوونی بازرگانەکان لە سوودی کەل و پەلەکانی رۆژهەڵات دەستی بەگریان کرد.

لەم کاتەدا کاهینێک لە کاهینەکانی پەرستگەی ئاموون کە سەری تاشیبوو و بە رۆن بۆن خۆشی کردبوو، لە گفتوگۆکەدا بەشداری کرد و وتی: من سەبارەت بە

مۆدێلی کراسی ژنان هیچ نالێم، چونکه (ئامون لەبارەی مۆدێلی جل و بەرگەوە هیچ فەرمانێکی پێ نەداوین، بەڵام ئەوەی کە دەبێتە هۆی لە ناوچوونی هەموو شتێک، قەدەغەکردنی سەفەری کەشتییەکانە لە لایەن فیرعەونەوە کە ناهێڵێت بۆ جێگا دوورەکانی ڕۆژهەڵات بڕۆن، چونکە ئەگەر ئەم کەشتییانە بۆ ڕۆژهەڵات نەڕۆن ناتوانن بخوور بهێنن و ئەگەر بخوور نەیەت خوای ئێمە (ئامون) لەو کاتەی کە قوربانیی بۆ دەکەین لەو بۆنە خۆشە بێبەش دەبێت. چونکە ئامون حەزی لە بۆنی خۆشە، ئەم دوژمنایەتییەی کە لەگەڵ ئاموندا دەکرێت گەورەترین بەدبەختیی میللەتی میسرە و لەو ڕۆژەوە کە هەرەمەکان (أهرام) دروست بوونە هەتا ئێستا کەس بە بیری نایەت کە گەلی میسر بەم شێوەیە چارەڕەش بووبێت و من دڵنیام کە لەمەودوا هەر میسرییەک شوێن کەوتووەکانی خوای نوێی فیرعەون ببینێت و بڕوانێت کە نیشانەی ئەو خوایە، کە خاچێکە، بە کراسەکەیەوە نەخشاوە، تف لە دەم و چاوی ئەو کەسە دەکات و ئەگەر لە نێوان ئێوەدا یەکێک هەبێت کە ئەم شەو بڕوات و لە پەرستگەی خوای نوێ دەست بەئاو بگەیەنێت من چەند پیاڵەیەک (کلکی تیمساح)ی دەدەمێ کە بینۆشێتەوە و ئەم کارە هیچ نارێکییەکی تیانییە، چونکە پەرستگای ئەم خوایە نەفرەت لێ کراوە دیواری نییەو ئەگەر کەسێک نزیکیش بێت دەتوانێت بە ئاسانی لەدەست پاسەوانەکان رابکات و من خۆم دەتوانم ئەم کارە بکەم، بەڵام لەبەر ئەوەی کە کاهینی پەرستگای (ئامون)م ئەگەر من ببینن باش نییەو دەبێتە سووکایەتی بۆ (ئامون).

لەم کاتەدا پیاوێک کە ئاسەواری ئاوڵە بەدەم و چاویەوە بوو لە لایەکی مەیخانەکەوە هەڵساو لە کاهینەکە نزیک بووەوە و کەمێک قسەی بە هێواشی لەگەڵدا کرد و کاهینەکە لە تەنیشت خۆیەوە داینیشاند و (کلکی تیمساح)ی دەرخوارد دا و پیاوەکە لە پاش ئەوەی بەگەرمای شەرابەکە سەری گەرم بوو، بە دەنگی بەرزەوە بە کاهینەکەی وت: من ئامادەم کە بڕۆم و ئەم کارەی کە وتت بە



ئەنجامی بگەیەنم، چونکە من باوەڕم بە ئامون هەیە و مەحاڵە بتوانم ڕێگا بدەم خوایەکی تر جێگای ئامون بگرێتەوە، چونکە لەو ڕۆژەوە کە لەدایک بوومە ئامون دەپەرستم.

کاهینەکە وتی: ئەگەر تۆ ئەمشەو بڕۆیت و پێویستیی خۆت (دەست بە ئاو گەیاندن) لە میحرابی پەرستگای (ئاتوون)دا جێبەجێ بکەیت من لێت خۆش دەبم و تەنانەت ئەگەر لاشەکەت مۆمیاییش نەکرێت، لەدوای مردن دەگەیتە سەرزەمینی بەختەوەری بەخشی ڕۆژئاوا، چونکە هەرکەسێک بۆ ئامون بمرێت ئەگەر وەکو مەلەوانەکانیش لە دەریادا بخنکێ، دەگاتە سەرزەمینی ڕۆژئاوا.

دوایی کاهینەکە لە تاو مەستیی خۆی ڕووی کردە ئەو کەسانەی کەلە مەیخانەکەدا بوون و وتی: ئەگەر ئێوە لە ڕێی ئاموندا تووشی (قەتل)یش ببن و دزی بکەن و خانوو بسووتێنن و هەر کردەوەیەکی دزێوی تریش بکەن، من ئێوە دەبەخشم و ئەگەر فیرعەونیش بکوژن من لێتان خۆش دەبم.

کاتێک کە قسەی کاهینەکە گەیشتە ئێرە، مەی فرۆشەکە واتە شاگردەکەی کاپتا کە مەیخانەکەی بەڕێوە دەبرد، لە کاهینەکە نزیک بووەوە و دارێکی کێشا بە تەوقی سەریدا، بەجۆرێک کە کاهینەکە کەوتە سەر زەوی و مەی فرۆشەکە وتی: منیش ئەمەم لەبەر ئامون کرد، چونکە دەزانم کە ئامون وتوویەتی هیچ کەسێک نابێت فیرعەونی کوڕی بکوژێت.

موشتەرییەکان هەموو قسەی مەی فرۆشەکەیان سەلماند، بەڵام لەبەرئەوەی لێدانی کاهین لەوانەبوو کە ئاکامی ترسناکی لەپاش بێت، من و کاپتا وەکو موشتەرییەکانی تر وامان بەچاک زانی کە لە مەیخانەکە بڕۆینە دەرەوە.

(مەریت) بۆ بەڕێ کردنی من لەگەڵمدا هات و کاتێک کە گەیشتینە ناو ڕێڕەوە تاریکەکەی مەیخانەکەوە دەستم خستە سەر دەستی و وتم: لە چاوەکانتەوە وا دەردەکەوێت کە تۆش وەکو من تەنهایت و برات نییە، (واتە مێردت نیە)و من حەزدەکەم کە ڕۆژێک تۆ بە کراسی مۆدێلی نوێ ببینم و دڵنیام

که تۆ لەو کراسەدا جوان دەبیت. چونکە تۆ سکت بچووک و سافەو دەرنەپەڕیوە.

(مەریت) دەستی منی لا نەبرد و وتی: لەوانەیە رۆژێک ئەم کراسە لەبەر بکەم و داوا لە تۆ، کە پزیشکێکی بکەم، کە لە بارەی هەندێ لە ئەندامەکانی لەشم رای خۆت دەربڕی و پێم بڵێی کە ئایا لەو ئەندامانە جوانترت لە پیشەی پزیشکییەکەی خۆت بینیوە یان نا؟

***

ئێستا سەرگوزەشتەی من گەیشتووتە جێگایەک کە دەبێ هەندێ شت بڵێم کە کاتێک چاوەکانی من ئەو شتانەی بینی لە تاو نەفرەت و بێزاریم دەڵەرزیم، بەڵام هیچ هۆیەکم بۆ پێشگرتن لەو رووداوانە نەبوو. دەبێ ئەو شتانە بڵێم کە تۆ، ئەی ئەو کەسەی لە دوای مردنی من ئەم پەرتووکە دەخوێنیتەوە باوەڕی پێ دەکەیت، چونکە پێشبینی دەکەم کە وەک ئەم رووداوانە لە سەردەمی تۆشدا روودەدەن و لەبەر ئەوەی کە لە سەرەتای ئەم کتێبەدا باسم کرد، لە جیهاندا هەموو شتێک دەگۆڕدرێ، جگە لە نەفامیی جۆری مرۆڤ و هەتا دنیا بمێنێت سوود لە نەفامیی خەڵکی وەردەگیرێت.

لە ناوەڕاستی هاویندا (هورم هەب) لە سەرزەمینی (کوش) کە کەوتۆتە باشووری میسرەوە گەڕایەوە. پەڕەسێلکەکان بەهۆی گەرمای هەوا نەدەفڕین و دەنگیان نەدەبیسترا و لە گۆماوەکان، ئاو، بۆگەن دەبوو و خەڵکی لە کاتی رۆژدا لەماڵ دەرنەدەچوون، مەگەر ئەوانەی کە ناچاربوون لە دارەڕاکەی بەندەری (**تەبەس**) خەریکی کارکردن بن، یان لە بیابان کشتوکاڵ بکەن، بەڵام باخی دەوڵەمەندەکان هەمیشە فێنک و پڕ لە گوڵ بوو و بەردەوام لەئاو بەناو جۆگەلەکانی باخەکەیان هاتوچۆی دەکرد.

لەو هاوینەدا فیرعەون بە پێچەوانەی ساڵەکانی تر لە کۆشکی خۆی نەهاتە دەرەوە کە بچێت بۆ میسری خواروو (سفلی) و سوود لە هەوا فێنکەکەی ئەوێ



وەربگرێت و لەبەر ئەوەی فیرعەون بۆ کوێستان نەڕۆیشت، هەموو زانییان کە کارەساتی گەورە روودەدەن.

رۆژێکیان خەڵکی (**تەبەس**) هەواڵیان بیست کە (هورم هەب) هاتووەتەوە لە ماڵەکانیان هاتنە دەرەوە بۆ ئەوەی سەربازەکانی فیرعەون ببینن. ئەوان بینییان کە لە هەموو ئەو رێگایانەی کە لە باشوورەوە بۆ **تەبەس** دەهات سەربازە رەش پێستەکان بەدەم و چاوی تەپ و تۆزاوییەوەو بە سەر نێزەی مسییەوە کە بەسەر نێزە درێژەکانیانەوە ئەدرەوشایەوە، هاتنە ناو شارەوە.رەش پێستەکان کە چاو و ددانی سپییان هەبوو بە سەرسووڕمانەوە دەیانڕوانییە دەورەبەر و دیاربوو کە لە بینینی گەورەیی و رازاوەیی شاری **تەبەس** سەرسام بوون.

لەو کاتەی کە سەربازە رەش پێستەکان هاتنە (**تەبەس**)ـەوەو کەشتییە جەنگییەکانی فیرعەونیش گەیشتنە کەنارەی بەندەر و گالیسکەی جەنگی و ئەسپیان لە کەشتییەکانەوە دەگواستەوە بۆ وشکانی و خەڵکی بینییان کە گالیسکەچییەکان و ئەو کەسانەش کە تیماری ئەسپەکانیان دەکرد رەش پێست یان خەڵکی سەرزەمینی (شەردن) بوون[٢].

دەبێ ئاماژە بەوە بکەم کە لە سەرەتادا لە میسر گوێ درێژیان بە گالیسکە جەنگییەکانەوە دەبەست و بەستنی ئەسپ بە گالیسکەی جەنگییەوە شێوەیەک بوو کە لە شەردنەوە بۆ میسر هات و ئەوساکە رەش پێستەکانیش وەک دانیشتووانی (شەردن) تەداوی کردنی ئەسپەکانیان گرتە ئەستۆ. کاتێک کە سەربازە رەش پێستەکان هاتنە ناوشارەوە لەکاتی شەو لە چوار رێیانەکانی شاردا ئاگری پاسەوانییان هەڵکرد و رێگای رووباریان لە باکوور و باشوورەوە گرت. بە جۆرێک کە هیچ کەسێک بەبێ رەزامەندیی فەرماندەی سوپای میسر نەیدەتوانی لە رێگای نیلەوە بۆ باکوور یان باشوور بچێت.

لەو رۆژەدا کە سەربازە رەش پێستەکان هاتنە ناو شارەوە خەڵکی ئەوەندە پەرێشان بوون کە کارگەکان و ئاشەکان و دووکانەکان و دارە راکەی بەندەر

دەستیان لە کارکردن هەڵگرت و کاسبەکانی شار ئەو شتانەی کە هەمیشە لەبەردەم دووکانەکانیان دایان دەنا کە سەرنجی کڕیار رابکێشێت، بردیانە ژوورەوەو دەرگای دووکانەکانیان داخست و بەتیر و قاییشی مسی پان دەرگاکانیان قایم کرد و مەی فرۆشەکان و خاوەن ماڵە گشتییەکان کۆمەڵێ پیاوی بەهێز و بێ تەربێتیان لە لای خۆیان راگرت بۆ ئەوەی ئەگەر رووداوێکی نالەبار روویدا، رێگا نەدەن کە مەیخانە و خانووە گشتییەکە بەرشاڵاوی پەلاماردەران بکەوێت.

خەڵکی کە لە **تەبەس**-دا تەنها لە کاتی نائاسایی بۆ رۆیشتنەناو پەرستگا کراسی سپییان لەبەردەکرد، جل و بەرگی سپییان پۆشی و بەرە و پەرستگای ئامون کەوتنەرێ کە لە راستیدا وەک شاروابوو و بۆ باس کردنی فراوانیی پەرستگای ئامون هەر ئەوەندە بەسە کە خوێندنگەی خانەی ژیان یەکێک بوو لە دامەزراوەکانی ئەو شوێنە.

ئەو رۆژەی سەربازەکان هاتنە شارەوە و دەست لە کار هەڵگیرا، دەنگ و باس بڵاوبووەوە کە شەوی رابردوو میحرابی پەرستگای ئاتوون کە لەگەڵ ئامووندا رکەبەری دەکرد، پیس کرابوو و سەگێکی مردوویان فڕێ دابووە ناو میحرابەکەیەوەو سەری پاسەوانەکەیان لەبناگوێوە بڕیبوو[3].

خەڵکی بەرووالەت بە بیستنی ئەم هەواڵە دڵگرانیی خۆیان پیشان دا، بەڵام لە ناخەوە هەموویان پێیان خۆش بوو، چونکە کەس بەرامبەر بە خوای نوێ، کە قسەی سەیری دەکرد، سۆزی نەبوو و دیسانەوە هەر ئەو رۆژە کاپتا وتی: گەورەم، کەل و پەل و کەرەستەکانی پزیشکیی خۆت بخەرە بەر دەستتەوە، چونکە من پێشبینی دەکەم کە لە سبەینێوە تا دوو سبەی دەبێ بەشێوەیەک کاربکەی کە دەرفەتی نان خواردنیشت نابێت.

لەو رۆژەدا کە رەش پێستەکان هاتن، لەبەر ئەوەی بیستم (هورم هەب)یش هاتووەتەوە رۆیشتم کە بیبینم، بەڵام دەرکەوت کە (هورم هەب) لە دوای



هەمووان، واتە رۆژی دواتر دێتەوە. ئەو شەوە سەربازە رەش پێستەکان لە **تەبەس** بوون، بەبێ ئەوەی فەرماندەی سوپا لەوێ ئامادەبێت و چەند دووکانێکیان تاڵان کرد و هێرشیان کردە سەر چەند ماڵێکی گشتی، بەڵام پاسەوانەکانی سوپا میسری و سپی پێست بوون، ئەوانیان لەبەرچاوی خەڵکی لە سێدارەدا، بەڵام ئەم سزایە قەرەبۆی زیانی خاوەن کەل و پەلەکان و تووڕەیی خاوەن ماڵە گشتییەکانی نەکرد.

رۆژی دوایی (هورم هەب) بە کەشتییەکی جەنگی هاتە ناو (**تەبەس**)ەوەو من بۆ ئەوەی بیبینم بە پەلە خۆم گەیاندە بەندەر و لەو باوەڕەدا بووم کە نەتوانم بە ئاسانی چاوم پێی بکەوێت، بەڵام هەر کە پێیان راگەیاند سینۆهە بۆ بینینی تۆ هاتووە، یەکسەر فەرمانی دا بۆ ناو کەشتییەکەم بهێنن.

تا ئەو کاتە ناوەوەی کەشتیی جەنگی میسریم نەدیبوو، بەڵام کاتێک کە چوومە ناو کەشتییەکەوە بۆم دەرکەوت کە لە نێوان کەشتیی جەنگی و کەشتیی بازرگانی جیاوازییەکی زۆر نییە، جگە لەوەی کەشتیی جەنگی هەندێ کەرستەی تێدایە کە بۆ مەبەستی هاویشتنی ئاگر بەکار دەهێنراو چارۆگەکانی رەنگاو رەنگ و جوانن و پێش و دواوەی کەشتییەکانیان بە شێوەیەکی جوان رازاندبووەوە.

کاتێک کە (هورم هەب)م بینی روانیم ماسولکەکانی بازووی لە جاران ئەستوورتر بوو و سینگی بە شێوەیەک هاتبووە پێش کە دەتگوت سینگی ژنە. (هورم هەب) قامچییەکی بەدەستەوە بوو کە دەسکەکەی زێڕ بوو و تەوقەیەکی زێڕین بەسەر سینگییەوە دەبینرا.

کاتێک کە گەیشتمە بەردەمی دەستم خستە سەر ئەژنۆم و داچەمیمەوە. (هورم هەب) پێکەنی و وتی: سینۆهە (ابن الحمار)، لەکاتێکی باشدا هاتیتە لام، بەڵام لەبەرئەوەی زۆر گەورە ببوو منی ماچ نەکرد و منیش نەمویرا ماچی بکەم.

لە تەنیشت (هورم هەب) پیاوێکی قەڵەو و کورتەباڵا دەبینرا کە لە بەر گەرمیی هەوا عارەقی کرد بوو و من نەمزانی کێیەو، لە ناکاودا بەسەر سوورمانەوە بینیم (هورم هەب) قامچییەکەی خۆی، کە نیشانەی فەرماندەیی بوو، دایە پیاوەکە و تەوقە زێڕینەکەی لە ملی دەرکرد و بۆ ئەوی درێژ کرد و وتی: ئەم تەوقە زێڕە لە مل بکەو لە ئەمڕۆ بەدواوە فەرماندەیی سوپای میسر لە ئەستۆ بگرە بۆ ئەوەی خوێنی گەلی میسر بەهۆی دەستە پۆخڵەکانی تۆوە بڕژێت، نەک بەهۆی دەستەکانی من.

لە کۆنەوە لەگەڵ شێوەی قسەکردنی (هورم هەب) ئاشنابووم و دەمزانی کە هورم هەب ئەو شتەی کە لە دڵیدایە دەیڵێت و ڕواڵەتسازی ناکات و بیستبووم کە تەنانەت لەگەڵ فیرعەونیشدا بەشێوەیەک قسە دەکات کە هەندێ جار وەک ئەوە بوو کە لێی تووڕە بێت، بەڵام من لەلای ئەو ڕیزپەڕ بووم و هەرگیز بە تووڕەییەوە لەگەڵ مندا نەدەدوا و وشەی ناشیرینی بەکار نەدەهێنا.

کاتێک کە قامچی و تەوقەکەی دایە پیاوە قەڵەو و کورتەباڵاکە، ڕووی کردە من و وتی: لەبەر ئەوە وتم لە کاتێکی باشدا هاتی چونکە من ئامادەم بێم بۆ ماڵی تۆ، من لەم (میزان)ـە بەدواوە[٤] فەرماندەی سوپای میسر نیم و ئەگەر لە ماڵی تۆدا حەسیرێکم دەست بکەوێت حەز دەکەم لەسەری بنووم و ماندوێتی لە لەشم دەربچێت و لەمە زیاتر هاودەمی ئەم شێتانە نەبم.

دوایی دەستی خۆی خستە سەرشانی پیاوە کورتە باڵاکەو وتی: سینۆهە بە وردی بڕوانە ئەم پیاوە و باش بیناسە، چونکە ئەم پیاوە کەسێکە کە لەم میزانە بەدواوە، چارەنووسی **تەبەس**، بەڵکو میسریش لەدەست ئەودایە، لەبەر ئەوەی ئەو فەرماندەی نوێی سوپای میسرە و فیرعەون لە جیاتی منی داناوە. چونکە من بە فیرعەونم وت شێت بوویتە، بەڵام ئەگەر تۆ بە باشی سەیری ئەم پیاوە بکەیت تێدەگەیت کە فیرعەون دیسانەوە پێویستی بە من دەبێت.

فەرماندەی نوێی سوپا کە عارەقەی لێ دەتکایەوە، وتی: هورم هەب لە من تووڕە مەبە تۆ خۆت دەزانی کە من نەمدەویست جێگای تۆ بگرم، چونکە من پیاوی شەڕ نیم و لەو باوەڕەدام کە بێ دەنگی باخەکەم و یاری کردن لەگەڵ ئەو پشیلانەی کە لە باخەکەمدا هەمە، بۆ من لە بیستنی دەنگە دەنگی مەیدانی شەڕ خۆشترە. بەڵام لەبەر ئەوەی فیرعەون منی کردە فەرماندەی نوێی سوپا، ناتوانم ڕێز لە ویستی ئەو نەگرم، بە تایبەت لەبەر ئەوەی وتی نە شەڕ دەبێتەوە و نە خوێنیش دەڕژێتە سەر زەوی، بەڵکو ئاموون خۆبەخۆ سەرنگون دەبێت و لە ناودەچێت.

هورم هەب وتی: یەکێک لە خەوشە گەورەکانی فیرعەون ئەوەیە کە کاتێک ئارەزووی لە شتێک بێت، دەبینێت لە دنیای خەیاڵدا ئاواتەکەی هاتووەتەدی و دوایی وا دەزانێت کە ئەو شتەی بیری لێ کردبووەوە بە ڕاستی جێبەجێ بووە.

لە بارەی (ئاموون)یشەوە ئەم هەڵەیەی کردووە و وا دەزانێت کە بەبێ خوێن ڕشتن دەتوانێت (ئاموون) سەرنگون بکات و خوای (ئاتوون)ی لە جیاتی دابنێت و لەبەر ئەوەی کە دەزانێت تۆ پشیلەکانت خۆش دەوێت و لە جەنگ بێزاری، ئەرکی لە ناوبردنی (ئاموون)ی بە تۆ سپاردووە، بەڵام من پێت دەڵێم کە بەبێ خوێنڕشتن ئەم کارە ناکرێت و تۆ دەبێ کۆمەڵێکی زۆر بکوژی بۆ ئەوەی بتوانی خوا (ئاموون) سەرنگون بکەی، بەڵام ئەو خوێنانەی کە دەڕژێت لەبەر ئەوەی هی تۆ نییە، زەرەر ناکەیت.

لە دوای ئەم قسەیە (هورم هەب) بە جۆرێک لەپی دەستی بە پشتی پیاوەکەدا کێشا، کە ئەو داچەمییەوە و دوایی بە منی وت: با لە کەشتییەکە بچینە دەرەوە.

کاتێک کە دەمانەویست لە کەشتییەکە بێینە دەرەوە ئەو سەربازانەی لەوێ دانیشتبوون هەڵسان و نەیزەکانیان لابرد ناو سڵاویان لە هورم هەب کرد و ئەویش بە سەربازەکانی وت: من خواحافیزیتان لێ دەکەم، بەڵام دڵنیابن ڕۆژێک دێت کە دەگەڕێمەوە لاتان و تا ئەو ڕۆژەی کە نەگەڕاومەتەوە گوێڕایەڵی ئەم

پیاوە بن کە فەرماندەی تازەتانە و ڕێک و پێکیی خۆتان بپارێزن، ئەگەرنا لە دوای ئەوەی کە گەڕامەوە ئەوەندە بە دار و قامچی بە پشتتاندا دەکێشم کە گۆشتی لەشتان پارچە پارچە لێ بێتەوە.

سەربازەکان پێکەنین و هورم هەب وتی: کەل و پەلەکەم لە کەشتی ناهێنمە دەرەوە، چونکە دەزانم کە لێرە پارێزراوترە. دوایی دەستی لە گەردنی من کرد و وتی: سینۆهە ئەمشەو حەز دەکەم خۆم سەرگەرم بکەم.

وتم: لەم شارە مەیخانەیەک هەیە کە ناوی (کلکی تیمساح)ە و خواردنەوەیەکی بۆن خۆشی هەیە، کەلە هیچ شوێنێک تەنانەت لە بابل و کریتیش هاوتای ئەو شەرابە دەست ناکەوێت، بەڵام بە هێزە و دەبێ دەست لە زۆر خواردنەوەی بپارێزی. ئایا حەز دەکەیت بۆ ئەوێ بڕۆین و ئەم شەرابە بنۆشینەوە؟

هورم هەب وتی: بەڵێ حەز دەکەم بۆ ئەو مەیخانەیە بچین.

وتم: کەواتە فەرمان بدە دەستەیەک سەرباز بۆ پارێزگاری تۆ و پاراستنی هێمنی بڕۆن بۆ مەیخانەکە.

لەگەڵ ئەوەشدا کە هورم هەب ئیتر فەرماندەی سوپا نەبوو، بەڵام بەشێوەیەک فەرمانی بەسەر فەرماندە نوێیەکە کرد، کە دەتگوت هێشتا ئەو پیاوە لە ژێر دەستی ئەودا خزمەت دەکات و پێی وت: کۆمەڵێ سەربازی باوەڕ پێکراو بنێررێتە مەیخانەی (کلکی تیمساح) بۆ ئەوەی ئەمڕۆ و ڕۆژەکانی تر ئاگایان لەو مەیخانەیە بێت و نەهێڵن لەوێ ئاژاوە ڕووبدات.

من بە دەرکردنی ئەم فەرمانە ڕازی بووم، چونکە وام بیر دەکردەوە کە ئەگەر کارەساتی دڵتەزێن ڕووبدات، مەیخانەی (کلکی تیمساح) یەکێکە لەو جێگایانەی کە لە پێش شوێنەکانی تر دەکەوێتە ژێر شاڵاوی خەڵکانی تالانچی. چونکە هەموو کەسێ دەیزانی کە لە پشت ئەو مەیخانەیە هەندێ جێگای لێیە کە ناوەندی مامەڵەی ئەو کەسانەیە کە دزی لە گۆڕی مردووەکان دەکەن، یان زێڕ و



پارەی دزراو لەوێ لە ناو خۆیاندا بەش دەکەن.

ئەم نهێنییە کە هەندێ خەڵکی پێیان دەزانی و لەوانەبوو لەکاتی ڕوودانی کارەساتی نالەباردا پەلاماری مەیخانەیان بدایەو زیانێکی زۆر لە کاپتا بکەوتایە، بەڵام لە دوای ئەوەی کە هورم هەب فەرمانی دا کە دەستەیەک سەرباز پارێزگاری لەو مەیخانەیە بکەن، ئەو مەترسییەش نەما.

من ڕێنومایی (هورم هەب)م کرد و بردمە (کلکی تیمساح) و لە یەکێک لە ژوورە تایبەتییەکان دام نیشاند و (مەریت) خواردنەوەی تایبەتی بۆ هێناو (هورم هەب) بەیەک هەناسە هەڵیقوڕاندو کۆکی، بەڵام لە دوای چەند ساتێکی تر داوای کرد پیاڵەیەکی تر لەو شەرابەی بۆ بهێنن.

مەریت جارێکی تر پەیمانەیەک لەو نۆشینەوەیەی بۆ هێناو ئەویش خواردییەوەو بە منی وت: ئەم ژنە جوانە، ئایا لەگەڵ تۆدا دۆستایەتی هەیە؟

وتم: دۆستایەتیی من لەگەڵ ئەم ژنە هاوڕێیەتی ئاساییە و لایەنی تایبەتی نییە.

چاوەڕوانی ئەوە بووم کە (هورم هەب) دەستی خۆی لەسەر دەستی مەریت دابنێت، بەڵام ئەو بە ئەدەبەوە ژنەکەی ئیزن داو لە دوای ئەوەی کە ڕۆیشت بە منی وت: سینۆهە سبەینێ ڕۆژێکە کە لە **تەبەس** خوێن دەڕژێت، چونکە فیرعەون بڕیاری داوە خوایەکەی خۆی جێنشینی ئامون بکات و من لەبەر ئەوەی فیرعەونم خۆش دەوێت پێشم لەم بڕیارەی نەگرت، چونکە دەمزانی کە ئەگەر نەمهێشتایە، فیرعەون بە شێوەیەک دڵگران دەبوو کە لەوانە بوو لە داخا بمرێت و تۆ دەزانی من کەسێکم کە لە بیابان لە کاتێکدا کە فیرعەون جێنشین بوو، بە ئامادەبوونی تۆ، ئەوم بە کراسەکەی خۆم داپۆشی بۆ ئەوەی سەرمای نەبێت و هەر لەو کاتەوە خۆشەویستی ئەم پیاوە چووەتە ناو ڕوحی منەوە.

بەڵام لەبەرئەوەی کە دەزانم هەڵوێستەکەی فیرعەون بۆ گۆڕینی خوا، دەبێتە هۆی خوێنڕێژی، وازم لە فەرماندەیی سوپا هێنا، بۆ ئەوەی من لە ڕشتنی خوێنی

خەڵکی بەرپرس نەبم، چونکە دەزانم کە ئەگەر ئەم ئەرکەم بخستایەتە ئەستۆی خۆم، لە داهاتوودا خەڵکی میسر نەفرەتیان لێ دەکردم.

سینۆهە.. لەو کاتەوە کە من و تۆ لە سووریا لە یەکتر جیابووینەتەوە، ئاوێکی زۆر بە بەستەری[٥] نیلدا تێپەڕیوە و چەندەها جار ئەم رووبارە لافاوی لێ هەڵساوە و وشکانییەکانی بە نیشتەنیی ئاو داپۆشیوە. هەروەها لەم وڵاتەشدا کارەساتی زۆر روویدا. لەوان بە فەرمانی فیرعەون سەفەرم کرد بۆ باشووری وڵات بۆ ئەوەی هەموو سەربازگەکان هەڵوەشێنمەوە و سەربازە رەش پێستەکان بهێنم بۆ **تەبەس** و ئێستا هیچ یەکێک لە شارەکانی باشووری میسر سەربازی نییەو سەربازگەکان چۆڵن. ئەم کردەوەیە لە سووریاش دووپات دەبێتەوە و بێ گومان گەلی سووریاش دەست بە راپەڕین دەکەن و ئەو کاتە لەوانەیە فیرعەون هەست بە شێتایەتیی خۆی بکات و بزانێت کە نابێت وڵات بەبێ سەرباز بەڕێوە بیات.

لەو کاتەوە کە فیرعەون بڕیاری داوە کە بە پێی فەرمانی خوایەکەی کاربکات، چی تر لە کانگەکانی میسر شتی بەبایەخ دەرناهێندرێت، چونکە دەڵێت ئازاری بەندەکان مەدەن و ئەوانەی کە تەمەڵن و لەکانگە کار ناکەن قامچییان لێ مەدەن. من ئەگەر چی سەربازم و کارم بە خوایەکانەوە نییە، بەڵام بۆ خوایە نوێیەکەی فیرعەون نیگەرانم، چونکە دەبینم کە ئەم خوایە بەتەمایە بە خوێن رێژی جێی خوایەکەی پێشوو بگرێتەوەو من سەرم لە کاری خوایەکان دەرناچێت، بەڵام ئەوە دەزانم کە خوا بۆ ئەوە دروست بووە کە خەڵکی بەختەوەر بکات، نەک خوێنیان بڕێژێت و لە رووی رامیارییەوە من لەگەڵ بڕیارەکەی فیرعەون-دام، بەڵام نەک بەو شێوەیەی کە ئەو دەیەوێت ئاموون سەرنگون بکات.

سوودی بڕیارە سیاسییەکەی فیرعەون لەوەدایە کە (ئاموون) لەبەر ئەوەی لە مێژە لە میسردا خوایەتی دەکات، زۆر قەڵەو بووە و بووەتە خاوەن زەوی و زار و



تاکستان (رەز)و مێگەل و ئاشی زۆر و کاتێک کە فیرعەون ئەو خوایەی سەرەونگون کرد هەموو سامانی خوا (ئاموون) بە فیرعەون دەبڕێت، بەڵام ئەم کارە بەم شێوەیەی کە فیرعەون دەیەوێت بە ئەنجامی بگەیەنێت دەبێتە هۆی کوژرانی هەزارەها کەس و کاول بوونی (**تەبەس**)یش.

وتم: هورم هەب من لە راستیدا رام لەگەڵ سەرنگون کردنی (ئاموون)ە، چونکە ئاموون خوایەکی چاوچنۆک و بێ بەزەییەو دژی ئازادی خەڵکییەو ئەوەندە بەهۆی کاهینەکانی خۆیەوە خەڵکیان لە نەزانیدا هێشتۆتەوە، کەلەم وڵاتەدا هیچ کەسێک ناتوانێت شتێک تێ بگات و ئەگەریش تێ بگات توانای دەربڕینی نییە، چونکە کاهینەکان یەکسەر لەناوی دەبەن و خەڵکی بەردەوام لە ئاموون دەترسێن، بەڵام ئاتوون خوایەکی بێ تەماح و ئاشتی دۆست و ئازادیخوازەو دەیەوێت خەڵکی لەترس رزگار بکات.

هورم هەب وتی: من لەگەڵ بۆچوونەکەی تۆدا نیم و ئەو خوایەی کە خەڵکی ترسیان لێی نەبێت بەمەترسیداری دەزانم، چونکە گەل بەبێ ترس بەڕێوە ناچێت و خوای نوێ لەبەر ئەوەی میهرەبان و ئازادیخوازە و ئاشتیی دەوێت، بۆ گەلی میسر لە خوایەکەی پێشوو مەترسیی زیاترە، بەڵام سەبارەت بە پێویستی سەرنگون کردنی ئاموون، لەگەڵ بۆچوونەکەی تۆدام و دەڵێم ئەم خوایە دەبێت لەناوبچێت، بەڵام نەک بەم جۆرەی کە فیرعەون دەیکات، ئەگەر فیرعەون جێبەجێ کردنی ئەم کارەی بەمن بسپاردایە، من بەشێوەیەک خوا (ئاموون)م لەناودەبرد کە تەنانەت خوێنی یەک میسریش نەڕژێت.

پرسیم: تۆ چیت دەکرد؟

وتی: من شەوێک بە نهێنی لەسەرتاسەری میسر و بەبێ ئەوەی کاهینەکانی پەرستگای ئاموون هەستی پێ بکەن، هەموو کاهینە پلە یەکەکانی (ئاموون)م دەکوشت و کاهینەکانی تریشم بۆ کارکردن دەنارده کانگەکان، بە شێوەیەک کە سبەینێی رۆژی دوایی کاتێک کە خەڵکی لە ماڵەکانیان دێنە دەرەوە، یەک

کاهینیشیان نەدەبینی و بەم جۆرە ئاموون لە ناو دەچوو، چونکە دەسەڵاتی ئاموون بەکاهینەکانییەوە بەندە و کاتێک ئاموون کاهینی نەبێت دەسەڵاتی نامێنێت. خەڵکیش دوای ئەوەی کە دەبینن خوایان نییە، ئیتر هەر خوایەکی تریان ئاراستە بکەی دەیپەرستن، چونکە عەقڵی ئەوان توانای لێکدانەوەی جیاوازی نێوان خوایەک و خوایەکی تری نییە.

بەڵام لەبەر ئەوەی فیرعەون دەیەوێت ئەم کارە بە ئاشکرا ئەنجام بدات، ئەمڕۆ لە **تەبەس** و زۆربەی شارەکانی میسر هەموو منداڵێک دەزانێت کە فیرعەون بەتەمایە ئاموون لەناوببات. بۆیە کاهینەکان خەڵکیان لە پەرستگاکانی **تەبەس** و شارەکانی تر کۆکردۆتەوە و هانیان دەدەن بەرگری بکەن و خەڵکی بەهۆی دنەدانی کاهینەکان خۆڕاگر دەبن و خوێن دەڕژێت.

لە دوای ئەم قسەیە هورم هەب داوای پەیمانەیەکی تر شەرابی (کلکی تیمساح)ی کرد و خواردییەوە و خواردنەوەی سێیەم سەرخۆشی کردو سەری خستە سەر دەستەکانی و بۆ بەدبەختیی گەلی میسر کە دەبوونە قوربانیی ئەو شەڕە گریا. ویستم پێش لە گریانەکەی بگرم، بەڵام سەیرم کرد خەوی لێ کەوتووە.

***

١- بخوورڕ: بریتی بوو لە گیایەک یان تۆی رووەکێک کە لەبەر بۆنی خۆشی لە پەرستگاو لە ماڵەکاندا دەیانسووتاند - وەرگێڕ.

٢- شەردن: جێگایەک بوو کە ئێستا لیبیای پێ دەڵێن - وەرگێڕ.

٣- لە فارسیدا دەڵێن سەریان لەم گوێیەوە بۆ ئەو گوێیەی بڕیبوو - وەرگێڕی کوردی .

٤- میزان کە ئەمڕۆ ئێمە تەرازووی پێ دەڵێین، لە میسری کۆن بە کاتژمێری ئاویان دەگوت و وەک چۆن ئێمە دەڵێین لەم کاتژمێرە بەدواوە، میسرییەکان دەیانگوت لەم میزانە بەدواوە- وەرگێڕ.

٥- بەستەر: جێگا - لێرەدا مەبەست رووی ئەو زەوییە نزمەیە کە ئاوی نیلی بەسەردا تێدەپەڕێت - وەرگێڕی کوردی.

# کوشتار لە تەبەس

ئەو شەوە لە ژووره تایبەتییەکەی مەیخانەکە پارێزگاریم لە هورم هەب کرد، چونکە ئەگەر بە جێم بهێشتایەو بڕۆیشتمایە، لەوانەبوو فەرماندەی نوێی سوپای میسر هەوڵی کوشتنی بدایە. بەڵام لە هۆڵی گشتیی مەیخانەکە تا بەیانی دەنگی پێکەنین و هەراو هوریای ئەو سەربازانە دەهاتە گوێ کە پاسەوانی مەیخانەکە بوون، چونکە کاپتاو شاگردەکەی لەبەر ئەوەی کە دەیانزانی کارەساتی ترسناک روودەدات، خواردن و ئاوی جۆیان دەدایە سەربازەکان بۆئەوەی دۆستایەتییان بۆ لای خۆیان رابکێشن.

لەو شەوەدا نەک هەر من نەنووستم، بەڵکو لە شارەکەشدا هیچ کەسێک جگەلە ئەفسەر و سەربازەکانی فیرعەون، نەنووستن و دوایی بۆم دەرکەوت کە خودی فیرعەونیش لەو شەوەدا بەخەبەر بووە. چونکە خەڵکی لەوە تێگەیشتبوون کە سبەینێ رۆژێکی گەورە دەبێت لە ژیانی دانیشتوانی **تەبەس** و بە مەزندەیەکی زۆر لە نێوان سوپای میسر و خەڵکەکە، کە لە ناو پەرستگای ئاموون و لەبەر دەمیدا کۆ ببوونەوە، شەڕێکی گەورە رووی دەدا.

کاهینەکانی پەرستگە ئەو شەوە قوربانییان کردو نان و گۆشتیان دا بەئەو کەسانەی کە لەوێ بوون و بە دەنگێکی بەرز هاواریان دەکرد، کە من لە هۆدەکەی خۆمەوە (لە مەیخانەکە) گوێم لە دەنگیان بوو. کاهینەکان جاربەجار ناوی ئاموونیان دەهێنا و دەیانگوت هەر کەسێک لە رێگای ئاموندا خۆی فیدا بکات، بێ گومان بە بەختەوەریی هەمیشەیی دەگات.

من دڵنیابووم کە ئەگەر کاهینەکان هانی خەڵکیان نەدایە، ئەو رۆژە و



رۆژەکانی تریش خوێن نەدەرژا، چونکە ئەگەر کاهینەکان تەسلیم بوونایە، فیرعەون لەبەرئەوەی ئاشتیخواز بوو و رقی لە خوێن رشتن بوو، ئازاری پێ نەدەگەیاندن و هیچ دوور نەبوو بەشێک لە زێڕ و پارەو زەوییەکانی ئاموونی بدایە بەو کاهینانە، بۆئەوەی باقی ماوەی تەمەنیان بە ئاسوودەیی بژێن بەڵام ئەگەر کەسانێک وا راهاتبێتن کە خاوەن دەسەڵات و دەوڵەمەند بن، بەجۆرێک دڵی پێوە دەبەستن کەلە پێناوی مانەوەی ئەو دەسەڵات و سامانە، لەگیانی خۆشیان دەبوورن.

کاهینەکان دەیانزانی کەئەگەر شەڕ دەست پێ بکات بێ گومان دەبێتە هۆی ئەوەی کە خەڵکی بەسەختی رق لە فیرعەون هەڵبگرن، چونکە ئەگەر شەڕ ببوایە سەربازە رەش پێستەکان خەڵکیان قەتل و عام دەکرد. ئەگەرچی بە هۆی ئەم خوێن رێژییەوە پەیکەری ئاموون سەرنگون دەکرا، بەڵام پەیمانی خوێن بەشێوەیەک ئاموونی لە دڵی خەڵکیدا پایەدار دەکرد، کە هەرگیز ئەو خوایە لە بیر نەدەکراو هەتاهەتایە نەفرەتیان لە فیرعەون دەکرد کە بۆچی سەربازە وەحشییە رەش پێستەکانی بەرداوەتە گیانی گەلەکەی خۆی، واتە میسرییە سپی پێستەکان.

لە راستیدا کاهینەکان ئومێدەواربوون کە بەهۆی بەرگری کردن و قەتڵ و عامی خەڵکی، خوای ئاموون بە نەمری بمێنێتەوە، ئەگەرچی پەیکەرەکەی سەرەونگوم بکرێت و پەرستگاکەی دابخرێت.

کاتێک رۆژ بووەوە گەرمای خۆر لە ماوەیەکی کەمدا ناسازگاریی هەوای شەوی لەناوبرد و لەوکاتەدا لە چوار رێیەکان و مەیدانەکانی شاری **تەبەس** نەفیریان لێدا و چەند جارچییەک لە مەیدانێکەوە بۆ مەیدانێکی تر دەڕۆیشتن و لەسەر پاپیرۆسەکان فەرمانی فیرعەونیان دەخوێندەوەو ناوەرۆکی فەرمانەکە ئەوە بوو کە ئاموون خوایەکی درۆیینەو دەبێ سەرنگون بکرێت و هەتاهەتایە نەفرەتی لێ بکرێت و هەموو پەرستگاکانی ئەم خوایە درۆزنەلە میسری سەروو و خواروو

و هەروەها هەموو زەوی و مەڕ و ماڵات و بەندەو زێڕ و پارەو مسی ئەو خوایە دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی فیرعەون و خوایەکی ئەوکە (ئاتوون)ە. هەروەها لەمەو بەدوا هەژارەکان دەتوانن لەو کانیاوانەی کە لە رابردوودا هی خوایە درۆزنەکە بووە، خۆیان بشۆن و لە ئاوی ئەوکانییانە بخۆنەوە و فیرعەون ئەو زەوی و زارانە دەداتە هەموو ئەو کەسانەی کە زەوییان نییە، بۆئەوەی بە شوکرانەی خوایەتی (ئاتوون) کشتوکاڵی تێدا بکەن.

کاتێک کە ئەم فەرمانە لە بەرامبەر پەرستگای ئاموون دەخوێندرایەوە، خەڵکی سەرەتا بێدەنگ بوون بۆئەوەی بزانن فیرعەون لە فەرمانەکەی خۆیدا چی دەڵێت و کاتێک فەرمانەکە گەیشتە ئەوەی کە هەموو پەرستگاکان و زەوی و زارو مەڕو ماڵات و...ی ئاموون لە لایەن فیرعەون و خوایەکەیەوە دەستی بەسەردا دەگیردرێت، کاهینەکان دەنگیان بەرزکردەوەو خەڵکیش بە چاو لێ کردنی ئەوانەوە بە جۆرێک هاواریان دەکرد کە دەتگوت بەرد و خشتی خانووەکان و شەقامەکانیش لەگەڵیاندا هاوار دەکەن.

سەربازە رەشەکان کە حەزیان لە رەنگی سپی و سوورە و رەنگی سوور و سپییان لە دەم و چاودابوو، کاتێک گوێیان لە دەنگی هاواریان بوو ترسیان لێ نیشت و چاوە سپییەکانیان بەترس و لەرزەوە دەیڕوانییە دەوروبەر، چونکە دەیانزانی کە ئەگەرچی ژمارەیان زۆرە، بەڵام ئەگەر خەڵکی **تەبەس** پەلاماریانی بدایە دەکوژران.

خەڵکی ئەوەندە بەقایم دەیانشیڕاند کە نەیانتوانی گوێ بیستی بەشەکانی کۆتایی فەرمانەکەی فیرعەون بن و نەیانزانی کە فیرعەون بڕیاری داوە کە ناوی نەفرەت لێ کراوی ئاموون بگۆڕدرێت و ناوی خۆشی گۆڕیوەو کردوویەتییە (ئەخناتوون) واتە (خۆشەویستی ئاتوون).

کاتێک ئەو فەرمانەیان لەبەردەم پەرستگەی ئاموونـدا دەخوێندەوە من لەوێ نەبووم و بەسەرهاتی ڕووداوەکەم دوایی بیست، بەڵام خەڵکی بەجۆرێک



هاواریان دەکرد کە دەنگیان دەگەیشتە (کلکی تیمساح) و هورم هەب لە دەنگی خەڵکی بەخەبەر بووەوەو هەڵساو دانیشت و وتی: سینۆهە، شەرابەکەی دوێنێ شەو داتپێیم بەهێز بوو و تا سبەینێ نووستم.

(هورم هەب) بە هۆی بیستنی دەنگی هاوار و ناو هێنانی ئاموون لە لایەن خەڵکییەوە، ڕووداوەکانی رابردووی، کەلە کاتی مەستی و خەودا فەرامۆش دەکرێت، هاتەوە یاد و بەڕێ کەوت و منیش لە دواییەوە ڕۆیشتم و لە ژوورەکەوە بەرەو هۆڵی مەیخانەکە چووین و بینیم سەربازەکان کە شەوی رابردوو زۆریان خواردبووەوە، بە هۆی سەرخۆشییەوە لە گۆشەیەکدا کەوتبوون و هێشتا لەخەو هەڵنەستابوون.

هورم هەب سەری خستە ناو تەشتێکی پڕلە ئاوی سارد بۆئەوەی خەوالوویەکەی شەوی رابردووی نەمێنێت و دوایی گۆزەیەک بیرەو نانێکی لە مەیخانەکە هەڵگرت و لە کۆڵانە چۆڵەکانەوە بەرەو پەرستگەی ئاموون بەڕێ کەوتین.

کاتێک کە گەیشتینە نزیک پەرستگا، پیاوە کورتە بالاو قەڵەوەکەی فەرماندەی نوێی سوپابوو و (پێپیت ئاموون)یان پێی دەگوت، بەسواری کەژاوەکەیەوە بەسەربازەکانی وت: ئەی سەربازەکانی سەرزەمینی (کوش) و، ئەی نەبەردەکانی ولاتی (شەردن)، فیرعەون فەرمانی داوە کە ئەم ئاموونە نەفرەت لێ کراوە سەرنگون بکەن و من بەڵێنتان دەدەمێ کە پاداشتی خۆتان وەردەگرن.

لە دوای ئەم وتەیە، فەرماندەی نوێی سوپا. وەکو بڵێی کۆتایی بە ئەرکی خۆی هێنابێت، لە کەژاوەکەیدا راکشاو بەهۆی گەرم بوونی هەوا بەندەکان باوەشێنیان دەکرد. لەو کاتەدا سەردەستەکان فەرمانیان بەسەربازەکانی خۆیان دا کە ئامادەی هەڵمەت بردن بن، من و (هورم هەب) لە جێگایەک بوین کە لە بەرامبەر پەرستگا بوو و هۆڵی یەکەمی پەرستگاکەمان بە باشی دەبینی و

سەیرمان کرد پڕە لە پیاوانی سپی پۆش و ژن و منداڵ و هەندێک لە منداڵەکان هێشتا لەخەو هەڵنەستابوون و، دیاربوو کە هەموویان شەو، لەبەردەم پەرستگا یان لە هۆڵەکەیدا نووستبوون.

لە ناکاو سەربازە رەشەکان کە دەم و چاوی خۆیان رەنگ کردبوو کەوتنەڕێ و گالیسکە جەنگییەکان بەرەوپێش چوون و ویستیان بچنە ناو پەرستگای ئاموونەوە. سەربازەکان بە پاژنەی نەیزەکانیان خەڵکیان لەسەر رێگای خۆیان دووردەخستەوە، تا گەیشتنە دەرگای پەرستگەکە، بەڵام کاتێک کە گالیسکەکان ویستیان بەرەو ناو پەرستگە بچن، خەڵکەکە بەدەنگی بەرز هاواریان کرد ئاموون و، بەیەک جوولانەوە بەرەنگاریان بوونەوە و لەبەرئەوەی نەیاندەتوانی لەگەڵ سەربازە رەش پێستە جەنگ دیدەکاندا شەڕ بکەن، خۆیان خستە ژێر گالیسکەکانەوەو بەشێوەیەک بە لاشەکانی خۆیان رێگایان بەست، کە گالیسکەکانیان وەستاند و ئەسپەکان ترسان و دەست و پێیان لێ دەداو قیژەی ژن و منداڵ دەگەیشتە ئاسمان.

خەڵکی بەرادەیەک لە تووڕەییدا دەخرۆشان کە ئەگەر سەربازەکان تا دوایین کەسیش ئەوانیان بکوشتایە دەستیان لە بەرگری کردن هەڵنەدەگرت، بەڵام ئەفسەرەکان لەبەر ئەوەی کە دەیانزانی فیرعەون دووپاتی کردۆتەوە کە خوێن نەڕژێت فەرمانی پاشەکشەیان دا. کاتێک خەڵکی بینییان سەربازەکان و گالیسکەکان پاشەکشە دەکەن، یان لەبەرئەوەی هەندێکیان کوژراو و بریندار ببوون، هاواری شادییان ئاسمانی هێنایە لەرزە.

من و هورم هەب کە ئەم رووداوانەمان دەبینی سەیرمان کرد ئەفسەرەکان لە کەژاوەی فەرماندەی سوپا نزیک بوونەوەو پێیان وت: ئەی (پیپیت ئاموون) ئێمە بەبێ خوێن رشتن ناتوانین بەرەوپێش بڕۆین و فیرعەونیش وتوویەتی نابێ خوێن بڕژێت... کەواتە چاری ئێمە چییە.

فەرماندەی سوپای میسر کە سەرنجی دابوو فیرعەون ناوی خۆی گۆڕیوە،



ئەویش ویستی ناوی خۆی بگۆڕێت و وتی: من (پیپیت ئاموون) ناناسم بەڵکو ناوی من (پیپیت ئاتوون)ـە، واتە ئەو کەسەی کە لەلایەن ئاتوونەوە بەرەکەتی بەسەردا رژاوە.

یەکێک لە ئەفسەرەکانی سوپا کە قامچییەکی زێڕینی بەدەستەوە بوو و فەرماندەی هەزار سەرباز بوو وتی: من نە کارم بە ئاتوونە و نەبە ئاموون و نە بەوانەش کە بەرەکەتیان لێی دەست کەوتووە، بەڵکو دەپرسم چاری ئێمە چییە و ئایا دەبێ پەرستگای ئاموون بگرین یان نا؟

فەرماندەی سوپا وتی: هەر جۆرێک کە فیرعەون فەرمانی داوە وەها بکەن و لەبەرئەوەی وتوویەتی خوێن نەڕژێت ئێوەش بەبێ خوێن ڕێژی دەست بەسەر پەرستگاکەدا بگرن و هەیکەلی ئاموون سەرنگون بکەن.

لە کاتێکدا کە لە تەنیشت کەژاوەی فەرماندەی سوپاوە راوێژی جەنگی دەکرا، خەڵکی بەردی زەویی حەوشە و شەقامەکانیان هەڵدەکەند و بەرەو رەش پێستەکانیان هەڵدەداو یەکێک لە بەردەکانیان دەستی ئەسپێکی فەرماندەیان شکاند کە بە کەژاوەکەوە بەسترابوو و یەکێکی تریش چاوێکی ئەسپەکەی کوێر کردو (پیپیت ئاتوون) کاتێک کە بینی ئەسپێکی کوێر و شەل کرا، تووڕە بوو و لە کەژاوەکە هاتە خوارەوەو سواری یەکێک لەگالیسکەکان بوو و فەرمانی دا هێرش ببەنەسەر پەرستگا.

کاتێک گالیسکە جەنگییەکان کەوتنەڕێ شۆفێری گالیسکەکان و ئەو سەربازانەی کە تێیدا بوون خەڵکیان بەرزدەکردەوەو یەکسەر بەدەوری گالیسکەکەوە پەتیان لە قوڕگیان دەخست و دەیانگوت بەم شێوەیە رەچاوی فەرمانی فیرعەون دەکرێت، چونکە خوێن نارژێت و ئەو کەسەی کە دەخنکێندرێت خوێنی لێ نایەت. سەربازە رەش پێستەکان کەوانەکانیان دەچەماندەوەو پەلاماری قەرەباڵغییەکەیان دەداو هەر کەسێکیان دەست بکەوتایە بەهەر دوو دەست دەیانخنکاند.

من و هورم هەب بە نەفرەتەوە روانییان کە ئەوان تەنانەت ژن و منداڵەکانیشیان دەخنکاند خەڵکی لە هەموو لایەکەوە بەردیان لەسەربازەکان دەگرت و ئەوانیش هەوڵیان دەدا کە بە قەڵغانەکان خۆیان بپارێزن و هەر ئەوەندە کە رەش پێستێک دەکەوتە دەست خەڵکەوە لەیەک ساتدا کەرت کەرتیان دەکرد.

(هورم هەب) کە گۆزەیەک خواردنەوەی بەدەستەوە بوو و نانەکەی بە پشتییەوە کردبوو چووە سەر یەکێک لە هەیکەلەکانی بەرامبەر پەرستگا، کە لەشی وەک شێر بوو و سەری وەک قۆچ بوو بۆئەوەی مەیدانی شەڕەکە بەباشی ببینێت و دەستی بە خواردنی نانەکەی کردو هەندێ جار گۆزەکی ئاوجۆیەکەی لێ دەسەندم و قومێکی لێدەدا.

(پیپیت ئاتوون) لە پێشەوەی سەربازەکانی خۆی تێدەکۆشا پەرستگاکە داگیر بکات. بەڵام بەبۆنەی بەرگریی بەهێزی جەماوەر پێی نەدەکرا. لەکەناری کەژاوەکەی ئەو میزانەکەی (کاتژمێری ئاوی) ئاوی تیانەدەماو تێدەگەیشت کە کات بە خێرایی تێدەپەڕێت.

لەو کاتەدا بیستم کە چەند سەربازێکی بانگ کردو ئەوانی هێنایە نزیک کەژاوەکەیەوە وتی: من لە ماڵەوە پشیلە مێیەیەکی جوانم هەیە کە ئەمڕۆ دەزێت و دەبێ بگەڕێمەوە بۆ ماڵ و داوا لە ئێوە دەکەم کە هەرچی زووترە ئەم پەرستگایە داگیربکەن و بتی ئاموون تێک بشکێنن. ئەگەرنا سوێند بێت بە ئاتوون ملوانکەی زێڕی گەردنی هەمووتان لێ دەکەمەوەو دەسکی قامچییەکانتان دەشکێنم.

ئەفسەرەکانی لەشکر تێگەیشتن کە ئەگەر پەرستگاکە نەگرن لە کار دەخرێن، بۆیە سەربازەکان خۆیان کۆکردەوەو لەسەر شێوەی هونەری سەربازی فەرمانی هێرشیان پێدان. لەم میزانە بەدواوە ئیتر کەس رەچاوی فەرمانی فیرعەونی نەدەکرد کە نابێت خوێن بڕژێت. بەڵکو سەربازە رەشەکان نەیزەکانی خۆیان بەسکی پیاو و ژن و منداڵدا دەکرد و نەیزەکانیان بە خوێنی ئەو خەڵکە سوور



کرد و ئەوەندە خوێن لەبەردەم پەرستگادا رژا کە سەربازە رەش پێستەکان لەناو ئەو خوێنەدا دەخلیسکانەوەو دەکەوتنە سەر زەوی. بەڵام هەر کەسێک کە دەکەوت یەکسەر دەکوژراو کاتێک کاهینەکان بینییان سەربازەکان دەستیان بە هێرشێکی سەخت کردووە، دەرگاکانی هاتنە دەرەوەی پەرستگەی ئاموونیان کردەوەو خەڵکی بەترس و لەرزەوە هەڵهاتن.

سەربازەکان هەڵهاتووەکانیان دایە بەردەستڕێژی تیر و هەندێکیان لێ خستە سەر زەوی و گالیسکەکان بە دوای هەڵهاتووەکاندا دەکەوتن. هەڵهاتووەکان لەکاتی راکردنیان خۆیان گەیاندە پەرستگای خوای نوێ، (ئاتوون)و لە تاو نەفرەت و تووڕەیی، کاهینەکانی پەرستگای خوای نوێیان کوشت و لەبەرئەوەی سەربازەکان بەشوێنیانەوە بوون و هاتنە ناو پەرستگاکەوە لەوێش خوێنێکی زۆر رژاو لەدوای ئەوەی شەڕ کۆتایی پێ هات کوژراوەکانیان ژمارد، دەرکەوت کە سەدجار سەد کەسی کوژراوە.

کاهینەکانی ئاموون ئەگەرچی دەرگاکانی هاتنە دەرەوەی پەرستگایان کردەوە کە خەڵکی رابکەن، بەڵام هەموو دەرگاکانی چوونە ژوورەوەیان داخست، کە لە مس دروست کرابوون و سەربازە رەشەکان لەبەردەم دەرگای مسین و دیواری بەرزی ئاموونـدا وەستان. ئەوان ئەو سەربازانەبوون کە بەردەوام لە دەشتاییەکاندا دەجەنگان و بەرەنگاری ئەو گوندانە دەبوونەوە کە خانووەکانیان لە زنج بوو (ئەو خانووانەی لە قامیش دروست دەکرێن) و نەیاندەزانی کە چۆن هێرش بکەنە سەر قەڵایەک کە شوورەیەکی بەرز و ئەستوور و دەروازەیەکی قایمی هەبێت.

کاهینەکان و لایەنگرەکانی تری پەرستگا، لەسەرەوە کۆڵەرم (نەیزەی کورت) یان بۆ رەش پێستەکان دەهاویشت، یان تیریان لە سەربازەکان دەگرت و کۆمەڵێک لەو رەش پێستانە لەبەردەم دیوارەکەدا کوژران.

لەبەرئەوەی کۆمەڵێکی زۆر منداڵ و ژن و پیاو کوژرابوون و خوێنیان زەویی سوور کردبوو، مێشێکی زۆر کۆببووەوەو (پیپیت ئاتوون) بانگی کرد بخوورم بۆ

بهێنن و مێشەکان دووربکەنەوە. لەدوای ئەوەی کە بخوورەکەیان سووتاند فەرماندەی تازە بە ئەفسەرەکانی وت: دەترسم فیرعەون زۆر لێمان تووڕەبێت، چونکە بەئێوەی وتبوو بتی ئاموون سەرنگون بکەن و دەست لە خوێن رشتن بپارێزن و ئێوە بە پێچەوانەی فەرمانەکەی ئەو کارتان کرد، واتە خوێنی خەڵکیتان رشت بەبێ ئەوەی پەیکەری ئەو خوایە نەفرەتییە لەناو ببەن.

بەڵام ئەمەی کە روویداوە چارەسەری نییەو من تەنها دەتوانم هەوڵ بدەم تووڕەیی فیرعەون ئێوە نەگرێتەوەو ئێستا دەچمە لای و لەوانەیە سەرێک لە ماڵی خۆشم بدەم و بزانم کە ئایا پشیلە مێیەکەم زاوە یان نا و ئێوە لەبەرئەوەی من لێرەنیم خواردن و خواردنەوە بدەنە سەربازە رەش پێستەکان و پێیان بڵێن خۆیان ماندوو نەکەن، چونکە هەوڵ دانیان بێ سوودەو ئێمە بۆ زاڵ بوون بەسەر ئەم پەرستگەیە کە ئێستا وەک قەڵایەکی لێ هاتووە ئامادەییمان نییەو هەر چەندە هەوڵ بدەین ئەم قەڵایە داگیر بکەین کارەکەمان بێ ئاکام دەبێت. بەڵام من لەم رووەوە بێ تاوانم چونکە فیرعەون بە منی نەگوتووە ئەم قەڵایە دەورە بدەو داگیری بکەو من کەرەستە ئامرازی داگیرکردنی قەڵام لەگەڵ خۆمدا نەهێناوەتە ئێرە.

لەو رۆژەدا چیی تر رووداوی شایانی باس رووی نەدا و ئەفسەرەکان فەرمانیان بەسەربازە قولەرەشەکان و سەربازانی شەردن (لیبیای ئێستا-وەرگێڕ)دا کە لە ژێر دیوارەکان نەمێنن و خۆیان لە لاشەکان دوور بخەنەوە کە لە ژێر خۆری گەرمی هاوینی **تەبەس**-دا بە خێرایی دەئاوسان.

لەو رۆژەدا خەڵکی بۆ یەکەمین جار بینییان کە قولەڕەشەکان و تەیرە لاشەخۆرەکان لە بیابانەکان و کێوەکانی نزیک (**تەبەس**)ەوە هێرشیان هێنا بۆئەوەی تەرمی کوژراوەکان بخۆن. لە کاتێکدا کە تا ئەو رۆژە کەس بەبیری نەدەهات هێرشی ئەم جۆرە باڵندانەی لە **تەبەس** بینی بێت. لەپاش ئەوەی سەربازەکان لە دیواری پەرستگاکەوە دوورکەوتنەوە ئەو گالیسکانەی ئازووقەیان



پێ بوو خواردن و خواردنەوەیان بەسەر سەربازەکاندا دابەش دەکرد.

سەربازەکانی شەردن کەلە رەشەکان زیرەکتر بوون لە جیاتی ئەوەی لەژێر خۆرەکەدا بوەستن خانووەکانی دەوروبەری پەرستگایان داگیرکرد کە هی دەوڵەمەندەکان بوون و لە سارداو (ژێرزەمین)ی خانووەکان پەلاماری کووپەکانی خواردنەوەیان داو رەش پێستەکان ماوەیەک لەژێر خۆردا مانەوەو لە دوای ئەوەی زانییان کە دەتوانن خانووەکانی دەوروبەر داگیربکەن و تیایدا بەسەربەرن ئەوانیش ئەو خانووانەی کە مابووەوە بۆ پشوودانی خۆیان داگیریان کرد.

ئەو شەوە لە **تەبەس** چرا هەڵنەکراو شەقام و کۆڵانەکان و رووباری نیل تاریک بوو، بەڵام سەربازە رەشەکان و شەردنییەکان مەشخەڵیان هەڵکرد و پەلاماری خانووەکانیان داو ئەوەی هەڵدەگیردرا بەتاڵانیان برد. خەڵکی لەترسی ئەوان لە ماڵ دەرچوون و لە شەقامەکاندا بڵاوەیان دەکرد و سەربازەکان لەو کاتەدا دەگەیشتنە هەر کەسێک لێیان دەپرسی، ئایا لایەنگری (ئاموون)ی یان ئاتوون و ئاشکرایە کە هیچ کەسێک نەیدەوێرا بڵێت لایەنگری خوای پێشووم و هەموویان خۆیان بەلایەنگری ئاتوون دەناساند. بەڵام سەربازەکان دەیانگوت درۆدەکەی و ئێمە ئەمڕۆ تۆمان لە پەرستگای (ئاموون) بینی و چەند ساتێکی تر سەریان دەبڕی و کراس و هەڵقە کانزاییەکەیان لێ دەکردەوە.

هەموو کەسێک دەیویست لە شاری **تەبەس** بچێتە دەرەوەو خۆی رزگار بکات، بەڵام نەیاندەتوانی، چونکە سەربازەکان هەموو رێگاکانی چوونە دەرەوەی شاریان گرتبوو و پێش رووباریشیان بەکەشتیی جەنگی داخستبوو و دەیانگوت فیرعەون وتوویەتی رێگا لە چوونە دەرەوەی خەڵکی بگرن بۆئەوەی کاهینەکان و لایەنگرەکانی (ئاموون) زێڕ و پارەی پەرستگای خوایە نەفرەت لێ کراوەکە لە شار نەبەنەدەرەوە کەلە سارداوەکانی پەرستگادا شاردبوویانەوە.

لە رۆژی دواییەوە هەوای **تەبەس** بەهۆی بۆگەن بوونی ئەو لاشانەی کە لەبەردەم پەرستگاو لەناوەوەیدا و لە شەقام و کۆڵانەکاندا کەوتبوون پیس بوو و

نەیاندەزانی کە چی لەو تەرمانە بکەن و چۆن مۆمیاییان بکەن. خانەی مردووەکان بە پێی نەریتی کۆن ئامادە نەدەبوو لاشەی کوژراوەکان وەربگرێ، مەگەر دادوەری گەورە فەرمانی وەرگرتنی ئەو لاشانەی بدایە، چونکە لەوانەبوو هەندێ کەس خەڵکیان بکوشتایە و دوایی لاشەکانیان بۆ خانەی مردووەکان ببەن کە لەوێ مۆمیایی بکرێت. بۆیە دەبووایە پزیشکێکی میسری بیگوتایە کە تەرمی بریندارەکە بەهۆی نەشتەرگەرییەوە وای لێ هاتووە.

یان دادوەری گەورە فەرمانی بدایە کە کوژراوەکە لە خانەی مردووەکان وەربگرن و مۆمیایی بکرێن. ئەگەریش دادوەری گەورە، کەلە بەرهەڵست کارەکانی خوای نوێ بوو، فەرمانی بدایە ئەو لاشانە لە خانەی مردووەکان وەربگیردرێن، خانەی مردووەکان ئەو لاشانەی هەر وەرنەدەگرت، چونکە حەوزەکانیان ئەوەندە جێگایەیان نەبوو کە سەدجار سەد تەرم بۆ مۆمیایی کردن وەربگرن. جگە لەوەش ئەوانەی کەلە دامەزراوی خانەی مردووەکان کاریان دەکرد، دژی خوای نوێ بوون چونکە وابلاوببووەوە کە خوای نوێ دەیەوێت نرخی مۆمیاکردنی مردووەکان هەرزان بکات.

چەند ساڵ لەمەوبەر، بەرلەوەی سەفەرە دوور و درێژەکانی خۆم دەست پێ بکەم، ئەو کاتەی کە بۆ مۆمیایی کردنی تەرمی دایک و باوکم چوومە خانەی مردووەکانەوە، لەگەڵ ئەوەشدا کە کرێکارەکانی ئەو جێگایە لە هەموو شتێکیان دەدزی، بەڵام گلەییان هەبوو کە کرێکەیان کەمەو دەبێ مووچەیان زیاد بکرێت. کەواتە رازی نەبوون ئەو کرێیەی بە کەمیان دەزانی کەمتر بکرێتەوە.

ئەفسەرەکانی لەشکر لەترسی فیرعەون رێگایان بە کەس و کاری مردووەکان نەدەدا لاشەی مردووەکانیان لەبەردەم پەرستگاو لە شەقام و کۆڵانەکان هەڵبگرنەوە و بۆ خانەی مردووەکانی ببەن، چونکە بەپێی رێ و رەسمی کۆن هەموو بەیانیانێک خانەی مردووەکان گوزارشتێکی بۆ فیرعەون دەنارد کە رۆژی پێشوو چەند مردوویان هێناوەتەئەوێ و ئەگەر فیرعەون بیزانیایە کە لە ناکاودا



ژمارەی مردووەکان ئەویش ئەوانەی کە کوژراون، زیادی کردووە تێدەگەیشت کە ئەفسەرەکانی سوپا بە پێچەوانەی فەرمانی ئەو کۆمەڵێکی زۆریان کوشتووە و خوێنی خەڵکیان رشتووە.

لە کاتێکدا کە لاشەکان لە دەوروبەری پەرستگاو لە شەقامەکاندا کەوتبوون، هەموو رۆژ و شەوێک کۆمەڵێ کوژراوی نوێ بەو تەرمانە زیادی دەکرد، چونکە سەربازە رەشەکان و شەرکەرەکانی شەردەن بەهۆی بۆنی خوێن و چێژی تالآنی کردن و خواردنی خۆراک و شەرابی زۆرەوە بە جۆرێک یاسایان خستبووەوە ژێر پێیانەوە کە ئەفسەرەکانیشیان نەیاندەتوانی پێشیان لێ بگرن.

کۆمەڵێکی تر لە پیاو کوژ و چەتەکانی رابردووش کە لە ترسی ئاموون و پاسەوانەکان نەیاندەوێرا دزی لە گۆڕەکان و لە ماڵی خەڵکی بکەن و دەستدرێژی بکەنە سەر ژنەکان، لە کەلاوەکان و لە چۆڵەوانییەکانی دووری کەناری نیل هاتنە دەرەوەو هەر یەکێکیان خاچێکی خوای نوێیان لەسەر سینگیان نەخشاند و بەناوی شوێن کەوتووانی خوای تازەوە دەستیان کرد بە کوشتن و ئابڕوو بردن و دزینی کەل و پەلی گۆڕ و خانووەکانی خەڵکی و تەنانەت دەستیان لە ئارامگای فیرعەونەکانی میسریش نەدەپاراست.

کاهینەکانی پەرستگای ئاموون لە بان دیوارەکانەوە نەفرەتیان لە فیرعەون و خوایە تازەکەی دەکردو دەیانگوت ئەم پیاوە شێتە و خوایەکەشی کە لەو شێت ترە بارودۆخێکیان دروست کردووە کە تا پەنجا ساڵی تر ناتوانن ئەو کاولکارییانە نۆژەن بکەنەوە.

هەموو شەوێک لە **تەبەس** گڕی سووتانی خانووەکان بۆ ئاسمان بەرزدەبووەوە و کەس نەبوو ئەو ئاگرانە بکوژێنێتەوە. ئەو گەڕەکەی ماڵەکەی منی لێ بوو، واتە گەڕەکی هەژارنشینەکان ببوو بە جێگای پەنابردنی کۆمەڵێکی زۆر لە ژن و پیاو و منداڵان، چونکە خەڵکی لەدوای ئەوەی کە بیستیان هورم هەب لە ماڵی مندا نیشتەجێ بووە هاتنە ئەو گەڕەکە بۆ ئەوەی لە پەنای (هورم هەب)ـەوە لە

شەڕی چەتە و سەربازە ڕەش پێستەکان و شەرکەرە شەردەنییەکان لە ئەمان دابن، چونکە ئەگەرچی شیرازەی ڕێک و پێکیی سەربازەکان تێکچووبوو بەڵام هێشتا ترسیان لە فەرماندەی پێشوویان هەبوو و لەترسی ئەو نەیاندەوێرا لە گەڕەکەکەی ئێمەدا ڕاوو ڕووت بکەن. یان لەبەرئەوەی کە گەڕەکەکەی ئێمە هەژارنشین بوو، لەو باوەڕەدابوون کە ئەگەر پەلاماریشی بدەن هیچیان دەست ناکەوێت.

هورم هەب لە ماڵی مندا لەڕتر دەبووەوە و لەگەڵ ئەوەشدا کە خواردنەکانی (موتی) ژنە خزمەتکارەکەی منی بە دڵ بوو ، بەڵام حەزی لە خواردن نەبوو و بە منی دەوت: سینۆهە ئەگەر کەسێک بتوانێت لە کاتی هەڵچوونی ڕووباری نیل پێش لە لافاوو بەرزبوونەوەی ئاوەکەی بگرێت، ئەوە دەکرێت بەسەر ئەو سەربازانەشدا زاڵ بێت کە کەوتوونەتە پێشێلکاری و ڕاوڕووت. من چەند ساڵ کۆششم کردووە تا ئەم سەربازانە ڕێک و پێک بن و وەک ئاژەڵە دڕەندەو کێوییەکان نەبن، بەڵام ئەم فەرماندە نەفامە کە تەنها بیرلە پشیلەکانی خۆی دەکاتەوە، بەچەند ڕۆژێک سەربازەکانی منی وەک دڕەندەکان لێ کردووە و ئێستا ئەگەر من بمەوێت ڕێکیان بخەمەوە هیچ چارێکم نییە جگەلەوەی کە سەدان کەسیان لێ بکوژم، چونکە بە هیچ شێوەیەکی تر ملکەچ و گوێڕایەڵ نابن.

لەو ڕۆژانەی کە لە **تەبەس** کۆکوژی و تاڵان کردن بەردەوام بوو، کاپتا دەوڵەمەندتر و قەڵەوتر دەبوو و، گوێم لێ بوو بەردەوام بوونی ئەو بارودۆخەی پێ خۆش بوو و دەیوت: گەورەم، ئەگەر ئەم وەزعە تا کاتی لافاو و هەڵسانی ڕووباری نیل (تا سەرەتای پاییز – وەرگێڕ) درێژە بکێشێت، من دەبمە یەکێک لە گەورەترین دەوڵەمەندەکانی میسر، چونکە سەربازەکان ئەو زێڕ و پارەو کەل و پەلە گرانبەهایەی کە دەیدزن دەیهێننە مەیخانەو لە جیاتی بەهای خواردنەوە دەیدەن بەمن و ئێستا چەند ژوورێک لە هۆدە تایبەتییەکانی مەیخانە پڕ بووە لە کەل و پەلی دزراو و بەتەمام هەر کە ڕێگای چوونە دەرەوە لە **تەبەس** کرایەوە،



یەکسەر ئەم کەل و پەلانە بە کەشتی بۆ وڵاتانی دەرەوە ببەم و لەوێ بیانفرۆشم.

هیچ یەکێک لە سەربازە ڕەشەکان و شەردەنییەکان و دز و خراپەکارانی میسری نەیاندەتوانی دزی لە مەیخانەکەی (کاپتا) بکەن، یان بە خۆڕایی شەراب بنۆشن، چونکە دەیانزانی کە ئەو مەیخانەیە لە ژێر پاراستنی ئەو سەربازانە دایە کە (هورم هەب) لەوێ داینابون و چەتەو سەربازە مەستەکان لە دوای هاتنە ژوورەوە، لە پێشا پارەی خواردنەوەکەیان دەدا، ئینجا (کاپتا) و (مەریت) خواردنەوەیان دەداپێیان.

کاپتاش بە باشی خزمەتی ئەو سەربازانەی دەکرد کە پارێزگارییان لە مەیخانەکە دەکرد و بەردەوام لە خواردن و خوارنەوە تێریانی دەکرد، بۆئەوەی بە دڵسۆزییەوە پارێزگاری لە مەیخانەکەی بکەن.

لە سێیەمین ڕۆژی کوشتارەکە بەهۆی زۆر بوونی لاشەکان نەخۆشی بڵاوبووەوەو ئەوەندە نەخۆش هاتنە لام، هەتا هەموو دەرمانەکانم تەواو بوو و چی تر دەرمان دەست نەدەکەوت و ئەگەر پێنج ئەوەندەی نرخی دەرمانەکانیشم بدایە دیسانەوە نەمدەتوانی دەرمان پەیدا بکەم و بە نەخۆشەکانم دەگوت: چییتر بۆ چارەسەرکردنی ئێوە دەرمانم نەماوە، بەڵام دەتوانم هەندێ ڕێنومایییتان بدەمێ کە ئەگەر کاری پێ بکەن لەوانەیە چاک ببنەوە.

لە شەوی چوارەم لە تاو بێ تاقەتیم بۆ مەیفرۆشییەکەی کاپتا چووم و لە دوای خواردنەوە هەر لەوێ نوستم. بەیانی (مەریت) منی لەخەو هەڵساند و پێم وت: ژیان وەکو شەوێکی سارد وایە کە مرۆڤ نەتوانێت ئاگرێک بکاتەوەو لەم شەوە ساردەدا دوو بوونەوەری تەنهاو غەمگین کە لە تەنیشت یەکەوە بوون لەوانەیە سوود لە گەرمایی لەشی یەکتری وەربگرن و گەرمیان ببێتەوە، ئەگەرچی چاوەکانیان بەدرۆ خۆشەویستیی خۆیان بۆئەوەی تر دەربڕن.

(مەریت) وتی: سینۆهە تۆ چۆن دەزانی کە چاوەکانی من درۆت لەگەڵ دەکەن؟ ئەگەر من درۆم لەگەڵتا بکردایەو تۆم خۆش نەویستایە دوێنێ شەو لە

دوای نووستنی تۆ لە تەنیشتتەوە پشووم نەدەداو من درۆت لەگەڵدا ناکەم، بەڵام تۆ بەبۆنەی ئەوەی کە جارێک ژنێک درۆی لەگەڵدا کردووی و تۆی فریو داوە ئامادەنیت بیسەلمێنی کەلەوانەیە ژنێک هەبێت تۆی خۆش بوێت و ئەمەی تۆ ئینکارییە.

دوایی مەریت وتی: لەو رۆژەوە کە تۆم بینیوە هەستم کردووە کە تۆ بەرامبەر بە ژنەکان بەد گومانی و ئەم بەدگومانییەی تۆ هۆیەکەی ئەوەیە کە وەکو خۆت دەڵێی ژنێکی جوان و پارە پەرست خیانەتی لێت کردووەو هەرچییەکی هەتبووە لێتی سەندووە و ناچاری کردووی کە لە میسر بڕۆیت و چەندساڵێک لە وڵاتانی تر ژیان بەسەر ببەیت و، ئایا تۆ ناتوانی لەم رۆژەدا کە ئەم شارە هەموو شتێکی گۆڕاوەو بنمیچی ژوورەکان جێی بنی هۆدەکانی گرتووەو دەرگاکان بە پێچەوانەوە دەکرێنەوە، حیسابی رابردووی خۆت لەگەڵ ئەم ژنەدا پاک بکەیتەوە بۆئەوە رەشبینیی تۆ بەرامبەر بە ژنەکان لە ناوبچێت.

لەو کاتەدا وەڵامی (مەریت)م نەدایەوە، بەڵام کاتێک کە لە مەیخانەکە چوومە دەرەوە کە بەرەو ماڵ بڕۆمەوە و پارێزگاری لە نەخۆشە بێ دەرمانەکان بکەم، وتەی ئەو ژنە منی پەرێشان کرد. ئەو کاتە من بیرم لە دەوڵەمەندی و خانوو نەکردەوە، تەنانەت بیری دارایی دایک و باوکیشم نەبوو، بەڵام شتێک زۆر ئازاری دەدام و ئەویش ئەوەبوو کە (نەفر نەفر نەفر) تەنانەت گۆڕی دایک و باوکمی لێ سەندم و بەخێوکەرە بەدبەختەکانم لەدوای ئەوەی تەمەنێکی زۆر بە بەخێوکردنی منەوە ماندوویێتییان چێشت لە کۆتاییدا بەبێ ئارامگا مانەوەو ئەم دەردە منی هێور نەدەکردەوەو هەرچەندە هەوڵم دەدا کە تەنها ئەم یەکەیان فەرامۆش بکەم، نەمدەتوانی.

لە رێگا تائەو کاتەی گەیشتمەوە ماڵ دەگریام، چونکە نەمدەزانی کە ئایا تۆڵەی خۆم لە (نەفرنەفرنەفر) بکەمەوە، یان نا؟ بۆ من تۆڵەسەندنەوە گرفتێکی نەبوو و هەر ئەوەندەکەمێک کانزام بدایە بەچەند سەربازێک، دەڕۆیشتن و ئەو



ژنەیان بۆ دەکوشتم. بەڵام من نەمدەویست ئەو بکوژم و کوشتنی ئەو ژنەم بۆ تۆڵەسەندنەوەی خۆم بەقیساس کردنێکی بچووک و بێ بایەخ دەزانی و هەر جارێک کە دەهاتەوە یادم کە بۆ مۆمیایی کردنی لاشەی دایک و باوکم ناچاربووم ماوەیەک لە خانەی مەرگ شاگردی بکەم، لەگەڵ ئەوەشدا کە من پزیشکی دەرچووی خانەی ژیان بووم و لەوێ پیس و پۆخڵترین و زەحمەتترین کارەکانیان پێ دەکردم، (نەفرنەفرنەفر)م بە هۆکاری ئەم بەدبەختییە دەزانی و خوێن لە دەمارەکانمدا دەجۆشا.

دەمتوانی واز لە تۆڵە سەندنەوەی ئەو ژنە بهێنم، بەڵام ئەگەر وام بکردایە مرۆڤێکی وەکو تۆ نەبووم، ئەی ئەو کەسەی کە لەدوای من ئەم پەرتووکە دەخوێنیتەوە. بەڵکو وەکو خوایەکەی تۆم لێ دەهات و من ناتوانم ببم بە خوایەکەی تۆ، چونکە ئەوەی مرۆڤ بێت ڕوحی تیایەو ئەو کەسەی کە گیانی تێدابێت لە فریودان و ئازار پێگەیاندن لەلایەن خەڵکەوە رەنج دەبات و کینەیان لە دڵ دەگرێت و ناتوانێت ئەو رقە فەرامۆش بکات و تەنها خوایەکانن کە دەتوانن رەنج ببینن و ئازار بکێشن و کینە لە دڵ نەگرن.

لەو کاتەی کە بیرم دەکردەوە کە چۆن دەتوانم تۆڵەی خۆم لەو ژنە بکەمەوە، بەجۆرێک کە ئیتر نەتوانێت گەنجەکانی تری وەکو من لە سەردەمی گەنجێتیدا هەڵبخەڵەتێنێ، بارودۆخی **تەبەس** خراپتر بوو. سەربازەکان کە تا ئەو کاتە هەر دەستدرێژییان دەکردە سەر خەڵکی بەرادەیەک بوێرببوون کە پەلاماری بەرپرسەکانی خۆیان دەداو قامچییەکانیان لە دەستیان دەسەند و دەیانکێشا بەتەوقی سەریانداو ملوانکەی زێڕی گەردنیان لێ دەکردەوەو بۆ خۆیانیان دەبرد.

یەکێک لە خاوەن دەسەڵاتەکان هەوڵی دابوو ملوانکە زێڕەکەی خۆی لەسەربازەکان بسەنێتەوە، بەڵام سەربازە رەش پێستەکان بە نەیزە شاڵاویان کردە سەری و ساتێ دوای ئەوە لاشەی ئەو بەرپرسە کەوتە سەر زەوی.

لە هەمان رۆژدا لە لایەن فیرعەونەوە پیاوێک هاتە ماڵی من و بە (هورم

هەب)ی وت: هەڵسە و لەگەڵ مندا وەرە بۆ کۆشک، چونکە فیرعەون دەیەوێت تۆ بچیتەلای.

(هورم هەب) هەڵساو خۆی شۆری و بەرەو کۆشکی پاشایەتی کەوتەرێ و من لە گفتوگۆکانی فیرعەون و هورم هەب دوایی بە هۆی پێ وتنی هورم هەب ئاگادار بوومەوە. فیرعەون کاتێک کە هورم هەبی بینی پێی وتبوو: دانیشتووانی **تەبەس** وەکو مراوی دەکوژرێن و زۆر لە ژنەکان لە لایەن سەربازە رەش پێستەکانەوە دەستدرێژی کراوەتە سەریان و ئێستا کار گەیشتۆتە ئەو رادەیەی کە سەربازەکان لە ئەفسەرەکانی خۆیان دەدەن و دەیانکوژن و فەرماندەی سوپاش توانای پێش لێ گرتنی ئەوانی نییە و من وەکو جاران تۆ دەکەم بە فەرماندەی سوپا بۆ ئەوەی هێمنی و ئاسایش بەرقەرار بکەی.

(هورم هەب) وتی: ئەی (ئەخناتوون)، تۆ خۆت دەتەویست وەهای لێ بێت و هەر واشی لێ هات...

فیرعەون وتی: من نەمدەویست وای لێ بێت و، من نەمگوتبوو خەڵک بکوژن و ماڵ و حاڵیان تالان بکەن و دەستدرێژی بکەنەسەر ژنەکان، بەڵکو وتبووم کە بەبێ خوێن رێژی ئاموون لەناو ببەن.

هورم هەب وتی: کاتێک کە تۆ بە یەکێک دەڵێیت گۆزەیەک شەراب بنۆشێتەوەو مەست نەبێت قسەیەک دەکەی کە لە ژێربیەوە دوورە، چونکە لە دوای ئەوەی گۆزە شەرابەکەی خواردەوە سەرخۆش دەبێت و ئەوهایی کەتۆ دەتەویست ئاموون سەرنگون بکەی ئاکامەکەی ئەوهایە کە دەیبینی.

(ئەخناتوون) وتی: ئێستا برۆ و ئاسایش و ئارامی بگەڕێنەوە.

(هورم هەب) وتی: ئەم کارە بەمن ناکرێت، مەگەر ئەوەی کە بۆ ماوەی دە رۆژ دەسەلاتی تەواو، واتە وەکو دەسەلاتی خۆتم بدەیتێ.

فیرعەون وتی: ئایا خوای ئاموون سەرنگون دەکەی؟

(هورم هەب) وتی: سەرنگون کردنی ئاموون بۆ دەرێژە پێدانی پاشایەتیی تۆ



پێویستە، چونکە ئەگەر تۆ ئەو لە ناو نەبەیت لەمەو بەدوا ناتوانی لە میسر پاشایەتی بکەیت و رووداوەکانی ئەم چەند رۆژە هەڵومەرجێکی وەهای دروست کردووە کە یان تۆ دەبێ پاشایەتی بکەیت، یان ئاموون خوایەتی بکات.

فیرعەون وتی: کەواتە ئاگاداربە کاتێک هێرش دەکەیتە سەر پەرستگا، کاهینەکانی ئەوێ نەکوژرێن.

(هورم هەب)وتی: من بەرلەوەی پەلاماری پەرستگا بدەم دەبێ سەربازە وەحشییەکان دامرکێنمەوەو لەدوای ئەوەی سەرەهاتە سەر ئاموون، پێت دەڵێم کەچی دەکەم.

فیرعەون ملوانکە و قامچیی فەرماندەیی دا بە (هورم هەب) و فەرمانی دا کە کەژاوە تایبەتییەکەی خۆی تایبەت بکەن بە سواربوونی فەرماندەی سوپا.

(هورم هەب) بەرلەوەی دەست بەکار بکات سەد کەس لەو سەربازانەی کە دەیناسین، بۆ سەربرین (جەللاد)ی هەڵبژاردو، شمشێرێکی دایە دەست هەر یەکێک لەوان و دوایی بە گەڕەکەکانی شاردا دابەشی کردن، بەجۆرێک کە هەر گەڕەکێک پێنج جەللادی بەرکەوت.

پاشان فەرمانی دا کە نەفیر (کەڕنا) لێ بدەن و هەموو سەربازەکان ئامادە بکەن. کۆمەڵێک لەو سەربازانەی وەفاداری هورم هەب بوون لەدوای ئەوەی کە بیستیان بووەتەوە بە فەرماندەی سوپا بە بیستنی دەنگی نەفیرەکان لە دەوروبەری (هورم هەب) کۆبوونەوەو ئەوسا بووە خاوەن پێنج سەد سەرباز.

ئەم پێنج سەد نەفەرە گالیسکەی جەنگیشیان هەبوو و، دوایی هورم هەب بەم سەربازانەوە لەشاردا کەوتەڕێ و هەر سەربازێکی لە کاتی تالان کردندا ببینیایە هەر ئەو کاتە بە هۆی جەللادەکانی خۆیەوە دارکاری دەکردن و ئەو سەربازەش کە یەکێکی بکوشتایە یەکسەر بەدەستی جەللادەکان سەری لە لاشەی جیادەکرایەوە.

هەرچەندە (هورم هەب) لەشاردا زیاتر دەچووە پێشەوە ئەو دەستە سەربازانەی

وازیان لە تالآن کردن دەهێنا دەهاتنە ریزەوەو لە دوای خۆی لە شەقامەکان و چوارڕێیانەکان سەربازگەی دادەناو دەیگوت پاشماوەی ئەو خراپەکار و تالآنچییانەی کە لە گەڕەکەکاندان دەستگیر بکەن و بکوژەکان یەکسەر لەناو ببەن.

(هورم هەب) هەتا سبەینێ لەگەڕەکەکانی **تەبەسدا** سووڕایەوەو هەرچەندە لەشاردا بەرەو پێشتر دەچوو ئەو گەڕەکانە ئاسایش و ئارامی بۆ دەگەڕایەوەو هەرچەندە بەرەبەیان نزیکتر دەبووەوە دەستەی دز و پیاو خراپەکان، وەک تاریکی شەو، لەکاتی بەرەبەیان، رووی لە کەم بوونەوە دەکرد.

لە دواوەی (هورم هەب)ـەوە ئەو ئەفسەرانەی کە لە گەڕەکەکاندا داینابوون هەر پیاو کوژێکیان بگرتایە یەکسەر دەیانکوشت و دزەکانیان دارکاری دەکرد. کاتی خۆر هەڵهاتن هورم هەب بەهۆی جارچییەکانەوە رایگەیاند کە شەوی رابردوو تەنها ئەو کەسانەی خەڵکیان کوشتبوو لە سێدارە دران، بەڵام لەم میزانە بەدواوە ئەگەر یەکێک دزیش بکات، یان دەستدرێژی بکاتە سەر ژنێک، دەکوژرێت.

هەتا نیوەی رۆژیش جەللادەکان سەری رەش پێستەکانیان لە پەیکەر جیادەکردەوە، چونکە ئەوان هێشتا ئامادەنەبوون بیسەلمێنن کە بارودۆخ گۆڕاوەو سەردەمی سەرەڕۆیی بەسەرچووە، بەڵام لە دوای نیوەڕۆوە سەربازە قولەڕەشەکان زانیتیان کە چارەیەکی تریان نییە جگەلەوەی خۆیان بەدەستەوە بدەن و بگەڕێنەوە سەربازخانەکان. لەگەڵ ئەوەشدا بەرلەوەی هەر سەربازێک بچێتە ناو سەربازخانەکەوە دەیانپشکنی و ئەگەر خوێنیان بە کراسەکەیەوە ببینیایە بە جەللادەکانیان دەسپارد کە سەریان لە لاشە جیابکەنەوە.

من دڵنیابووم کە (هورم هەب) تەنها بۆ مەبەستی گەڕاندنەوەی ئاسایش سەربازە رەشەکانی بەو شێوەیە نەدەکوشت، بەڵکو لەبەرئەوەی میسری بوو، لەوەی کە سەربازە میسرییەکانیان دەکوشت بەداخ بوو و دەیەویست تۆڵەیان لێ



بکاتەوە.

ئەو رۆژە کاتێک کە شەو داهات **تەبەس** ئەمن و ئارام بووەوە، بەڵام بەجۆرێک کوشتار و تالآنی و کاولکاری، خەڵکی دڵگران کردبوو، کە شەو، چراکانیان هەڵ نەکرد و لە خانووە گشتییەکانەوە دەنگی مۆسیقا نەدەبیسترا، بەڵام ئەو مەیخانانەی کە لەو شێواوی و نائارامییەدا وێران نەکرابوون ئەو شەوە کاسبییەکی باشیان کرد و، (کاپتا) راستی دەکرد کە پیشەکەی ئەو کاسبییەکە، کە هەرگیز لەکار ناکەوێت، چونکە خەڵکی هەم لەکاتی شادی دەنۆشنەوەو هەم لەکاتی بەدبەختی و پەژارە.

لە بەیانی رۆژی دواییەوە (هورم هەب) کەشتی سازەکان و دارتاشەکانی بانگ کردو، کۆمەڵێکی زۆر لە کرێکارەکانی راسپارد کە بەشێک لە خانووە نیوە وێرانەکانی دەوڵەمەندەکان تێک بدەن و کەشتییە کۆنەکان سکراب بکەن بۆئەوەی بە تەختەی خانوو و کەشتییەکان بتوانن ئاگر بار(مەنجەنیق)[1]و پەیژە و بورجی بەرز دروست بکەن کە توانای گواستنەوەی هەبێت. چونکە (هورم هەب) دەیزانی کە لە دوای ئەوەی کاهینەکانی ئاموون زانیتیان کە فیرعەون شکاوەو نەیتوانیوە پەرستگاکەیان داگیربکات و خوایەکەیان سەرەونگوم بکات، گفتوگۆ لەگەڵ ئەواندا سوودی نییە. چونکە ئەوەندە لە خۆیان بایی ببوون کە مەحاڵ بوو خۆیان بەدەستەوە بدەن و چارەیەکی تر نەبوو، جگەلەوەی کە بە پێی هونەری جەنگی هێرش بکرێتە سەر پەرستگاکەو دیوارەکەی بشکێنن.

ئەو رۆژە هەتا بەیانی رۆژی دواتر لە شاری **تەبەس** دەنگی قازمە (قولینگ) و چەکوش دەهات و کرێکارەکان داریان لە کەشتی و بینایەکان دەهێناو دارتاش و کەشتی سازەکان دەستیان بە دروستکردنی پەیژەو مەنجەنیق و بورجی گوێزەرەوەو (سەرقۆچ) دەکرد[2].

لە شەو و رۆژێکدا پێنج بورجی جەنگی و هەندێ پەیژەو چوار ئاگر بار و چەند سەرقۆچێک دروست کرا و رۆژی دوایی سەربازەکانی (هورم هەب) لە

پێنج لاوه هێرشیان کرده سەر پەرستگەی ئاموون.

کاهینەکانی پەرستگە، کە پێشبینیی ئەوەیان نەکردبوو پەرستگاکەیان گەمارۆ بدرێت خۆیان بۆ بەرەنگاربوونەوەی پەلاماردەرەکان ئامادە نەکردبوو. زۆرجار لەم کاتانەدا لەبان دیوارەکەوە ئاوی کوڵاو و رۆنی داخیان بەسەر هێرش بەرەکاندا دەکرد، بەڵام کاهینەکان لەو کاتەدا نە ئاوی گەرمیان هەبوو و نە رۆنی داخ.

کاتێک کە دەرگاکانی پەرستگا بەهۆی لێدانی سەرقۆچەکانەوە هاتە لەرزەو کاهینەکان زانیتیان تێک دەشکێن، نەفیریان لێدا بۆئەوەی خەڵکی ئاگادار بکەنەوە کە چی تر بەرگری نەکەن، چونکە دەیانزانی کە ئاموون بایی پێویست قوربانیی بۆ کراوە و باقی خەڵکەکە دەبێ زیندوو بمێنن بۆئەوەی لە ئایندەدا بتوانن دووبارە خوای ئاموون زیندوو بکەنەوە.

لەدوای خۆبەدەستەوەدان، دەرگاکانی پەرستگایان کردەوەو خەڵکی کەلە مانەوە لەو پەرستگایە بێزار ببوون بەخۆشحاڵییەوە بۆ ماڵەکانی خۆیان رۆیشتنەوە.

بەم شێوەیە (هورم هەب) بەبێ خوێن رشتن دەستی بەسەر ئاموون-دا گرت و پزیشکەکانی خانەی ژیانی ناردەوە بۆ شار بۆئەوەی نەخۆشەکان چارەسەربکەن، بەڵام نەچووە ناو خانەی مردووەکانەوە کە ئەویش یەکێک بوو لە دامەزراوەکانی پەرستگا، چونکە کەسانی زیندوو نابێت بچنە ناو خانەی مەرگەوە، مەگەر ئەوانەی کە لە کرێکارەکانی ئەو جێگایەن، یان ئەوانەی مردووەکانی خۆیان دەهێنا کە مۆمیایی بکرێت، یان لاشە مۆمیاییی کراوەکان وەربگرنەوە.

لەدوای ئەوەی کە دەروازەکانی پەرستگا کرانەوە کاهینەکان لەگەڵ هەندێ لە پاسەوانەکانی پەرستگا کە ماددەی سڕکەر (مخدر)یان کردبووە لەشیانەوە بۆ ئەوەی هەست بە ئازارنەکەن، لەو جێگایەدا کە پەیکەری ئاموونی لێ بوو سەقامگیر بوون و لەوکاتەدا لە پەرستگا جەنگ لە نێوان کاهینەکان و



پاسەوانەکانیان لە لایەک و لە لایەکی تریشەوە سەربازەکانی (هورم هەب)، دەستی پێ کردو ئەم شەڕە تا پاش نیوەڕۆ درێژەی کێشا.

هەموو پاسەوانەکانی پەرستگا کوژران و هەندێک لە کاهینەکانیش کوژران و تەنها کاهینە پلە یەکەکان مانەوە. ئینجا (هورم هەب) کەڕەنای لێداو جەنگ راگیراو بە کاهینەکانی وت: من لەگەڵ خوایەکەی ئێوەدا دوژمنایەتیم نییە، چونکە پیاوێکی سەربازم و من لەگەڵ خوایەکاندا نە دۆستایەتیم هەیەو نە دوژمنایەتی. من لەو باوەڕەدام کە ئەگەر پەیکەری خوای ئێوە لەم پەرستگایەدا نەدۆزرێتەوە باشترەو خۆتان دەتوانن بتەکەی لەناو ببەن و، بەم شێوەیەش من بە کوشتنی خوایەکەتان تاوانبار نابم و ماوەی یەک میزان مۆڵەت دەدەمە ئێوە کە لەم بارەیەوە راوێژ بکەن و بڕیاری خۆتان بدەن. لەدوای ئەوە هێرش دەکەمە سەرتان، چونکە من سەربازم و دەبێ فەرمانی فیرعەون ئەنجام بدەم و ئەگەر ئێوە لە دوای میزانێکی تر پەیکەری خوایەکەی خۆتان لەناو ببەن و بتانەوێت لە پەرستگا بچنە دەرەوە کەس رێگاتان لێ ناگرێت و ئێمە تەنها سەرنجی ئەوە دەدەین کە زێڕ و پارەی پەرستگاکە، کە ئێستا هی خوای فیرعەونە لەگەڵ خۆتاندا نەیبەن.

کاهینەکان وتیان: زۆر باشە ئێمە میزانێکی تر وەڵامی خۆمان دەدەینەوە.

لەدوای تێپەڕبوونی کاتژمێرێک، کاهینەکان لە جێگاکەی خۆیان هاتنە دەرەوەو بە (هورم هەب)یان وت: بێتە ژوورەوەو ئەو لە دوای چوونە ژوورەوە پەیکەری خوای ئاموونی نەدی و زانیی کە کاهینەکان بتەکەیان تێک شکاندووەو کەرتەکانی بتەکە لەگەڵ خۆیاندا دەبەنە دەرەوە بۆئەوەی بتوانن بڵێن کە ئاموون خۆی ون کردووەو لە داهاتوودا خۆی ئاشکرا دەکات.

هورم هەب دەرگای گەنج (خەزێنەی زێڕ و پارە)ی پەرستگاکەی مۆرکردو بەرد تاشەکانی راسپارد کە ناوی ئاموون لەسەر بەردەکانی پەرستگا بسڕنەوەو لە جیاتی ئەوە ناوی ئاتوونی لێ بنووسن. دوایی بە هۆی جارچییەکانەوە بە

خەڵکیان ڕاگەیاند کە ئاموون لە ناوچوو و لە بری ئەو ئاتوون لە ئەمڕۆ بەدواوە خوای میسرە.

خەڵکی لەدوای ئەوە کە زانییان شەڕو خوێن ڕشتن تەواو بووە لە خانووەکانیان هاتنە دەرەوەو لەکاتی شەودا **تەبەس** وەک ئەو کاتانەی کە ئاسایشی تیابوو بەچراکان ڕووناک بووەوەو بەهۆی گەڕانەوەی ئاسایش و ئاشتی و دەست پێکردنی خوایەتی (ئاتوون) جیاوازی لە نێوان سپی و ڕەش نەماو من زۆرجار دەمبینی کە دەوڵەمەندەکان ڕەش پێستەکانیان بانگهێشت دەکرد بۆ ماڵی خۆیان.

هەرئەو شەوە کەلە گەڕانەوەمدا بۆ ماڵەوە بەشاردا تێپەڕیم دوو ڕووداوم بینی کە فەرامۆشی ناکەم، یەکێکیان ئەوەبوو کە ڕووانیم پیاوێک لە چینی گەورەکان لەکۆڵانێکدا بانگهێشتی ڕەش پێستێکی دەکرد کە بێت بۆ ماڵەکەی و لەگەڵیدا نان بخوات و لە ڕووداوی دووەمدا بینیم کە یەکێک لە پاسەوانەکانی ئاموون کە بە بریندراوی لە قەراغ شەقامێکدا کەوتبووو ناوی ئاموونی بە سەر زمانیدا دەهێنا ، خەڵکی ڕژانە سەری و مێشکیان بە بەرد پەرژ و بڵاوکرد و ژنەکان لە دەرەوەی لاشەکەی سەمایان کردو هەمان ئەوکەسانەی مێشکی سەری ئەو پیاوەیان بە بەرد پرژاند، کە بۆچی ناوی ئاموون بەسەر زمانیدا دەهێنێت، دە ڕۆژ بەر لەوە ئەگەر کەسێک جنێوی بە ئاموون بدایە دەیانکوشت.

کاتێک کە بەرەو ماڵ دەچوومەوە ئەم دوو دیمەنەم بینی و سەرم بەهەردوو دەست گرت و کەوتمە بیرکردنەوە، چونکە زانیتم کە مەحاڵە خوایەک هەبێت کە بتوانێت نەزانی و نەفامیی خەڵکی لەناو بدات. دوایی لە جیاتی ئەوەی بەرەو ماڵ بڕۆمەوە ڕێگای (کلکی تیمساح)م گرتەبەر.

ئەوشەوە، شەوێک نەبوو کە بتوانم بچم بۆ ماڵ، چونکە لە نەفامی جۆری مرۆڤ و باوەڕی سستیان زۆر دڵگران بووم و بەرەو مەیخانەی (کلکی تیمساح) ڕۆیشتم، کە بە خواردنەوە و گفتوگۆ لەگەڵ (مەریت)دا، دڵی خۆم بدەمەوە.



کاتێک گەیشتمە ئەوێ ئەو سەربازانەی کە پاسەوانی مەیخانەکە بوون و لە دۆستایەتیی من و (هورم هەب) بەئاگابوون، دەورەیان لێدام و وتیان مەریت بە ئێمەی وتووە کە تۆ دەبێ تۆڵەی خۆت لە یەکێک بکەیتەوەو لەبەرئەوەی کە دەزانین لە هاوڕێ دڵسۆزەکانی (هورم هەب)ی و لەبەر ئەوەش کە ئەم مەیخانەیە هی بەندەکەی پێشووت، (کاپتا)یە، ئامادەین کە تۆڵەت بۆ بسەنینەوە.

لە(مەریت)م پرسی: کە ئایا تۆ بە ئەمانەت وتووە بۆ تۆڵە سەندنەوەی من، گوێڕایەڵیم بکەن؟

ژنەکە وتی: بەڵێ، من لەو باوەڕەدام کە ئەگەر ئەمشەو تێپەڕبێت و تۆ تۆڵەی خۆت لەو ژنە نەسێنیتەوە کە فریوی دای و بەدبەختی کردی، چی تر ئەم هەلەت بۆ ناڕەخسێت، چونکە لە سبەینێوە بارودۆخی **تەبەس** ئاسایی دەبێتەوە، بەڵام ئەمشەو هێشتا نائاساییە و هەر کەسێک لەگەڵ یەکێکی تردا ناکۆکییەکی هەبێت دەتوانێت تۆڵەی لێ بسەنێتەوە.

بەسەربازەکانم وت: لەگەڵ مندا وەرن، بەڵام هۆشیاربن کە ئێوە ئەمشەو فەرمانی هورم هەب جێبەجێ دەکەن و ئەگەر بتانەوێت بە پێچەوانەی فەرمانی ئەو بجووڵێنەوە سەرتان لە لاشە جیادەبێتەوەو من ئەمشەو تەنها فەرمانی (هورم هەب) بە ئێوە ڕادەگەیەنم.

ئەم قسەیەم کرد بۆئەوەی سەربازەکان بترسێن و لە گوێڕایەڵی فەرمانی من سەرپێچی نەکەن. سەربازەکان وتیان: دڵنیابە کە ئێمە بە پێچەوانەی فەرمانی تۆ کە دەزانین فەرمانی هورم هەبە، ڕەفتار ناکەین.

وتم: هەروەها کەس نابێت من ببینێت و بمناسێتەوەو ئێوە بۆتان نییە ناوی من بەسەر زارتاندا بهێنن. بەڵکو ئەگەر داوای ڕوون کردنەوەیان لێ کردن بڵێن کە لە لایەن خوای (ئاتوون)ەوە هاتوون بۆ ئەوەی تۆڵە لە دوژمنەکانی بسەنینەوە. ئێستا کەمێک سەبر بگرن تا کەژاوەیەک دەهێنن و من بەسواری کەژاوەکە لە گەڵتاندا دێم.

(کاپتا) بەندەکەی پێشووی من یەکێکی بۆ هێنانی کەژاوە ناردو لە دوای کاتژمێرێک، کەژاوەیەکی هێناو سواری بووم و لەگەڵ سەربازەکان بەڕێ کەوتین هەتا گەیشتینە دەرگای ماڵەکەی (نەفرنەفرنەفر). لەوێ بەسەربازەکانم وت: لەم خانووەدا ژنێکی لێیە کە لە هەموو ژنەکانی ئەوێ جوانترەو ئێوە بە بینینی یەکەم بە جوانی و شکۆمەندییەکەی دەیناسنەوە. بەمەرجێک لە دوای سەیرکردنی ئەو نەهێڵن کە بەقسەکانی خۆی فریوتان بدات. بڕۆن و بیهێنن بۆ ئێرە و ئەگەر خۆی بەدەستەوە نەدا پاژنە نەیزەیەکی لێ بدەن کە بێدەنگ بێت و بەرگری پێ نەکرێت، بەڵام نەکەن بەدڕەفتاریی لەگەڵدا بکەن و ئەگەر (هورم هەب) بزانێت کە ئێوە لەگەڵ ئەم ژنەدا بەدڕەفتاریتان کردووەو جوانییەکەیتان شێواندووە، هەمووتان دەکوژێت.

لەناو خانووەکەی (نەفرنەفرنەفر)ەوە دەنگی ساز و ئاواز دەهاتە گوێ و هەندێ لە میوانەکانی ئەو سەرخۆش بوون و بەردەوام دەیانشیڕاند. کاتێک کە سەربازەکان لە دەرگایان دا خزمەتکارەکانی ئەوێ نەیانویست دەرگایان لێ بکەنەوە، چونکە وایان دەزانی کە ئەو سەربازانە توانای پارەدانیان نییە، بەڵام سەربازەکان بەزۆر چوونە ناو خانووەکەوەو ئەوانەی کەلە ماڵەکەدابوون هەڵهاتن و ئەوەندەی پێ نەچوو کە یەکێک لە سەربازەکانم بینی (نەفرنەفرنەفر)ی لە پارچەیەکی رەشدا پێچابووەوەو بەرەو کەژاوەکەی منی دەهێنا.

کاتێک پارچە رەشەکەم بینی وام زانی مردووەو سەربازەکان لاشەکەیان بۆ هێناوم، بەڵام لەدوای ئەوەی کە ژنەکەیان لە کەژاوەکەدا لە تەنیشت منەوە دانا لێم ڕووانی، بۆم دەرکەوت کە زیندووە، بەڵام لە هۆش چووەو وەکو جاران جوانەو سەرە تاشراوەکەی ئەدرەوشایەوە.

هەریەکێک لە سەربازەکان کەمێک پارەم داپێیان و ئەوانم ئیزندا و مەبەستم ئەوەبوو کە نەزانن من بۆ کوێ دەچم. ئینجا بە بەندەکانی کەژاوەکەم وت: من ببەنە خانووەکەم کە لەشەقامێکی نزیک پەرستگای خوای پێشوو، (ئاموون)ـە.



ماڵی من لەوێ نەبوو، بەڵام دەمەویست ناو و نیشانی نادروست بدەمە بەندەکان و دوایی ئیزنیان بدەم. لە شەقامێکی نزیک پەرستگا کەژاوەکەم راگرت و بە بەندەکانم وت دایبنێن و خۆم لەکەژاوەکە هاتمە دەرەوەو (نەفرنەفرنەفر)م لەکەژاوەکە دەرکرد کەلە پارچەیەکی رەشەوە پێچرابووەوەو کرێی بەندەکانم داو ئیزنم دان.

لەدوای رۆیشتنیان (نەفرنەفرنەفر)م هەڵگرت کە هێشتا بێ هۆش بوو و بەرەو خانەی مەرگ بەڕێ کەوتم. لەدوای ئەوەی گەیشتمە ئەوێ لە دەرگام داو چەند کەسێک لە کاهینەکانی خانەی مەرگ هاتن و دەرگایان کردەوەو هەر کەبینییان من بە رواڵەت مردوویەکم هێناوە دەستیان بە جنێودان کردو وتیان: مەگەر ئەم رۆژانە پیشەکەی ئێمە رەواجی نییە کەتۆش مردوومان بۆ دەهێنی؟

وتم: ئەم مردووەی کە من بۆم هێناون لەگەڵ مردووەکانی تردا جیاوازە... وەرن سەیرکەن.

کرێکارەکانی مۆمیایی کردنی مردووەکان مەشخەڵیان هێناو کاتێک سەیری (نەفر نەفر نەفر)یان کرد، بەجۆرێک خۆشحاڵ بوون کەپێکەنین و من لە دوای چەند ساڵ کە گوێم لە پێکەنینی کرێکارەکانی ئەوێ نەببوو لە دەنگی پێکەنینیان هاتمە لەرزە.

یەکێک لەوان لە (نەفر نەفر نەفر)نزیک بووەوەو دەستی خستە سەر سینگی و وتی: پەنا بە ئاموون... ئەم ژنە هێشتا گەرمە.

وتم: ئەگەر دەتانەوێت بە ئاسوودەیی کارەکەی خۆتان بکەن و کەس گرفتتان بۆ دروست نەکات، ناوی ئاموون مەهێنن، چونکە خوای ئاموون ئیتر نەماوەو لە جیاتی ئەو ئەمڕۆ (ئاتوون) لەمیسردا خوایەتی دەکات. بەڵام ئەم ژنە، بەشێوەیەک کە دەیبینن گەرمەو من بە ئێوەی دەسپێرم کە بەباشی پارێزگاریی لێ بکەن و بە جۆرێک لەشی مۆمیایی بکەن کە هەرگیز تێک نەچێت و ملوانکەی زێڕ و گەوهەرەکانی ئەو بۆ کرێی ئێوە بەسە.

کاتێک خزمەتکارەکانی خانەی مەرگ زانییان ئەو ژنە زیندووە، تێگەیشتن کە من چی دەڵێم و یەکێک لەوان وتی: ئەگەر من بزانم کە تۆ ئەی پیاوی نەناسراو، شوێن کەوتووی خوای نوێی میسری منیش ستایشی خوای تازە دەکەم، چونکە لەو رۆژەوە کە خۆم ناسیوە، لێرەدا ژیان بەسەر دەبەم و هەمیشە کاتەکانی خۆم لەگەڵ ژنە مردووەکاندا بەسەر دەبرد کە لە زستان ساردترن و هەرگیز رووی نەداوی ژنێکی زیندوولەباوەش بگرم و ئێستا بە پیرۆزی بوونی تۆ، من و ئەمانەی ئێرە دەتوانین لەگەڵ ژنێکی زیندوودا دابنیشین و دڵنیابە کە تاماوەی حەفتا جار حەفتا رۆژی لێرە دەیهێڵینەوەو ئەگەر رۆژێکیش رامان پێچن کەبۆچی ژنێکی زیندوومان لێرە راگرتووە دەڵێین ئێمە ئەومان بە مردوو وەرگرتووە، بەڵام لەدوای ئەوەی کە خستمانە ئاوو خوێوە، هاتەوە گیان.

من دەمزانی کە کرێکارەکانی خانەی مەرگ کەلە هەموو ژیانیاندا لە خزمەت مردووەکان بوونە و بەهۆی بۆنە بۆگەنەکەی لەشیانەوە رێگایان نادەن کە بۆ ماڵە گشتییەکانی **تەبەس**، مەحاڵە کە بهێڵن (نەفر نەفر نەفر) لەوێ بچێتە دەرەوە.

بەم جۆرە من تۆڵەی دایک و باوکم لە (نەفر نەفر نەفر) سەندەوەو ئێستا دەڵێم لەگەڵ ئەوەشدا کە تۆڵە سەندنەوە وەکو شەرابێک مرۆڤ مەست دەکات، بەڵام مەستییەکەی زوو لەناو دەچێت و نازانم بۆچی لەدوای ئەوەی کە تۆڵە دەسەندرێتەوە، مرۆڤ پەشیمانیی دەبێتەوەو تۆڵە وەرگر بە خۆی دەڵێت کە خۆزگە تۆڵەم نەسەندایەتەوە.

ئەو کاتەی (نەفر نەفر نەفر)م تەسلیمی کرێکارەکانی خانەی مەرگ کرد بۆئەوەی دڵی خۆم بدەمەوە بە خۆمم دەوت کە من ئەم کارەم بۆ رزگارکردنی گەنجەکانی داهاتوو کردووە، چونکە تائەو رۆژەی کە ئەم ژنە جوان و ئازادە، گەنجە سادەو تازە کارەکانی وەکو منی لەکاتی گەنجێتیدا بەدبەخت دەکرد.

لەدوای ئەوەی کە گەڕامەوە مەیخانەکە (مەریت) بەرەو من هات و دەستی گرتم و داینیشاندم و وتی: سینۆهە بۆچی خەمباری؟



وتم: لەبەرئەوەی کە ژنەکان هەموو کاتێک دەبنە هۆی بەدبەختی ئێمەو کاتێک کە ئێمە شەیدای خۆیان دەکەن، گرفتاری گۆمی چارەڕەشیمان دەکەن و کاتێکیش کە تۆڵەیان لێ دەکەینەوە دیسانەوە خۆمان بە بەدبەخت دەزانین.

(مەریت) وتی: ئەم شێوەی بیرکردنەوەیەی تۆ لە بەرئەوەیە کە هێشتا کەسێکت نەدیوەتەوە کە بیەوێت بەختەوەرت بکات.

وتم: من لە خوایەکانی میسر و خوایەکانی هەموو ئەو گەلانەی کە سەفەرم بۆ وڵاتەکەیان کردووە داواکارم کە من لە مەترسیی ئەو کەسانەی کە دەیانەوێت بەختەوەرم بکەن بپارێزێت، چونکە فیرعەونیش دەیەویست گەلی میسر بەختیار بکات و ئێستاش بۆنی لاشەی کوژراوەکان **تەبەسی** هەراسان کردووە.

لەم کاتەدا مەریت پەیمانەیەک (کلکی تیمساح)ی دایە دەستم و وتی بنۆشە...و ئەم جۆرە بیرکردنەوە ئازار گەیەنەرە لەخۆت دوور بخەرەوە.

(کلکی تیمساح)ـەکەم نۆشییەوەو هەرئەوەندە کە لە قوڕگم چووە خوارەوە هەستم کرد بیرکردنەوەکەم گۆڕاوەو چی تر بیرلە (نەفر نەفر نەفر) ناکەمەوە، بەڵکو لە فکری مەریتدا بووم. پێم وت: (مەریت) من ئەمشەوپێویستم بەتۆیە، چونکە تۆڵەسەندنەوەم لەو ژنە ئیتر حیسابی منی لەگەڵ ژنەکان پاک کردەوە.

مەریت وتی: سینۆهە ئەگەر دەتەوێت بزانی کە ژنێک تۆی خۆش دەوێت یان نا؟ ئەو ژنە بەهۆی زێڕ و پارە، یان ئەو دیارییانەی کە لە داهاتوودا دەبێ بیدەیتێ تاقی بکەوە. لەوانەیە ژنێک ئەمڕۆ زێڕ و پارەت لێ نەسێنێ بەڵام لەگەڵتدا رادەبوێرێ بۆئەوەی لە داهاتوودا دیاریی گەورەترت لێ وەربگرێت، یان وەکو (نەفر نەفر نەفر) فریوت بدات و لەبەر ئەوەی کەوتوویتە داویەوە ناچارت بکات هەموو شتێکی خۆتی بدەیتێ و تەنها هۆی هەڵسەنگاندنی خۆشەویستیی ژن، بەرامبەر بە پیاو، ئەوەیە کە نە ئەمڕۆ زێڕ و زیوت لێ وەربگرێت و نەچاوەڕوانی ئەوەش بێت کە لە ئایندەدا شتێکی بدەیتێ، ئایا تۆ لە رابردوودا، تووشی ئەم جۆرە ژنە بوویتەو ئەو ئامادەبوو کە بەبێ ئەوەی داوای شتت لی

بكات ببێته هاوسەری تۆ؟

وتم: بەڵێ... من لە ژیانمدا لەگەڵ ژنێک ئاشناییم پەیاکرد کە زێڕ و پارەی لێم نەدەویست. بەڵام ئامادەنەبوو ببێتە هاوسەرم.

مەریت وتی: کەواتە ئەو ژنە تۆی خۆش نەدەویست.

وتم: ئەو خوایەکی خۆی خۆش دەویست و دەیگوت کە دەبێ کچێنییەکەی خۆی پێشکەش بە خوایەکەی بکات.

مەریت ئەو شەوە منی بردە یەکێک لە ژوورە تایبەتییەکانی مەیخانەکە حەسیرەکەی خۆی بۆ راخستم کە لەسەری بنووم. بۆچی پیاوەکان کاتێک کە ژنێکیان خۆش دەوێت، ئیتر خۆیان لەبیردەکەن و دەگۆڕێن و نایهێننەوە یاد کە لە رابردوودا لەگەڵ یەکێک پەیمانی بەستووە کە لەگەڵ هیچ ژنێکدا کۆنەبێتەوە. ئایا کەس هەیە کە بتوانێت بڵێت کاتێک کە ژنێکی میهرەبان و دڵسۆزی بینی و روانی کە ئەو ژنە بەبێ هیچ مەبەستێکی ماددی دەبێتە هاوبەشی شادی و پەژارەی ئەو، پەیمانەکەی کە لە رابردوودا بەستوویەتی بەدەستی فەرامۆشیی نەسپێرێ. لەگەڵ هەموو ئەم شتانەشدا باوەڕ ناکەم کە من پەیمانەکەی خۆمم لەگەڵ هاوسەرم (مینا) شکاندبێ، کە ژیانەکەی خۆی پێشکەش بە خوایەکەی کردو من وا بیردەکەمەوە کە چۆن رۆن(واتە نەوت)ی گڕی لاواز بەهێزدەکات، ژنی جوانیش ئاگری پیاوە بەڕادەیەک هەڵدە گیرسێنێ کە لەو گەرمییەدا هەموو ئەو پەیمانانەی کە لە رابردوودا لەبارەی ژنانەوە بەستوویەتی دەیسووتێنێ.

هەرچەندە لەگەڵ مەریتدا کە بە میهرەبانیی خۆی، دڵە خەم داگرتووەکەمی شادمان دەکرد و لە تەنهایی دەری دەکردم، باسم لە پەیمانێکی نوێ دەکرد، بەڵام من ئەو ژنەم (مینا) هەمیشە لە یادبوو. من لەو ئەندیشەیەدا بووم کە ئەگەر رۆژێکی فیرعەون بەمن بڵێت تۆ زانستەکەی خۆت بدە بەمن و پیاوێکی نەزان بەو من لە بری ئەوە تاجی پاشایەتیی خۆمت دەدەمێ، بەئەم مامەڵەیە رازی نەدەبووم، چونکە دەمزانی کە بە نەزانی ژیان بەسەربردن هیچ بایەخێکی نییە،



ئەگەرچی مرۆڤ فیرعەونیش بێت.

بەڵام ئەگەر مەریت بەمنی بووتایە زانستەکەی خۆتم بدەرێ و لەمەوبەدوا پیاوێکی نەزان بەو من لە جیاتی ئەوە هەموو شەوێک لەگەڵ تۆدا دەبم، من بەم ئاڵوگۆڕە رازی دەبووم، چونکە دەمزانی کە گەورەترینی بەختەوەرییەکان، پێکەوە ژیانە لەگەڵ ژنێک کە پیاوەکە ئەو و، ئەویش پیاوەکەی خۆش بوێت.

ئەوشەوە بیرم لەوە دەکردەوە کە بەبێ سوود بە دەریاکاندا سەفەرم کردووەو بە خۆرایی بۆ سووریا و بابل و (هاتی) و کەرت رۆیشتم کەلەو ولاتانە بەختەوەری بەدەست بهێنم، چونکە بەختیارییەک کە من بە شوێنیدا وێڵ بووم نەلە دەریابوو و نە لە بابل و هاتی و شوێنەکانی تر، بەڵکو ئەم بەختەوەرییە بەسەربردن بوو لەگەڵ ژنێک کەلە شارەکەی خۆمدا (**تەبەس**)، دەژیا.

بەڵام دەبێ ئەوەش بڵێم کە مرۆڤ دەبێ بە دەریاکاندا سەفەربکات و ولاتانی تر ببینێت بۆئەوەی بزانێت کە ئەو بەختەوەرییەی ئەو بەدوایدا دەگەڕێت لە شوێنەکانی تر دەست ناکەوێت، بەڵکو لە نیشتمانەکەی خۆیدا هەیە. هەتا مرۆڤ بەهۆی رێپێوان، بەو جۆرەی کە من لە بابل لەکاتی هەڵهاتنم لەوێ بە پێ رۆیشتم، ماندوو نەبێت، قەدری دانیشتن و پشوودان نازانێت و دەستکەوتی بەختەوەری لە ژنێک کە پیاوەکەی خۆش بوێت، پێویستی بەوەیە کە مرۆڤ بەر لەوە بێبەش بوونی چێشتبێ.

بەیانی کاتێک کە لە خەو هەڵسام (مەریت) بە پێکەنینەوە وتی: سینۆهە، ئەگەر من لەبەر زێڕ و پارە تۆم خۆش بویستایە و پێویستیم بەکانزای تۆ بووایە، دەمگوت من لێرە ببەرەوە بۆ ماڵی خۆت بۆئەوەی بتوانم لەوێ بە ئاسوودەیی بژیم. بەڵام من پێویستیم بە پارەی تۆنییەو تۆم لەبەر پارە و زێڕ و زیو ناوێت و هەر ئەوەشە کە لێرە دەمێنمەوە.

وتم: مەریت، ئەگەر تۆ منت خۆش دەوێت بۆچی نایەی بۆ خانووەکەی من، کە هەمیشە لەوێ بمێنینەوە؟

وتی: من لەبەر دوو هۆ نایەمە ماڵی تۆ، یەکەم لەبەر ئەوەی ڕەواجی ئێرە بەسراوەتەوە بەمن، چونکە تەنها من دەتوانم نۆشابەی (کلکی تیمساح) دروست بکەم و نهێنیی دروست کردنی ئەم خواردنەوەیە نادرکێنم، بۆئەوەی ڕکەبەریی بازرگانیم نەبێت، لەبەرئەوە ناتوانم لێرە بڕۆم و لە ماڵی تۆدا نیشتەجێ بم.

هەروەها تاقی کراوەتەوە کە ئەو ژن و پیاوەی بەبێ پێویستی ماددی یەکتریان خۆش دەوێت واباشترە کە دوور لە یەکتری بژێن بۆئەوەی هەرگیز ئاگری خۆشەویستییەکەیان خامۆش نەبێت. من ئەگەر لە ماڵی تۆدا بمێنمەوە لە دوای تێپەڕبوونی یەک یان دوو وەرز وەکو یەکێک لە کەل و پەلەکانی ماڵی تۆم لێ دێت و تۆ لە دوای ئەوەی کە دێیتەوە ماڵ حەزناکەی سەیری من بکەی، بەڵام ئەگەر دوور لە یەکتری بژین تۆ هەمیشە منت خۆش دەوێت.

***

١- مەنجەنیق: ئاگربار - ئامرزای ئاگر هاویشتنە بۆ ناو قەڵا لە کاتی شەڕدا - وەرگێڕی کوردی.

٢- سەرقۆچ یان قۆچ سەر (ڕمی زۆر گەورە).. بریتی بوو لە تیری گەورە و گران کە سەری ئەو تیرانەیان وەکو سەری قۆچ (سەری قوربانی یان گا دەتاشی و دە تا بیست کەس ئەو تیرەیان هەڵدەبڕی و بەڕاکردنەوە بە قایم دەیانکوتابە دەروازەی قەڵاکەدا، بۆئەوەی بیشکێنن و بچنە ناو قەڵاکەوە- وەرگێڕ.

## («ئەخناتوون» فیرعەونی میسر)

ئەو رۆژە هورم هەب چووە لای فیرعەون و پێی راگەیاند کە خوای ئاموون سەرنگون بووە و لە ناو چووە و لە جیاتی ئەو خوای ئاتوون خوایەتی دەکات و فیرعەون بەیەکجاری ئەوی کرد بە فەرماندەی نەگۆڕی سوپاو پێی وت بەتەمام سبەینێ بۆ زیارەتی پەرستگای ئاتوون بڕۆم و ئەمشەو لە کۆشکی پاشایەتی میوانداری لە هاورێکانم دەکەم.

(هورم هەب) لە بارەی منەوە لەگەڵ فیرعەون-دا گفتوگۆی کرد بوو و گوتبووی ئەم پزیشکە ئەو کەسەیە کە کاتێک جێ نشین بوویت لەگەڵ تۆدا لە بیابان بوو و فیرعەون منی بە بیر هاتبوو و بە (هۆرم هەب)ی وتبوو ئەمشەو کە بۆ میوانداری دێیت، ئەویش لەگەڵ خۆتدا بهێنە. ئینجا (هورم هەب) هەندێ زانیاریی لە بارەی منەوە بە فیرعەون دابوو کە بەشێکیان زێدەڕۆیی بوون و وتبووی ئەو پزیشکە میسرییە هاوتای نییە لە جیهاندا و هەموو زانیارییەکی پزیشکیی میسرو وڵاتە بیانییەکانی هەیە و تا ئەمڕۆ سەدان کەس لە نەخۆش و بریندارەکانی لە مردن رزگارکردوون.

(ئەخناتوون)[1] فیرعەونی ئێمە زیاتر حەزی لە بینینی من کردبوو بەم شێوەیە من بۆ یەکەمین جار وەکو بانگهێشت کراوێک لە میوانداریی فیرعەون ئامادە بووم.

هەروەها کاتێک کە چوومە ناو کۆشکی فیرعەونەوە بۆ یەکەمین جار لەوێ ژنە میسرییەکانم بە مۆدێلی تازەی هاوینەوە بینی. ئەم مۆدێلە زۆر جوان بوو و ژنەکان جلەکانی خۆیان بە شێوەیەک دووریبوو کە سەرنج راکێش بوو. هەروەها



ئەو ژنانەی لەو میوانداریيە بوون دەوری چاویان سەوز کردبوو و رەنگی سووری جەرگیان لە گۆناو لە لێویان دابوو.

(هورم هەب) منی بردە لای فیرعەون و سەیرم کرد (ئەخناتوون) کە من بە منداڵم دەزانی گەورە ببوو و وەکو پیاوی لێ هاتبوو، بەڵام دەموچاوی لەڕولاواز بوو و چاوی ئەدرەوشایەوە.

(ئەخناتوون) کراسێکی کەتانی لەبەردابوو کە پێیان دەگوت کەتانی پاشایەتی و کاتێک کەمنی بینی گوتی: سینۆهە من ئەوکاتەی جێ نشین بووم تۆم بینیوە و ئەمڕۆ هورم هەب لە بارەی زانستی تۆوە گفتوگۆی لەگەڵ من کرد و گوتی: کە لەمیسرو وڵاتانی تر فێری هونەری پزیشکی بوویتە. دوایی باسی چۆنیەتیی باری تەندروستیی خۆی کرد و گوتی: ماوەیەکە سەرم ژان دەکات و هەرکاتێک یەکێک لەبارەی شتێکەوە دەدوێت کە پێچەوانەی حەزی من بێت سەرم ژان دەکات و بە جۆرێک ئازارم دەدات کە نەدەتوانم خواردن بخۆم و نەدەنووم پزیشکەکان ژانە سەرەکەی من بە دەرمانی سڕکەر (مخدر) هێور دەکەنەوە، بەڵام لەم دەرمانانە بێزارم، چونکە دەزانم کە دەرمانی هێور کەرەوە هۆشیاریی مرۆڤ پەرت و بڵاو دەکات و ناهێڵێت بە ئاسوودەیی بیر لە خوایەکەم بکەمەوە ... سینۆهە ... ئایا تۆ ئاتوون دەناسی.

ئەو پرسیارەی فیرعەون لە منی کرد پرسیارێکی ترسناک بوو و دەبوایە بە وریاییەوە وەڵامم بدایەتەوە و پێم گوت بەڵێ ئاتوون دەناسم. فیرعەون گوتی: چۆن دەیناسی. گوتم: دەزانم ئاتوون شتێکە گەورەتر و بەرزتر لە زانستی من و زانینی هەموو تاکەکانی مرۆڤ.

فیرعەون لەم وەڵامە خۆشحاڵ بوو و گوتی: سینۆهە ئەو وەڵامەی تۆ داتەوە لەو وەڵامانەی کە خەڵکی تر بەمنیان داوەتەوە باشترە ئێستا پێم بڵێ کە ئایا دەتوانی بە هۆی قلێشاندنی کاسەی سەر چاکم بکەیتەوە.

گوتم: (ئەخناتوون) چارەسەری ژانە سەرەکەی تۆ پێویستی بە قلێشاندن

نییە، چونکە پزیشک دەتوانێت بە شێوەیەکی تر چارەسەری تۆ بکات و قڵیشاندنی سەر چارەسەرێکە، کە پزیشکەکان بەکاری ناهێنن مەگەر ئەوکاتەی کە هیچ ڕێگایەکی تر بۆ چاک بوونەوە نەبێت. فیرعەون گوتی: هورم هەب ستایشی تۆی زۆر کردووە و منیش ئەوەندە لە وەڵامەکەت، لەبارەی ئاتوونەوە ڕازیم، کە حەز دەکەم پلەو پایەیەکت بدەمێ و خۆت دەزانی کە سەر قڵیشێنی پاشایەتی، کە پیر ببوو مردووە و جێگاکەی چۆڵە و من تاوەکو ئێستا کەسم لە جیاتیی دانەناوە بەڵام تۆ لەمەودوا دەبیتە سەر قڵیشێنی پاشایەتی و لە ڕۆژی ئەستێرەی سەگەوە لە سوودەکانی ئەم پلەو پایەیە کەڵک وەردەگری و فەرمان دەدەم کە لە خانەی ژیان بەو پلەیە بتناسن[٢].

لە دوای ئەم وتەیە هورم هەب منی لە فیرعەون جیاکردەوەو ئێمە بۆ نان خواردن بەرەو تەلارێکی تر چووین و هورم هەب گوتی: جێگای سەر قڵیشێنی پاشایەتی لەلای ڕاستی فیرعەون و بنەماڵەی پاشایەتییە و من و هورم هەب هەردووکمان لەوێ دانیشتین.

لە کاتی نان خواردن روانیم فیرعەون نەگۆشتی مراوی و قاز دەخوات و نەگۆشتی مەڕو مانگاو ماسی، بەڵکو نانێکی کەرت کرد و دەستی بە خواردنی کردو لە جیاتی شەراب ئاویان بۆ خستە ناو پەیمانەکەیەوە و نۆشی و لە دوای ئەوەی تێر بوو رووی کردە ئامادە بووان و گوتی: بەگەلی میسر بڵێن خواردنی فیرعەون (ئەخناتوون)، حەقیقەت و ئاشتی و نان و ئاوە و خواردنەکەی لەگەڵ خواردنی هەژارترین بەندەکانیش جیاوازیی نییە. بەڵام لە دوای ئەو شەوە بۆم دەرکەوت (چونکە خۆم بینیم) کە فیرعەون گۆشتی مراوی و قازو مەڕو مانگاش دەخوات و شەرابیش دەنۆشێتەوە، بەڵام لە چونیەتیی نان خواردنەکەی بەرنامەیەکی ڕێک و پێکی نەبوو و هەندێ کات حەزی دەکرد نان و ئاو بخوات و هەندێ کاتیش نانی هەر نەدەخوارد.

میوانەکان لە دوای نان خواردن چوونە ژوورێکی ترەوە و لەوێ بینیم



پیاوێکی قەڵەو لێم نزیک بۆوەوەو من سەرەتا نەمناسییەوە، بەڵام کاتێک کە روانیمە چاوەکانی زانیم، توتمس-ی هاوڕێ دێرینەکەی خۆمە. لە ناسینەوەی زۆر خۆشحاڵ بووم و لە ئامێزم گرت و ماچم کردو گوتم: توتمس بۆ بینینی تۆ چوومە مەیخانەکەی کە جاران لەوێ بەیەکەوە دادەنیشتین، بەڵام پێیان گوتم: کە تۆ هیچکە بۆ ئەو مەیخانەیە ناڕۆیت.

(توتمس) پێکەنی و گوتی: ئاخر من بوومەتە پەیکەر تاشی پاشایەتی و پلەو پایەکەم ڕێگا نادات بۆ ئەو جێگایە بڕۆم، سەرەڕای ئەوەش هەندێ هاوڕێم پەیاکردووە کە بەردەوام بۆ خواردنی بەتام و لەزەت و خواردنەوە، بانگهێشتم دەکەن بۆ ماڵەکانیان و پێویست ناکات بۆ خواردنەوە بچم بۆ ئەو مەیخانەیە.

گوتم: توتمس لەبەر ئەوەی تۆ پەیکەرتاشی پاشایەتیی، دیارە پەیکەرەکانی فیرعەون کە لەسەر ئەستوونەکانی پەرستگای نوێی ئاتوون دروست کراوە تۆ، ڕەنگڕێژیت کردووە.

توتمس گوتی: ئێمە چەند پەیکەرتاشێکین کە بەیەکەوە کاردەکەین و لە هونەری ڕاستەقینە بەو شێوەیەی کە لە (کریت) سەرنجی خەڵکی رادەکێشێت، ئیلهام وەردەگرین و ئەوکاتەی کە خوای درۆیینی ئامون بەسەر میسردا فەرمانڕەوایی دەکرد ئێمە ناچار بووین بنچینەکانی هونەر بخەینە ژێر پێمانەوە و لە دروستکردنی بتەکان و شێوە کێشان، پەیڕەوی لە یاساکانی خوای درۆیین بکەین و ئەگەر کەمێک لەو شێوەیە لامان بدایە، کاهینەکانی ئەو خوایە درۆزنە ئێمەیان بەکافر دەزانی و دەیان کوشتین. ئەوان دەیانگوت هەر جۆرە هونەرێک کە پێچەوانەی یاساکانی خوا (ئامون) بێت کوفرە و هەر هونەرمەندێک شێوەیەکی ڕەنگڕێژی بکردایە یان پەیکەرێکی دروست بکردایە کە وەک شێوەی هونەریی ئامون نەبوایە، شایانی کوشتن دەبوو و ئێمە، هونەرمەندانی ڕاستەقینە و دڵسۆز کە لە هونەردا باوەڕمان بە ئازادی هەبوو، لە بەر ئەوەی نەماندەتوانی خۆمان بکەینە هاوڕەنگی دەوروبەر و لە نەفامێتیی شوێن

کەوتوانی خوای پێشوو پەیڕەوی بکەین، تووشی برسێتی دەبووین و ئاوی جۆمان دەخواردەوە و هەندێ کات تەنانەت ئاوی جۆشمان دەست نەدەکەوت، بەڵام ئەمڕۆ ئازادین و دەتوانین بە ئازادی خەریکی هونەرەکەی خۆمان بین و هەر چییەکمان بوویت دروستی بکەین.

من (توتمس)م بەهورم هەب ناساند و پێم گوت ئەم پیاوەی دەیبینی هونەرمەندێکی بێ هاوتایە و فیرعەون لەبەر ئەوەی بایەخی ئەو دەزانێت کردوویەتی بە پەیکەرتاشی پاشایەتی.

هورم هەب بە بینینی پەیکەرتاشی پاشایەتی خۆشحاڵ بوو، بەڵام بەبۆنەی پلەو پایەکەی زۆر خۆشحاڵییەکەی خۆی دەرنەبڕی، بەڵام توتمس کاتێک شێوە و ئەندامەکانی لەشی (هۆرم هەب)ی بینی پێی گوت: من زۆر حەزدەکەم پەیکەری تۆ دروست بکەم و لە پەرستگای ئاتوون دایبنێم، چونکە تۆ رزگارکەری ئاتوون و رووخێنەری خوای درۆیینی ئاموونی و شایستەی ئەوەی کە پەیکەرەکەت لە پەرستگای نوێ دابنرێت.

هورم هەب بە شێوەیەک لەم وتەیەی دڵخۆش بوو کە دەموچاوی لە خۆشیا گیرسایەوە و من هەستم کرد کە هۆی شادییەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە تا ئەو رۆژە هیچ کەسێک وێنەی ئەوی نەکێشا بوو و پەیکەریان بۆ نەتاشیبوو و توتمس یەکەمین جار بوو دەیەویست پەیکەری ئەو لە بەرد بتاشێت.

لەو کاتەدا کە ئێمە لە بارەی پەیکەری (هورم هەب) گفتوگۆمان دەکرد بینیم (هورم هەب) لەناکاودا هەڵساو دەستەکانی بە ئەژنۆیەوە ناو داچەمییەوە. ئێمە سەرنجمان دایە ئەو جێگایەی کە (هورم هەب) سەری بۆی دانەواندبوو و روانیمان (نەفرتیتی) شاژنی میسر کە هاوسەری (ئەخناتوون)ە بەرەو ئێمە دێت. بۆیە ئێمەش هەڵساین و بەرامبەری داچەمیینەوە.

(نەفرتیتی) مۆدێلی نوێی جل و بەرگی خانمەکانی کۆشکی لەبەر کرد بوو و کاتێک گەیشتە ئێمە، دەستی خستە سەر سینەی و سەیرم کرد ئەنگوستیلە و



بازنگی لەدەست دا نییە، چونکە نەیدەویست بەهۆی بازنگ و ئەنگوستیلە، جوانییەکەی خۆی لەناو ببات.

شاژن رووی کردە من و گوتی: سینۆهە دەستەکانم بۆ پەروەردە کردنی منداڵێکی کوڕ بێ سەبری دەکەن چونکە فیرعەون کوڕێکی دەوێت کە لە دوای ئەو لەسەر تەختی پاشایەتی میسر دابنیشێت و هەردووکمان بە بۆنەی ئەوەی کوڕم نەبووە نیگەرانین و لە خوایە درۆزنەکەی ئاموون کە سەرنگوممان کردووە دەترسێین و دەزانین کە لە کەمینی ئێمە دایە. من دوو کچم بووە، بەڵام تاوەکو ئێستا کوڕم نەبووە و لەبەر ئەوەی بیستم کە تۆ پزیشکێکی گەورەی و لە ولاتانی دەرەوە زانیاریی فراوانت کۆکردۆتەوە، پێم بڵێ کە چ کاتێک کوڕم دەبێت.

من هەوڵم دا جوانییەکەی فەرامۆش بکەم و بە چاوی پزیشکێکەوە بڕوانمە (نەفرتیتی)و پێم گوت: ئەی ژنی فیرعەون باشتر وایە کە تۆ لە ئارەزووی لە دایک بوونی کوڕدا نەبیت چونکە بەشی دواوەی ئەندامەکانی لەشی تۆ باریکەو ئەو ژنانەی بەشی دواوەی لەشیان پانایی کەم بێت، هەرکاتێک کوڕیان ببێت لەوانەیە لە کاتی منداڵ بووندا بمرن.

شاژن گوتی: هەرچۆنێک بێت من حەزم لە کوڕە و تۆ دەبێ چارەسەرێک بدۆزییەوە کەمن کوڕم ببێت. گوتم: ئەی (نەفرتیتی) هیچ کەسێک جگە لە ئاتوون ناتوانێت دەست نیشانی نێرو مێ بوونی ئەو منداڵە بکات کە لە سکی دایکیدایەو من لە ولاتانی تر هەندێ پزیشکم بینی کە دەیانوت دەتوانن وابکەن کە ژن کوڕ، یان کچی ببێت. بەڵام زۆربەیان درۆیان دەکرد و هەرکاتێک کە درۆکەیان دەردەکەوت، ژنە زاوەکەیان تاوانبار دەکرد کە بەپێی فەرمانی ئەوان کاری نەکردووە و ئەوان دەیانزانی کە ئەو فەرمانانەی دەیاندەنێ ئەوەندە ورد و گرانە کە ژنەکان ناچاردەبن هەندێ لەو فەرمانانە پێشێل بکەن و ئەمەیان دەکردە بەهانە بۆ ئەوەی نەزانیی خۆیان داپۆشن، بەڵام من درۆت لەگەڵدا ناکەم و دان

بەوەدا دەنێم کە ناتوانم دەرمانێکت بدەمێ کە بە هۆیەوە کوڕت ببێ.

ئەگەر چی لەبەر ئەوەی تۆ دوو کچت بووە، دوور نییە منداڵی سێیەمت کوڕبێت، بەڵام لەم بارەیەشەوە بەڵێنی تەواوت نادەمێ. (نەفەر تیتی) کە بەزەردەخەنەوە گوێی لە قسەکانی من گرتبوو، لە دوای ئەوەی وتەکانم تەواو بوو مەلوول بوو و تێگەیشتم کە قسەکانی من دڵگرانی کردبوو. توتمس کاتێک کە بینی شاژن نارەحەت بوو، هاتە ناو گفتوگۆکەمانەوە و گوتی: ئەی (نەفرتیتی) تۆ بۆچی لە بوونی کچ دڵگران دەبیت. تۆ جوانترین ژنی جیهانی و هەر ئەوە باشترە کە بەردەوام کچت ببێت، بۆ ئەوەی کچەکانت وەکو تۆ جوان بن و جوانییەکەتان جیهان رووناک بکاتەوە. من کچە گەورەکەی تۆم بینیوە و دەزانم کە چەند جوانە و ئەمڕۆ هەموو ژنەکانی دەربار (کۆشک) هەوڵ دەدەن بە جۆرێک ئارایش بکەن کە وەک ئەویان لێ بێت و من زۆر حەزدەکەم کە پەیکەرێکی تۆ دروست بکەم بۆ ئەوەی هەزاران ساڵ دوای مردنی تۆ، خەڵکی جوانییەکەت ببینن و پیایا هەڵبدەن و ناوی (نەفرتیتی) هەمیشە لە جیهاندا ناوی جوانی بێت[٣].

(نەفرتیتی) زەردە خەنەیەکی هات و دیاربوو لە قسەکانی پەیکەرتاشی پاشایەتی دڵخۆش ببوو و دوایی لە ئێمە دوورکەوتەوە.

رۆژی دواتر من، مەریتم لە (کلکی تیمساح) هێنایە دەرەوە و لەگەڵ خۆمدا بردم بۆ ئەوەی دیمەنی رۆیشتنی فیرعەون بۆ پەرستگای نوێ ببینێت. (مەریت) کراسی مۆدێلی نوێی خانمەکانی لە بەرکردبوو و ئەگەر چی بەخزمەتکارێکی مەیخانە لە قەڵەم دەدرا، بەڵام کاتێک کە لەگەڵ ئەودا لە مەیخانە هاتینە دەرەوە و لە شەقامەکانی **تەبەس** هەنگاومان دەنا، شەرم دای نەگرتم، چونکە مەریت جوان و سەنگین بوو و بەیەکەوە بەرەو پەرستگای تازە رۆیشتین و لەبەردەم پەرستگاکە لە جێگایەک کە تایبەت بوو بە نزیکانی فیرعەون دانیشتین و مەریت دەستی خستە سەر شانم و سەرگەرمی تەماشا کردنی قەرەباڵغییەکە بوو



وا هەست دەکەم کە لەو رۆژەدا هەموو دانیشتووانی **تەبەس** لە بەردەم پەرستگاو لەو شەقامانەی کە شوێنی تێپەڕ بوونی فیرعەون بوو، ئامادەببوون و لەهەر دوولای شەقامی قۆچەکان (بەبۆنەی ئەو پەیکەرانەی کە سەریان وەک قۆچ بوو، ئەو شەقامەیان بە شەقامی قۆچەکان، ناو نابوو)، دەفری پڕ لە گوڵیان دانابوو بۆ ئەوەی کاتێک کە فیرعەون هات، خەڵکی گوڵبارانی رێگاکەی بکەن.

لە پاش ئەوەی من و مەریت لەسەر جێگای خۆمان دانیشتین سەرنجم دا بارودۆخێکی نائاسایی رووی داو لە دوای ئەوەی ورد بوومەوە بۆم دەرکەوت بارە نائاساییەکە دەگەڕێتەوە بۆ بێ دەنگ بوونی خەڵکی.

کاتێک کۆمەڵێ هەژار لە گەڕەکێکدا کۆ دەبنەوە، لەبەر ئەوەی هەموویان قسە دەکەن دەنگە دەنگێکی بەردەوامیان لێ دەبیسترێ، بەڵام ئەو رۆژە لەو جێگایە کەس قسەی نەدەکردو بە شێوەیەک بێ دەنگی ئەوێی داگرت کە مرۆڤی نارەحەت دەکردو تەنها دەنگی قەلەڕەشەکان و واشەکان دەهاتە گوێ کە لە ئاسماندا دەفڕین، چونکە بە رادەیەک لەو لاشانەی کە لە **تەبەس**-دا کەوتبوون تێر ببوون، کە نەیاندەویست لەوێ برۆن.

کاتێک کە فیرعەون بە سواری کەژاوە هات، روانیم کۆمەڵێ سەربازی رەش پێست، کە دەموچاویان رەنگ کردبوو لە دوای کەژاوەکەی ئەو بوون. دانانی سەربازە رەشەکان وەکو پاسەوانانی فیرعەون، لەو رۆژەدا هەڵەیەکی گەورە بوو، چونکە لەنێوان تەماشاچییەکان کەس نەبوو کە لە مەرگەساتی کوشتار و تاڵانی **تەبەس**، لە سەربازە رەش پێستەکان زیانی پێ نەگەیشتبێ. هێشتا فرمێسکی چاوی ژنەکان وشک نەبووبۆوە و برینی پیاوەکان سارێژ نەببوو و زۆربەی خەڵکی خانوویان نەبوو و رەش پێستەکان ماڵەکانی ئەوانیان سووتاندبوو.

لەو رۆژەدا فیرعەون تاجی دوو قاتی بەسەرەوە بوو و بەپێی نەریتی دێرین دەستەکانی تێک هەڵکێش بە سینگییەوە نابوو و لە دەستێکیدا گۆچان و لە دەستەکەی تری قامچی دەبینرا کە نیشانەی پاشایەتی و دەسەڵات بوو.

فیرعەون وەکو بت بوو و نەدەجوولایەوە، چونکە لە بۆنە رەسمییەکاندا کە فیرعەون بە ناوەڕاستی خەڵکیدا تێدەپەڕێت، نابێت بجوولێتەوە.

سەربازەکان کاتێک کە فیرعەونیان بینی نێزەکانیان بەرز کردەوە و هاواری خۆشییان کردو دەرباریەکان و دەوڵەمەندەکانیش وەکو سەربازەکان دەنگیان بەرز کردەوە، بەڵام ئەم هاوارەیان لە نێوان بێ دەنگی و ساردیی خەڵکی، وەکو دەنگی مێشێک وابوو کە لە رۆژێکی زستاندا گیزە گیز بکات. ئەوانەی هاواری شادییان دەکرد کاتێک کەتێگەیشتن خەڵکی بێ دەنگییەکەی خۆیان نەشکاندووە، شەرمەزاربوون و دەمیان داخست.

لەو کاتەدا (ئەخناتوون) فیرعەونی میسر بە پێچەوانەی رێ و رەسمی دێرین کە دەبوایە فیرعەون وەکو بت بێ بزوێن بێت، دەستی لەسەر سینگی هەڵگرت و گۆچان و قامچییەکەی جووڵاند بۆ ئەوەی سڵاو لە خەڵکی بکات.

لە ناکاو خەڵکەکە هاتنە لەرزەو دەنگێک وەک دەنگی تۆفان لە حەشاماتەکە بەرزبووەوە و هاواریان کرد (ئاموون مان دەوێت) ... (ئاموون خوای ئێمەیە) ... (ئاموون پاشای خوایەکانە).

دەنگی خەڵکی بەرادەیەک بەرزبووەوە کە دەتگوت هەموو خشت و بەردەکانی **تەبەس** لەگەڵیاندا هاوار دەکەن و جەماوەرەکە بەدەنگی بەرز دەیانوت (ئاموونمان دەوێت) ... ئەی فیرعەونی درۆزن ... بۆ خوایەکەمانت سەرنگون کرد.

هەڵگرەکانی کەژاوەکە بەرادەیەک لەم دەنگانە ترسان کە یەکسەر وەستان، بەڵام ئەفسەرەکان نەیانهێشت و کەژاوەکە بەرەو دەرگای پەرستگەی نوێ کەوتەڕێ. لەو کاتە خەڵکی بە نەعرەتەی ترسناکتر لە نەڕەی شێر کەوتنەڕێ و رێگایان لە کەژاوەکەی فیرعەون گرت و دوایی بارودۆخەکە بەشێوەیەک ئاڵۆز بوو کە نەدەزانرا چ کەسانێ لە چ جێگایەکدا دەجەنگان و تا ئەوشوێنەی چاوم بڕی دەکرد و دەمتوانی ببینم، لە نێوان خەڵکی و سەربازەکاندا شەڕێک دەستی پێ کرد کە زۆر بێ بەزەییانە بوو.



سەربازەکان بە نەیزەو شمشێر، ژن و پیاویان دەکوشت و خەڵکی بەکێرد و دارو بەرد کەوتنە گیانی سەربازە رەش و سپییەکان و هەرکە سەربازێکیان دەکەوتە بەردەست یەکسەر دەیانکوشت، بەڵام کەس بەردی بۆ فیرعەون نەدەهاوێشت. چونکە فیرعەون وەکو باوو باپیرانی خۆی لە خۆرەوە هاتبوو و تەنانەت کەس نەیدەوێرا بیر لەوە بکاتەوە کە بەردیش لە فیرعەون بگرێت.

بینیم فیرعەون لە ناو کەژاوەکەیدا هەڵساو بەبێ رەچاوکردنی کەسایەتی و شکۆمەندییەکەی بە دەنگی بەرز بە سەربازەکانی گوت دەست هەڵگرن خەڵکی قەتلوعام مەکەن، بەڵام سەربازەکان بە شێوەیەک سەرقاڵی جەنگ و خوێن رشتن بوون کە گوێیان لە دەنگی فیرعەون نەبوو. فیرعەون کە دەیزانی هیچ مەترسییەک هەڕەشە لەو ناکات، چونکە دەیزانی کەس بەرامبەر بەئەو نیازی خراپی نییە، بەبێ مەترسی دیمەنی شەڕی نێوان خەڵکی و سەربازەکانی دەبینی.

یەک چرکەش هاواری (ئاموونمان دەوێت)، نەدەوەستا و خەڵکی ئەوەندە تووڕەیی دایگرتن، کە بەرەو جێگای نزیکان و هاوڕێکانی فیرعەون واتە ئەو شوێنەی ئێمە لێی دانیشتبووین، هەڵمەتیان هێناو ویستیان ئێمە بکوژن.

(هورم هەب) کاتێک کە بینیی گیانی هەموو دەرباریەکان کە ژمارەیەکی زۆریان ژن بوون، لەمەترسیدایە، فەرمانی دا نەفیر لێ بدەن و لە دوای ئەوەی دەنگی نەفیرەکان بەرز بووەوە ئەو گالیسکانەی کە لە کۆڵانەکانی تەنیشتەوە دانرابوون کەوتنەڕێ. هورم هەب لەبەر دووربینی گالیسکە جەنگییەکانی لە کۆڵانەکانی دەوروبەر دانابوو، بۆ ئەوەی هەستی خەڵکی بەبینینیان نەبزوێت و هەروەها بۆ ئەوەش کە لەکاتی تێکرژاندا بتوانێت ئاسایش بەرقەرار بکات.

پێشەوەی گالیسکەکان لە مەیدانی جەنگدا پەیکان و داسی پێوە دەکرا، بەڵام لەو رۆژەدا ئەو گالیسکانە هیچی پێوە نەبوو و هورم هەب گوتبووی لێی بکەنەوە بۆ ئەوەی خەڵکی نەکوژرێت.

گالیسکەکان بەرۆیشتنێکی خێراو رێکوپێک هاتن و جێگاکەی ئێمەیان

دەورەداو هەندێکیان لە دەوری کەژاوەکەی فیرعەون وەستان. خەڵکی ویستیان بەرگری بکەن، بەڵام زانییان کە لە ژێر گالیسکەکاندا پان دەبنەوە. بۆیە ڕێگایان کردەوە و کەژاوەکەی فیرعەون کەوتەڕێ، بەڵام فیرعەون نەچووە ناو پەرستگاکەوە، بەڵکو لەوێ تێپەڕبوو و گەیشتە نیل و لە کەژاوەکەی هاتە خوارەوە و سواری کەشتیی پاشایەتی بوو و لە کاتێکدا کە کەشتییە جەنگییەکان پاسەوانییان لێ دەکرد لەوێ دوور کەوتەوە.

خەڵکی کە بینییان فیرعەون نەیتوانیوە بۆ پەرستگای خوای نوێ بڕوات و بە سواری کەشتییەکەیەوە لەبەر چاو ون بوو، هاواری خۆشییان بەرز بووەوەو تاڵانچییەکان پەلاماری ماڵە دەوڵەمەندەکانیان داو دەستیان بەتاڵانی کرد و بە زۆر دەست درێژییان کردە سەر ژنە جوانەکانیان. بە جۆرێک کە (هورم هەب) ناچار بووەوە جارێکی تر لەگەڵ سەربازەکانی خۆیدا لە تەبەس بکەوێتەڕێ و لە هەر گەڕەکێکدا چەند (جەللاد)ێک دابنێت بۆ ئەوەی هەر کەسێکیان لە کاتی کوشتن وتاڵانیدا ببینیایە بیانکوشتایە.

کاتی عەسر بەهۆی ئەو سەرانەی جەللادەکانی هورم هەب لێیان کردبۆوە، ئاسایش گەڕایەوە ناو شارو بەر لە ئاوابوونی خۆر قەلەڕەشەکان و واشەو داڵاشەکان لە ئاسمانەوە هاتنە خوار بۆ ئەوەی ئەو لاشانە بخۆن کە لە هەر گەڕەکێکدا و بەتایبەتی لە شەقامی قۆچەکان و لەبەردەم پەرستگای نوێدا کەوتبوون.

(ئەخناتوون) هەتا ئەو ڕۆژە خۆڕاگریی ڕاستەقینەی خەڵکیی بە چاوی خۆی نەبینیبوو و چاوی بەخوێن ڕێژی نەکەوتبوو و لە دوای بینینی خوێن ڕێژییەکەی ئەو ڕۆژە، فیرعەون بەتەواوی رقی لە دانیشتووانی تەبەس هەڵسا، کە بەو شێوەیە بەرامبەر بە خوایەکەی ئەو بەرگرییان دەکرد و فەرمانی دا هەرکەسێک ناوی ئاموون بهێنێت یان شێوەی ئاموون لە سەر قاپ و قاچاغی ماڵەکەی ببینرێ، لە **تەبەس** دوور بخرێتەوە و بۆ کاری زۆرەملێ بینێرنە کانگەکان. بەڵام



خەڵکی قسەیان نەدەکر و هیچ کەسێ خەبەری لە یەکێکی تر نەدەدا.

فیرعەون ڕۆژی دواتر پرسیاری کرد چەند کەسی شوێنکەوتووی ئاموون دوور خراونەتەوە و پیاوەکانی گوتیان کەس دوور نەخراوەتەوە، چونکە کەس ناوی ئاموون ناهێنێت. فیرعەون گوتی: ئەی ئەمانەی دوێنێ هاواریان دەکرد (ئاموون) مان دەوێت کێن؟ ئایا ئەوان دەسگیرناکەن و بۆ کانگەکانیان نانێرن؟ ئەوانیش دەیانگوت دوێنێ ژمارەی خەڵکی ئەوەندە زۆر بوو کە نەمانتوانی بیانناسینەوە و نازانین چ کەسانێک خوایە درۆیینەکەیان دەویست.

لەو کاتەدا، فیرعەون لەبەر ئەوەی زۆر تووڕە ببوو فەرمانێکی دەرکرد کە زۆر جێگەی داخ بوو، چونکە بڕیاری دا هەرکەسێک یەکێک لە شوێنکەوتووەکانی خوای ئاموون ئاشکرا بکات مافی ئەوەی هەیە کە دەست بەسەر داراییەکەیدا بگرێت، لەگەڵ ئەوەشدا خەڵکانی ڕەوشت بەرز ئامادە نەبوون کە شوێنکەوتووەکانی ئاموون بە فەرمانبەرەکانی میری نیشان بدەن. بەڵام کۆمەڵێ دزو چەتەو هەندێ لە بەندەکان بۆ ئەوەی دەست بەسەر ماڵ و حاڵی خەڵکیدا بگرن خەڵکانێکیان بە تۆمەتی ئەوەی باوەڕیان بە(ئاموون)ە، دەست نیشان کرد و فەرمانبەرەکانیش یەکسەر ئەو خەڵکانەیان بۆ کارکردنی زۆرە ملێ دەنارده کانگەکان و دزو بەندەکان دەستیان بەسەر ماڵەکانیاندا دەگرت.

لە کاتێکدا کە ئەم ستەمکارییە لە **تەبەس** بەردەوام بوو، لە شەوی سێیەمی دوای ڕووداوی نزیک پەرستگا نوێیەکە، لە کاتێکدا کە لە ماڵەوە نووستبووم، لە کۆشکی فیرعەونەوە کەژاوەیەکیان بۆ ناردم و داوایان لێ کردم بڕۆم بۆ کۆشک. کاتێک کە چوومە ناو کۆشکەوە زانیم فیرعەون گرفتاری ئەو نەخۆشییە بووە کە جار بەجار تووشی دەبێت و هەندێ لە پزیشکەکانیش کە لە خانەی ژیانەوە هاتبوون لەوێ بوون.

بۆم دەرکەوت کە پزیشکەکان دەترسان چارەسەری فیرعەون بکەن و ناردبوویان بە شوێن مندا، بۆ ئەوەی منیش شەریکی چارەسەرکردنەکەبم و

بەرپرسێتیی چاک بوونەوەکەی بەسەر کەسانی زیاتردا، دابەش ببێت. جگە لەوەش لەبەر ئەوەی من ببووم بەسەر قڵیشێنی پاشایەتی، واتە پزیشکی فیرعەون، ئامادەبوونی منیان لەوێ بەپێویست زانیبوو.

لە فیرعەون نزیک بوومەوە و دەستم گرت و هەستم بە لێدانی دڵی کردو ڕوانیم لێدانی دڵی لاوازەو پەنجەکانی دەست و پێی (ئەخناتوون) ساردە، دوایی پێڵووی چاوەکانیم بەرز کردەوە، بەڵام ڕوانیم چاوەکانی ئاسەواری ژیانی تێدابوو و ئەدرەوشایەوەو نیشانەی ئەو کەسانەی لە کاتی سەرەمەرگدان لە چاوەکانیدا بەدی نەدەکرا. بە پزیشکەکانم گوت دەبێ کەمێک لە خوێنەکەی فیرعەون بڕژێت بۆ ئەوەی بێتەوە هۆش.

پزیشکەکانی خانەی ژیان گوتیان ئێمە ناتوانین بڕیار لەسەر ئەم جۆرە چارەسەرکردنە بدەین، چونکە فیرعەون ئەندامەکانی لەڕولاوازەو کەم خوێنە و ئەگەر خوێنەکەی بڕژێت، دەمرێت. گوتم: ئەگەر ئەم بێ هۆشییەی بەردەوام بێت دەیکوژێت، چونکە بەرەبەرە لێدانی دڵی لاوازتر دەبێت هەتا دەمرێت، بەڵام دەبێ بەشێوەیەک خوێنەکەی بڕێژین، کە لە دوای بە هۆش هاتنەوەی هەست بەوە نەکات کە خوێنی لێ دەرکراوە. ئەوان گوتیان ئایا بەرپرسێتیی ئەم کارە دەخەیتە ئەستۆی خۆت؟ گوتم: بەڵێ، چونکە دڵنیام بەردەوام بوونی ئەم بێ هۆشییەی مەترسیی هەیە.

پزیشکەکان گوتیان هەرچییەکت دەوێت بیکە. من دەرزییەکم لە جانتاکەم دەرکرد و خستمە ناو ئاگرەوە و لە دوای ئەوەی دەرم هێناو سارد بووەوە، دەرزییەکەم کرد بەرەگی دەستی فیرعەون و خوێن هاتە خوارەوە و چەند ساتێک دوای ئەوە فیرعەون دەمی کردەوەو هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشاو یەکسەر خوێنەکەیم ڕاگرت و دەستیم بەستەوەو ئەو دەفرەی خوێنەکەی تیابوو شاردمەوە. فیرعەون بە تەواوەتی هاتەوە هۆش و هەڵسایەوەو دانیشت و هەرکە پزیشکەکانی خانەی ژیانی بینی، هاتەوە یادی کە خانەی ژیان لە پەرستگای



(ئاموون)ەو بەبۆنەی ئەو نەفرەتەی کە لە ئاموونی هەبوو فەرمانی دا ئەو پزیشکانە لە کۆشک ببەنەدەرەوە.

لەپاش ئەوەی ئەوان ڕۆیشتن فیرعەون گوتی: سینۆهە برۆ کەشتییەکانی من ئاگادار بکەرەوە کە ئامادەبن و بەسەوڵ لێدەرەکان بڵێن کە من بەتەمای سەفەرم.

لێم پرسی بۆ کوێ دەڕۆیت. گوتی: من چیی تر لەم شارە ژیان نابەمەسەرو بەکەشتییەکانی خۆم بەرێ دەکەوم و ئەوەندە دەڕۆم تادەگەمە جێگایەک کە بۆ دروست کردنی شارێکی نوێ لە باربێت و لەوێ شارێکی نوێ دروست دەکەم و تیایدا نیشەجێ دەبم و ئیتر هەنگاو نانێمە ناو (**تەبەس**)ەوە، چونکە دانیشتووانی ئەم شارە شوێن کەوتووی خوای چەوت و درۆزنی (ئاموون)ن و ڕەفتاری ئەوانم لەبەردەم پەرستگای ئاتوون لە بیر ناچێت و دەڵنیام کە لە هیچ سەردەمێکدا باوو باپیرانی من لە میسر بەم جۆرە بەرە و ڕووی حەق نەناسی خەڵکی (**تەبەس**) نەبوونەتەوە.

بۆیە تۆ دەبێ بڕۆی و (هورم هەب) ئاگادار بکەیتەوە کە ئەمشەو بەکەشتی لە (**تەبەس**) دەڕۆین و هەر کەسێک کە منی خۆش دەوێت لەگەڵمدا دێت. (هورم هەب) لەو کاتەدا کە کەلوپەلی ڕۆیشتنی فیرعەونی ئامادە دەکرد پێمی گوت: سینۆهە، ئەوەها باشترە، چونکە هەم دانیشتووانی (**تەبەس**) بە ئارەزووی خۆیان دەگەن و داخوازییەکانیان دەهێننەدی و هەم فیرعەونیش ئەوەی دەیەوێت دەیکات بەبێ ئەوەی شەڕ دروست ببێتەوە.

(ئەخناتوون) بۆ دەرچوون لە **تەبەس** ئەوەندە بە پەلەبوو کە لەسەر بنەماڵەی پاشایەتی نەوەستاو گوتی: من دەڕۆم و ئەوان با لە دوواوە بێن و سواری کەشتییەکەی خۆی بوو و هۆرم هەبیش کۆمەڵێک لە کەشتییە جەنگییەکانی ڕاسپارد کە لەگەڵیدا بن و پارێزگاریی لێ بکەن. منیش لەگەڵ فیرعەوندا ڕۆیشتم و لە دڵیشمدا بەو ڕۆیشتنە ڕازی بووم چونکە دەمزانی کە ئاوو هەوا

گۆڕین بۆ ئەو بەسوودە.

ئێمە ڕوومان لە باکوور و پشتمان لە **تەبەس** کرد و بە ئاراستەی ڕۆیشتنی ئاوی نیل بەڕێ کەوتین. کاتێک کە ماوەیەک ڕۆیشتین و لە **تەبەس** دوور کەوتینەوە چارۆگە ئەرخەوانییەکانی کەشتیی فیرعەونیان هەڵکرد بۆ ئەوەی خێرایی کەشتییەکە زیاد بکات. ئەوەندەی پێ نەچوو کە دیوار و کۆشکەکان و ئەستوونە بەردییەکان (مەبەست ئەو ستوونانەیە کە بە ئەستوونی لەسەر زەوییەوە دایان دەناو لە سێبەرەکەی حیسابی کاتیان دەکرد) و سێ کێوەکەی (**تەبەس**) لەبەر چاو ون بوون. بەڵام یادگاریی پایتەختی میسر لەگەڵ ئێمەدا بوو، چونکە هەندێ جار تیمساحەکانی نیل لە ئاوەکەدا دەردەکەوتن و کلکە درێژ و بەهێزەکانیان دەجووڵاندەوە و دیاربوو خەریکی خواردنی ئەو لاشانە بوون کە ڕووباری نیل لە(**تەبەس**)ەوە دەیهێنا. هەندێ لەو لاشانە لەبەر ئەوەی بەسەر ئاوەکەوە بوون بۆگەن ببوون و بۆنە ناخۆشەکەی لە هەوادا بڵاو ببۆوەو لە هۆدەکەی فیرعەون کە لەناو کەشتییەکە بوو بووخوریان دەسووتاند بۆ ئەوەی ئەو بۆنە ناخۆشە نەمێنێت.

لە دوای دە ڕۆژ گەیشتینە جیگایەک کە ئیتر لاشەی لێ نەبوو و فیرعەون لە ژوورەکەی خۆی هاتەدەرەوە و لەسەر ڕووی کەشتییەکە ڕاوەستاو بەسەیرکردنی کەنارەکانی نیلەوە خەریک بوو. زەوی لە هەردوو لای ڕووبارەوە، زەرد ڕەنگ بوو و گوندنشینەکان بەروبوومی کێڵگەکانیان کۆدەکردەوە و بەرە و گوندیان دەبردەوە و مەڕومالاتیان بۆ ئاو خواردن دەهێنایە کەناری نیل و شوانەکان شمشاڵیان لێ دەدا.

کاتێک کە خەڵکی کەشتیی فیرعەونیان دەبینی لە ئاواییەکانی ئەم بەرو ئەو بەری نیلەوە لقی دار خورمایان بەدەستەوە دەگرت و بەراکردنەوە دەیانجووڵاندەوەو بە هاوار و دەنگی بەرزەوە شادییان دەردەبڕی.

فیرعەون لە خۆشیی بینینی ئەو خەڵکە شادو کەیف خۆشە پێ دەکەنی و



هەندێ جار فەرمانی دەدا کەشتییەکە بوەستێنن و دەچووە وشکانی و لەگەڵ لادێیەکاندا گفتوگۆی دەکرد و دەستی بۆ ژن و منداڵەکان ڕادەتەکاند. هەندێ جار لە کەناری نیل مەڕەکان لە فیرعەون نزیک دەبوونەوەو بۆنی دامێنی کراسەکەیان دەکرد یان دەیانلێستەوەو فیرعەون وەک منداڵ خۆشحاڵ دەبوو و پێ دەکەنی.

گۆڕانی باری تەندروستیی (ئەخناتوون)م پێ خۆش بوو بەڵام لە کردەوەیەکی ناڕازی بووم و ئەویش ئەوە بوو کە دەیگوت خوای ئەو (ئاتوون)، خۆرەو خۆی لەسەر کەشتییەکە دادەنیشت و دەموچاو و لەشی لەبەردەم خوایەکەی ڕادەگرت. ئەم خوایە (خۆر) لە هاوینەکانی میسردا مەترسیی هەبوو و گەرمای زۆر مرۆڤ تووشی نەخۆشی دەکات.

فیرعەونیش لەبەر ئەوەی زۆر لەبەردەم خۆر دادەنیشت تای لێ هات و چاوەکانی بریسکەی دەدایەوە، بەڵام شەوان وەزعی باشتر دەبوو و لەسەر ڕووی کەشتییەکە دادەنیشت و سەیری ئەستێرەکانی دەکردو بە منی گوت هەموو زەوییەکانی خوایەکەی پێشوو دابەش دەکەم بەسەر ئەو جووتیارانەی کە زەوییان نییەو ئەوان تا ئەمڕۆ بە کەم هەڵیان کردووەو هەژار بوونەو من وا دەکەم گەنمێکی زیاتر پەیا بکەن و مانگاو مەڕی زۆر بەخێو بکەن و ئەوەندە بخۆن، هەتا منداڵەکان و ژنەکانیان، قەڵەو و جوان بن و چییتر بەرامبەر بە یەکتری کینەیان نەبێت.

خوای من (ئاتوون) جیاوازی نێوان دەوڵەمەندو هەژار ناهێڵێت و کارێک دەکات کە ئیتر بەندەکان ناچار نەبن بۆ پەیدا کردنی خواردن هەموو تەمەنی خۆیان بۆ گەورەکانیان عارەق بڕێژن.

سینۆهە، من لەبەر ئەوە لە **تەبەس** دەرچووم، چونکە دەزانم (**تەبەس**) شارێکە کە لە نێوان هەژارەکان و دەوڵەمەندەکان جیاوازی زۆر هەیەو کۆمەڵێ زۆر لە خەڵکی هەژار، ناچارن بە کرێکاری و بەندەیی هەموو تەمەنی خۆیان بۆ

دەوڵەمەندەکان کار بکەن و هەمیشە هەر هەژارو برسی بن و هەرچەندە ماندوو دەبن سوودەکەی دەست دەوڵەمەندەکان دەکەوێت. من لە دانیشتووانی **تەبەس** کە خوایەکەی پێشوو دەپەرستن بێزارم چونکە ئەو خوایە درۆزنە خوازیاری بەدبەختی و برسێتیی هەژاران و بەهێز بوونی دەوڵەمەندەکانەو هەموو یاساکانی خۆی بەشێوەیەک داناوە کە دەوڵەمەندەکان ساڵ بە ساڵ زەنگینتر بن و هەژارەکان لە چارە رەشی و نەبوونیدا بمێننەوە. من دەزانم کە ناکرێت چاوەڕوانی ئەوە بین خەڵکی **تەبەس** دەست لە پەرستنی خوایەکەی پێشوویان هەڵبگرن، چونکە ئەوان بەهۆی باوەڕی خوایە کۆنەکەوە چێژیان لە دەوڵەمەندی و رابواردن وەرگرتووەو ئومێدی من تەنها بە منداڵەکان و گەنجەکانە، چونکە تەنها ئەوانن کە دەتوانن باوەڕ بە ئاتوون بهێنن و بەهاری ئایندەی میسر دروست بکەن. کاتێک کە منداڵ و گەنجەکان لە منداڵی و لاوێتییەوە فێری باوەڕ هێنان بە ئاتوون بوون، ئیتر ئامادەنین ئاموون بپەرستن و لە دوای گەورەبوون جگە لە ئاتوون کەسی تر ناناسن. بۆ ئەوەی ئەو منداڵانە باوەڕ بە ئاتوون بهێنن بە تەمام مامۆستاکانی پێشوو لە قوتابخانەکان دەربەکەم و لە جیاتی ئەوان مامۆستای نوێ بخەمەناو ئەو قوتابخانانەو هەروەها سوورم لە سەر گۆڕینی خەتی میسر، چونکە یەکێک لە هۆکارە کاریگەرەکانی جیاوازیی نێوان دەوڵەمەندو هەژار، ئەم خەتە میسرییەیە. من وا بیر دەکەمەوە کە ئێمە پێویست ناکات بۆ نووسین، شێوەی هەموو شتێک بکێشین. بەڵکو دەتوانین بەجۆرێکی تر ئەو شتەی دەمانەوێت بینووسین. خەتی میسریی ئەمڕۆ خەتێکی زۆر گرانەو چینی هەژارەکان ناتوانن چەند ساڵ بۆ فێر بوونی ئەم خەتە بخوێنن و تەنها دەوڵەمەندەکانن کە توانای خوێندنیان هەیەو لەبەر خوێندەواری پایەیان لە هەژارەکان بەرزترە، بەڵام کاتێک کە خەتەکە ئاسان بووەوە، هەموو دەتوانن بخوێنن و بنووسن و دوڵەمەندەکان چیی تر ناتوانن خوێندەوارییەکەیان بکەنە هۆکارێک بۆ بەرز نرخاندنی خۆیان بەرامبەر بە هەژاران.



لەم قسەیەی فیرعەون ترسام چونکە دەمزانی خەتی نوێ چۆنە و ئاگاداربووم کە ئەو نووسینە ئاسانە، بەڵام ناشیرینەو هەموو نووسەرەکان رقیان لێیەتی و بە فیرعەونم گوت ئەم کارە مەکەو خەتی میسر مەگۆڕە.

گوتی: بۆچی؟ گوتم: چونکە هەموو یاساکانی خوایە میسرییەکان بەم خەتە نووسراوەتەوەو ئەم جۆرە نووسینە پیرۆزە. فیرعەون گوتی: خەتی تازەش کاتێک کە کاری پێ کراو خەڵکی یاسای خوایەکانیان پێ نووسییەوە دەبێتە خەتێکی پیرۆز. گوتم: گۆڕینی خەتی میسر زیانێکی تریشی هەیە. گوتی: زیانەکە چییە؟ گوتم: ئەگەر فێربوونی خەت بە جۆرێک ئاسان ببێت کە هەموو کەسێک بتوانێت فێری خوێندەواری بێت، ئیتر کەس بەدەستەکانی خۆی ئیش ناکات و زەوییەکان بەبێ کشتوکاڵ دەمێننەوەو کانگەکان لە کاردەکەون و ئەوسا ئەم خەتە ئاسانە بۆ میللەتێک کە لە برسا دەمرێت چ سوودێکی هەیە؟

چاوەکانی فیرعەون لە دوای بیستنی ئەم قسەیە درەوشانەوەو گوتی: سینۆهە من لە **تەبەس** هاتمە دەرەوە بۆ ئەوەی لە دەست ئەو خەڵکەی کە لایەنگری رێ و رەسمی ئاموونن، رابکەم و ئێستا دەبینم یەکێک لە شوێن کەوتووەکانی ئەو رێبازە کۆنە لە تەک منەوەیە، سینۆهە تۆ راستییەکان نابینی، بەڵام من ئەوەندە بینام کە راستییەکان لە ئەودیو ساڵەکانی داهاتووەوە، وەک ئەوەی بڕوانمە ئاوی زوڵاڵ، دەبینم. کاتێک کە خەڵکی هەموو فێری خوێندەواری بوون، هەموو بەدەستەکانی خۆیان کار دەکەن و وەک کۆمەڵێ برا، کارە دەستییەکانی وەک کشتوکاڵ و کانزاکاری و پیشەسازی و بازرگانی لە نێوان خۆیاندا، بەش دەکەن.

لەو دنیایەی کە خوایەکەی من (ئاتوون) دروستی دەکات رق و کینە بەدی ناکرێت و لەو جیهانە کەس نان لە دەستی کەس وەرناگرێت بەڵکو هەموو کەسێک نانەکەی خۆی لەگەڵ ئەوی تردا دووکەرت دەکات. لەو جیهانەدا کە هەموو خوێندەوارو زانان، جیاوازیی نێوان هەژارو دەوڵەمەند لە ناو دەچێت و نە کەس هەژار دەبێت و نە کەسیش دەوڵەمەند دەبێت. چونکە کەس ناتوانێت بە

ناوی ئەوەی لەوەی تر بەرزترە یەکێک بکاتە کرێکار، یان کۆیلەی خۆی و کەس بەوەی تر نالێت برۆ ئەی سریانیی پۆخڵ. یان برۆ ئەی رەش پێستی بۆگەن، چونکە هەموو کەسێ خەڵکی تر بە برای خۆی دەزانێت و لەبەر ئەوەی چینی هەژار و زەنگین یەکسان دەبن و کەس کینە لە دڵ ناگرێت، شەڕ روونادات.

فیرعەون لە کاتی وتنی ئەم وشانە بەشێوەیەک جۆش و خرۆش گرتبووی کە ترسی دروست دەکردو من زانیم کە دیسانەوە تووشی گەشکەبووەو لە سەر حەسیرێک لە بان کەشتییەکە رامکشاندو دەرمانێکی هێور کەرەوەم دەرخواردی دا بۆ ئەوەی ئارام ببێتەوە. بەڵام لە دوای ئەوەی فیرعەون راکشاو ئارام بووەوە هەستم کرد کە ئەگەرچی (ئەخناتوون) هەندێ کات شێت دەبێ، بەڵام تێک چوونەکەی لەوانەیە کەسانی تریش تووش بکات و من کەوتبوومە ژێر کاریگەرێتیی قسەکانی ئەو، چونکە من گەلانێکی زۆرم بینیبوو و بۆم دەرکەوتبوو کە هەرچۆنێک بێت هەموو میللەتان وەکو یەکترن و زۆر شارم بینیبوو و دەمزانی کە شارەکانیش لە یەکتر دەچن و جیاوازیی نێوان بەرزی و نزمیی دیوارەکان و رەنگی باڵاخانەکان نابێتە هۆی لەیەک نەچوونی شارەکان.

من پزیشکم و لە دیدی پزیشک، نەخۆشی میسری و نەخۆشی سریانی و بیماری رەش پێست، یەک شتەو هیچ کامیان لەوەی تر چاکتر نین و ئەرکی پزیشک ئەوەیە هەر یەکێکیان چارەسەر بکات. لەبەر ئەوەی ئەمانەم دەزانی وتەکانی فیرعەون کاری لێم کردبوو و بەخۆمم دەوت ئەگەرچی ئەم پیاوە شێتەو، شێتییەکەی خەڵکی تریش تووش دەکات، بەڵام ئەم تێکچوونەی کاتێک کە تووشی مرۆڤێکی تر دەبێت دەبێتە هۆی چێژ وەرگرتنی.

لە ناخەوە هەستم دەکرد کە فیرعەون، راستییەکی گەورەی بەسەر دەمدا دێت و ئەگەرچی راستییەکەی ئەو دەیلێت لە دنیای سەر زەویدا پیادە نابێت و تەنها لە دنیای (مەغریب)[٤] جێبەجێ دەبێت، بەڵام دەبێ دان بەوەدا بنرێت کە ئەگەر جۆری مرۆڤ بتوانێت بەو شێوەیە بژێت و جیاوازییەکان لە ناو ببات دەگاتە



بەختەوەریی راستەقینە. دەمزانی کەبەر لە فیرعەون (ئەخناتوون)، هیچ کەسێک راستییەکی وەها گەورەو درەوشاوەی نەوتووەو لە دوای ئەویش کەس نایەت کە بتوانێت راستییەکی ئەوها بەرجەستە (زەق) دەرببڕێت.

تێگەیشتم کە لەبەر خۆ پەرستیی دەوڵەمەندەکان و نەزانیی هەژاران کەس ئامادەی سەلماندنی ئەو راستییانەی فیرعەون نییەو خوێنێکی زۆر دەڕژێت، (وەک چۆن لە تەبەس رووی دا)و لەوانەیە کە حکوومەتی گەورەی میسر لە ناو بچێت، بەڵام ئەوەی فیرعەون دەیگوت شتێکە کە کەس بەر لە ئەو نەیگوتووەو لە دوای ئەویش کەس نایلێت و ئەگەریش بگوترێت ئەوا چاویان لە (ئەخناتوون) کردووە. دوایی لە کاتێکدا کە سەیری ئەستێرەکانی ئاسمانم دەکرد بە خۆمم گوت سینۆهە، تۆ پیاوێکی کە خۆت نازانی لە کوێوە هاتووی و دایک و باوکت کێ بوونەو لە دوای ئەوەی گەورە بوویت، بیستت ژن و پیاوێک تۆیان کردووەتە کوڕی خۆیان، کە پیاوەکە پزیشکی هەژارانی **تەبەس** بوو و ژنەکەی ئەو تۆی لەسەر رووباری نیل لە ناو سەبەتەیەکدا گرتبۆوەو بە خێویان کردبووی. تا ئێستاش تۆ هەر پزیشکی هەژارانی **تەبەس** بوویتە و بەبێ تەماحی زێڕو پارە ئەوانت چارەسەر کردووە.

کەواتە ئەگەر راستییەکەی خوایە نوێیەکەی فیرعەون بڵاوتر ببێتەوە و جیاوازیی هەژارو دەوڵەمەند لە ناو بچێت، تۆ زیان ناکەیت و ئەگەر وابێت ئەی لەبەر چی لایەنگری لە حەقیقەتی خوایە نوێیەکەی فیرعەون ناکەیت و هانی (ئەخناتوون) نادەیت کە ئەم راستییە لە وڵاتی میسر بڵاو بکاتەوە. تۆ سینۆهە دەزانی ئەو کارەی کە فیرعەون دەیەوێت بیکات لە هیچ وڵاتێکدا جێبەجێ ناکرێت و لە هیچ شوێنێکدا ناتوانرێ جیاوازیی نێوان زەنگین و هەژار، گەورەو بەندەو خاوەن کارو کرێکار لە ناو ببرێت، بەڵام لەبەر ئەوەی میسر وڵاتێکی دەوڵەمەندەو خاوەن زەوی و زاری زۆر بەپیتە، لە وانەیە بتوانێت ببێت بە جێگای پیادەکردنی ئەم راستییە و هەر کاتێک ئەم حەقیقەتە لە میسر پیادە

بکرێت بێ گومان لێرەوە بۆ هەموو جیهان دەڕوات و لە هەموو شوێنێ جیاوازییەکان لە ناو دەچێت و ئەوکاتە ساڵێکی جیهانیی نوێ لە دنیادا دەست پێ دەکات[٥].

زانیم کە لە هیچ کاتێکدا دەرفەتی ئەوها بۆ مرۆڤ نارەخسێت کە بتوانێت خۆی بۆ هەمیشە بەختەوەر بکات، چونکە هەرگیز هیچ فیرعەونێک لایەنگری ئەم راستییە نییە کە جیاوازییەکانی نێوان چینەکان لەناو ببرێت و لەوانەیە لە داهاتوودا بەندەکان و کرێکارەکان، هەوڵی ئەوە بدەن کە ناچون یەکییەکان نەهێڵن، بەڵام کەس سەرنج ناداتە ویستی ئەوان و ئەگەریش گوێیان لێ رابگیردرێت، بۆیان جێ بەجێ ناکەن، چونکە دەوڵەمەندەکان هێزی کرێکارو بەندەکان لەناو دەبەن. بەڵام کاتێک کە فیرعەونی میسر بڵێت دەبێ جیاوازی لە نێوان هەژارو دەوڵەمەندا نەمێنێت، لەبەر ئەوەی گوتەکەی کار لە خەڵکی دەکات و دەسەڵاتی جەنگی و زێڕو پارەی هەیە، لەوانەیە گوتەکەی خۆی سەر بخات و ناچون یەکیی نێوان خەڵکی لەناو ببات و نابێت ئەم تاکە دەرفەتە لە دەست بدرێت، کە دەبێتە هۆی دابین کردنی بەختیاریی مرۆیی. چونکە مەحاڵە لەمەو بەدوا لە میسر یان لە سووریاو بابل پاشایەک فەرمانڕەوایی بکات کە خۆی هەوڵ بدات جیاوازی نەهێڵێت. لە تەنیشت کەشتییەکەوە وەستا بووم و چاوم لە ئەستێرەکانی ئاسمان بڕیبوو و بیرم دەکردەوەو ، لە کەنارەکانی نیلەوە بۆنی گەنمی پێگەیشتووی کێڵگەکانم دەکرد.

لە ناکاودا (کاپتا) ، کەوتەوە یادم کە ئێستا لە **تەبەس** خاوەنی مەیخانەی (کلکی تیمساح)ەو سەرمایەدارەو بیرم لەوە دەکردەوە کە ئەگەر لێرە بوایەو وتەکانی فیرعەونی ببیستایە چیی دەوت. ئەگەر چی کاپتا لەوێ نەبوو، بەڵام دەمزانی کە ئەو لە دوای بیستنی قسەکانی فیرعەون چی بەسەردەمدا دەهات. ئەو دەیوت سینۆهە، گریمان فیرعەون توانیتی جیاوازیی نێوان فەقیرو دەوڵەمەند لە ناو ببات و هەموو خەڵکی فێری خوێندەواری بوون و ئیتر نەگەورە ماو



نەبەندەو نەخاوەن کارو نەکرێکارو هەموو برایانە دەستیان بەکشتوکاڵ و پیشەسازی و بازرگانی کرد ... ئایا لە دوای ئەوە هەموو بەدبەختییەکانی مرۆڤ لە ناو دەچێت و ئیتر کەس بە دەسڕەنجی ئەوانەی تر دەوڵەمەند نابێت؟

لەو رۆژەدا دیسانەوە هەندێ خەڵکی زیرەک و دەستەیەکی تری نەفام پەیادەبن ... هەندێکیان فێڵبازن و ئەوانەی تر سادەن و ئەوانەی کە هۆشیارو فێڵبازن کیسەی نەفام و گەمژەکان بە تاڵ دەکەنەوە، یان بە پیلانی ژیرانە ئەوان ناچاردەکەن کە کاریان بۆ بکەن و بەردەوام وابووەو لەمەو بەدواش هەر وادەبێت، چونکە مرۆڤ ئەگەر پێی بکرێت یەکێکی تر هەڵبخەڵەتێنێ مەحاڵە کە دەست لە فریودانی هەڵبگرێت و کەسێک کە دەتوانێت زیان بگەیەنێتە خەڵکی تر، ئەم کارە دەکات و لە نێوان نەوەکانی مرۆڤدا ئەو کەسانە توانای زیان گەیاندن و ئازاردان و فریودانیان نییە، کەمردبێتن. تەنانەت ئەم فیرعەونەی تۆش کەدەیەوێت جیاوازییەکان بنبڕ بکات، بڕوانە چیی لە خەڵکی کردووە؟

لەم راستییە کە فیرعەون و خوایەکەی لایەنگری لێ دەکەن تائەمڕۆ تەنها چەند جۆرە گیانەوەرێک سوودیان لێ بینیوە، وەک قەلەڕەش و داڵاش و باڵندەو لاشە خۆرەکان و تیمساحەکانی نیل و خەڵکی جگە لە زەرەر هیچی تریان نەبینیوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کە دەمزانی ئەگەر کاپتای لێ بوایە، رەخنەی دەگرت،

لە رۆژی دوای ئەوە، کاتێک کە فیرعەون لە بارەی خوایەکەی خۆی و راستییەکەی لەگەڵ مندا گفتوگۆی دەکرد منیش بیرۆکەکەیم دەسەلماندو ئەویش خۆشحاڵ دەبوو. لەرۆژی پانزەیەم لە دوای دەرچوون لە **تەبەس** کەشتیی فیرعەون گەیشتە سەرزەمینێک کەهی هیچ خوایەک نەبووە. ئەو زەوییە لە کەنارەکانی نیل بوو و تەخت بوو و کەمێک دوورتر چەند گردێکی لێ بوو، بەڵام داری پێوەنەبوو. چەند شوانێک لەوێ، لە کەناری رووبارەوە خەریکی لەوەڕاندنی مەڕەکانیان بوون. فیرعەون لەوێ لە کەشتی دابەزی و ئەو زەوییەی خستە ژێر

دەسەڵاتی (ئاتوون)ەوەو وتی: لێرەدا شارێک دروست دەکەم و ناوی دەنێم (شاری ئاسۆی ئاتوون)[٦].

لە دوای کەشتییەکەی فیرعەونەوە ئەو کەشتییانەش کە لە دواوە بوون گەیشتنە کەنارو سەر نشینەکانی دابەزین. فیرعەون بیناسازەکانی خۆی بانگ کردو وتی: دەبێ لێرەدا شارێک دروست بکەن و هەر یەکێک لەوانەی کە لەگەڵیدا بوون پارچە زەوییەکی دا پێیان بۆ دروست کردنی خانوو. لەو شارەدا بەپێی نەخشەکەی (ئەخناتوون) دەبوایە پێنج شەقام لە باکوورەوە بەرەو باشوورو پێنجی تریش لە رۆژهەڵاتەوە بۆ رۆژئاوا دروست بکرێت.

لە هەر جێگایەک لە زەوییەکە خانوویەک دروست دەکرا کە هاوشێوەی خانووەکەی بەرامبەری بوو و بەپێی فەرمانی فیرعەون، بەرزی هیچ خانوویەک نەدەبوو لە خانووەکانی تر زیاتر بوایەو لەهەر ماڵێک ژمارەی ژوورەکان و جێگای چێشت لێ نانیان دەبووایە وەک یەک بووایە.

فیرعەون دەیەویست کە لەو شارەدا هەموو یەکسان بن و کەس خۆی بەزیاتر نەزانێت و سوپاسی (ئاتوون) بکەن کە ئەم یەکسانییەی بۆ ئەوان هێناوەتە کایەوە، بەڵام کاتێک کە شارەکە دروست دەکرا، بیستم کە هیچ یەکێک لەوانەی خەریکی دروست کردنی خانوون، سوپاسی (ئاتوون) ناکەن و بە پێچەوانەوە نەفرەتیان لە ئاتوون و فیرعەون دەکرد، کە بۆچی فیرعەون ئەوانی لە (**تەبەس**)ەوە بۆ شوێنێک هێناوە کە نەئاوەدانیی لێیەو نەمەیخانە.

هیچ ژنێک لەو خانووەی کە بۆ ژیانی خۆی و مێردەکەی دروست دەکرا، رازی نەبوو، چونکە ژنەکان دەیانەویست لەبەردەم ماڵەکانیاندا ئاگر بکەنەوەو چێشت لێ بنێن، لە کاتێکدا کە لەماڵەکانی شارە تازەکە، ئاگردان لە ناو خانووەکەدا دروست کرابوو.

ئەوانەی لە (**تەبەس**) لە ناو ئەو خانووانە دەنووستن کە بنی ژوورەکەیان لە دای (دای وشەیەکی فارسییەو بەمانای قوڕی کوتراو و رەقە) دروست کردبوو،



کاتێک کە بینییان لە شاری نوێ بنی هۆدەکان بەخشت فەرش دەکرێت نارەزاییان دەربڕی و گوتیان خشت بەهۆی بەسەرا رۆیشتن دەبێتە تەپ و تۆزو ئەرکی گرانە. هەروەها لە گڵە سوور (رۆس)ەکەی ئەو وڵاتە رازی نەبوون و دەیانوت ئەم خاکە لە دوای ئەوەی کە وشک بووەوە، درز دەبات و دەشکێت.

دانیشتووانی خانووەکانی ئەو شارە دەیانویست لە بەردەم خانووەکانیاندا سەوزە بچێنن، بەڵام فیرعەون چاندنی سەوزایی لە ناو شار قەدەغە کردبوو و پارچە زەوییەکی لە دەرەوەی شار دابووە هەر یەکێک لەو ماڵانە، کە لەوێ سەوزە بچێنن، بەڵام دانیشتووانی شارەکە گلەییان دەکرد کە زەوییەکانیان لە رووبارەوە دوورە و هێنانی ئاو لە نیلەوە بۆ ئەوان زەحمەتە. ژنەکان لە ناوەڕاستی شەقامەکانی شار تەنافیان لە ئەم بەر بۆ ئەوبەر دەبەست و جلە شۆراوەکانیان لە سەر ئەو تەنافە هەڵدەخست بۆ ئەوەی وشک ببێتەوەو فیرعەون ئەم کارەشی قەدەغە کردبوو. هەروەها وتبووی کە خەڵکی نابێت مەڕو بزن لە خانووەکانی شاردا رابگرن، بەڵام ژنەکان گوێیان نەدەدایە ئەم فەرمانەو مەڕو بزنیان لە ماڵەکانیاندا رادەگرت.

لەگەڵ ئەوەشدا وردە وردە خوویان بە شارە نوێیەکەوە گرت و ئەگەرچی (**تەبەس**)یان فەرامۆش نەدەکرد، بەڵام من دەمزانی کە ئەگەر پێیان بوترێت بڕۆن بۆ (**تەبەس**)، هیچیان ئامادە نەبوون کە بگەڕێنەوە.

دوایی وەرزی پاییزو هەڵچوونی ئاوی نیل هاتەوەو ئێمە وامان زانی بە بۆنەی بەرز بوونەوەی ئاوی نیل فیرعەون دەگەڕێتەوە بۆ (**تەبەس**)، بەڵام ئەو لە کەشتییەکەی خۆیدا مایەوەو لەوێوە دەیڕوانییە کاروباری دروستکردنی خانووەکانی شاری (ئاسۆی ئاتوون). هەربەردێک کە دەخرایە سەربەردێکی تر دەبووە هۆی خۆشحاڵیی فیرعەون و دەمبینی کاتێک کە خانوویەک لە تەواو بووندابوو پێدەکەنی.

فیرعەون بە شێک لەو زێڕو پارەیەی کە لە پەرستگای ئامون دەستی

کەوتبوو لە دروستکردنی خانووەکاندا خەرجی کردو هەموو زەوییەکانی (ئاموون)ی بەسەر ئەو هەژارانەی کە حەزیان لە جووتیاری بوو، دابەش کرد.

(ئەخناتوون) بۆ ئەوەی بازرگانەکانی (**تەبەس**) تەنگاو بکات، کەل و پەلی هەموو ئەو کەشتییانەی کڕییەوە کە بەرەو بەشی سەرووی رووباری نیل و شاری (**تەبەس**) دەڕۆیشتن و بە شێوەیەک بۆ دروستکردنی شاری نوێ پەلەی دەکرد کە نرخی دارو بەرد بەرز بووەوە و ئەگەر پیاوێک بیتوانیبایە لە یەکەمین تاڤگەی رووباری نیل، کە دەکەوێتە تەنیشت دارستانە گەورەکانەوە، تەنها یەک جار داری بۆ شاری (ئاسۆی ئاتوون) بهێنایە، دەوڵەمەند دەبوو.

کرێکارێکی زۆر هاتبوونە شاری (ئاسۆی ئاتوون)و لە کەناری نیل لەو خانووانەی کە بە قامیش دروست دەکران نیشتەجێ ببوون و لە بەیانییەوە تائێوارە خشتیان دەبڕی و لە کوورەدا گەرمیان دەکردو رێگاوبانەکانیان تەخت دەکردو جۆگایان بۆ ئاودێری دروست دەکرد. لە دوای تەواو بوونی بەرز بوونەوەی ئاوی نیل هەزارەها داری گەورەو داری میوەیان لە دەوروبەرەوە هێناو لەو شارەدا چاندیان. هەندێ لەو دارانەساڵی دوایی میوەیان گرت و خودی فیرعەون لەو دارانە میوەی چنییەوە. لەو کاتەی کە بیناسازو وەستاو کرێکارەکان خەریکی کارکردن بوون و کەشتییەکان بەردو داریان دەهێنا، منیش ئیشم زۆر بوو چونکە هێشتا کاری وشک کردنەوەی زەلکاوەکانی شارە نوێیەکە تەواو نەببوو و کرێکارەکان بەهۆی بوونی ئاوی وەستاو و زەلکاوەکان تووشی نەخۆشی دەبوون. یەکێک لەکارە بەسوودەکان کەئەنجام درا، دروست کردنی دارەڕا[٧] (اسکلە)ی کەناری رووبار بوو و کاتێک کە دارەڕاکە تەواو بوو، بار بەرەکانی رووبار لە مەترسیی تیمساحەکان پارێزران.

بەر لەوەی جێگای بارداگرتنی کەناری رووبار تەواو بێت، کۆڵبەرەکان ناچار بوون بچنە ناو ئاوەکەوە بۆ ئەوەی بتوانن باری کەشتییەکان بگەیەننە وشکانی و لەناکاودا هاواری یەکێک لەباربەرەکان بەرز دەبووەوەو ئەوانی تر دەیانزانی



کەتیمساحێک پەلاماری ئەو بەدبەختەی داوە. بینینی دیمەنی باربەرێک کە نیوەی لەشی لەناو دەمی تیمساحێکدایە، زۆر ترسناکەو بەر لەوەی بتوانن بەدەنگییەوە بچن، تیمساحەکە رایدەکێشێتە ژێر ئاوەکەوە. بۆ ئەوەی لەکونێکدا بیشارێتەوە، تاکو لەدوای ئەوەی لاشەی باربەرەکە بۆ گەن بوو ئینجا بیخوات . بۆیە ناچار بوون کۆمەڵێ راوچی تیمساح لە شوێنی رژاندنی ئاوی رووباری نیل بۆ ناو دەریاوە، بهێنن و زێڕیان بدەنێ بۆ ئەوەی مەترسیی تیمساحەکان لەناوببەن و ئەوان لەماوەیەکی کەمدا تیمساحەکانیان کوشت، ئەگەرچی تاکاتێک کە دارەڕای بارداگرتنەکە تەواو نەببوو، مەترسیی تیمساحەکان هەرمایەوە.

بیستم کە ئەو تیمساحانەی لەشاری (ئاسۆی ئاتوون) بوون هەمان ئەو تیمساحانەن کەلە(**تەبەس**)ەوە بەدووی کەشتییەکەی فیرعەونەوە هاتبوون. چونکە پێش بینییان دەکرد کەدیسانەوە خۆراکێکی بەتامیان بەنسیب بێت.

من ناتوانم لەوە تێ بگەم کە تیمساح چۆن دەتوانێت لەنێوان بەرێکەوتنی کەشتی فرعەون لە **تەبەس**، تا گەیشتنی بۆ شاری (ئاسۆی ئاتوون) و دەست کەوتنی نێچیر، هێڵی بەپەیوەندی دروست بکات، بەڵام لەزۆر کەسم بیستووە کە تیمساح گیانەوەرێکی زیرەک و ژیرە. بۆیە لەدوای ئەوەی راوچییەکان هاتن و دەستیان بەکوشتنی تیمساحەکان کرد ئەو گیانەوەرە ترسناکانە وایان بەباش زانی کەلەو شارە بڕۆن و ئەگەر عاقڵ نەبوونایە ئەو جێگایەیان بەجێ نەدەهێشت و کۆچ کردنیان لەوێ بەڵگەی ژیریی ئەو گیانەوەرەیە، چونکە تێگەیشتن کە ئەگەر بمێننەوە هەموویان دەکوژرێن. بەڵام لەدوای چۆڵ کردنی کەنارەی شاری (ئاسۆی ئاتوون) رێگای (**تەبەس**) یان گرتەبەر، چونکە لەوانەیە وایان زانیبێ کەهێشتا ناوەندی فەرمانڕەوایی هۆرم هەب لە (**تەبەس**)ەو لەوانەیە دیسانەوە لاشەی کوژراوەکان فڕێ بدەنە ناو ئاوەکەوە و بەئاوساوی بەسەر ئاوەکە بکەون.

پاش ئەوەی ئاوی نیل لەدوای بەرز بوونەوە، کشایە دواوە، هورم هەب کە

لەلایەن فیرعەونەوە راسپێردرابوو سوپا هەڵوەشێنێتەوە و سەربازە رەش پێست و شەردەنییەکان ئیزن بدات (بەڵام دەمزانی کە فەرمانەکەی بەتەواوەتی جێبەجێ ناکات)، بۆ شاری (ئاسۆی ئاتوون) هات.

(هورم هەب) لەبەر ئەوە لەشکرەکەی هەڵنەدەوەشاندەوە، چونکە دەیزانی کە سووریا شۆڕش دەکات و میسر بۆ کوژاندنەوەی ئاگری راپەڕینی سووریا پێویستی بەسوپا هەیە، بەڵام فیرعەون باوەڕی بە راپەڕینی سووریا نەبوو و دەیگوت سووریا هەڵناگەڕێتەوە و باشتر وایە کەسەربازە رەش پێستەکان و شەردەنییەکان، کە لە میسر نەفرەتیان لێ دەکردن، ئیزن بدرێن و بۆ وڵاتی خۆیان بڕۆن و خەڵکی چیتر ئەوان نەبینێت .لەو رۆژەوە کە هورم هەب هاتە ناو شاری ئاسۆوە هەر کاتێک کە پێویستی راگرتنی سوپای لەلای فیرعەون باس دەکرد گفتوگۆیەک بەم شێوەیە لەنێوانیاندا دەست پێ دەکرا: هورم هەب دەیوت: بارودۆخی سووریا زۆر شڵەژاوەو میسرییەکان لەوێ زۆر لاوازن و ئەگەر راپەڕین دەست پێ بکات میسرییەکانی سووریا لەرۆژی یەکەمدا لەناو دەچن و تۆ دەبێ لەشکرێکت هەبێ کەبتوانێ پێش لەهەڵگیرسانی شۆڕشی سووریا بگرێت.

ئەخناتوون وەڵامی دەدایەوە، ئایا تۆ وێنەکانی کۆشکەکەی منت لەم شارەدا بینیوە؟ ئایا ئەوەش دەزانی کە وێنەکێشەکان، هەندێ شێوەی وەک وێنەکانی (کریت) یان لەسەر دیوارەکانی من کێشاوە. ئەگەر تۆ بیبینی تێدەگەی کە بەجۆرێک نەخشێنراوە کەوا دەزانی ماسییەکان لەناو ئاوەکەدا خەریکی هاتوچۆن و مراوییەکان لەهەوادا دەفڕن. بەڵام سەبارەت بە سووریا، من لەو باوەڕەدانیم کە لەوێ شۆڕش بەرپا بێت، چونکە (خاچی ژیان)م بۆ پاشاکانی سووریا ناردووەو پاشای وڵاتی (ئامورۆ) لە سووریا ئەوەندە لەگەڵ مندا دۆستە، کە پەرستگایەکی بۆ ئاتوون دروست کردووە، ئایا تۆ تاقە گەورەکەی بەردەم کۆشکەکەی منت بینیوە کە بۆ ئاتوونم دروست کردووە[٨].

من رات دەسپێرم کە بڕۆی و ئەم تاقە ببینی، چونکە شتێکی دیدەنییەو



بیناسازو وەستاکان زۆر بەجوانی دروستیان کردووەو من نەمویست بۆ دروستکردنی تاقەکەی ئاتوون بەندەکان لەکانگە بەرد دەر بکەن و ئازار بکێشن و فەرمانمدا بەخشت دروستی بکەن.

(هورم هەب) دەیوت: من هەر کاتێک کە دێمە کۆشکەکەتەوە تاقی ئاتوون دەبینم، بەڵام ئاگات لەپاشای ئامورۆ بێت. (ئەخناتوون) وەڵامی دەدایەوەو دەیگوت: من حەز دەکەم ئەو لەوحانە ببینی کەئەو بۆ منی ناردووە، بۆ ئەوەی بزانی کەئەم پاشایە چۆن بووەتە موریدی ئاتوون و لەبارەیەوە پرسیار لەمن دەکات بۆ ئەوەی بیروباوەڕی بەئاتوون بەهێزتر بێت.

هورم هەب دەیگوت: من بایەخ بەلەوحەکان نادەم چونکە ئەگەر رۆژێک پاشایەک بیەوێت هەڵگەڕێتەوە هەموو جۆرە لەوحەو پەیمانێک دەخاتە ژێر پێیەوە و هیچ شتێک جگە لەبەکارهێنانی هێز ناتوانێت پاشاکان ناچار بکات کە ملکەچی تۆ بن. ئیستا کەدەتەوێت سوپاکە هەڵوەشێنمەوە هەرنەبێ بهێڵە لە سنوورەکان کۆمەڵێ سەرباز رابگرم بۆ ئەوەی دەستدرێژی نەکرێتە سەر خاکی میسر. ئێستا ئەو هۆزانەی کە لە باشووری میسر دەژین بۆ ئەوەی مەڕومالاتی خۆیان لە لەوەڕگاکانی میسر بلەوەڕێنن سنوور دەبەزێنن و دێنە ناوخاکی وڵاتەکەی تۆوەو ئاگر بەردەدەنە خانووی رەش پێستەکان. لەکاتێکدا کەئەم رەشانە دۆست و هاوپەیمانی تۆن و لەبەر ئەوەی خانووەکانیان لەقامیش دروست کراوە زوو ئاگری تێ بەر دەبێت.

(ئەخناتوون) وەڵامی دەدایەوە کە هۆی دەستدرێژی کردنی هۆزەکانی باشوور دەگەڕێتەوە بۆ هەژاریی ئەوان و ئەگەر بیانتوانیایە لە وڵاتەکەی خۆیان مەڕ و مالاتەکەیان بلەوەڕێنن، نەدەهاتنە ناو میسرەوە، بەڵام لەبەر نەبوونی لەوەڕگە، ناچارن مەڕەکانیان بهێننە لەوەڕگاکانی میسر و ئەگەر رەش پێستەکانی باشوور لەگەڵیاندا بسازن و رێگابدەن کەئەوان مەڕەکانیان بهێننە ناو لەوەڕگەکانیان، هەرگیز خانووەکانیان ناسووتێنرێ.

هورم هەب گوتی: تۆ بەمن دەڵێی سوپا پەرت و بڵاو بکەم و سەربازەکان ئیزن بدەم بڕۆنەوە بۆ شارەکانی خۆیان، بەڵام ئایا دەزانی کەبەر لەئیزن دانی سەربازەکان دەبێ پاسەوانییەکی بەهێز لەمیسردا دروست بکرێت، چونکە ئەو سەربازانەی کە بەرەڵڵا دەکرێن تادەگەنەوە ولاتەکەی خۆیان ، هەزارەها ماڵ تالاّن دەکەن و دەستدرێژی دەکەنە سەر هەزارەها ژن.

فیرعەون وەڵامی دایەوە کەئەمە تاوانی تۆیە کە لەبارەی ئاتوونەوە قسەت بۆ سەر بازەکانی سوپای من نەکردووە، چونکە ئەگەر ئەوان ئاتوونیان بناسیایەو بیانزانیایە کە ئەو خوای ئاشتی و خۆشەویستییە، بیریان لە تالاّن و دەستدرێژی کردنە سەر ئافرەتان نەدەکردەوە. ئەمڕۆ لەم شارەدا لەبەر ئەوەی خەڵکی ئاتوون دەناسن (مەریتاتوون)ی کچم بەتەنهایی پیاسە دەکات و جگە لە ئاسکێک، هیچ پاسەوان و هاوڕێیەکی نییە و هەرگیز رووی نەداوە کەس دەست درێژی بکاتە سەری. من لەو باوەڕەدام کە جگە لەوەی سەربازەکان ئیزن بدرێن، دەبێ گالیسکە جەنگییەکانیش لەناو ببرێن، چونکە بوونی گالیسکەی جەنگی بەپاشاکانی تر نیشان دەدات کەئێمە بەتەمای شەڕین، بەڵام ئەگەر گالیسکە نەبێت وا تێدەگەن کە ئێمە بەتەمای شەڕکردن نین.

هورم هەب بەگاڵتە پێکردنەوە گوتی: ئایا باشتر نییە گالیسکە جەنگییەکانمان بفرۆشین، چونکە من لەو باوەڕەدام کە پاشای ئامورۆ لە سووریاوە، یان(هاتی)یەکان ئامادەن گالیسکەکانی تۆ بکڕنەوە بۆ ئەوەی رۆژێک لە دژی تۆ بەکاری بهێنن.

ئەم گفتوگۆیەی فیرعەون و هورم هەب چەند رۆژێک درێژەی کێشا و لە کۆتاییدا هورم هەب کە خۆڕاگر بوو توانی فیرعەون بە دوو شت قایل بکات: یەکێکیان ئەوەبوو کە لە سەر سنوورەکانی میسر سەر بازگە رابگرێت و دووەمیان ئەوە بوو کە لەناو میسر ئێشکچی (پاسەوان) دابمەزرێنێت، بۆ ئەوەی پارێزگاری ئاسایشی ناوخۆی وڵات بکەن. فیرعەون گوتی: من بەمەرجێ رێگا



دەدەم ئێشکچی دابنێیت، کە لە داهاتوودا نەتوانی وەکو سوپا کەڵکی لێ وەربگری. لەبەر ئەوەی ئەو پاسەوانانە نەبن بەهێزی سەربازی ، فیرعەون بریاری دا چەکەکەیان تەنها نەیزە(ئەویش بەبێ سەر نێزەی کانزایی) بێت.

هورم هەب بەم فەرمانە رازی بوو بەڵام لەو کاتەی کە خەریکی دروست کردنی ئێشکچیی ناوخۆ بوو، کە لەدوای هەڵوەشاندنەوەی سوپا سەربازەکانیش ئیزن بدات، دوو پەیک(نامەبەر) یەک لەدوای یەک لە سووریاوە هاتن و رایانگەیاند کە پاشای ئامورۆ لەدوای بیستنی جەنگی نێوان خوای کۆن وخوای نوێ و رۆیشتنی فیرعەون لە(**تەبەس**)و نیشتەجێ بوونی لەشاری نوێ، شۆڕشی بەرپاکردووەو بەتەمای گرتنی دووشاری نزیکی سووریایە کەیەکێک لەو دووشارە (مەژیدۆ)یەو ئێستا سەربازگەی میسری لەشاری (مەژیدۆ) گەمارۆ دراوە و داوای یارمەتی لەفیرعەون دەکەن.

فیرعەون لەدوای پێگەیشتنی ئەم هەواڵە بەهۆرم هەبی گوت: من باوەڕ ناکەم پاشای ئامورۆ لە سووریا بەبێ هۆ شۆڕشی بەرپاکردبێت و واهەست دەکەم فەرمانبەرانی میسری لە سووریا بێ رێزییان لەگەڵدا کردبێت و ئەویش تووڕە بووبێت و تا ئەو رۆژەی کە بۆم دەرنەکەوێت ئەم پیاوە بەهۆی هاندانی میسرییەکانەوە نەبووە، هیچ کارێک بۆ تەمێ کردنی ناکەم. بەڵام ئەم رووداوە منی بەئاگا هێنایەوە کە وەکو پێویست سەرنجم نەداوەتە سووریاو هاتەوە یادم کە تۆ (هورم هەب) کاتێک کەلە (ئورشەلیم) بووی لەوێ پەرستگایەکت بۆ ئاتوون دروست نەکرد و ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کە خۆم لە ئورشەلیم شارێک بۆ ئاتوون دروست بکەم، بۆ ئەوەی ببێت بە پایتەختی سووریا و کە(مەژیدۆش) ئارام بووە وە لەوێش شارێک بۆ ئاتوون دروست دەکەم، چونکە (مەژیدۆ) ناوەندێکی بازرگانیی گەورەیە و لەسەر رێگای کاروانەکانە و ئەگەر لەوێ شارێک بۆ ئاتوون دروست بکەین، زۆر ئاوەدان دەبێتەوە.

هورم هەب کاتێک کە ئەم وەڵامەی لە فیرعەون بیست لەتووڕەییدا دەسکی

قامچییەکەی خۆی شکاندو کەرتەکانی فڕێ دایە پێش قاچی فیرعەون و ڕۆیشتە دەرەوە و بەمنی گوت ئەم پیاوە شێتە و لەجیاتی ئەوەی سوپا بنێرێت و پاشای ئامورۆ سەرکوت بکات، دەڵێت بەتەمام لە ئۆرشەلیم شار دروست بکەم و بیکەمە پایتەختی سووریا.

لەو ڕۆژانەی کە هورم هەب لەشاری ئاسۆ بوو، سەبارەت بە سەفەرەکانی من پرسیاری زۆری دەکرد و دەیەویست بزانێت کە ئایا من توانیومە بە پێی ڕاسپاردەکەی ئەو زانیاریی سەربازی لەو وڵاتانە بەدەست بهێنم یان نا؟ کاتێک کەدەستم بەقسەکردن کرد و زانیارییەکانم بۆ گێڕایەوە زۆر بە وردی گوێی لێم دەگرت و ڕۆژێکیان ئەو کێردەم نیشانی دا کە لەهاتییەوە هێنابووم و بە بینینی کێردەکە زۆر حەپەساو گوتی: سینۆهە کێردە مسییەکانی ئێمە لەچاو ئەم کێردە کە تۆ دەڵێی ئاسنییە، وەک کێردی دار وایە. (هورم هەب) هەندێ پرسیاری لەبارەی سەربازەکان و کەلوپەلی جەنگیی وڵاتان لە من دەکرد، کەمنداڵانە دەهاتە بەر چاو، بەڵام دوایی تێگەیشتم کە هۆرم هەب لەبەر ئەوەی خۆی سەربازە ئەو پرسیارانەی لێ دەکردم. بۆ نموونە دەیپرسی کاتێک کە سەربازەکانی بابل مەشق دەکەن یەکەم جار قاچی چەپیان پێش دەخەن یان قاچی ڕاست، یان دەیپرسی لەهاتی ئەو ئەسپانەی کە تێشووی گالیسکە جەنگییەکانن لەهاوشانی گالیسکەکاندا دەڕۆن یان لەدوایەوە، هەروەها دەیپرسی تایەی گالیسکەکانی بابل چەند نیوە تیرەی هەیەو ئایا قەراغی تایەکان بەکانزا داپۆشراوە یان تایەکان ڕووپۆشی کانزاییان پێوە نییە. یەکێکی تر لەو شتانەی زۆر بەلایەوە گرنگ بوو ئەوە بوو کە دەیەویست بزانێت کەوەزعی ڕێگاو بان و پردەکان، لەهاتی و (میتانی) و (بابل)و وڵاتانی تر چۆنە.

هەموو ڕۆژێک نووسەرێک دەهات و ئەو شتانەی کەمن لەبارەی بەندەرەکان و ڕێگاوبان و ڕووبار و ژمارەی سەربازانی وڵاتان دەمگوت، دەینووسی، بۆ ئەوەی هەر کاتێک هۆرم هەب پێویستی پێی بێت سەیریان بکات، بەڵام ئەو شتانەی



کە لەبارەی خوایەکانی وڵاتان و باڵاخانە و بت و شێوەکاری و ئاوەڕۆی زێرابەکان و ئاودەستە سەرنجراکێشەکانی (کریت) کە بەردەوام ئاوی تیادا ڕەوان بوو بەلای هۆرم هەبەوە گرنگ نەبوو و دەیوت سەرباز پێویستی بەم جۆرە زانیارییانە نییە.

ئەو ڕۆژەی هۆرم هەب لەتووڕەییدا دەسکی قامچییەکەی خۆی شکاند، دوای ڕۆیشتنی ویستی دەست لەکار بکێشێتەوە، بەڵام (ئەخناتوون) لەبەر ئەوەی خۆشی دەیویست منی ناردەلای (هۆرم هەب)و گوتی: پێی بڵێ بێت لەگەڵ مندا ئاشت بێتەوە، چونکە من حەزناکەم بەدڵڕەنجاوییەوە لە من جیابێتەوە. هەر چەندە فیرعەون و هۆرم هەب ئاشت بوونەوەو فیرعەون قامچییەکی تری دا پێی، بەڵام هۆرم هەب نەیتوانی فیرعەون ڕازی بکات کە بۆ سەرکوت کردنی پاشای ئامورۆ لەشکر بنێرێتە سووریا.

هۆرم هەب کە مانەوەی خۆی بەبێ سوود دەزانی بەرەو شاری (مەمفیس) کەوتەڕێ، بۆ ئەوەی لەوێ ئێشکچی بۆ پاراستنی ئاسایشی ناو شار دابین بکات، چونکە (مەمفیس) ناوەندی میسر بوو و کەوتبووە شوێنێک کە مەودای نێوان باکوور و باشووری میسر لەو شارەوە یەکسان بوو.

لەدوای ڕۆیشتنی هۆرم هەب فیرعەون پێی وتم: سینۆهە ئەگەر ئاتوون وای دانابێت کە سووریا لەژێر دەسەڵاتی میسر دەربچێت، هەر ئەوە باشترە کە ئیرادەی ئاتوون سەربگرێت چونکە داگیرکردنی سووریا لەلایەن میسرەوە جگە لە زیان هیچی تری بۆ ئێمە نەبووە.

وتم: (ئەخناتوون) ئەوەندەی من بەبیرم بێت و لە خەڵکم بیستبێ دەست بەسەراگرتنی سووریا لەلایەن میسرەوە سوودی بۆ میسر هەبووە، چونکە میسر سوودی لەسامانە فراوانەکەی سووریا وەرگرتووە.

فیرعەون وتی: دەوڵەمەندی و سامان یەکێکە لەو شتانەی کە دەبێتە هۆی تێکچوونی گەل، چونکە خەڵکی خۆپەرست و تەوەزەل و بێ بەزەیی دەکات.

میللەتی میسر گەلێکی زەحمەتکێش و بەقەناعەت و خۆگرو بەبەزەیی بووە، بەڵام لەو کاتەوە کە میسر سووریای داگیر کردووە و سامانی سووریا هاتە ناو میسرەوە، خەڵکی لە سریانییەکان فێری تەمەڵی و رابواردن و هەندێ داب و نەریتی ناشیرین بوون. بەڵام ئەگەر میسر لە دەست سووریا رزگار بێت، چیتر میسرییەکان گرفتاری ئاکاری ناپەسندی سریانییەکان نابن.

من ئەگەرچی دەمزانی کە فیرعەون شێت بووە، بەڵام چاوەڕوانی ئەوە نەبووم کە ئەم قسەیە لەدەمی پاشایەک ببیستم، چونکە پاشا بۆ پاراستنی دەسەڵاتی خۆی نابێ بەوە رازی بێت کە زەویی وڵاتەکەی لەدەست بدات و پێم وت: ئەی(ئەخناتوون) من ماوەیەک لە سووریا بووم و لەشاری ئەزمیر و مەژیدۆ ژیاوم و لە ئەزمیر فەرماندەی سەربازگەی میسری، کوڕێکی هەبوو کەناوی(رامسس)بوو و ئەم کوڕە کە ئەو کاتە دەساڵان بوو بەجوانترین منداڵی سووریا لەقەڵەم دەدرا و بەردەوام بەهەڵمات و کەلای بەردین یاریی دەکرد، بەڵام تووشی نەخۆشی بوو و هێنایانە لای من و منیش زانیم کە کرمی گەدەی هەیەو چارەسەرم کرد.

هەروەها لە(مەژیدۆ)ش ژنێکی میسری هەبوو کە هیچ پیاوێک نەیدەتوانی زیاتر لەیەک جار دەموچاوی ئەو ژنە ببینێ ، چونکە ئەگەر دووجار بیبینیایە سەرسام دەبوو و رۆژێکیان ئەو ئافرەتەیان هێنایە لای من و روانیم سکی ئاوساوەو پێم گوت: دەبێ بۆ چارەسەری نەخۆشییەکەت سکت هەڵبدڕم و رۆژێکیان چووم بۆ ماڵیان و سکیم هەڵدڕی و چاک بووەوە. فیرعەون پرسی بۆ ئەم قسانە بۆ من دەگێڕیتەوە؟

وتم:: لەبەر ئەوە ئەم شتانە بە تۆ دەڵێم چونکە ئەو کوڕە ئێستا بە زەبری شمشێر و نێزەی سەربازە سریانییەکان کەرت کەرت بووە و ئەو ژنە جوانە، کەوتۆتە دەست سەربازە سەرخۆشەکانی سووریاو ئەوان بەبێ ئەوەی گوێ بدەنە هاواریی و زەنای ئەو، دەستدرێژیی دەکەنە سەر. ئایا ئەم رووداوانە بەلای تۆوە



بێ بایەخە و ئامادەی رێگا بدەی کە نەوەکانی میسر لە سووریا بکوژرێن و دەست درێژی بکرێتە سەر ژنە میسرییەکان؟ فیرعەون سەیرێکی کردم وتی: سینۆهە ئەی چی بکەم؟

ئایا فەرمان بدەم کەلەبەر ئەوەی سووریا شۆڕشی کردووە و دەیان میسری کوژراوە، سەربازەکانم سەد جار، سەد سریانی بکوژن؟ ئایا ئەگەر ئەم کارە بکرێت بە رای تۆ کارێکی چاک و ژیرانەیە؟ مەگەر ئەو سریانییانەی لەبەر کوشتنی هەندێ لەمیسرییەکان، دەیانکوژین، گیانیان نییەو ئەوانیش وەک میسرییەکان خاوەنی ژن و منداڵ نین؟ ئەگەر من سزای خراپە بە خراپە بدەمەوە تەنها خراپە دروست دەبێت.

بەڵام ئەگەر سزای خراپە بەچاکەکردن بدەمەوە، ئەگەر چی گومان دەکرێت کە خراپەی لێ دروست ببێت، بەڵام دڵنیام کە ئەو خراپەیە لەوە کەمترە کە بیانەوێت بەخراپە وەڵامی خراپەکارییان بدەنەوە. ئەگەر تۆ پزیشکی منی و ناتەوێت وتەکانت من بیمار بکات، سەبارەت بە تۆڵەسەندنەوە لە سووریا، بە تاوانی کوشتنی میسرییەکان، مەدوێ، چونکە ئەم وتەیەی تۆ ، من زۆر ناڕەحەت دەکات. لەسەر دەمی خوایەتیی ئاموون خوێنیان بەخوێن دەشۆرییەوە و لەسەر کوژرانی یەک میسری، سەد کەسیان لەخەڵکی وڵاتەکانی تر دەکوشت. بۆیە کینە زیاتر دەبوو، چونکە ئەو سەد کەسە، ژن و منداڵ و خزمی تریان هەبوو ئەوانیش هەوڵی تۆڵەسەندنەوەیان دەدا، بەڵام ئاتوون دەڵێت نابێت بەخوێن رشتن تۆڵە بسەندرێتەوە، چونکە ئەگەر لە بری کوشتنی یەکێک ، یەکێکی تر بکوژرێتەوە، هەرگیز رق و کینەو لاساری لەناو ناچێت، بۆیە پێت دەڵێم کە چیتر لەم بارەیەوە لەگەڵ من گفتوگۆ مەکەو بهێڵە من لەگەڵ حەقیقەتەکەی خۆمدا بژێم و لەجیاتی کینە، لەلایەن ئاتوونەوە خۆشەویستی لەدڵی خەڵکیدا دروست بکەم .

## ئەو شارە تازەی فیرعەون دروستی کرد

من هیچکە قسەم نەکرد، بەڵام نەمدەتوانی دەنگی پیاکێشانی سەرقۆچ بە دەروازەی شاری (مەژیدۆ) لەبیر خۆم ببەمەوە و دەمزانی کەلەو شارەدا هەر ژنێکی میسری بکەوێتە دەست سەربازە سریانییەکان، بەبێ رەزامەندی ی خۆی دەست درێژی دەکرێتە سەری، بەڵام سەرەڕای ئەمانە، خۆشحاڵ بووم لەوەی، کە شێتێکی ئەوها رەوشت جوانم دەبینی.

من هێشتا باسی دەربارییەکان (بنەماڵەی پاشایەتی)ی ئەخناتوونم نەکردووە، کە لە (**تەبەس**)ەوە هاتن. ئەوان نەیانتوانی لەگەڵ فیرعەوندا بێن بۆ شاری ئاسۆ چونکە (ئەخناتوون) ئەوەندە بەپەلە لە(**تەبەس**)ەوە بەرێ کەوت کە دەربارییەکان بەفریا نەکەوتن لەگەڵیدا بەرێ بکەون و ئەوان دوایی هاتن. ژیانی دەربارییەکان، جگە لەوەی کە بەردەوام لەفیرعەونەوە نزیک بن و لەکاتی پێکەنینی، ئەوانیش پێبکەنن و لەکاتی پەژارەشدا خۆیان خەمبار نیشان بدەن، هیچ ئامانجێکی تری نەبوو. باوکەکانیشیان لە سەردەمی فیرعەونەکانی پێشوو ئەم کارەیان دەکرد و بوونیان کاریگەرێتییەکی تری نەبوو و نەوەکان پیشەو ناوی باوکیان بۆ دەبووە میرات.

لەگەڵ ئەوەشدا کە زۆربەی دەربارییەکان هیچ کارێکیان نەدەکرد بەڵام پیشەی رەسمییان هەبوو و پلەو پایەکەی خۆیان لەگەڵ یەکتریدا بەراورد دەکرد و هەر یەکێکیان هەوڵی دەدا وای نیشان بدات کە پیشەی ئەو گەورەتر و بەرێزترە لە کاری ئەوانی تر. هەندێ جاریش کە پیشەی یەکێک لە دەربارییەکان (خزمەکان)ی فیرعەون لە پلەی ئەوانی تر بەرزتر دەنرخێنرا، ئەوەی تر وای



دەردەخست کە ئەگەرچی بە رواڵەت پایەی ئەو نزمترە، بەڵام لەمانادا پیشەکەی ئەو گرنگترو بەرزترە و هاورێکانی ئەو کەسەش وایان نیشان دەدا کەقسەکەی راستە. پیشەی دەربارییەکانی فیرعەون بریتی بوو لە پێڵاو دانەری دەربار و چەتردار و نانەوای دەربار و بەرگدروو (خەیات)ی دەربار و شەرابچی و... ئەوان لەهەموو تەمەنیاندا تەنانەت یەک جاریش کەوش و چەتری فیرعەونیان هەڵنەدەگرت و یەک جاریش نانیان بۆ نەدەکردو یەکجاریش جامێکی شەرابیان نەدەدایە دەستی، چونکە هەموو لەپیاوانی دەرباری بوون و پێیان نەنگ بوو ئەم کارانە بکەن و ئەم ئەرکانەیان بە بەندەکان یان خزمەتکارەکان دەسپاردو لە دەرباری (ئەخناتوون) تەنانەت خەتەنەکەری پاشایەتیشی لێ بوو و منیش، بەسەر قلێشێنی پاشایەتی لەقەڵەم دەدرام. بەڵام سەرقلێشێن ناوێکی رواڵەتی پزیشکی تایبەتی فیرعەون بوو و من لەو باوەڕەدام کە لە نێوان دەربارییەکاندا تەنیا من کارم دەکرد.

لەبەر ئەوەی بەردەوام ئاگام لەباری تەندروستیی فیرعەون بوو و ئەو رۆژەی کە دەربارییەکان بەسواری کەشتی لە(**تەبەس**)ەوە هاتن، هەر ئەوەندە کە گەیشتنە شاری ئاسۆ، دەستیان بە خوێندنی سروودی(ئاتوون)ی خوای نوێ کرد بۆ ئەوەی وای نیشان بدەن کە باوەڕیان بەخوایەکەی فیرعەون هەیە. پاشان لەو خێمانەی کە لە کەناری رووبار هەڵیان دا نیشتەجێ بوون، هەتا خانووەکانی شار دروست ببێ و لەوێ دەیانخواردو دەیاننۆشییەوە و چێژیان لەژیان وەردەگرت، چونکە وەرزی زستانی میسر بەتەواوەتی کۆتایی پێ هاتبوو و وەرزی بەهار دەستی پێ کردبوو و باڵندەکان دەیانخوێند.

دەربارییەکان ئەوەندە خزمەتکارو بەندەیان هەبوو کە تەنیا جێگای حەوانەوەی ئەوان، بە شارێک لە قەڵەم دەدرا، چونکە ئەوان نەیاندەتوانی بەبێ بەندە و خزمەتکار ژیان بەسەر ببەن و هەندێ لەوان تەنانەت توانای شوشتنی دەستەکانیشیان نەبوو و دەبوایە بەندەکان دەستیان بۆ بشوشتنایە، بەڵام

شتێکیان هەرگیز لەبیر نەدەچوو و کەمتەرخەمییان لێی نەدەکرد و ئەویش ئەوەبوو کە فیرعەون لە هەر شوێنێک بوایە ئەوانیش لەوێ بوونایە، بۆ ئەوەی (ئەخناتوون) بیانبینێت و ناو و شێوەیانی فەرامۆش نەکردایە.

ئەوان کاتێک کەبینییان فیرعەون حەزدەکات شارەکە زوو تەواو بێت بەنناییشیان دەکردو خۆم بینینم کە هەندێ لە ژنە جوانەکانی دەربار بەرووتی لەسەر زەوی دادەنیشتن و خشتیان دەبڕی و هەندێ لە پیاوەکانیشیان لە کاتێکدا کە بەندەکان چەتریان لەبان سەریانەوە راگرتبوو، کە هەتاو لێیان نەدات، خشتەکانیان یەک لەدوای یەکتری لەسەر دیوارەکە دادەنا و وەستاکان هەمیشە لەم بەننا نەزان و ڕیاییانە بەداخ بوون چونکە ئەوان بەنناییيان نەدەزانی و خشتەکانیان بە جۆرێک لەسەر یەکتری دادەنا کە وەستا راستەقینەکان ناچار دەبوون ئەو دیوارانە برووخێنن و سەر لەنوێ دروستی بکەنەوە.

دەربارییەکان بە کارەکەی خۆیانەوە دەنازین و هەموو رۆژێک دەستە تلۆق کردووەکەی خۆیان نیشانی فیرعەون دەدا بۆ ئەوەی بزانێت کە چەند بۆ دروست کردنی شاری خوایەکەی ئەو زەحمەت دەکێشن . لەدوای چەند رۆژێش لە کاری بەننایی ماندوو دەبوون و بۆ ئەوەی کارەکەیان جۆراو جۆر بێت، دەستیان بەناشتنی نەمام و باخەوانی دەکرد و ئینجا نۆبەی باخەوانەکان بوو کە لەتاو توورەبوونیان پەنابەنە بەر خوایەکانی میسر، چونکە هەر چییەک باخەوانەکان دەیانچاند، ئەوان وشکیان دەکردەوە ونەمامە بچووکەکانیان لەناو دەبرد و جۆگەلەکانی ئاویان تێک دەدا.

باخەوانەکان و ئەوانەی نەمامیان دەچاند نەیاندەتوانی بەئاشکرا بەرامبەر بە پیاوەکان وخانمە دەربارییەکانی فیرعەون نارەزایی دەربڕن و بڵێن کەدەست لەکاری ئێمە وەرمەدەن و، ئەوانیش بەخەیاڵی ئەوەی یارمەتیی باخەوانەکان دەدەن هەموو رۆژێک ئازاریان دەدان و کارەکانی ئەوانیان زیاد دەکردن. بەڵام ئەو ژن و پیاوانە هەر زوو لە نەمام ناشتن و گوڵ چاندنیش بێزار بوون و شەوان



مێشوولە ئازاریانی دەدا و بەیانییان دەهاتنە لای من بۆ چارەسەری پێستی لەشیان. کە مێشوولەی پێوەدابوو و داوای مەڵحەمیان لێ دەکردم.

هەندێک لەوانیش بەدزییەوە دەگەڕانەوە بۆ (**تەبەس**) بۆ ئەوەی کاتەکانیان لەخۆشگوزەرانیدا بەسەر ببەن و ئەوانەش کە نەیاندەتوانی بە نهێنی بگەڕێنەوە، چونکە ئەوەندە خۆیان نیشانی فیرعەون دابوو کە دیار نەبوونیان گومانی دروست دەکرد، لەگەڵ گەرماو مێشوولەی ئەوێ راهاتن و کاتەکانی خۆیان بەخواردنەوە و یاریی(زار هەڵدان) دەبردە سەر.

بیناسازیی شاری ئاسۆ بەرەو پێش دەچوو و خانووەکان بەرزتر دەبوونەوەو دارەکان گەورە دەبوون و زەوییەکانی دەرەوەی شار پڕ ببوو لە شینایی بەسوود. من نازانم بیناکانی شاری ئاسۆ چەندی تێچوو، بەڵام دەمزانی کەهەموو ئەو زەوی و پارانەی کە فیرعەون لەپەرستگای خوایەکەی پێشوو دەستی کەوتبوو لەدروست کردنی ئەو شارە دا خەرج کراو کەمیشی هێنا. دەبێ ئەوە بڵێم کە زێڕو پارەکانی ئاموون هەمووی نەکەوتە دەستی فیرعەونەوە، چونکە کاهینەکانی ئاموون لەبەر ئەوەی پێشبینییان دەکرد کە لەوانەیە فیرعەون خوایەکەیان لەناو ببات، هەندێک لەو زێڕە عەمبارکراوەیان ، بەر لە دەست پێکردنی شەڕ، بۆ شوێنی تر گواستبۆوە.

بنەماڵەی پاشایەتی میسر بەهۆی رۆیشتنی فیرعەون، دابەش ببوو و شاژنی پێشوو واتە دایکی (ئەخناتوون) کە ناوی( تی‌ئی) بوو رازی نەبوو کە لە **تەبەس** بڕوات و کۆشکی رازاوەی پاشایەتی بەجێ بهێڵێت. (ئامی)یش کە کاهینی پەرستگای گەورەی ئاتوون بوو و پێشتر لەم سەر گوزەشتەیەدا باسیم کرد، هەر لە **تەبەس** مایەوە لەدوای رۆیشتنی فیرعەون باری گوزەرانی خەڵکی **تەبەس** هیچ گۆڕانێکی بەخۆیەوە نەدی و تەنها فیرعەون لەوێ نەمابوو و خەڵکیش رۆیشتنی فیرعەونیان پێ ناخۆش نەبوو، بەڵکو بەفیرعەونێکی درۆزنیان دەزانی و وایان بیردەکردەوە کە ئیتر لە شەڕو ئاژاوەی ئەو ئاسوودە

بوونە.

شاژن (نەفرتیتی) کە هاتبووە شاری ئاسۆ، بۆ منداڵ بوون گەڕایەوە شاری **تەبەس**، چونکە نەیدەتوانی چاوپۆشی لە هاوکاریی مامانە رەش پێستەکان بکات و بۆ جاری سێیەم کچێکی تری بوو ناویان نا (ئانخزئاتوون)و سەری ئەو کچەش وەک سەری دوو کچەکەی تر درێژ بوو، چونکە مامانە رەش پێستەکان بۆ ئەوەی (نەفرتی‌تی ) لەکاتی منداڵبووندا بەئاسانی بزێت سەری کچەکانیان لەناو سکی شاژندا دەگوشی و درێژیان دەکردەوە.

خەڵکیش کە لەو دەستکاری کردنەی مامانەکان بێ ئاگابوون، درێژ بوونی سەری کچەکانی فیرعەونیان بەیەکێک لە موعجیزە(پەرجوو)ەکان دەزانی و وایان بیر دەکردەوە کە لە جۆری سەری رەچەڵەکێکی گەورەی خوایەکانە، کە بەشازادە خانمە جوانەکانی میسر بەخشراوە. نەفامیی خەڵک گەیشتبووە رادەیەک کە هەوڵیان دەدا سەری خۆیان وەک سەری شازادە خانمەکانی میسر لێ بکەن و لەبەرئەوەی لە دوای منداڵ بوون ئیتر نەدەکرا سەریان درێژ بکەنەوە و بەو شێوەیە ناکرێ سەری ژنێکی باڵغ درێژ بکەنەوە، پرچی دەستکردی تایبەتییان لەسەر دەکرد بۆ ئەوەی سەریانی درێژ نیشان بدایە.

بەڵام شازادە خانمەکان بۆ ئەوەی بیسەلمێنن کەدرێژ بوونی سەری ئەوان سروشتییە نەک دەستکرد، هەندێ جار بەبێ پرچی دەستکردو بە سەری تاشراوەوە لەمیوانداریییەکان ئامادە دەبوون و شاعیرەکان هۆنراوەیان لە وەسفی سەریان دەهۆنییەوەو پەیکەرتاشەکان بۆ دروست کردنی شێوەی بتەکانی خۆیان چاویان لەنموونەی سەری ئەوان دەکرد.

لەپاش ئەوەی کچی سێیەمی (نەفرتی‌تی) هاتە دنیاوە، شاژنی میسر لە(**تەبەس**)ەوە بۆشاری ئاسۆ گەڕایەوەو بەیەکجاری لەوێ مایەوە، بەڵام حەرەمسەرای فیرعەونی هەر لە **تەبەس** بەجێ هێشت، چونکە حەزی نەکرد مێردەکەی لەوە زیاتر سەر قاڵی پێداویستییەکانی حەرەم ببێت و ئەو وزە کەمەی



خۆی بۆ جێبەجێ کردنی کاروباری ئەوێ بەفیڕۆ بدات. خودی فیرعەونیش ژنەکانی تری زۆر خۆش نەدەویست و تەنها هەندێ جار بۆ ئەنجامدانی ئەرکی هاوسەرێتی دەچووە لایان و من دەمزانی (نەفرتیتی) ی لەهەموویان زیاتر خۆش دەویست. چونکە لەهەموو ژنەکانی حەرەم جوانتر بوو و لەدوای بوونی سێ کچ، هێشتا هەر بەشاجوانێکی بەرجەستە لەقەڵەم دەدرا. لەگەڵ ئەوەشدا (نەفرتیتی) بۆ ئەو خۆشەویستییەی فیرعەون خۆی، بەقەرزاری جادووگەرە رەش پێستەکان دەزانی، نەک جوانییە سروشتییەکەی خۆی و جادووگەرەکان پێیان گوتبوو کە ئەگەر ئەڤینی مێردەکەی بپارێزێت، لە داهاتوودا کوڕی دەبێت.

شاری (ئاسۆی ئاتوون) بەیەک ساڵ دروست کراو ئەگەر کەسێک مێژووی دروستکردنی خانووەکانی شاری نەزانیبایەو بهاتایەتە ناو ئەو شارە و بیبینیبایە،وای دەزانی کەهەر نەبێ دەساڵە دروست کراوە، چونکە دارخورما و داری سێبەردار و درەختە میوەدارەکانیان لەرەگەوە هەڵکەندبوو و هێنابوویانە ئەو شارەوەو چاندبوویان. هەندێ لەدارەکان وشک بوونەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی پێشبینیی وشکەوە بوونیان کردبوو ئەوەندە داریان هێنابوو کەشاری ئاتوون ببووە باخێکی سێبەردار و میوەدار و لەجۆگەلە ئاوەکان ماسیی بچووک هاتوچۆیان دەکرد و مراوییەکان لە بان شارەوە دەفڕین و ئاسکە ماڵییەکان لەناو ماڵەکاندا لەناوەڕاستی گوڵ و گیایەکان راکەڕاکیان دەکردو لەکاتی چێشت لێنان بۆنی بەهارات (ادویة) دەهات.

بەم شێوەیە شاری (ئاسۆی ئاتوون) بەناوی (ئاتوون)ەوە دروست کراو کاتێک کە وەرزی پاییز هاتەوە و ئاوی نیل بەرز بووەوە، فیرعەون بە یەکجاری بڕیاری دا کە بە رەسمی ئەو شارە پێشکەشی ئاتوون بکات. ماوەیەک بەر لەوە بیناسازەکان و کرێکارەکان، چوار شەقامی گەورەیان دروست کردبوو کە یەکێکیان لەناو شارەوە بۆ هەر چوار لا دەڕۆیشت و لە کۆتایی هەر یەکێک لەو شەقامانە بتێکی ئاتوون داندرابوو. رۆژێکیان فیرعەون لەگەڵ بنەماڵەی

پاشایەتی و دەربارییەکان بەرەو ئەو پەیکەرەی لەلای باکوورەوە بوو رۆیشتن و لەوێ بەڵێنی دا کە ئەو شارە هەمیشە بەشاری ئاتوون بزانێت و تا زیندووە ئەوێ بکاتە بارەگای هەمیشەیی خۆی و لەدوای مردنیشی تەرمە مۆمیایی کراوەکەی لەو شاخە بنێژن کە کەوتووەتە لای رۆژهەڵاتەوە. پەیکەر تاشەکان و ئەو بەننایانەی کە دەبوایە گۆڕی فیرعەونیان دروست بکردایە لەبەر ئەوەی کە دەیانزانی ماوەی چەند ساڵێک لەو شوێنە شاخاوییانە نیشتەجێ دەبن بە ژن و منداڵەکانی خۆیانەوە رۆیشتن و بەر لە رۆیشتنیان فیرعەون پێیانی گوت: حەز ناکەم بۆ دروست کردنی ئارامگەکەم خۆتان ماندوو بکەن و لە کارەکەتان پەلەمەکەن، چونکە ئاتوونی خوای من دەڵێت نابێت ئازاری کەس بدەیت و ئێوە ئەگەر رۆژانە دوو یان سێ کاتژمێر (میزان) کاربکەن لەدوای چەند ساڵێک گۆڕەکەم دروست دەکەن و هەوڵ بدەن خواردنی زۆر بخۆن و ژن و منداڵەکانیشتان باش تێر بکەن بۆ ئەوەی قەڵەو و جوان بن چونکە ئاتوون جوانیی خۆش دەوێت و جوانی دەبێتە هۆی ئەوەی کەلەخەڵکیدا خۆشەویستی دروست ببێت و لە گەلێک کە هەموو ژن و پیاوەکانی جوان بن کینە دروست نابێت.

کاتێک کە فیرعەون فەرمانی دروستکردنی گۆڕەکەی خۆی دا، گەورەکان و دەربارییەکانیش هەوڵیان دا ئەوانیش گۆڕ بۆ خۆیان دروست بکەن. ئەم بابەتە فیرعەون و ئەوانی تریشی بە ئاگا هێنا کە پێویستیان بە(خانەی مەرگ) هەیە. بۆ ئەوەی مردووەکان لەوێ مۆمیایی بکرێن و لەبەر ئەوە فیرعەون فەرمانی دا کە باشترین مۆمیا کارەکانی(خانەی مەرگ)ی **تەبەس** بهێنن بۆ شاری ئاتوون.

فیرعەون دەیزانی کە ئەو مۆمیاکارانە لەناو پەرستگای ئامووندا دەژین و ئەوەشی دەزانی کە تەنانەت یەک کەسیش لە کرێکارەکانی مۆمیایی کردن ئاموون و ئاتوون ناناسن، چونکە ئەوان لەبەر ئەوەی لە هەموو ماوەی تەمەنیاندا لەوێ بوونە، وەکو گیانەوەرێک لەقەڵەم دەدرێن کە نابێت بەمرۆڤیان دابنێیت. چونکە بەجۆرێک خوویان بە مردووەکانەوە گرتووە کە وەک ئەوانیان لێهاتووە.



ئەو رۆژەی کرێکارەکانی مۆمیایی کردنی **تەبەس** بەسواری کەشتییەوە بەرەو **تەبەس** هاتن، خەڵکی لووتی خۆیان گرت و چوونە ژوورەوە. چونکە بۆنی تایبەت بەو کرێکارانە لە هەوادا بڵاو ببۆوەو خەڵکی لەتاوا رایان دەکرد و تەنها من لەو بۆنە رام نەکرد . چونکە هاتەوە یادم کە منیش رۆژێکی وەک ئەوان لەخانەی مەرگ کارم دەکرد.

بەر لەوەی مۆمیا کارەکان بێنە قەراغ شارەکە (خانەی مەرگ)ێکیان بۆ دروست کردبوون و فیرعەون منی کردە بەرپرسی چاودێری دروستکردنی بیناکە و ئامادەکردنی کەرەستەی کاری مۆمیایی. چونکە دەیزانی کە کاهینەکانی خوای ئاتوون رقیان لە مۆمیاکارەکان دەبووەوە. چونکە وایان دەزانی کە ئەوان هێشتا شوێن کەوتووی خوای پێشوون و هیچ یەکێک لە کاهینەکانی ئاتوون ئامادە نەدەبوو چاودێریی دروستکردنی ئەو خانووە بگرنە ئەستۆی خۆیان.

من کارەکەی خۆم بەباشی ئەنجام دا ، چونکە جگە لەزانیاریی پزیشکی، خۆشم لە خانەی مەرگ کارم کردبوو و دەمزانی، کە خانەی مەرگێکی تەواو پێویستی بە چ شتێک هەیەو لەو خانەیە چەند حەوزێکی گەورەم بۆ ئاو و خوێ دروست کرد و چەندین تەلارم دروست کرد کەمۆمیاکارەکان بۆ دەرکردنی ناوسک و کاسەی سەری مردووەکان و پێچانەوەیان تەنگاونەبن. هەروەها لەبەر ئەوەی دەمزانی کە شوێنی هەمیشەیی کرێکارەکان هەر لەناو خانەی مەرگدایە، بۆ نیشتەجێ بوونیان ژووری پێویستم دروست کرد. لەبەر ئەوەی کە لەو شارەدا خانوویان بۆ منیش دروست کردبوو، هەر لەو شارەدا مامەوەو لەوە بەدوا ژیانی من لەوێ رووداوێکی گرنگی تیادا روونەدا. چونکە لەوانەیە مرۆڤ لەماوەی چەند ساڵێکدا هیچ شتێکی بەرچاو لە ژیانیدا روونەدات و هەندێ جاریش لەماوەیەکی کەمدا کارەساتی زۆر روودەدات و من ماوەی دەساڵ لەشاری ئاسۆ مامەوەو لەم ماوەیەدا کارەکانم هەمووی هەروەک یەک بوو و هەموو رۆژێک نەخۆشەکانم لەماڵەوە چارەسەر دەکرد و هەموو رۆژێکیش دەچوومە کۆشکی

فیرعەون و هەندێ جاریش لە ژیانی من و دانیشتووانی تری شاری ئاسۆ هەندێ شت روویداوە کە لە رووداوەکانی تری ئەو ساڵە بەبایەخ تر بوو.

لەماوەی مانەوەم لە شاری ئاتوون زانیاریم هیچ زیادی نەکرد، بەڵام لەو شتانەی کە لەسەردەمی گەنجێتیم فێری ببووم، سوودم وەردەگرت و وەک مێش هەنگوین بووم کە لە زستاندا هەنگوینی تازە دروست ناکات و لەوەی لەهاویندا کۆی کردۆتەوە کەڵک وەردەگرێت. دوور نییە کەلەم دەساڵەدا تێپەڕبوونی کات رووحی منی گۆڕیبێت. چونکە تێپەڕینی شەوو رۆژ وەک بەردێک کە ئاو بەسەریدا بڕوات کار لە مرۆڤ دەکات. ئاو لەگەڵ ئەوەشدا کە نەرم و رەوانە بەڵام بەرد دەتاشێت و سافی دەکات و تێپەڕینی کاتیش رووح دەتاشێت و شێوەیەکی تری بەسەردا دەهێنێت.

من بەهۆی زیاد بوونی تەمەنم قورس ترو سەلار تر ببووم و ئیتر وەکو سەردەمی گەنجێتیم بەزانست و زیرەکییەکەی خۆم نەدەنازیم و لەوانەیە ئەوەی بووە هۆی لەسەر خۆیی و رەوشت بەرزیم، ئەوە بوو بێت کە کاپتا بەردەوام پێی نەدەگوتم: تۆ پزیشکێکی گەورەیت و دەبێ هونەرەکەی خۆت بناسێنی بۆ ئەوەی قەدرت بگرن. کاپتا لەو شارە نەبوو بەڵکو هەر لە **تەبەس** دەژیاو لەوێ مەیخانەکەی خۆی و داراییەکەی منی بەڕێوە دەبرد.

شاری ئاسۆ لەگەڵ ئەوەشدا کە بەجێگای نیشتەجێ بوونی فیرعەون لەقەڵەم دەدرا، بەڵام بەشێوەیەک دەیبردە سەر کە دەتگوت لە دنیایەکی تردا، جگە لە میسر دروست کراوەو دەنگدانەوەی رووداوەکانی جیهانی دەرەوە وەک شەوقی مانگ، کە شەوێک لەئاو بدات و دوایی نەمێنێت، دەگەیشتە شاری ئاسۆ. بۆ فیرعەون شارەکانی تری میسر وەک ئەوە بوو کە نەبێت، چونکە ئاگای لە رووداوەکانی ئەو شارانە نەبوو . ئەو نەیدەزانی کە لەشارەکانی تر وشکە ساڵی و نەبوونی و ئازار فەرمانڕەوایی دەکات، چونکە دەرباریییەکان هەرگیز راستییەکەیان پێ نەدەوت و دەیانزانی کە نابێت ئەو شتانەی پێ بڵێن کە



دەبێتە هۆی دڵتەنگ بوونی. ئەگەریش هەندێ جار ناچار دەبوون کە چەند شتێکی پێ بڵێن (چونکە دەیانزانی چارەیەکی تریان نییە) بەجۆرێک ئەو شتانەیان لە بەینی شتی چاکی وەکو هەنگوین و گوڵ و شتە بۆن خۆشەکان، دەپێچایەوە، کەفیرعەون هەستی بە گرنگیی ئەو رووداوانە نەدەکردو لەبەر ئەوە راستییەکانیان پێ نەدەوت تاکو تووشی ژانە سەر نەبێت.

شاری **تەبەس** لەلایەن (ئامی) کاهینی گەورەی **(تەبەس)** بەڕێوە دەچوو و فیرعەون هەر شتێک کە بۆ پاشایەتی و دەسەڵاتدارێتی دزێوی بووایە،، وەک وەرگرتنی سەرانە (باج)و دادپەروەری کردن و بازرگانی، لە **تەبەس** هێشتبوویەوە بۆیە **تەبەس** وەکو جاران بەپایتەختی راستەقینەی میسر لە قەڵەم دەدراو شاری ئاسۆ بەجۆرە پایتەختێکی کاتی لەقەڵەم دەدرا. ئامی خەزووری ئەخناتوون بوو و فیرعەون متمانەیەکی زۆری پێی هەبوو و کاهینی گەورەی ئاتوون وەکو پاشایەکی راستەقینە لە **تەبەس**-دا فەرمانڕەوایی دەکرد. لە دوای رووخانی خوای ئاموون ئیتر هیچ هێزێک نەبوو دژایەتیی فیرعەون بکات و بتوانێ ببێتە بەربەست بۆ دەسەڵاتەکەی. کەواتە (ئامی)یش کە بە ناوی فیرعەون و خوای نوێوە لە **تەبەس** فەرمانڕەوایی دەکرد، ناڕازی نەبوو و (ئامی) وای بیر دەکردەوە کە لەبەر ئەوەی خوای کۆن لە ناو چووە و دەسەڵاتی نوێش لە میسردا چەسپاوە، ئیتر چی تر نائارامی و پەرێشانی دروست نابێتەوە.

دەسەڵاتی ئامی ئەوەندە بەرفراوان بوو کە هەموو کەسێک و هەموو شتێکی دەگرتەوە و ئەگەر دوو جووتیار، یان دوو باربەر (حەماڵ) ناکۆکییان پەیابکردایە، دەبوایە کێشەکەیان لە لایەن کاهینی گەورە، یان ژێردەستەکانی چارەسەر بکردایەو (ئامی) لەوەی کە فیرعەون لە شاری ئاسۆ دەمێنێتەوە و ناگەڕێتەوە خۆشحاڵ بوو، چونکە دەیزانی کە ئەگەر فیرعەون بگەڕێتەوە بۆ **تەبەس**، گرفت بۆ ئەو دروست دەکات. کاهینی گەورە بۆ ئەوەی فیرعەون خۆشحاڵ بکات، رازاندنەوەی شاری ئاسۆ دیاریی گرانبەهای بۆ دەناردو فیرعەون

هەر چەندە زێڕو پارەی بۆ تەواو کردنی شارە تازەکە بویستایە، کاهینی گەورە بۆی دەنارد.

هورم هەب لە شاری (مەمفیس) فەرمانڕەوایی دەکرد و ئاسایش و هێمنیی ولاتی دەپاراست. چونکە ئەو هێزی ئەژنۆی هەموو فەرمانبەرێکی باج بوو، کە بۆ سەندنی سەرانە لە خەڵک دەچوون و هێزی بازووی هەر پەیکەرتاشێکیش بوو کە ناوی ئاموونی لە سەر بت و پەرستگاکان و گۆڕەکان ڕەش دەکردەوە و لە جیاتی ئەوە ناوی ئاتوونی لەسەر هەڵدەکەند.

فیرعەون فەرمانی دابوو کە تەنانەت گۆڕی باوکیشی بکەنەوە و ناوی ئاموونی لەناو ئارامگەکە و لە سەر رووپۆشی مۆمیاییەکە ڕەش بکەنەوەو لە جیاتی ئەوە ناوی ئاتوون بنووسن. جا کاتێک کە گۆڕی باوکی (ئەخناتوون) کرایەوە، ئیتر دیارە گۆڕی خەڵکی ئاساییش هەر دەکرایەوەو ناوی خوای نوێیان لە جیاتی ئاموون دەنووسی. کاتێک کە ویستیان ناوی ئاموون لە سەر گۆڕەکان نەهێڵن و ئاتوونی لێ بنووسن، لەگەڵ ئەوەشدا کە هەڵکەندنی گۆڕ لە میسر قەدەغەبوو، بەڵام ئامی رەخنەی نەگرت. چونکە ئەو پیاوێکی زیرەک بوو ودەیزانی کە تا ئەو کاتەی فیرعەون بۆ شەڕکردن لەگەڵ مردووەکان دەچێت، کارو فەرمانەکانی، مەترسیی بۆ زیندووەکان نییە و مرۆڤ دەبێ نەفام بێت کە بە ڕێگاگرتن لە کارێ کە دژی مردووەکانە، فیرعەون لە خۆی بڕەنجێنێ.

لەپاش شەڕی ناوخۆی (تەبەس)، کە لە نێوان لایەنگرانی خوای نوێ و خوای کۆن، کە پێشتر باسم کرد، ولاتی میسر ماوەیەک ئارامیی بەخۆیەوە بینی و (ئامی) کاهینی گەورە، وەرگرتن و سەندنی سەرانە (مالیات)ی بەچەند باج وەرگرێکی گەورە سپارد و ئەوانیش بە هۆی چەند باج وەرگرێکی بچووکەوە سەرانەیان لە خەڵکی دەسەندو لەپاش هەر دەورەیەکی وەرگرتنی باج، باج بدە هەژارەکان، کەبەپێی یاسای گشتی، زیاتر لە باج بدە دەوڵەمەندەکان ئەرکیان دەکەوتەسەرشان، خۆڵیان بەسەر خۆیاندا دەکردو کراسیان لەبەرخۆیاندا دەدراند



کە باج وەرگرەکان بەچاوی بەزەییەوە سەیری بکەن. بەڵام کەس سەرنجی نەدەداپێیان، چونکە بینینی پیاوێکی هەژار کە گرفتاری ستەمی فەرمانبەرانی وەرگرتنی باج بووبێت ئەوەندە ئاساییە، کە کەس سکی پێی نەدەسووتا.

هەروەها لەدوای هەر جارێک، باج وەرگرەکان لە ساڵی رابردوو دەوڵەمەندتر دەبوون و ئەمەش بنچینەیەکی سەرەکییە کە چارەسەری نییەو تاجیهان بمێنێ سەرانە لە خەڵکی دەسەندرێ و فەرمانبەرەکانی باجیش بە زیانی میری بێت یان بەزەرەری خەڵکی دەوڵەمەند دەبن و تەنها بەیەک شێوە دەکرێ ڕێگا لە زەنگین بوونی فەرمانبەرانی باج بگیردرێت و ئەویش ئەوەیە کە باج هەرنەبێت و ئەمەش مومکین نییە.

لە شاری (ئاسۆ)، (نەفرتی تی) چوارەمین کچی خۆی بە دنیا هێنا و لەدایک بوونی کچی چوارەم بەرادەیەک بووە هۆی بەدبەختی، کە نەهامەتی شۆڕشی سووریاشی لە بیر بردەوە (کەلە داهاتوو دا باس دەکرێت کە چۆن سووریا شۆڕشی لە دژی فیرعەون کرد).

(نەفرتی تی) لە دوای ئەوەی کچی چوارەمی بوو هەموو کەسێکی تاوانبار دەکرد کە جادوویان لێی کردووەو بوونەتە هۆی ئەوەی کە دیسانەوە کچی ببێ و بەرەو تەبەس رۆیشت بۆ ئەوەی یارمەتی لە جادووگەرە رەش پێستەکان وەربگرێ و ئەوان ئەو جادووەی کە خەڵکی لە ئەویان کردووە، پووچەڵی بکەنەوە.

***

١- ناوی یەکەم جاری ئەم فیرعەونە (ئاموون هوتەپ)ی چوارەم بوو و ناوی یەکەمی وانیشان دەدات کە (ئاموون)ی خۆش دەویست بەڵام دوایی بڕوای بە (ئاتوون) هێناو ناوی خۆی کردە (ئەخناتوون) واتە (ئەو کەسەی ئاتوونی خۆش دەوێت) و ئەو ئاتوونی بە خوای تەنیاو نەبینراو دەزانی و لە دەرگای خوای تەنیاو نەبینراو موناجاتی دەکرد. و.

٢- لە میسری کۆن، وەک ئێران لە سەردەمی هەخامەنشییەکان ڕۆژەکانیان بە

ناوی ئەستێرەکانی ئاسمانەوە ناو نابوو و مەبەست لە (ئەستێرەی سەگ) ئەستێرەیەکی درەوشاوەیە کە یەکێکە لە کۆمەڵە ئەستێرەکانی سەگی گەورە (کلب الاکبر) و ناوی یەکێک لە ڕۆژەکانی میسر بووە. و.

٣- ئەم پەیکەرەی شاژنی میسر کە (توتمس) دروستی کردووە ئێستا ماوەو ماوەیەک لە مۆزەخانەی (بەرلین) بوو پاشان فوئادی یەکەم، پاشای میسر داوای لە حکوومەتی ئەڵمانیا کرد کە ئەو پەیکەرەی، شوێنەوارناسانی ئەوروپی لە کاتی هەڵکەندنیان، لە میسر دۆزیبوویانەتەوە بگەڕێنێتەوە بۆ میسرو حکوومەتی ئەڵمانیاش بتەکەی پێدانەوەو بەو پێیە پەیکەری (نەفر تی تی) دەبێ ئێستا لە یەکێک لە مۆزەخانەکانی میسر بێت. و.

٤- دنیای مەغریب لە میسر جێگای مردووەکان و هەروەها دنیای ژیانی نەمریش بووە. وەرگێڕ.

٥- میسرییەکان یەکەم میللەتن کە زانیویانە، زەوی کە بەدەوری خۆردا دەسووڕێتەوە هەر بیست و حەوت هەزار ساڵ جارێک، دەگاتە ئاست ئەستێرەیەکی تایبەت و بە ئەم سەردەمە بیست و حەوت هەزار ساڵەیان دەوت ساڵی جیهانی-و.

٦- (شاری ئاسۆی ئاتوون) لە زمانی فارسیدا لە کاتی دەربڕین قورسەو لەبەر ئەوەی کە ناوی مێژوویییە نابێت بگۆڕدرێت. هەروەها پیتی (نون)و پیتی (م) لە هەندێ لە زمانە ئەوروپییەکاندا لە یەکترەوە نزیکەوهەندێ لە مێژوو ناسانی ئەوروپی لە سەر شێوەی یۆنانییەکانی کۆن (ئاتوون) بە (ئاتوم)یش ناو دەبەن- و.

٧- دارەڕا (اسکلە) شوێنی وەستانی کەشتی لە کەناری رووبار یان دەریا- شوێنی بارکردن و داگرتنی کەلو پەلی کەشتییەکان. وەرگێڕی کوردی

٨- (تاق: بنمیچی چەماوە. کە لە شێوەی کەوانەییدا لەسەر دەرگا یان لەژێر پرد دروست دەکرێت - لە شێوەی میحراب. و. کوردی) دروستکردنی تاقی (نصرە) کە لە سەردەمی رۆمانییەکانەوە بۆ ڕێزلێگرتن لە سەرکەوتووەکانی شەڕ ببووە شتێکی باو، لە داهێنانی رۆمییەکان نەبوو، بەڵکو ئەوان لە میسرو (کریت)ەوە فێری ئەم کارە بوون و لە میسرو کریت تاقیان بۆ خوایەکان دروست دەکرد. و.

***



**کۆتایی بەرگی یەکەمی کتێبی سینۆهە – پزیشکی تایبەتی فیرعەون**

***